


# مایا


نووسینی: یۆستاین گاردەر

وەرگێڕانی: بەهرۆز حەسەن

بابەت: ڕۆمان

مۆنتاژی کۆمپیوتەر: سەیران عەبدولڕەحمان

هەڵەچنی: سارا عەبدوڵڵا

تیراژ: ١٥٠٠ دانە

نرخ: ٥٠٠٠ دینار

ژمارەی سپاردن: ١٥٢٢ ی ٢٠٠٩

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

چاپی: یەکەم ساڵی ٢٠٠٩

کوردستان - سلێمانی

www.serdam.org

سەرچاوە / Maya

Justin Gaarder

Camilla Christensen بۆ زمانی دانیمارکی وەریگێڕاوە

چاپی دووەمی بە دانیمارکی ٢٠٠٢ لەلایەن دەزگای «Forum» ەوە

دەقە کوردییەکە پێشکەشە بە هەموو خوێنەرانی (گاردەر)و بەتایبەتیش پێشکەشە بە ڕۆحی هەمیشە زیندووی مامۆستا (کەمال جەلال غەریب)، ئەو زاتەی کە بەڕاستی شایانی ئەوەیە بە ڕێزەوە ناوی بنرێت (باوە گەورەی فەرهەنگی زانستی کوردی)...

بەهرۆز حەسەن

# ناوەڕۆک

# پێشەکی

قەت ڕەشەبا و ڕەهێڵە و ئاووهەوای تەڕوبڕی ئەو بەیانییەی مانگی یەکی (١٩٩٨) م بیرناچێتەوە کە (فرانک) بە فڕۆکە لەسەر دوورگە بچکۆلەکەی (تاڤیونی) لە (فیجی) نیشتەوە. بەدرێژایی شەوەکە هەورەگرمە هەراسانی کردین، هەر پێش نانخواردنی بەیانیش، کارمەندانی (ماراڤیو پلانتەیشن ڕیسۆرت) خەریکی چاکردنەوەی شۆرتێک بوون کە کەوتبووە بەشی کارەبای ئوتێلەکەوە. ئەمباری خواردەمەنییە بەستووەکان لە مەترسیدا بوون و سەرقاڵی چاکردنەوەی بوون، لەبەرئەوە پێشنیارم کرد من بە سەیارە بچمە (ماتای) و هەندێک لە میوانەکان بهێنم، کە دەبووایە لەگەڵ فڕۆکەی ئەو بەیانییەدا لە شاری (نادی)یەوە بگەیشتنایەتە ناو دوورگەی (بەرودوا)[1].

(ئەنجێلا) و (یۆکین کیس) لە دڵەوە سوپاسی پێشنیارەکەیان کردم، یۆکین یەک دوو وشەی بە ناڕوونی دەرپەڕاند و وتی: «هەمیشە لە کاتی لێقەوماندا دەتوانرێت متمانە بە کەسێکی بەریتانی بکرێت».

پیاوێکی نەرویجی و دوو ئەمریکی سواری لاندرۆڤەرەکە بوون و هەرکە دانیشتن، یەکسەر سەرنجم چووە سەر پیاوە نەرویجییەکە، کەسێکی زۆر جیددی دیاربوو. بە مەزەنەی خۆم تەمەنی لە دەوروبەری چل ساڵاندا بوو، باڵایەکی مامناوەندی و هەروەک زۆربەی خەڵکانی ئەسکەندەنافی قژێکی کاڵی پێوە بوو، بەڵام چاوی قاوەیی بوو و یەکجار پەست و بێتاقەت دیاربوو. ناوی خۆی بە (فرانک ئاندەرسن) ناساند و بیرمە لەویادا وام بە خەیاڵدا هات کە سەر بەو گروپە دەگمەنەی مرۆڤایەتی بێت کە بەدرێژایی ژیانیان بە دەستکورتی ژیان و بەردەوامنەبوونی ڕۆحەوە دەناڵێنن و هەست بە پەستی دەکەن. مەزەندەکەم ڕاست دەرچوو، چونکە هەر ئەو ئێوارەیە بۆم دەرکەوت کە زانایەکی زیندەوەرناس بوو لە بواری گەشەکردنی ژیاندا. ئێ خۆ ئەگەر کەسێک خۆی لە خۆیدا پەست و دڵتەنگ بێت، زانستی زیندەوەرناسی لە بواری گەشەکردنی ژیاندا هێندە وەرەی بەرز ناکاتەوە.

لەسەر مێزی نووسینەکەی ماڵەوە لە (کرۆیدن)، پۆستکارتێکی چرچولۆچم لەبەردەمدایە کە ڕێکەوتی (٢٦-٥-١٩٩٢)ی پێوەیەوە و لە بەرشەلۆنەوە نێردراوە.

وێنەی پۆستکارتەکە، قەڵای کڵێسە تەواونەکراوەکەی (گاودی) نیشان دەدات کە ناوی (لاساگرادا فامیلیا)یە. لە پشتی پۆستکارتەکەش ئەم وشانە نووسراوە...

(زۆر ئازیزم فرانک... ڕۆژی سێشەممە دێم بۆ (ئۆسلۆ)، بەڵام بە تەنها نایەم. باش خۆت ئامادە بکە، چونکە ئەمجارەیان هەموو شتەکان جیاواز دەبێت. نەکەی تەلەفۆنم بۆ بکەیت! دەمەوێت بەرلەوەی هیچ وشەیەکی تر لەنێوانماندا بوترێت، هەست بە جەستەت بکەم. شلە ئەفسوونایییەکەت لەیادە؟ بەمزوانە تۆش تامی چەند دڵۆپێکی دەکەیت. جارجارێک لەڕادەبەدەر ترسم لێ دەنیشێت. ئەرێ ناکرێت شتێک بکەین و بەشێوەیەک لە شێوەکان ڕازی بین بەوەی کە ژیان هێندە کورتە؟

(ڤیرا)ی خۆت

پاشنیوەڕۆیەک من و فرانک لە بارەکەی (ماراڤیو) بەدیار دوو بیرەوە دانیشتبووین، لەپڕێکدا ئەو پۆستکارتەی نیشاندام کە وێنەی منارە بەرزەکانی لەسەربوو. من باسی (شیلا)م بۆ گێڕایەوە و وتم چەند ساڵێک لەمەوبەر لەدەستمداوە، ئەویش بۆ ماوەیەکی زۆر بێدەنگ دانیشتبوو، لەپڕێکدا جزدانەکەی کردەوە و پۆستکارتێکی قەدکراوی دەرهێنا، یەکسەر کردیەوە و لەسەر مێزەکەی بەردەممان داینا. تێکستی سەر پۆستکارتەکە بە زمانی ئیسپانی نووسرابوو، بەڵام فرانک وشە بە وشەی بۆ وەرگێڕام. وا هاتە بەرچاوم کە پێویستی بە یارمەتی من بێت بۆ ئەوەی لە وەرگێڕانەکەی تێبگەم.

پرسیارێکم لێ کرد و وتم:

- ڤیرا کێیە؟ هاوسەرت بوو؟

سەرێکی بۆ لەقاندم و وتی:

- لە کۆتایی ساڵانی هەشتاکاندا لە ئیسپانیا یەکتریمان بینی، هەر دوای یەک دوو مانگیش پێکەوە گواستمانەوە بۆ ئۆسلۆ و لەوێ ژیانمان دامەزراند.

- دواتریش لە یەک جیابوونەوە؟

سەرێکی بۆ ڕاوەشاندم، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا وتی:

- پاش دە ساڵ ڤیرا گەڕایەوە بۆ بەرشەلۆنە. پاییزی پێشوو گواستیەوە.

لەویادا خۆم پێ نەگیراو وتم:

- بەڵام ڤیرا نە ناوێکی باوی ئیسپانییە و نە ناوێکی (کاتالانی[2])شە.
ئەویش وتی:
- ڤیرا ناوی شارۆچکەیەکی بچکۆلەی ئەندەلوسیایە. بەپێی قسەی خێزانەکەی، کاتی خۆی دایکی لەو شارەدا بە ڤیرا دووگیان بووە.
تەماشایەکی پۆستکارتەکەم کرد و وتم:
- بۆ سەردانی خێزانەکەی چووبووە بەرشەلۆنە؟
دیسانەوە سەری ڕاوەشاندەوە و وتی:
- چەند حەفتەیەک لەوێ مابووەوە بۆ ئەوەی داکۆکی لە نامەی دکتۆراکەی بکات.
- ئاوها؟
- نامەی دکتۆراکەی دەربارەی کۆچکردنی مرۆڤ بوو لە ئەفریقاوە. ڤیرا (پالیۆنتۆلۆج[3])ە.
ئینجا پرسیم:
- ئەی ئەو کەسە کێ بوو کە لەگەڵ خۆیدا هێنای بۆ ئۆسلۆ؟
- سۆنیا بوو.
لەوەندە زیاتری نەگوت، لەبەرئەوە پرسیمەوە:
- ئەی سۆنیا کێیە؟
- سۆنیای کچمان.
- کەواتە کچێکیشتان هەیە.
ئاماژەی بۆ پۆستکارتەکە کرد و وتی:
- ئا بەو شێوەیە زانیم کە ڤیرا دووگیانە.
- دووگیانە بە منداڵی تۆ؟
ڕاچڵەکی و وتی:
- بەڵێ دووگیان بوو بە منداڵی من.
هەر لەوێوە ئەوەندە تێگەیشتم کە کێشەیەکیان بەیەکەوە هەبووە و دەمویست هەڵیبهێنم، بەڵام هێشتا شتێکی تریشم لەبەردەستدابوو کە دوای بکەوم.
- باشە ئەو (شلە ئەفسووناویە) چی بوو کە داینابوو چەند دڵۆپێکیت بداتێ؟ بەلای منەوە ئەوە شتێکی زۆر سەرنجڕاکێشە.
کەمێک ڕاما. دواتر بە نەختێک شەرمەوە خەندەیەکی خستە سەر لێوی و وەک

ئەوەی لە نرخی بابەتەکە کەم بکاتەوە وتی:
- ئاااه.. ئەوە شتێکی زۆر بێ مانا بوو. شتێک بوو لە شتەکانی ڤیرا.
ئاماژەم بۆ بۆیەکە کرد تا بیرەیەکی ترم بۆ بهێنێت. فرانکیش قومێکی بچکۆلەی لە بیرەکەی دابوو. دواتر هەروا بەئاسانی وتم:
- بۆم باس بکە.
ئەویش وتی:
- هەردووکمان جۆرە تینوێتییەکی شێتانەمان هەبوو بۆ ژیان. یان دەتوانم بڵێم هەردووکمان بەهەمان شێوە (پەرۆشی ژیانێکی هەتاهەتایی بووین)، نازانم لە مەبەستم تێدەگەیت یان نا؟
ئەرێ تێگەیشتم!؟ هەستم بە ترپەی سەر سنگم دەکرد، لەبەرئەوە وام بە باش زانی کەمێک ئارام ببمەوە. هەر ئەوەندە لەپی دەستێکم بۆ بەرز کردەوە و بەو شێوەیە نیشانم دا کە پێویست ناکات (پەرۆشی ژیانی هەتاهەتایی)م بۆ ڕوون بکاتەوە. ئەویش لە مەبەستەکەم تێگەیشت. وا هاتە بەرچاوم ئەوە یەکەمین جاری نەبێت کە بیەوێت ئەو زاراوەیە ورد بکاتەوە. ئینجا لەسەر قسەکانی بەردەوام بوو و وتی:
- من قەت لەوەوپێش لە هیچ ئافرەتێکی تردا ئەو شێوە پەرۆشییەم نەدیبوو. ڤیرا کەسێکی گەرموگوڕ بوو و بەتەواوەتی بەم ژیانەوە بەسترابووەوە، بەڵام هاوکاتیش زۆرجار لە جیهانە تایبەتییەکەی خۆیدا دەژیا، یان باشترە بڵێم لە جیهانی پالیۆنتۆلۆجیدا دەژیا. یەکێک بوو لەو کەسانەی کە زیاتر ژیانی بەشێوەیەکی ستوونی دەبینی وەک لەوەی بەشێوەیەکی ئاسۆیی بیبینێت.
- ئاوها؟
- کەسێک بوو لەوانەی کە گرنگیان بە مەیل و ئارەزووی سەردەم نەدەدا. تەنانەت گرنگی بە شێوەی ڕووخساریشی نەدەدا. لە ڕاستیشدا نەک هەر جوان، بگرە هەر زۆر جوانیش بوو، بەڵام یەک کەڕەتیش نەمدی گۆڤارێکی باوی حەفتانە بخوێنێتەوە، هەڵبەتە مەبەستم لە گۆڤاری ژنانە و شتی وایە.
فرانک هەروا دانیشتبوو و پەنجەیەکی بە پەرداخی بیرەکەیدا دەهێنا و پاش قەیرێک وتی:
- جارێکیان خۆی شتێکی بۆ گێڕامەوە و وتی: «لە کاتی گەنجیمدا زۆر بەگوڕ خەونم بەوەوە دەبینی کە شلەیەکی ئەفسووناویم هەبێت. ئەو کاتە نیوەیم دەخواردەوە و ئیتر بۆ هەتاهەتایە دەژیام. دواتریش کاتێکی بێ سنوورم لەبەردەستدا دەبوو تا

پیاوێک بدۆزمەوە و نیوەکەی تری بدەمێ. بەو شێوەیەش دڵنیا دەبووم کە ڕۆژێک لە ڕۆژان ئەو پیاوە گونجاوە هەر دەدۆزمەوە، ئیدی ئەگەر پاش حەفتەیەک بووایە یان سەد ساڵ، یان هەزار ساڵ دواتریش بووایە هەر دەمدۆزییەوە».

دیسانەوە ئاماژەم بۆ پۆستکارتەکە کردەوە و وتم:

- وا لە دواجاریشدا ئەو شلەی ژیانەی دۆزیەوە، وایە؟

بەناچاری زەردەخەنەیەک گرتی و وتی:

- ئەو کاتەی لە سەرەتای هاوینی (٩٢)دا لە بەرشەلۆنەوە هاتەوە بۆ ماڵەوە، زۆر بە جیددی وتی: «ئێ خۆ ئێمە هەردووکمان دەبێت لەوەوپێش چەند دڵۆپێکمان لەو شلە ئەفسووناویە خواردبێتەوە کە من لە کاتی گەنجیمدا خەونم پێوە دەبینی».

ئەو خەیاڵی لای ئەو منداڵە بوو کە چاوەڕوانی بووین، هەربۆیە وتی: «لە ئێستا بەدواوە بەشێکی تۆ و بەشێکی من دەست بە ژیانی تایبەتی خۆی دەکات. ڕەنگە بۆ ماوەی هەزاران ساڵ ئەم تۆوەی ئێمە بەر بگرێت».

- مەبەستی لە نەوەکانی دوای ئێوە بوو؟

- بەڵێ بیری لەوان دەکردەوە. لە ڕاستیدا هەموو مرۆڤەکانی سەر ئەم زەویە لە یەک ئافرەتی دیاریکراوەوە هاتوون کە چەند سەد هەزار ساڵێک لەمەوبەر لە ئەفریقادا ژیاوە.

قومێکی لە بیرەکەی دا و بۆ ماوەیەک بێدەنگ بوو، منیش ویستم بێدەنگیەکەی بشکێنم و وتم:

- بەیارمەتیت بەردەوام بە.

تەماشایەکی ناوچاوی کردم. لەوە دەچوو بۆ ساتێک هەڵم بسەنگێنێت و بزانێت ئەو پیاوەم کە دەتوانێت متمانەی پێ بکات یان نا. ئینجا وتی:

- ئەو کاتەی کە گەڕایەوە بۆ ئۆسلۆ، وتی: «بەتەواوەتی دڵنیابە لەوەی ئەگەر ئەو شلە ئەفسووناویەم هەبووایە، بۆ چرکەیەکیش دوودڵ نەدەبووم و لەگەڵتا بەشم دەکرد». بێگومان من هیچ جۆرە (شلەیەکی ئەفسووناویم) نەخواردەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەستم کرد ساتێکی گەورەی ژیانمە. شتێکی جوانم لەوەدا بینی کە وێرابووی بڕیاری شتێک بدات کە بۆ هەتاهەتایە ناتوانرێت بگۆڕدرێت. من ئەو بڕیارەیم بەرز نرخاند.

وەک ئەوەی لەگەڵ قسەکانیدا بم، سەرێکم بۆ لەقاند و وتم:

- وەک دەزانیت لەم ڕۆژگارەدا چیتر شتێکی ئاسایی نییە کە پەیمانی هەتاهەتایی

بدرێت بە یەکتری. ئێستاکە لە کاتی خۆشیدا خەڵکی پێکەوە دەمێننەوە و هەر ئەوەندەی ناخۆشی دێتە ئاراوە، ئیتر زۆربەی خەڵکی سوک و باریک ڕادەکەن و دوای ژیانی خۆیان دەکەون.

هەستم کرد کەمێک بە قسەکانم هەڵچوو:

– وا بزانم وشە بە وشەی قسەکانیم لەیادە. ئەو وتی: «بەلای منەوە، تەنها یەک پیاو و یەک زەوی بوونی هەیە. ئەم هەستە قووڵەشم لەوەوە سەرچاوە دەگرێت کە تەنها یەک کەڕەت دەژیم».

سەرێکم بۆ لەقاند و وتم:

– ئەوە دانپیانانێکی گەورەی خۆشەویستییە. ئەی دواتر چی ڕوویدا؟

دیاربوو حەزی بەو باسە نەبوو. پاش ئەوەی پەرداخەکەی فڕ کرد، وتی:

– سۆنیا لە تەمەنی چوار ساڵ و نیودا ماڵئاوایی لێکردین، خەم و ماتەمینییەکی گەورە ماڵەکەمانی تەنی و دواتر نەمانتوانی چیتر پێکەوە بژین..

هەروا دانیشتبوو و بە بێدەنگی سەیری ناو دارگوێزە هیندییەکانی دەکرد.

هەرچەندە یەک دوو کەڕەت بە جیددی هەوڵم دا ڕاستەوخۆ باسەکە بوروژێنمەوە، بەڵام لەو بارەیەوە هیچ شتێکی تر باس نەکرا.

هەروەها بۆقێکی گەورەش قسەکانی پێ بڕین و لەناکاوێکدا خۆی هەڵدایە سەر ئەو سەکۆیەی لەسەری دانیشتبووین، گوێمان لە تەپەکەی بوو کە وتی: «تررپ!» و دوای ئەوە بۆقە گەورەکە لە بەرپێماندا لەژێر مێزەکەدا خۆی مەڵاس دا.

فڕانک وتی:

– بۆقێکی کێوی[٤].

– بۆقێکی کێوی؟

– پێشی دەوترێت (بوفۆ مارینوس Bufo marinus). ئەم جۆرە بۆقەیان لە ساڵی (١٩٣٦)دا لە (هاوای)ەوە هێنا تا مێش و مەگەزی قامیشی شەکرەکانی ئێرەیان پێ قەلاچۆ بکەن. ئێستاکەش لێرەدا زۆرباشی دەگوزەرێنن و ژمارەیان زیادی کردووە.

ئاماژەی بۆ ناو دارگوێزە هیندییەکان کرد و لەویادا چوار پێنج دانەمان بینی. پاش یەک دوو خولەک دە دوانزە دانەم لەناو گیا تەڕەکەدا بینی. من چەندین ڕۆژ بوو لەسەر ئەو دوورگەیە بووم و قەت ئەوەندە بۆقی کێویم بەیەکەوە نەدیبوو. هەر لەوە دەچوو فڕانک بەلای خۆیدا ڕایانبکێشێت، پاش نەختێک ژمارەی ئەو بۆقانەی کە من

دەمتوانی بیانبینم، لە بیست دانەیەک تێپەڕی. تا ئەندازەیەک قێزم لەوە دەهاتەوە کە ئەو هەموو بۆقە بەیەکەوە ببینم.
جگەرەیەکم داگیرساند و وتم:
– هێشتا هەر بیر لەو شلە ئەفسووناویە دەکەمەوە کە ناوت هێنا. ئاخر هەموو کەسێک ناوێرێت بیخواتەوە. وا بزانم زۆربەی خەڵکی توخنی ناکەون.
دوای ئەوە چەرخەکەم لەسەر مێزەکە دانا. ئاماژەم بۆ کرد و بە چرپەیەک وتم:
– ئەمە چەرخێکی ئەفسووناوییە. ئەگەر ئێستا دایبگیرسێنیت، بۆ هەتاهەتایە لەسەر ئەم زەویە دەژیت.
بەبێ ئەوەی خەندە بیگرێت، هەروا تەماشای ناوچاوی دەکردم. وا دەهاتە بەرچاوم کە بیلبیلەی چاوی بدرەوشێتەوە.
وەک ئەوەی پێ لەسەر قسەکانم دابگرم وتم:
– بەڵام دەبێت زۆر بەباشی بیر بکەیتەوە، چونکە تەنها ئەم کەڕەتە ئەم بوارەت دەدرێت و ئەو بڕیارەی کە دەیدەیت، دواتر بەهیچ شێوەیەک ناتوانیت بیگۆڕیت.
قسەکەمی وەلاوە نا و وتی:
– ئەوە هیچ گرنگیەکی نییە.
منیش هێندە دڵنیا نەبووم و نەمزانی چ بڕیارێک دەدات. لەبەرئەوە زۆر بە جیددی لێم پرسی:
– دەتەوێت هێندەی تەمەنی مرۆڤێکی ئاسایی بژیت، یاخود دەخوازیت بۆ هەتاهەتایە لەسەر ئەم زەویە بژیت؟
فرانک زۆر بەهێواشی، بەڵام بەدڵنیاییەوە، چەرخەکەی بەرز کردەوە و دایگیرساند.
ئەو دیمەنە زۆر کاری تێکردم. من نزیکەی حەفتەیەک بوو لەسەر دوورگەی (فیجی) بووم و تەنها لەوەبەدواوە هەستم کرد چیتر تەنها نیم.
وەک سەرنجێک وتم:
– خەڵکانی وەکو من و تۆ هێندە زۆر نین.
لەویادا بۆ یەکەمین جار خەندەیەکی گەورە کەوتە سەر لێوانی. وا بزانم ئەویش هەروەک من سەرسام بوو بەو پێکگەیشتنەمان.
وەک ئەوەی دان بە قسەکەمدا بنێت وتی:
– نا، بێگومان خەڵکانی وەکو من و تۆ کەمن.

هاوکات لەگەڵ ئەو قسەیەدا کەمێک خۆی بەرز کردەوە و بەسەر پەرداخی بیرەکاندا دەستی بۆ ڕاکێشام تا تەوقەم لەگەڵدا بکات.
هەستم دەکرد متمانەی تەواومان بە یەکتر هەبێت، لەوەدەچوو هەردووکمان ئەندامی یانەیەکی زۆر تایبەتی و جیاواز بین. من و فرانک بەهیچ شێوەیەک نیگەرانی فیکرەی ژیانی هەتاهەتایی نەبووین، بەڵکو کتومت لە پێچەوانەکەی تۆقیبووین.
هێندەی نەمابوو بۆ کاتی نانخواردنی ئێوارە و منیش بەبۆنەی نەمانی ڕەسمیات لەنێوانماندا و تێکەڵبوونمان، ناڕاستەوخۆ پێشنیاری ئەوەم کرد پێکەوە قومێک مەشروبی قورس بخۆینەوە.
پێشنیارم کرد جن بخۆینەوە و ئەویش بە سەرلەقاندنێک ڕەزامەندیی خۆی نیشان دا.
تا دەهات ژمارەی بۆقە کێویەکانی ناو دارگوێزە هیندییەکان زیادیان دەکرد، منیش لەلای خۆمەوە سەرلەنوێ قێزم لێیان هاتەوە. لەویادا ڕاستییەکی تریشم بۆ فرانک باس کرد و وتم (من حەزم لێ نییە مارمێلکە لە ژووری نووستنەکەمدا بێت).
پێکی جنەکانیان بۆ هێنایە سەر مێزەکە. لەو کاتەشدا کە بۆیەکان خەریکی ڕازانەوەی مێزەکان بوون و ئامادەیان دەکردن بۆ نانی ئێوارە، ئێمە بە خۆشیی فریشتەکانی ئاسمان کەوتینە خواردنەوەی جنەکانمان. هەروەها بە خۆشی ئەو خەڵکە کەمەش خواردمانەوە کە بەردەوام ئیرەیی بە فریشتەکانی ئاسمان دەبەن، چونکە بوونی ئەوان هەتاهەتاییە. دواجار فرانک ئاماژەی بۆ بۆقە کێوییەکانی ناو دارگوێزی هیندییەکان کرد و وتی: «ناچارین بە خۆشی ئەوانیشەوە قومێک هەڵبەین».
ئینجا وتی:
– لایەنی کەم لە ڕێگەی خوێنەوە برامانن. خزمایەتی ئێمە لەگەڵ ئەماندا زیاترە وەک لە خزمایەتیمان لەگەڵ فریشتەکانی ئاسمان.
فرانک ئاوها بوو. ئەو بەڕاستی کەسێکی پڕلە فەنتازی و خەیاڵ بوو، بەڵام لەهەمانکاتیشدا کەسێک بوو کە لەسەر ئەم زەویە دەژیا. ڕۆژی پێشووتر باسی سەفەرەکەی بۆ کردم و وتی: «پێم خۆش نەبوو لەناو ئەو فڕۆکە بچکۆلەیەدا دانیشم کە لە (نادی)یەوە گواستمیەوە بۆ (ماتای)، چونکە تووشی ڕەشەبا و ڕەهێڵەیەکی یەکجار توند بووین.
جگە لەوەش باسی نیگەرانی خۆی بۆ کردم و وتی: «لەو سەفەرە کورتەدا تەنها یەک فڕۆکەوان تەیارەکەی لێدەخوڕی و هیچ یاریدەدەرێکی لەگەڵدا نەبوو».
لەو کاتەدا کە پەرداخەکانمان فڕ کرد، باسی ئەوەی بۆ کردم کە لە کۆتایی مانگی چواردا ئامادەی کۆنفرانسێک دەبێت کە لە دانیشگای شاری دێرینی (سالامانکا)ی

ئیسپانیادا بەڕێوە دەچێت. هەروەها وتی: «دوێنێ تەلەفۆنم بۆ سەنتەری کۆنفرانسەکە کرد و دڵنیایان کردمەوە کە (ڤیرا)ش ئامادەی ئەو کۆنفرانسە دەبێت، بەڵام بەڕاستی نازانم ئەویش ئەوە دەزانێت کە لە (سالامانکا) یەکتر دەبینین یان نا».

وەک پێشبینییەک وتم:

– ئێ خۆ تۆ ئومێدەواریت کە ئەو ببینیت، وانییە؟ هیواداریت کە لە مانگی چواردا ڤیرا ببینیت، وایە؟

وەڵامی پرسیارەکەی نەدامەوە، تەنانەت نەمبینی بە سەریش وەڵامم بداتەوە.

ئەو ئێوارەیە هەموو مێزەکانی چێشتخانەی (ماراڤیو)یان پێکەوە نووساند و بەو شێوەیە یەک مێزی گەورەی لێ دەرچوو. من خۆم دەستێکم لەو فیکرەیەدا هەبوو، چونکە زۆربەی میوانەکان تەنها بوون. لەو کاتەدا کە (ئانا) و (خۆسێ) وەک یەکەمین میوانی ئەو ئێوارەیە هاتنە چێشتخانەکەوە، بۆ دواهەمین جار تەماشایەکی پۆستکارتەکەم کرد کە وێنەی هەر هەشت قەڵاکەی بەسەرەوە بوو و دواتر بەرەو فرانک ڕامکێشا و یەکسەر وتی:

– بۆ خۆت! خۆ من لە هەموو بارێکدا وشە بە وشەیم لەیادە.

هەستم کرد بەشێوەیەکی شاراوە لە دڵەوە پێی ناخۆش بوو، لەبەرئەوە هەوڵم دا ڕای بگۆڕم، بەڵام بەهیچ شێوەیەک ڕای خۆی نەگۆڕی. وا هاتە بەرچاوم کە بڕیارێکی گرنگی دابێت، چونکە وتی:

– ئەگەر من لەلای خۆم بیهێڵمەوە، ئەوا لەوانەیە ڕۆژێک لە ڕۆژان بیدڕێنم. لەبەرئەوە باشتر وایە کە لەلای تۆ بمێنێتەوە. کێ دەزانێت، خۆ ڕەنگە کەڕەتێکی تریش یەکتری ببینینەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا لەلای خۆمەوە بڕیارم دا بەرلەوەی فرانک دوورگەی (تاڤیونی) بەجێبهێڵێت، بۆی بگەڕێنمەوە، بەڵام ئەو بەیانییەی کە سەفەری کرد، شتێک لە ماراڤیودا ڕوویدا و ئەوەم لەبیر چووەوە.

***

هەرئەوڕاستیەی کە پاش نزیکەی ساڵێک فرانکم بینییەوە، ڕێکەوتێکی سەرسوڕهێنەر بوو و تامێکی خۆشتری بەم ژیانە بەخشی. هیوایەکی ئاوهای هێنایە ئاراوە کە چەند هێزێکی شاراوە بوونیان هەیە و ئەوان پەتی چارەنووسمان ڕادەکێشن.

من بەهۆی ڕێکەوتەکانەوە تەنها پۆستکارتێکی کۆنم دەست نەکەوت کە ئێستاکە وا لەبەردەممدایە، بەڵکو لەمڕۆ بەدواوە بوومە خاوەنی نامەیەکی دوورودرێژ کە

فرانک بۆ ڤیرای نووسیوه، هەڵبەتە دوای ئەوەی کە لە مانگی چواردا لە سالامانکا چاوی پێکەوتبوو. من خۆم ئەمە وەک سەرکەوتنێکی شەخسی خۆم دەبینم کە ئەو بەڵگەنامە تایبەتیەم لەلایە، سەرکەوتنێک کە هەرگیز ڕوویندەدا ئەگەر بەرێکەوت فرانکم لە (مەدرید)ا نەبینیبایە. لەوەش زیاتر، هەر ڕێک لەو ئوتێلەدا بینیم کە تیایدا نامە دووردرێژەکەی بۆ ڤیرا نووسی بوو. من لە مانگی یانزەی (١٩٩٨)دا فرانکم لە ئوتێلی (پالاس)دا بینییەوە.
لەو نامەیەدا کە بۆ ڤیرای نووسیووە، باسی چەندین بەسەرهات دەکات کە پێکەوە لەسەر دوورگەی (فیجی)دا بینیمان. زیاتریش سەرنج دەخاتە سەر ئانا و خۆسێ، هەروەها لەنێوان ئەو گفتوگۆیانەی پێکەوە کردبوومان، باسی یەک دوو دانەیەکیان دەکات.
ئێستاکەش کە دەمەوێت تەواوی ئەو نامە دووردرێژە بخەمەڕوو، ڕەنگە تاوناتاوێک فریو بخۆم و لە هەندێک شوێندا بۆچوونەکانی فرانک بوەستێنم و هەندێک بۆچوونی قووڵی خۆم هەڵبرێژم، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا وام بە باش زانی ئەو نامەیەی کە بۆ ڤیرا نووسراوە وەک خۆی بخەمەڕوو و دواتریش سەرنجەکانی خۆم لە شێوەی پاشکۆیەکدا بنووسم.
بێگومان دڵم بەوە خۆشە کە ئەو نامە دووردرێژەم لەبەردەستدایە، بەتایبەتیش چونکە بواری دام کە لێکۆڵینەوەیەک لەسەر (٥٢) پەرەگرافی مانیفێستەکە بکەم. لێرەدا گرنگە بڵێم هەڵەیەکی گەورەیە ئەگەر وا هەست بکەن کە من بەشێوەیەکی نایاسایی نامەیەکی شەخسیی کەسێکی ترم کردووە بە هی خۆم. بەهیچ شێوەیەک ئەوە ڕاست نییە. هەڵبەتە ئەم بابەتەشم داناوە بۆ دواتر و لە پاشکۆکەی خۆمدا دێمەوە سەری.

***

لە پاش چەند مانگێکی کەم پێ دەنێینە ناو سەدەی بیست و یەکەوە. من هەست دەکەم کات خێرا تێدەپەڕێت. پێم وایە تا دێت کات خێراتر و خێراتر تێدەپەڕێت.
من هەر لە کاتی گەنجیمەوە، کە لە ڕاستیدا ئەوەندە ماوەیەکی زۆری بەسەردا تێنەپەڕیووە، دەمزانی بۆ ئەوەی سەدەی نوێ ببینم، دەبێت تەمەنم بگاتە (٦٧) ساڵ. هەمیشە ئەو بیرۆکەیە هەم دەیترسانم و هەم ئەفسوونێکی تایبەتیشی پێ دەبەخشیم. (شیلا) لەم سەدەیەداماڵئاوایی لێ کرم، ئەو تەنها (٥٩) ساڵ ژیا.
ڕەنگە بەرلەوەی بچینە ناو سەدەی نوێوە، دیسانەوە سەفەر بکەمەوە بۆ (دوورگەی بەرودوا). بەجیددی بیر لەوە دەکەمەوە کە نامەکەی ڤیرا بپێچمەوە و بیخەمە ناو

کەبسولێکی زەمەنییەوە، بۆ ئەوەی تا هەزار ساڵی تر بە داخراوەیی بمێنێتەوە. ڕەنگە هەر پێویست نەکات تا ئەو کاتە بڵاوی بکەمەوە، هەقە هەمان شتیش لە مانیفێستەکە بکەم. هەزار ساڵ هەر هیچ نییە، بەلایەنی کەمەوە ئەگەر بە پێوانەی ئەو کاتە دووردرێژە بیپێوین کە لە مانیفێستەکەدا کورت کراوەتەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەزار ساڵ زۆربەی هەرەزۆری ئەو جێشوێنانە دەسڕێتەوە کە لە کاتی ئێستاماندا بوونیان هەیە. بەهەمان شێوەش، ئەو کاتە لە باشترین حاڵەتدا چیرۆکی (ئانا ماریا مایا) وەک ئەفسانەیەکی یەکجار کۆن تەماشا دەکرێت.

تازە من پیر بووم و بەهۆی ئەم تەمەنەمەوە بەلامەوە گرنگ نییە لە چ کاتێکدا قسەکانی سەر سنگم بهێنمە دەرەوە. من ئەوەم بەلاوە گرنگترە کە ڕۆژێک لە ڕۆژان دەریان ببڕم و تەنانەت هیچ پێویستیش ناکات کە من ئەو قسانە بکەم. پێدەچێت هەر لەبەرئەوە بێت کە بە جیددی بیرۆکەی ئەو کەبسولە زەمەنییە هەڵدەسەنگێنم. بەو ئومێدەی هەزار ساڵی تر هەراوهوریا لەم جیهانەدا تۆزێک کەمتر بێت.

***

پاش ئەوەی کەڕەتێکی تریش بەوردی ئەو نامەیەم خوێندەوە کە بۆ ڤیرا نووسرابوو، هەست دەکەم ئامادە بم کە جلەکانی شیلا لە ماڵەکەدا لاببەم. بەڕاستی کاتی ئەوە هاتووە. سەرلەبەیانی سبەینێ چەند کەسێک لە ڕێکخراوی (سوپای ڕزگاری)° یەوە دێن و ئامادەن هەمووی بەرن، تەنانەت ماکسییە کۆنەکانیشی دەبەن، هەرچەندە دڵنیام کە بۆیان نافرۆشرێت. سەیرە، تاڕادەیەک هەست دەکەم هێلانەیەکی کۆنی پەڕەسێلکەیەک لادەبەم کە چەندین ساڵە هیچ تەیرێک ڕووی تێ نەکردووە.

پاش ماوەیەکی کەم وەک بێوەپیاوێک ژیانم دادەمەزرێنم. ئێ ئەوەش شێوە ژیانێکە. هەروەکو جاران دڵم هێندە داناخورپێ کە تاوناتاوێک تەماشایەکی وێنە ڕەنگاوڕەنگە گەورەکەی شیلا دەکەم.

لەو دوادواییەدا وەک کەسێکی زۆر دوورەپەرێز ژیانم دەگوزەراند و لەم ڕوانگەیەوە وەک پارادۆکسێک دێتە بەرچاو کە بەبێ سێ و دوو دەمەوێت شلە ئەفسووناویەکەی ڤیرا فڕ بکەم. بەبێ چاونووقاندن دەمەوێت بیخۆمەوە، تەنانەت ئەگەر دڵنیاش نەبم لەوەی کە کەسێک دەدۆزمەوە تا نیوەکەی تری بدەمێ. تازە لە هەموو بارێکدا درەنگە بۆ ئەوەی بیدەمە شیلا. ئەو لە ماوەی ئەم چەند ساڵەی پێشوودا جگە لە دەرمانی کیمیاوی، هیچێکی تری وایان دەرخوارد نەدەدا.

هەر لە ئێستاوە دەزانم بەیانی چی دەکەم. بۆ نانی ئێوارە (کریس بات)م بانگ

کردووه. کریس بەڕێوەبەری گشتیی کتێبخانەی (کرۆیدن)ە. منیش یەکێکم لەو کەسانەی کە بەردەوام سەردانی ئەو کتێبخانەیە دەکەم. من پێموایە شەرەفێکی گەورەیە بۆ شارەکەمان کە کتێبخانەیەکی ئاوها مۆدێرنی تێدا کراوەتەوە کە پلیکانەی ئۆتۆماتیکیشی تێدایە. کریس پیاوێکی زیرەک و بەتوانایە. ئەگەر ئەو چەرخەی بارەکەی (ماراڤیو)ی بخەمە بەردەست، ئەوا پێم وا نییە بیەوێت دایبگیرسێنێت. پێشم وا نییە وەک من قێزی لە بینینی ئەو هەموو بۆقە کێوییەی ناو دارگوێزە هیندییەکانی ئەوێ بکاتەوە.

لە ئێستاوە بڕیارم داوە پرسیاری لێ بکەم و بزانم بە بڕوای ئەو کام لەم دووانە ئاساییترە: ئایا پێشەکی کتێبێک بەر لە تەواوبوونی کتێبەکە دەنووسرێت یان ئەو کاتە دەنووسرێت کە کتێبەکە تەواو دەکرێت؟ من خۆم وای بۆ دەچم پێشەکی کتێبێک لە زۆربەی حاڵەتەکاندا لەدوای تەواوبوونی کتێبەکەوە دەنووسرێت. سەرنجم داوە ئەو شێوە پێشەکییە هەمیشە هاوتای شتێکی تر دەوەستێتەوە، بەتایبەتیش ئەم سەرنجەم ئەو کاتە لەلا دروست بوو کە لە خوێندنەوەی نامەکەی فڕانک بوومەوە.

هەتا چەند سەد ملیۆن ساڵێک بەسەر ئەو کاتەدا تێنەپەڕی کە یەکەمین وشکاوەکییەکان بەخشکەیی هاتنە سەر زەوی، هیچ بوونەوەرێکی زیندووی سەر ئەم زەویە نەیتوانی وەسفی ئەو ڕووداوە بکات کە کاتی خۆی ڕوویداوە. تەنها ئەمڕۆکە دەتوانین پێشەکی مێژووی نەوەی مرۆڤایەتی بنووسینەوە، واتە ماوەیەکی یەکجار زۆر دوای ئەوەی کە ئەو چیرۆکە دەستی پێ کردووە. بەو شێوەیەش بوونی شتەکان سەرلەنوێ دێنەوە سەر هەمان خاڵ، هەر ڕێک وەک ئەوەی لە بازنەیەکدا بخولێنەوە. ڕەنگە ئەم حاڵەتە بەسەر هەموو پرۆژەیەکی خولڵقاندندا بچەسپێت. تەنها ئەو کاتە لە گرنگی ڕووداوێک تێدەگەین کە تێدەپەڕێت. قەت هەورەگرمە فریای ئەوە ناکەوێت کە ئاگادارمان کاتەوە لە هەورەبروسکە. ئەو کەسەی لە چارەنووس تێدەگات، دەبێت بەسەریشیدا زاڵ بێت.

من نازانم (کریس بات) چەندێک شارەزایی لە ئەستێرەناسیدا هەیە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پێم خۆشە پرسیارێکی لێ بکەم و بزانم ڕای بەرامبەر ئەم دارشتنە زۆر کورتەی مێژووی ئەم گەردوونەمان چییە؟

پانزە ملیارد ساڵ بەسەر تەقینەوە گەورەکەدا تێپەڕی، ئینجا دەنگی گرمەکەی بیسترا.

جۆن سپۆک

کرۆیدن، مانگی شەشی ساڵی (١٩٩٩)

# نامەیەک بۆ ڤیرا

ئازیزم ڤیرا..

وا دوو حەفتەیەک بەسەر دوا دیدارماندا تێپەڕی و هەر بەهۆی ئەو شتەی کە لە دواهەمین ئێوارەماندا بەسەرماندا هات، ڕەنگە پێت خۆش بێت کە هەواڵێکم بزانیت. نەمتوانی پێشتر پەیوەندیت پێوە بکەم، چونکە ناچار بووم بوەستم تا هەموو سەرەداوەکان کۆبکەمەوە.

من لەدوای کۆنفرانسەکە هەر لە (سالامانکا)دا مامەوە، چونکە لە سەدا سەد دڵنیا بووم کە ئەو دوو کەسەی لەژێر پردەکەی سەر ڕووباری (تۆرمس)دا بینیمن، خۆیان بوون. تۆ پێت وابوو گاڵتەت لەگەڵدا دەکەم، بەڵێ نەک هەر ئەوەش، بگرە واتزانی هەروا بەرلەوەی بگەڕێینەوە بۆ ئوتێلەکە، چیرۆکێکی سەرنجڕاکێشت بۆ دەهۆنمەوە تا لەگەڵ خۆمدا بتهێڵمەوە، بەڵام لە ڕاستیدا (ئانا) و (خۆسێ) بوون کە لەژێر پردەکەدا بوون، بۆیە ویستم لە ماوەی یەک دوو ڕۆژێکدا هەوڵی دۆزینەوەیان بدەم، ئینجا شارەکە بەجێبهێڵم. هەر بۆ سەرلەبەیانی ڕۆژی دواتر بە ڕێکەوت لە (پلازا مایۆر)دا بینیمنەوە، بەڵام ئێستاکە نامەوێت پێش کاتی ڕووداوەکان بکەوم، بەڵکو دەمەوێت بەپێی مێژووی کاتی ڕووداوەکان هەموو شتێکت بۆ بگێڕمەوە. کەواتە با لە سەرەتاوە هۆی نووسینی ئەم نامەیەی ئەمڕۆمت بۆ ڕوون بکەمەوە.

دوای حەفتەو نیوێک، واتە دوێنێ، لە مۆزەخانەی (پرادۆ)ی مەدریددا چاوم بە خۆسێ کەوت. لەوەدەچوو ئەویش لەناو ئەو هەموو گەلەرییە گەورانەدا بەدوای مندا گەڕابێت. پێشنیوەڕۆی ئەمڕۆش دیسانەوە یەکتریمان بینیەوە، ڕێک لەو کاتەدا بوو کە من لەسەر کورسییەکی ناو پارکی (ڕێتیرۆ) دانیشتبووم و بە قووڵی بیرم لە هەموو ئەو شتانە دەکردەوە کە ئەو لەوەوپێش پێی گوتبووم، بەڵام هێشتا چەند بەشێکی وێنە گشتیەکەم نوقسان بوو و لەپڕێکدا لەبەردەممدا قوت بووەوە، کتومت وەک ئەوەی کەسێک ناوی ئەو شوێنانەی پێ وتبێت کە من ڕۆژانە پیاسەم پیادا دەکردن. بۆ ماوەی چەند کاتژمێرێک پێکەوە دانیشتین و دواتر بەناو پارکەکەدا تا

وێستگەی (ئاتۆشا) لەگەڵیدا ڕۆیشتم. ڕاستەوڕاست پێش ئەوەی ئاوڕ بداتەوە و بەرەو قیتارەکەی ڕابکات، سەفتەیەک ڕەسمی فۆتۆگرافی دامێ. کاتێکیش گەڕامەوە ئوتێلەکە و تەماشام کردن، سەیرەکەم لەسەر پشتی هەر ڕەسمێک شتێک نووسراوە. ڤیرا، ئەوە مانیفێستەکە بوو! تەواوی هەموو وەرەقەکانم لەدەست دابوو.
لەبەر ئەو قسانەی کە خۆسێ لە پارکی (ڕیتیرۆ)دا بۆی کردم وە بەتاییبەتیش بەهۆی ئەو ڕەسمانەی کە دایمێ، بەرلەوەی لەناکاودا بەجێم بهێڵێت، ناتوانم مەدرید بەجێ بهێڵم هەتا تەواوی ئەم چیرۆکەت بۆ ڕەوانە نەکەم. ئێستاکە کاتژمێر دووی پاشنیوەڕۆیە و لەوە ناچێت ئەم شەو زۆر بخەوم. هەر لە ژوورەکەمدا هەندێک خواردنم خوارد و قاوەشم خواردەوە. لە ئێستاوە هەتا سەرلەبەیانی ڕۆژی هەینی، کە شتەکانم کۆدەکەمەوە و بەرەو ئیشبیلیا سەفەر دەکەم، جگە لە ناردنی ئەم نامەیە بۆ تۆ، هیچ شتێکی ترم لە خەیاڵدا نییە.
دەترسم لەم ماوەیەدا نەچیتە سەر ئینتەرنێت، هەر ئەم خەیاڵەشم کەمێک فریوم دەدات بەش بەش ئەم نامەیەت بۆ ڕەوانە بکەم، بەڵام وا باشترە هەموویت بە یەک کەڕەت بۆ بنێرم، وەک دەڵێن (یان هەمووی یان هیچ). ئەوەشم بە خەیاڵدا هات کە پەیامێکت لە ڕێگەی (ئی مەیڵ)ەوە بۆ بنێرم و پێت بڵێم بەیانی نامەیەکی دوورودرێژت پێ دەگات، بەڵام پەشیمان بوومەوە، چونکە تەنانەت لەوەشیان دڵنیا نیم و چیتر نازانم تا چەندێک دەتەوێت شتێکت لە منەوە پێ بگات. بەدەر لەوەش دەبێت لەڕادەبەدەر خۆم ماندوو بکەم تا وات لێ بکەم باوەڕ بەم چیرۆکە بکەیت، کە هێشتا دەستم بە نووسینی نەکردووە.
هەرچۆنێک بێت من لەسەر دوورگەکانی (فیجی) کەوتمە ناوتەونی ئەم جاڵجاڵۆکەیەوە، بەڕاستیش لەیادم نییە فریای چەندێکی کەوتم کە بۆت بگێڕمەوە. ئێ خۆ تەنها چەند ڕۆژێکی کەم یەکتریمان بینی و پێم وابێت هەردووکیشمان هەستمان کرد وا باشتر بێت کە کەمێک لە یەکتری دوور بین، بەڵام ئەو کاتەم باش لەیادە کە وتم بۆ ساتێک ئەو دوو کەسە سەرنجڕاکێشەی سەر دوورگەکانی (فیجی)م بینی و لەویادا هەموو باسەکە کرایەوە. ئیتر دوای ئەوە بەڕاستی نازانم چیم گوت و چیم نەگوت، چونکە تۆ بەردەوام قاقای پێکەنینت لێدەدا و باسەکەت پێ دەبریم. تۆ خۆت لەو بڕوایەدا بوویت کە من هەموویم دەهۆنیەوە و وەک باسێکی خۆشی ئێواران بۆت دەگێڕمەوە تا ماوەیەکی زیاتر لەلای ڕووبارەکە بتهێڵمەوە.
ئاساییە گەر بپرسیت: «باشە (ئانا) و (خۆسێ) چ پەیوەندییەکیان بە منەوە هەیە،

یان چ پەیوەندیەکیان بە هەردووکمانەوە هەیە؟». لەم بارەیەوە دەبێت دێڕێکی ناو یەکێک لە نامەکانی خۆتت بەیاد بهێنمەوە کە کاتی خۆی لە بەرشەلۆنەوە بۆت ڕەوانە کردبووم، تۆ لەو نامەیەدا نووسیبووت: «ئەرێ ناکرێت شتێک بکەین و بەشێوەیەک لە شێوەکان ڕازی بین بەوەی کە ژیان هێندە کورتە؟». ئێستاکە من ئەو پرسیارە دەوروژێنم، وە بۆ ئەوەی بتوانم وەڵامی بدەمەوە، ناچارم لە سەرەتادا باسی ئانا و خۆسێ بکەم. ئەگەر بتەوێت لە مەودای مەبەستم تێبگەیت، دەبێت لەگەڵمدا بۆ ڕابردوویەکی زۆر دوورتر بگەڕێیتەوە، ڕەنگە پێویست بکات تا سەردەمی (دیڤۆن[٦]) بگەڕێیتەوە، چونکە لەویادا بوو کە سەرەتای گیانەوەرە وشکاوەکیەکان سەریان هەڵدا. بە بڕوای من ئەم چیرۆکە لەوێوە دەست پێ دەکات.
پەیوەندیی نێوانی من و تۆ بە هەر شێوەیەک بشکێتەوە گرنگ نییە، بەڵام لە دواتردا داوات لێ دەکەم چاکەیەکم لەگەڵدا بکەیت. بۆ ئێستاکەش هێندەم بەسە کە پاڵ بدەیتەوە و بخوێنیتەوە.. تەنها بخوێنەرەوە و بەس.

# ئەو کەسەی دواجار شتەکان دەبینێت، بە باشترین شێوە دەیانبینێت

دوورگەی (تاڤیونی) سەر بە دوورگەکانی (فیجی)ە، دواهەمین قۆناغی سەفەرەکەم بوو کە بە مەبەستی پشکنینی زانستی بۆ ماوەی دوو مانگ بوو لە ئۆقیانووسی ئارامدا دەستم پێ کردبوو. ئەرکی من لێکۆڵینەوەیەک بوو لەسەر ئەو ئاژەڵ و ڕووەکە نوێیانەی کە هێنرابوونە سەر دوورگەکان و دەبووایە کاریگەریانم لەسەر هاوسەنگی ژینگەی ئەو ناوچانە دەربخستایە. هەڵبەتە لێرەدا هەم مەبەستم لەو ئاژەڵانەیە کە بەدزییەوە گەیشتوونەتە ئەم ناوچانە، هەروەک جرج و مشک و مێش و مەگەز و مارمێلکە، هەم مەبەستیشم لەو ڕەگەزانەشە کە کەم تا زۆر بەدەستی ئانقەست گەیشتوونەتە ئێرە هەروەک (ئۆپەسۆم)[7]و (بانەوانک)[8] کە بەتایبەتی بۆ ئەوە هێنراونەتە ئێرە تا قەلاچۆی ئەو گیانەوەرە زیانبەخشانەی پێ بکەن کە زیان بە بەرهەمی نوێی کشتوکاڵی ئەم ناوچەیە دەگەیەنن. گروپێکی تریش ئەو ئاژەڵانە دەگرێتەوە کە ماڵی کراون، هەروەک پشیلە و بزن و بەراز و بەتایبەتیش ئەو ئاژەڵانەی کە گۆشتیان دەخورێت و بە خەمساردییەوە بەرەڵا کراون، هەروەها ئەو ئاژەڵە کێویانەش کە بە سەربەستی لە سروشتدا دێن و دەچن، ڕێک مەبەستم لەو گیانەوەرانەیە کە گژوگیا دەخۆن هەروەک کەروێشک و ئاسکەکێوی. هەرچی دەربارەی ئەو ڕووەکانەشە کە هێنراونەتە ئێرە: هەم ئەو ڕووەکانەی کە بۆ جوانی بەکار دەهێنرێن و هەم ئەو ڕووەکانەش کە سوودیان لێ وەردەگیرێت، لیستی ناوەکەم هەر زۆر دووروودرێژە و جگە لەوەش لە دوورگەیەکەوە بۆ دوورگەیەکی تر جیاوازە، لەبەرئەوە هیچ سوودێکی وای نابێت ئەگەر ناوی یەک دوو دانەیەکیان بهێنم.

بەشی خوارووی ئۆقیانووسی ئارام، شوێنێکی لەڕادەبەدەر نموونەیی و نایابە بۆ ئەو جۆرە لێکۆڵینەوانە، چونکە هەریەک لەو دوورگە دابڕاوانە تا ماوەیەکی کەم لەمەوبەر خاوەنی هاوسەنگیەکی سروشتی دێرینی خۆیان بوون، وە هەریەکەشیان چەندەها ڕووەک و ئاژەڵی جۆراوجۆری تایبەت بەو ناوچەیەیان لەسەر ژیاوە. ئەمڕۆکەش هەر

ئەو ناوچەیەی خوارووی ئۆقیانووسی ئارام، لەچاو شوێنەکانی تری جیهاندا، زۆرترین ژمارەی ئەو گیانەوەرانەی تێدا دەژی کە هەڕەشەی فەوتانی یەکجارەکیان لەسەرە، هەڵبەتە بە ڕەچاوکردنی ژمارەی دانیشتووان و ڕووبەری ناوچەکە. هۆی ئەمەش تەنها بۆ ئەوە ناگەڕێتەوە کە ڕەگەزی نوێی گیانەوەر و ڕووەکیان هێناوەتە ئەو ناوچانە، بەڵکو لە زۆر ناوچەدا بڕینەوەی داری دارستانەکان و پرۆژەی کشتوکاڵی بێسەروبەر، بۆتە هۆی ئەوەی زەویەکەی بە ئەندازەیەکی کوشندە دابخورێت و دواجاریش ژینگەی ئاسایی گیانەوەرەکانی کاول کردووە.

بەشێوەیەکی گشتی زۆربەی ئەو دوورگانەی کە من سەردانم کردن، هەتا نزیکەی سەد ساڵێک لەمەوبەر هیچ تێکەڵییەکیان لەگەڵ کەلتووری ئەورووپیدا نەبووە، بەڵام دواتر دواهەمین شەپۆلی گەورەی کۆڵۆنی ئەورووپییەکان بۆ ئەو ناوچانە دەستی پێ کرد. بێگومان هەر دوورگەیەک و هەر کۆڵۆنییەکی نوێ و هەر کەشتیەک کە گەیشتۆتە کەناری ئەو دوورگانە، چیرۆکێکی تایبەتیی خۆیان هەیە، بەڵام ئەو زیانە گەورە و تاڵەی کە لە دواجاردا بەسەر ژینگەی ئێرەدا شکایەوە هەر هەمان شتە: چونکە لەگەڵ گەیشتنی یەکەمین کەشتی بۆ ئەم ناوچەیە، جرج و مشک و مێش و مەگەز، کە دواتر هەر بۆ خۆیان لە ناوچەکەدا دەرکەوتن، نیمچە دەردێک بوون و تووشی ژینگەی ئێرە بوون. هەر بۆ هاوسەنگی ئەو گیانەوەرە زیانبەخشانە، زۆر بەپەلە کۆمەڵێک ڕەگەزی گیانەوەری تریان هێنایە سەر دوورگەکان، بۆ نموونە بۆقی کێوییان هێنا بۆ ئەوەی قەلاچۆی مێش و مەگەزیان پێ بکەن، بەتایبەتیش ئەو مێش و مەگەزانەی کە لەناو قامیشی شەکرەکاندا هەبوون. هەروەها پشیلەیان هێنا بۆ ئەوەی قەلاچۆی جرجی پێبکەن، بەڵام پاش ماوەیەک زیانی ئەو گیانەوەرە نوێیانە زۆر زیاترێک بوون لە زیانی جرج و مێش و مەگەزەکان، لەبەرئەوە گیانەوەری گۆشتخۆری تریان هێنا تا بۆقی کێوی و مار و جرجی پێ قەلاچۆ بکەن. دواجاریش ئەو گیانەوەرانە کارەساتێکیان لە ژینگەی ئەو ناوچەیەدا خوڵقاند، نەک هەر تەنها بۆ کۆمەڵێک باڵندەی جۆراوجۆر، بەڵکو کاریگەرییان لەسەر کۆمەڵێک خشۆکی تایبەتیی ئەو ناوچەیەش بەجێهێشت، بەو شێوەیەش پێویستیان بە گیانەوەری گۆشتخۆری گەورەتر بوو. ئیدی بەو جۆرە یەک بەدوای یەکدا بەردەوام بوون ڤیرا.

ئەمرۆکەش لەم سەردەمەدا خەڵکی متمانەیەکی زۆری بە ژەهر و ڤایرۆس و چەندەها جۆری ماددەی پاکژکەرەوە هەیە، مەبەستم لە بەرپاکردنی جەنگی ماددە کیمیاوی و بایەلۆجیەکانە، بەڵام هەروا بەئاسانی زنجیرە خۆراکێکی[9] نوێ پێک ناهێنرێت، بگرە

پرسیاره هەره گەورەکە لەوەدایە کە شتێکی وا هەر لە بنەڕەتەوە ڕێی تێدەچێت یان نا. هاوکاتیش شتێکی ترسناکە کە ئاوها بەئاسانی دەکرێت هاوسەنگییەکی بایۆلۆجی سروشتی تێک بدرێت، هاوسەنگییەک کە سروشت چەندەها ملیۆن ساڵی بەسەر بردووە تا بنیاتی بنێت، بەڵام گەمژەیی جیهانی چیتر شتێک نییە کە لە چوارچێوەی سنووری وڵاتەکاندا بمێنێتەوە و ئەو سنوورانە دەشکێنێت. لێرەدا من بیر لە جۆرە زیرەکییەکی بێ پەروای گەمژەێتی دەکەمەوە، بیر لەو جۆرە داهێنانە یەکلایەن و بیرتەسکە دەکەمەوە کە کاتی خۆی هێندە گەشەی نەکردبوو و زۆر سنووردار بوو لەلای دانیشتووانی ڕەسەنی ئوسترالی و نیوزلەندی و مالیزییەکان، دواتریش ئەو کاتە گەشەی سەند کە بوونە قوتابی و چوونە قوتابخانەی پیاوە سپییەکانەوە. هەروەها بیر لە گەمژەێتی و بێمانایی قازانج[10] و تەماح دەکەمەوە. ڕاستە لە سەردەمی ئێستاماندا زاراوەی جوانی وەک (جیهانگیری) و (پەیمانبەستنی بازرگانی) بەکار دەهێنین، بەڵام ئەوە دەلالەتێکە بۆ ئەوەی کە خواردن چیتر وەک (خۆراکێکی زیندوو) تەماشا ناکرێت، بەڵکو وەک کاڵایەک دەبینرێت. جاران مرۆڤایەتی دەیتوانی لە بەروبوومی کشتوکاڵ بەشی مانەوەی ژیانی خۆی دابین بکات، بەڵام ئەمڕۆکە تا دێت زیاتر و زۆرتر کاڵای بێکەڵک بەرهەم دەهێنرێت کە تەنها هەرە دەوڵەمەندەکانی جیهان دەتوانن بیانکڕن. ئەمڕۆکە چیتر وەک جاران ڕۆژ بە ڕۆژ ناژین بەبێ ئەوەی نیگەرانی پاشەڕۆژ بین. تازە سەردەمی ئەو خۆشی و بەهەشتە بەسەرچوو.

بەهەرحاڵ، تۆ خۆت باش دەزانیت کە من هەر لە کۆنەوە چەندە خولیای گیانەوەرە خشۆکەکان بووم. هەر ئەو سەرسامیەشم لە سەردەمی گەنجیمدا بەرامبەر ژیانی سەد بۆ دوو سەد ملیۆن ساڵ لەمەوبەری سەر ئەم زەویە، وای لێ کردم ببمە زانای بایۆلۆجی. ئەو کاتەی من باسی لێ دەکەم، زۆر پێش ئەوە بوو کە لەناکاوێکدا لەم دە پانزە ساڵەی ڕابردوودا، گرنگییەکی یەکجار زۆر بە دایناسۆرەکان درا و بووە شتێکی مۆدێرن و بڵاو. من دەمویست بزانم ئەو گیانەوەرە خشۆکانەی کە هەر زۆر تایبەتمەند بوون، بۆچی لەپڕێکدا قڕیان تێکەوتووە. بەدەر لەوەش پرسیارێک سەرقاڵی کردبووم و لەو کاتەشەوە تا ئێستا لە مێشکم دەرنەچووە: چی ڕوویدەدا ئەگەر دایناسۆرەکان نەفەوتانایە؟ ئەی ئەو گیانەوەرە شیردەرە بچکۆلانە چیان بەسەر دەهات کە هەر لە (شیرناڵی)[11] دەچوون و لە بنەڕەتدا من و تۆشیان لێوە هاتووین؟ بەڵام وەک وتم لە هەمووی گرنگتر بەلامەوە ئەم پرسیارە بوو: دایناسۆرەکان چیان بەسەردا دەهات ئەگەر نەفەوتانایە؟

له ناوچەی خوارووی ئۆقیانووسی ئارامدا، چەندەها بواری مەزنم بۆ ڕەخسا تا لێکۆڵینەوە لەسەر کۆمەڵێک ڕەگەزی خشۆکی یەکجار بەتەمەن بکەم. یەکێک لەو گیاندارە گرنگانەی کە بینیم (تواتارا)[12] بوو کە لەسەر هەندێک لە دوورگە دابڕاوەکانی نیوزلەندادا دەژین. هەرچەندە لەوانەیە ئەم قسەیەم کەمێک نارەحەتت بکات، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پێم خۆشە دان بە ڕاستییەکدا بنێم و بڵێم لەو کاتەدا کە بەتەمەنترین گیانداری بڕبڕەداری زیندووی سەر ئەم زەویەم بینی لەناو پاشماوەی دارستانە دێرینەکانی خاکی (گۆندوانا)[13]دا بە سەربەستی دەسوڕایەوە، هەستێکی یەکجار سەرسوڕهێنەرم لەلا دروست بوو و ناتوانم بە وشە دەری ببڕم، بەڵام دەتوانم بڵێم لێوانلێو بووم لەو هەستە. ئەم خشۆکە دێرینانە لە کونی ژێر زەویدا دەژین و زۆرجاریش بە هاوبەشی لە کونەکانیاندا لەگەڵ (فولمار)[14]دا دەژین. ئەم گیانەوەرانە هەتا (٧٠) سانتیمەتر گەشە دەکەن، جێی سەرنجیشە کە پلەی گەرمای لەشیان نزمە و گونجاوترین پلەش (٩)ی سەدییە، ڕێدەکەوێت تەمەنیشیان لە سەد ساڵ زیاتر تێپەڕێت. کاتێک کە بە شەوانە دەیانبینیت، ڕێک هەروەک ئەوە وایە کە بگەڕێیتەوە بۆ سەردەمی (جورا)[15]، ئەو کاتەی کە (لاوراسیا)[16] لە خاکی (گۆندوانا) جودا بووەوە و دایناسۆرە گەورەکان هێندە نەبوو سەریان هەڵدابوو، هەر لەو کاتەشدا بوو کە (هۆزی سەرلمۆزیەکان) وەک بەشێکی بچکۆلە لە (بەشی مارمێلکەکان) جیا بووەوە، بەڵام وەک هۆزێکی خشۆکی لە ئەندازەبەدەر سەرسەخت بەردەوامیان بە ژیان دا. لە سەرجەمی ئەو هۆزەش کە جیابوونەوە، (تواتارا) تەنها خشۆکە کە تا ئێستا توانیبێتی بمێنێتەوە، گرنگە بڵێم لە نزیکەی (٢٠٠) ملیۆن ساڵی پێشووەوە تا ئەمڕۆکە هیچ گۆڕانکارییەکی وەهای بەسەردا نەهاتووە.

ڤیرا، لەویادا ناچار بووم هەناسەیەکی قووڵ هەڵبکێشم. ئاخر بینینی تواتارا دەتهەژێنێت، سەرسامت دەکات، هەروەکو ئەوە وایە لەناکاوێکدا باڵندەیەکی هەرە دێرینی سەر ئەم زەویە بە زیندوویی لەسەر یەکێک لەم دوورگە دابڕاوانەدا ببینیت. بەڕاست، کاتی خۆشی شتێکی ئاوها ڕوویدا، لە ڕۆژی (٢٢ی مانگی دوانزەی ١٩٣٨) دا ماسیگرێک لە بەشی ڕۆژهەڵاتی خوارووی ئەفریقادا، ماسییەکی (پەڕەکەداری پەلپەل)ی گرت، ئەو جۆرە ماسییەی کە پێی دەگوترێت (ماسیی شین). ئەم گرووپی ماسیە ڕۆڵێکی زۆر گرنگیان لە گەشەکردنی ژیانی سەر ئەم زەویەدا بینیوە، چونکە ڕەچەڵەکی من و تۆ و هەموو گیانەوەرە بڕبڕەدارەکانی سەر وشکانی لە ئەوانەوە هاتووە. ئەم گرووپی ماسییە هەتا ڕۆژی جەژنی لەدایکبوونی مەسیحی

ساڵی (١٩٣٨) تەنها بەشێوەی بەبەردبوو تۆمار کرابوون و زاناکان تا ئەو کاتە پێیان وابوو نزیکەی (١٠٠) ملیۆن ساڵێک لەمەوبەر فەوتابن. هەم ئەو (ماسییە شین)ە و هەم (تواتارا)ش شایانی ئەوەن کە ناویان بنرێت گیانەوەری (بەبەردبووی زیندوو)، ڕەنگە لێرەدا لە شوێنی خۆیدا بێت کە بڵێم شایانی ئەو ناوەن (هەتا ئەو کاتەی کە بوونیان هەیە)، چونکە هەمووی چەند ساڵێکی کەمە کە تواتارا لەسەر بەشێکی زۆری نیوزلەندادا بڵاوبۆتەوە.

من قەت بەلامەوە شتێکی سەرنجڕاکێش نەبووە کە هەر تەنها گوێ بۆ هاوەڵێکم شل بکەم کە وەسفی ڕەگەزێک لە ڕەگەزەکانی گیاندارانی بۆ کردبم، بەڵکو من هەمیشە گرنگیم بە شێوەی سەرهەڵدانی ڕەگەزی گیانداران داوە، گرنگیم بە شێوەی گەشەکردن و پۆلێنکردنیان داوە، لەم بارەیەشەوە لە زۆربەی حاڵەتەکاندا تا ئەندازەیەکی زۆر ناچارین پشت بە پاشماوە بەبەردبووەکان ببەستین. بێگومان دۆزینەوەی پاشماوەی بەبەردبووی دایناسۆری پەڕدار لەم دوادواییەدا، بە هەرە گەورەترین دۆزینەوە دادەنرێت لە ماوەی ئەم چەند سەد ساڵەی پێشوودا. ئەو هەواڵە هەژێنەرە زانستیە، بەڵگەیەکی یەکجار گرنگە و هیچ گومانێکی نەهێشتەوە کە باڵندەکان لە دایناسۆرەکانەوە هاتوون. بگرە تاڕادەیەک دەتوانین بڵێین باڵندەکان دایناسۆرن!

بەهەرحاڵ من نامەوێت بڵێم ئێسقانی کۆن و پاشماوە بەبەردبووەکان هیچ گرنگیەکیان لەلام نییە، بەڵام هەرچی دەربارەی ئەو ڕەگەزانەیە کە ئێستاکە دەژین و ماون، وام پێ باشە کە خۆم لە نزیکەوە توێژینەوەیان لەسەر بکەم و ئینجا سوود لە (مۆنۆگرافی)[١٧] توێژەرەکانی تروەربگرم، دواتریش دەمەوێت بەشێوەیەکی بەرفراوانتر و بە بەرنامەوە لێکۆڵینەوەیەکی قووڵیان لەسەر بکەم. هەرچی دەربارەی مانەوەی (تواتارا)یە (هەمان شتیش ئەو ڕەگەزانە دەگرێتەوە کە لە شوێنێکی دیاریکراودا دەژین و تا ئەندازەیەک ماوەیەکی زۆرە لەویادا ماونەتەوە) کتومت دەگەڕێتەوە بۆ مانەوەی خودی ژینگەکەی کە بەو شێوە سەرسوڕهێنەرە لە ماوەی چەندین ملیۆن ساڵی پێشوودا وەک خۆی ماوەتەوە. بەڕاست، لێت ناشارمەوە هەندێکجار هەستم دەکرد (داروین)ێکی مۆدێرنم، بەتایبەتیش کاتێک لە دوورگەیەکەوە بۆ دوورگەیەکی تر بە فرۆکە دەفریم و بەسەر ئەو هەموو مەرجانە سەوز و شینی سەوزباو و ڕوون و کاڵەی قەراغ دەریاکاندا تێدەپەڕیم.

ئەو کاتەی لەسەر دوورگەکانی فیجی بووم، زۆر بەشێوەیەکی تایبەتی گرنگیم بە

لێکۆڵینەوەی (ئیگوانا)[١٨] دەدا کە تەنها لەسەر یەک دوو دوورگەی ئەو ناوە دەژی و بۆ یەکەمین جار لە ساڵی (١٩٧٩)دا (جۆن گیبۆنس) دۆزییەوە و وەسفی کرد. دوو ڕەگەزەی ئیگوانا لەسەر دوورگەکانی فیجی دەژین، ئەمەش هەر خۆی لە خۆیدا شایانی سەرنجە، چونکە ئەم جۆرە مارمێلکەیە جگە لە دوورگەکانی فیجی، لە هیچ شوێنێکی تری ئاسیادا ناژی -هەڵبەتە یەکێک لە ڕەگەزەکانی لە (تۆنگا) شدا دەژی. لەوەوپێش کۆمەڵێک توێژەر وای بۆ دەچوون کە ئەم جۆرە مارمێلکەیە بەشێوەیەکی زۆر سەرسوڕهێنەر بواریان بۆ ڕەخسابێت و لە خوارووی ئەمریکاوە بەهۆی ڕووەکی سەرئاوەوە گەیشتبنە ئێرە! بێگومان ئەوە شتێکی شیاوە، چونکە پێدەچێت جگە لە شیردەرەکان، ڕەگەزی تریش لە ڕێگەی قەدی داری (بالسا[١٩]) و ئەو جۆرە شتانەوە، توانای جێگۆڕکێیان هەبووبێت لە کیشوەرێکەوە بۆ کیشوەرێکی تر. بەهەرحاڵ پرۆفیسۆر (پیتەر نیوئیڵ) کە مامۆستایە لە دانیشگای (خوارووی ئۆقیانووسی ئارام)دا دەڵێت: «ڕێی تێدەچێت مێژووی جیۆلۆجی (ئیگوانا)کانی سەر دوورگەکانی فیجی زۆر زیاترێک بێت لەو مێژووەی لەوەوپێش مەزەنە دەکرا».
ئەو لەم بارەیەوە دەنووسێت: (دۆزینەوە نوێکانی پاشماوەی بەبەردبووی تیمساح (ئەو جۆرەی کە دەتوانن هەزارەها کیلۆمەتر مەلە بکەن) ئەوەمان نیشان دەدەن کە (ئیگوانا)کان ماوەیەکی زۆر لەوەوپێشتر لێرەدا بوون وەک لەوەی لەوەوبەر مەزەنەمان دەکرد. لەوەدەچێت ئەو مارمێلکانە لە پاشماوەی خاکی (گۆندوانا)وە هاتبن، لەو کاتەدا کە فیجی - و چەند وڵاتێکی تری وەک نیوزلاند و ئوسترالیا و هیندستان- بەشێک بووە لەو پلێتە کیشوەرییە گەورەیەی کە دواتر پارچەپارچە بووە. بەڕاست، ئیگوانا لە (ماداگاسکەر)یشدا دەژین، کە زیاتر لە (١٥٠) ملیۆن ساڵ لەمەوبەر بەشێک بووە لە خاکی (گۆندوانا).
بەهەرحاڵ لێرەدا نامەوێت بە توێژینەوەکانی خۆمەوە ماندووت بکەم. ئەو کاتەی لە دەوروبەری تەواوبوونی ئەم هەزارەیەدا کە ڕاپۆرتەکەم بڵاو دەکەمەوە، فرسەتێکی باشت لەبەردەستدا دەبێت تا تاووتوێیان بکەیت. بێگومان تەنها ئەگەر بخوازیت: بەڕاستی دەمەوێت ئەو پەیمانەم بدەیتێ.
لە شاری (ئاوکلاند[٢٠])ەوە بۆماڵەوە دەگەڕامەوە: هەموو حەفتەیەک هێڵی ئاسمانی نیوزلەندا دوو سەفەری خۆش و بێ کێشە ڕێک دەخات لە شاری (نادی) و (هۆنۆلولو)ەوە بۆ (لۆس ئەنجلس) و لەوێشەوە بۆ (فرانکفۆرت). ئێ من هیچ کەسێکم نەبوو کە لە ماڵەوە چاوەڕوانم بکات، لەبەرئەوە بڕیارم دا چەند ڕۆژێک بۆ

خۆم لەسەر دوورگەکانی فیجی بمێنمەوە. هەڵبەتە هەم بۆ ئەوەی هەموو ئەو شتانە هەزم بکەم کە ئەزموونم کردبوون، بەتایبەتیش هێشتا لەو ناوچە گەرمەدا لەناو ئەو هەموو دوورگە بچکۆلانەیەدا بووم و هەم ویستیشم ماندوویی خۆم دەربکەم و بەر لە سەفەرە دوورودرێژەکەم بەرەو ماڵەوە کەمێک قاچی بۆ ڕابکێشم. بێگومان ئەو کاتەی کە لە سەرەتای مانگی یانزەدا سەفەرەکەم بۆ ناوچەی خوارووی ئۆقیانووسی ئارام دەست پێ کرد، بۆ ماوەی نزیکەی حەفتەیەک لەسەر دوورگەی فیجی مامەوە، بەڵام فریای ئەوە نەکەوتم دوورگەی (تاڤیونی) ببینم کە خۆی لە خۆیدا گەوهەرێکە و زۆرجاریش پێی دەگوترێت (بەهەشتی دوورگەکانی فیجی)، چونکە لە ئەندازەبەدەر بەپیتە و تاڕادەیەکیش هیچ کاریگەرییەکی دەرەکی پێوە دیار نییە و وەک خۆی ماوەتەوە.
ئەو بەیانییەی کە من سەفەرم کرد ژمارەی موسافیرەکان زیاترێک بوو لە ژمارەی کورسییەکانی ئەو فڕۆکەیەی هێڵی ئاسمانی (سەن فلاوەر) کە دەبووایە لە (نادی) یەوە بەرەو (تاڤیونی) بفڕییایە، هەر بەهۆی ئەوەشەوە جانتاکەم لەگەڵ ئەو فڕۆکەیەدا بارکراو و من و چوار موسافیری تریشیان خنییە ناو شتێکەوە کە پێیان دەگوت (فڕۆکەی شقارتە). دڵنیات دەکەمەوە کە ئەو ناوە پڕ بە پێستی خۆی بوو. بە نیمچە گرمۆڵەیی لەناو ئەو فڕۆکە بچکۆلەیەدا دانیشتین و تەنها شەش کورسی تێدا بوو. کاپتنێکی سەرسپی بە دەنگێکی ڕوون و نایاب بەخێرهاتنی کردین و بە ڕوویەکی خۆشەوە وتی: «بەداخەوە لەم سەفەرەدا هیچ خواردن و خواردنەوەیەکتان پێشکەش ناکرێت. داواشتان لێ دەکەم هەتا زۆر پێویست نەبێت، مەچنە ناو مەمەڕی نێوان کورسییەکانەوە». هەر بەو قسانەی توانی مەزاجێکی خۆش لەنێوان موسافیرەکانیدا بڵاو بکاتەوە و لە ترس و دڵەڕاوکێ ڕزگارمان بکات. نیوەی دوو پەنجەی ئەو دەستەشی قرتابوو کە بۆ سەلامکردنی ئێمە ڕایوەشاند، دیسانەوە بینینی ئەو دیمەنەش جەوەکەی هێندەی تر خۆش کرد. هەڵبەتە (مەمەڕی نێوان کورسییەکان) تەنها پانزە سانتیمەتر پان بوو و لەو جەوەدا هیچ یەکێکمان توانای ئەوەمان نەبوو بیر لە خواردن بکەینەوە، چونکە کەمێک پاش ئەوەی فڕۆکەکە بەرز بووەوە، ڕەهێڵەیەکی توند بەملاولادا دەیهێناین و دەیبردین، هاوکاتیش ماتۆڕەکەی بە نقەنق دەیویست بەسەر شاخی سەرسەختی (تۆمانیڤی)ی دوورگەی (ڤیتی لیڤیو)دا بەر زمان بکاتەوە.
وابزانم ئەو پیاوە سەرسپییە کاپتنێکی خانەنشین بوو، وە پێم وابێت تەنها شتێک

که وای لێ کردبێت بگوێزێتەوە بۆ دوورگەی فیجی، ئەوە بووە کە نەیتوانیوە بە یەکجارەکی دەستبەردای سوکانی لێخوڕین و ئامێری پێوانی بەرزی بێت و سەخت بووە بەلایەوە ماڵئاواییان لێ بکات. بەدەر لەوەش ڕازی بوو بەوەی فڕۆکەیەکی کۆن لێبخوڕێت، فڕۆکەیەک کە پەنجەرەی پێشەوەی درزی تێکەوتبوو و لایەنی کەم لەو کاتەدا یەک دوو ئامێری شکاوی تێدابوو. کێ دەزانێ، خۆ پێشی دەچێت فڕۆکەکە هی خۆی بووبێت، پێم وا نییە شتێکی لەو بابەتە هێندە گران بێت. بەهەرحاڵ بەڕاستی پیاوێکی میهرەبان بوو. من بەناچاری هەردوو ئەژنۆم لە پشتی کورسییەکەی ئەو چەقاندبوو، ئەویش بەردەوام ئاوڕی دەدایەوە و خەندەیەکی گەورەی دەخستە سەر لێوی و دانەدانە لێی دەپرسین (ئەی تۆ خەڵکی کوێیت؟). بەردەوامیش لەسەر نەخشەیەک ئەو شوێنەی پیشان دەداین کە تێیدا بووین. زۆر بەپەرۆشییەوە ئاماژەی بۆ دۆلفینەکانی ناو دەریاکەی خوارەوە دەکرد و ئەو ماسییانەی نیشان دەداین کە هەڵبەزودابەزیان دەکرد و دەستی بۆ مەرجانی قەراغ دەریاکان ڕادەکێشا. ئەو پیاوە دەمی نەدەوەستا و یەکبینە قسەی دەکرد.

ڕەنگە تا ئێستا هێندە تێگەیشتبیت کە من لەویادا بەڕاستی دەترسام و دڵم لە مشتما بوو. ڕاستە ڕاهاتبووم بەوەی سەفەر بە فڕۆکەی چکۆلە بکەم، ئێ خۆ لە ماوەی چەند حەفتەی ڕابردوودا جگە لە سەفەری نێوان ئەو دوورگانە هیچی ترم نەدەکرد، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەبێت دان بەوەدا بنێم کە لەو سەفەرەدا دڵەڕاوکێ گرتبوومی، چونکە تەنها یەک کاپتن فڕۆکەکەی لێدەخوڕی و کەسی تری لەگەڵدا نەبوو. لێرەدا دەتوانیت بەرپەرچم بدەیتەوە و بڵێیت: دەکرێت بڵێین ترسەکەت شتێکی نائەقڵانییە، تەنها لەبەرئەوەیە کە خۆت کەسێکی هەستیاریت.. بەڵێ.. ئا ئێستا لەو بڕوایەدام گوێم لە دەنگت بێت کە دەڵێیت: (ئێ خۆ تەنها یەک کەسیش سەیارە لێدەخوڕێت و ئەو کەسانەی بە ڕووداوی سەیارە گیان لەدەست دەدەن، زۆر زیاترن لەو کەسانەی کە لە ئاسماندا بەهۆی ڕووداوی فڕۆکەوە دەمرن). لەوانەیە ئەوە ڕاست بێت، هەرچەندە سەختە ناوێکی وەک (نائەقڵانی) بەسەر ئەو حاڵەتەدا داببڕین کە لەناکاوێکدا تووشی دڵەڕاوکێیەکی ئاوها ببین، بەتایبەتیش کە لەسەروو پێنج هەزار پێوە ببین و دیسانەوە بەتایبەتیش کە کاپتنێک ئەو فڕۆکەیە لێبخوڕێت کە تەمەنی لە کۆتایی شەستەکاندا بێت. گەر لەو ناوچە گەرمەدا سەرت گێژ بخوات، ئەوا نەک هەر تەنها شتێکی ئاساییە، بەڵکو زۆر بەئاسانی شتێکی ئینسانیشە، شتێکە لەو شتانەی کە ڕوودەدەن.

من لەو هەموو سەفەرانەدا نیگەرانی ئەوە نەبووم کە هەڵەیەکی تەکنیکی ڕوو بدات، بەڵکو تا ئەندازەیەک لە پێچەوانەکەی دەترسام. من لە هەڵەیەکی سروشتی دەترسام، دانیشتبووم و هەستێکی تۆقێنەرم هەبوو، پێم وابوو تەنها گیانەوەرێکی بڕبڕەداری گۆشتنم و هیچی تر، ڕێک لەو کاتەدا وامدەزانی بە کورسیی فڕۆکەیەکەوە بەستراومەتەوە، هەستم دەکرد هەمان شتیش بەسەر ئەو کەسەی بەردەممدا بچەسپێت کە بێخەیاڵ بۆ خۆی دانیشتبوو و سوکانەکەی بەدەستەوە بوو –هەڵبەتە هەر ئەوەندە بوو کە ئەو سی ساڵێک لە منیش بەتەمەنتر بوو.
وەک دەرئەنجامێکی حەتمی ئەو هەستەشم ترپەی دڵم بەرز بووەوە و هەر لە ترپەی دڵی کەسێک دەچوو کە تازە لە پێشبڕکێیەکی ماراسۆن هاتبێتە دەرەوە، وامزانی دڵم لە خولەکێکدا دوو سەد کەڕەتێک لێدەدا و لەویادا خۆم بە خۆمم وت (ئاخۆ دڵی کاپتنەکە چۆن لێبدات؟! ئاخۆ ڕێژەی کۆرسترۆڵ و ترپەی شادەمارەکانی دڵی چۆن بن؟!). ئاخر من هیچ شتێکم دەربارەی ناولەشی ئەو کاپتنە پیرە نەدەزانی، هەر ئەمەش خۆی لە خۆیدا هێندەی تر توشی دڵەڕاوکێی کردم. من چوزانم، خۆ ڕەنگە ئەو باوەڕی بە ژیانی هەتاهەتایی هەبووبێت، جۆرە بڕوایەکی لە ئەندازەبەدەر بێ پەروا کە دەبووایە ڕێک بۆ کەسانی وەک ئەو قەدەغە بووایە، بێگومان مەبەستم لەو کاپتنانەیە کە بە تەنها و بەبێ هیچ یاریدەدەرێک فڕۆکە لێدەخوڕن و هاوکاتیش چەند موسافیرێکیان لەگەڵدایە کە کرێیان داوە. لە هەموو بارێکدا پێم وانییە نموونەی ئەو جۆرە کاپتنانە هێندە زۆر بن. من چوزانم، خۆ پێشی دەچوو لەو دوادواییەدا ئافرەتێک هەڵی خەڵەتاندبێت، یان لەوانەیە لەژێرەوە نیازی وابووبێت کە دواتر لە هەمان ئەو پێشنیوەڕۆیەدا بەناچاری دان بەوەدا بنێت کە دەیەوێت دزییەکی گەورە بکات. بەهەرحاڵ من خۆم هیچ خۆشییەکم لە بینینی شاخی (تۆماڤینی) نەبینی، تەماشکردنی دۆلفینەکان و مەرجانەکانی قەراغ دەریاکانیش هیچ دڵی خۆش نەکردم. هەستم کرد هەموو ئەو شتانە هەر زۆر زۆر لە خوارمەوە بوون و منیش لە کونێکدا گیرم خواردبوو و نەمدەتوانی بێمە دەرەوە. لەو کاتەدا بەڕاستی بیری بتڵە جنەکەم دەکرد و ئەگەر لەناو ئەو فڕۆکەیەدا پێم بووایە، بەهیچ جۆرێک شەرمم نەدەکرد و ڕاستەوڕاست قومم پێوە دەنا، بەڵام بەداخەوە ئەو بتڵەی کە دەرمانی هێورکەرەوەم بوو لەناو ئەو جانتایەدا بوو کە لەگەڵ فڕۆکەکەی تردا بار کرابوو.
ڤیرا، لێرەدا من نە باسی (ترسی فڕین)ت بۆ دەکەم و نە مەبەستیشم لەم وەسفە ئەوەیە کە باسی سەفەرنامەیەکت بۆ بگێڕمەوە. ئەو شتەی کە من هەوڵ دەدەم بۆت

باس بکەم، شێوەی ژیان و هەستی منە. خۆ بە شێوەیەک لە شێوەکان هەمیشە ئەم هەستەم هەر لەگەڵدایە، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی تەنها لە دوو حاڵەتدا بەتەواوەتی سەرهەڵدێنن و دێنە دەرەوە: ئەو کاتەی بەیانیان خەبەرم دەبێتەوە و لەگەڵ ئەو جارە کەمانەش کە سەرخۆش دەبم. هەروەک چۆن بە لاتینی دەڵێن (In vino veritas)، واتە (حەقیقەت لەگەڵ خواردنەوەی شەرابدا دەردەکەوێت). بەڕاستی من خۆم بۆ خۆم پێم وایە زۆرجار سەرخۆشی، بە بەراوردکرن لەگەڵ حاڵەتی هۆشیاری پڕ لە تەمومژی ئاسایی ڕۆژانەدا، شێوازێکی بیرکردنەوەی ئاشکراتر و ڕوونتر و ڕاشکاوانەتر دەخوڵقێنێت. بەلایەنی کەمەوە دەربارەی پرسە گەورەکان بەو شێوەیەیە، منیش لێرەدا مەبەستم لەو جۆرە پرسانەیە. بەو شێوەیەش کاتێک مەسئولیەتی بوون یان نەبوونم خستە دەستی ئەو کاپتنە خانەنشینکراوەی کە (فڕۆکەیەکی شقارتە)ی جام شکاوی لێدەخوڕی بە چەند ئامێرێکی شکاوەوە، خێراتر و ئاسانتر و ڕاستەوخۆتر گەیشتمەوە هەمان ئەو حاڵەتە دەروونییە. تەنها جیاوازیش لەگەڵ ئەو دوو حاڵەتەی کە لەوەوبەر باسم کردن، ئەوە بوو کە هەستەکانم تیژتر بوون، چونکە نە نیمچە خەواڵو بووم و نە ئەلکهولیش دەماری نێوان خانەکانی مێشکمی بێ هۆش کردبوو.

بەڕاستی ئەوە یەکەمین جارم بوو لە فڕۆکەیەکدا دانیشم و تەنها یەک کاپتنی بەتەمەن لێی بخوڕێت، چ کاپتنێکیش: ئەو دەستەی بە سوکانەکەوە گرتبووی، سێ پەنجەی تەواو بوو و دوو پەنجەکەی تری نیوەی قرتا بوو. دەنا من بەردەوام هەموو بەیانییەک بۆ ڕۆژێکی نوێ هەڵدەسم و زۆرجاریش ڕێک دەکەوێت سەرمەستی ئەو حاڵەتە هزرییە سەیرە ببم کە لە بنەڕەتدا ڕوونتر و حەقیقیتر و تەندروستتریشە. هەر ئەمەش وام لێ دەکات قووڵترێک بڕوانمە ئەو شتانەی لەویادا بە خەیاڵمدا دەهاتن و هەستم پێ دەکردن، لەویادا کە ماوەی سەعات و چارەکێکی خایاند و لەنێوان هەورەکاندا بووم تا لە (نادی)یەوە گەیشتمە (تاڤیونی). لەلایەکی تریشەوە دەمەوێت بەوردی باسی (ئانا) و (خۆسێ)ت بۆ بکەم کە لەوێ بینیمن، هەروەها بەتایبەتیش نامەوێت باسی (گۆردن) لەیاد بکەم، کە وابزانم تا ئێستا ناوم نەهێناوە، بەڵام ئەو کۆمەڵە گفتوگۆیەی کە لەگەڵیدا کردم، کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر مانەوەی من بەجێهێشت لەو دوورگەیەدا.

شتێک هەیە کە من هەمیشە خۆم لێ دزیوەتەوە و قەت لەوەوپێش نەمویستووە بە جیددی لەگەڵ تۆدا باسی بکەم، هەرچەندە من خۆم پێم وایە یەک دوو جار

بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ ویستم باسی بکەم بۆت. مەبەستم لەو ڕووداوەیە کە لە سەردەمی منداڵیمدا لەلای ماڵی خۆمانەوە لە (فێستفۆلد)دا بینیم. وابزانم تەمەنم هەر حەوت یان هەشت ساڵێک بوو، لە هەموو بارێکدا دڵنیام هەشت ساڵم پڕ نەکردبووەوە، چونکە لە هەشت ساڵیدا بۆ ماوەی چوار ساڵ گواستمانەوە بۆ شاری مەدرید. بیرم دێت بە ڕێگایەکی ناو دارستانەکەدا ڕام دەکرد، گیرفانەکانم پڕ کردبوو لە (کەستانیا)، کە لە دارستانەکەدا دۆزیبوومنەوە و دەمویست بە زووترین کات بگەمەوە ماڵەوە تا پیشانی دایکمی بدەم. لەناکاوێکدا کارمامزێکی بچکۆلەم بینی لەسەر عەردی تەڕوبڕی ئەو دارستانە ڕاکشابوو و کەم تا زۆری لەشی بە گەڵای وەریوی ئەو پاییزە داپۆشرابوو. هەرچی دەربارەی وێنەی گەڵاکانە لە یادەوەریمدا بە یەکجاری تۆمار بووە، چونکە هەندێک لەو گەڵایانە کەوتبوونە سەر جەستەی کارمامزە بچکۆلەکە. وامزانی خەوتووە.. بەتەواوەتی بیرم نایەتەوە، وابزانم زۆر بەهێواشی لێی نزیک بوومەوە تا دەستێکی پیا بهێنم یان گەڵا زەرد و سوورەکانی لەسەر لابەرم، بەڵام دواتر بۆم دەرکەوت کە کارمامزەکە نەخەوتبوو، بەڵکو مردار بووبووەوە.

حاڵەتی مرداربوونەوەی کارمامزەکە، یاخود ڕاستترێک بیڵێم ئەو حاڵەتەی کە من بە مردوویی دۆزیمەوە، وای لێ کردم هەست بە شەرمێکی گەورە بکەم، شەرمێک کە قەت نەمتوانی بۆ دایک و باوکمی باس بکەم، بەڵێ، تەنانەت نەمتوانی بۆ داپیرە و باپیرەشمی بگێڕمەوە. ئاخر ئەگەر ڕێی تێبچێت کارمامزێکی بچکۆلە لەو دارستانەدا بەمردوویی بکەوێت، کەواتە ڕەنگە دوای ئەو سەرەی من بێت کە بکەوم و بمرم. لەو کاتەشەوە تا ئێستا ئەو هەست و وێنەیە هەروەک هەستێکی نیمچە فیزیاوی لە جەستەمدا ماوەتەوە. من هەمیشە خۆمم وەک کەسێک بینیوە کە ڕۆحی بریندار بووە، وەک کەسێک کە ئەزمەیەکی دەروونی هەبووە، بێگومان بێدەنگ بوون و پەردەپۆشکردنی خۆم وای لەو ڕووداوە کرد کە ئازاری دەروونم بدات. ئەگەر ئەو ڕۆژە بە گریانەوە ڕام بکردایەتەوە ماڵەوە بۆ لای دایکم، ئەوا بێگومان ئەو یارمەتیەم دەخرایە بەردەست کە پێویستم بوو و دەمتوانی بەسەر ئەو ڕووداوە ناخۆشەدا تێپەڕم، بەڵام نەمتوانی بیدرکێنم، نەمتوانی لەلای هیچ کەسێک باسی بکەم، چونکە هەستم بە شەرم و سوک و ڕسواییەکی گەورە دەکرد. یەکسەر لەگەڵ بینینی ئەو ڕووداوەدا هێندە تێگەیشتم کە منیش بوونەوەرێکم و لە گۆشت و خوێن پێکهاتووم، هێندەشم بۆ ڕوون بووەوە کە لە گیانەوەرێک زیاتر نیم و لە کاتی ئێستادا کاتێکم

لەسەر ئەم زەویە هەیە، بەڵام ڕۆژێک دێت کە چیتر بوونم لێرەدا نامێنێت.
دوور نییە ئەم خولیایەی کە ئێستاکە هەمە بۆ سروشت، هەر بەهۆی کاریگەری گەورەی بینینی ئەو کارمامزە مردووەوە بێت. بەلایەنی کەمەوە ئەو ڕەهەندەی لەو دارستانە پڕلە گەڵا وەریوەدا بینیم، کاریگەریی خۆی لەسەر ئاراستەی قووڵبوونەوەی خوێندنی دواترم بەجێهێشت. من هەمیشە ئەو هەستەم هەبووە کە پێویستم بەوەیە لەو ماوە گەورەیەی کات تێبگەم. هەربۆیە وەک کوڕێکی فزوڵی دوانزە ساڵان، ئاشنا بووم بە تەقینەوە گەورەکە و ماوە مەزنەکانی نێو گەردوون. بەردەوامیش جۆرە تێڕوانینێک لەلام پەرەی سەندووە و بۆتە بەشێکی کەسایەتیم، ئەویش ئەوەیە کە ئەم زەویەی من لەسەری دەژیم تەمەنی نزیکەی پێنج ملیارد ساڵە و تەمەنی گەردوونیش سێ یان چوار کەڕەتی تەمەنی ئەم زەویە زیاترە.
من لە هەر ساتێکدا بێت شیاوی ئەوەم کە بە یەکجارەکی ون ببم، ئەمە ڕێک ئەو بیرکردنەوەیەیە کە دەمتۆقێنێت، بیرکردنەوە لەو حاڵەتە زۆر ترسناکە کە تەنها یەک کەڕەت لەم ژیانەدا دەبم و کە مردیشم ئیتر قەت قەت ناگەڕێمەوە ناوی. هەربۆیە بەردەوام هەوڵم داوە بەشێوەیەک لە شێوەکان لەگەڵ ئەو فیکرەیەدا ئاشت ببمەوە و ویستوومە خودی خۆم و ئەم ژیانە کورتەم بخەمە ناو بازنەیەکی گەورەترەوە.
هەوڵم داوە خۆم لەسەر ئەو فیکرەیە ڕابهێنم کە من تەنها بەشێکی زۆر بچکۆلەی حەکایەتە گەورەکەی ژیانم.. تەنها چمکێکی بچکۆلە و سەرپێیی شتێکی ترم کە زۆر لە خۆم گەورەتر و بەهێزترە. ئا بەو شێوەیە هەوڵم داوە پێناسی خۆم، خودی خۆم، فراوانتر بکەم، بێگومان هەمیشەش خودە بچکۆلەکەم باجەکەی داوە و لەسەر ئەو کەوتووە، ئەو خودەی کە لە هەموو ساتێکدا پێی دەچێت توشی هەمان چارەنووسی کارمامزەکە بێت، مەبەستم لەو گیانەوەرە سمدارە مرداربووەوەیە کە تا ئێستاش لە شوێنێکی قووڵی نائاگاییمدا ماوەتەوە. بەڕاستی هەوڵم داوە، ئێستاش بەردەوام هەر هەوڵ دەدەم، هەرچەندە نامەوێت دان بەوەدا بنێم کە جۆرە پێشکەوتنێکی فریادڕەسم بەدەست هێناوە. بەردەوام هەموو بەیانییەک ئەوەم بە خەیاڵدا دێت کە تەنها من، تەنها خۆم و تەنها لە ئێستادا و لێرەدا بوونم هەیە، تەنها لە ئێستادا، کتومت لەم کاتەدا من و تۆ هەڵگری ئاگایی خودی گەردوونین.
ڕەنگە ئەگەر ژیانمان لە ڕوانگەیەکی ئەبەدییەوە ببینین، ئەنجامێکی ئەقڵانی یان ئەخلاقی وامان پێ ببەخشێت کە شایانی ڕێز بێت، بەڵام مەرج نییە ئارامی مێشکمان لەم ڕێگایەوە دەست بکەوێت. مەرج نییە من، کە گیاندارێکی شیردەری قەبە و

ناشیرینم و بەئاگام لە خۆم، هەر ئەوەندەی کە بتوانم هەموو ڕابردووی گەردوون لە یادەوەریمدا هەڵبگرم، ئیتر شێوە تەباییەکم دەست بکەوێت، مەبەستم لە ڕابردووی گەردوون لەو کاتەوەیە کە تەقینەوە گەورەکە ڕوویدا و هەتا بۆ نموونە سەردەمی (بیڵ کلینتۆن) و (مۆنیکا لوینسکی)، ئەمە ئەگەر بمانەوێت ناوی تەنها دووان لە گیاندارە شیردەرە هەرە بەناوبانگەکانی ئەم سەردەمەمان بهێنین. لەئامێزگرتنی ماوەیەکی زەمەنی گەورەتر و فراوانتر، ئارامی بە مێشکت نابەخشێت، بەڵکو تا ئەندازەیەک بەپێچەوانەوەیە. دەبێت دان بەوەدا بنێم کە ئەوە لە خراپەوە بەرەو خراپترت دەبات و وابزانم وا باشترێک بوو کە هانام ببردایەتە بەر دکتۆرێکی دەروونی تا لە ڕێگەی نەشتەرگەرییەوە ئەو گیانەوەرە مردووەی لەناو نائاگایی هەوکردوومدا دەربهێنایە، ئێستاکە پێم وابێت درەنگ بێت بۆ ئەو کارە.

وا من ئەوەی مەبەستم بوو گوتم و ئێستاکەش دەتوانین بگەڕێینەوە سەر باسی کابینەی تەسکی فڕۆکە بچووکەکە، وەک لەوەوپێش وتم نەک تەنها هەر لەو بەیانییە ڕوونانە دەچوو کە تێدەپەڕن و خدوتکەی خانەکانی مێشکم دەدەن، دواتریش هەست دەکەم کە من گیانەوەرێکی بڕبڕەداری هەر زۆر ژیرم و حوکم بەسەرمدا کراوە کە جارجارێک ڕووبەڕووی ئەو فیکرەیە ببمەوە کە من تەنها چەند مانگێکی قۆڕی کەمم لەم ژیانەدا ماوە. بەڵکو لەویادا ئەزموونێکی سەعات و چارەکیم بینی کە زۆر زۆر ناسک بوو، چونکە هەستم کرد ژیانی سەر زەویم بە چەند چرکەیەک دەژمێردرا نەک بە چەند مانگێک. ئەو گیانەوەرە شیردەرەی کە سوکانەکەی بەدەستەوە بوو، هەروا بێخەیاڵانە ئاوڕێکی دایەوە و بە پەنجە بچکۆلەکانی نەخشەیەکی گەورەی کردەوە، ئینجا خستیە باوەشی ئەو گیاندارە شیردەرە ئوسترالییە مێیەی کە لەلای ڕاستمەوە دانیشتبوو، ئەو ژنە ناوی (لاورا) بوو. من پێم خۆش نەبوو لەو کاتە ناسکەدا هێندەی تر حاڵەتەکە ئاوها بە خەمساردییەوە وەربگیرێت و تا ئەندازەیەک بگاتە ئەوەی کە پێی بڵێین لێخوڕینێکی بەدڕەوشتانە. بێگومان لێرەدا کە من ئەم باسە دەگێڕمەوە، نامەوێت بەهەڵە لێم تێبگەیت و وابزانیت ئەو کەسانەی لەگەڵمدا بوون کەسانێکی خراپ بوون، بەڵکو تەواو بەپێچەوانەوە بوو، من دانەدانەی موسافیرەکانم خۆش دەویست و لەویادا زۆر ئاسایی بوو بەلامەوە سەر بخەمە باوەشیانەوە تا هەست بە ئارامی و دڵنەوایی بکەم. هەستم دەکرد مارمێلکەیەکی بچکۆلەم، هەستم دەکرد گیاندارێکی بچکۆلانەی ترساوی ناو لادێیەکم و دەبووایە هەر لەسەر عەرد بوومایە و ئەوێم جێنەهێشتایە. ئەو قەناعەتەشم ڕاستەوخۆ خەتای

ئەوە بوو کە بەڕاستی یەکێک لە نەوەکانی دواتری مارمێلکە فڕۆکەکەی لێدەخوڕی، چ کەسێکیش، کەسێکی پیری خەمسارد بوو و لەهەمانکاتیشدا وا خۆی نیشان دەدا کە پیاوێکی زیرەک و بەتوانایە. هەر ئەو ڕاستیەی کە ئێستاکە دەتوانیت ئەم دێڕانە بخوێنیتەوە و جگە لەوەش ئەوەی کە دواتریش لە (سالامانکا) یەکتریمان بینی، هێندە دەردەخەن کە دواجار فڕۆکەکە بە بێ کێشە و بە سەلامەتی نیشتەوە. خاڵی دیار و گرنگی ئەو سەفەرە لەوەدا بوو کە هەستێکی زۆر سەیری پێ بەخشیم و نەمدەتوانی بەرەنگاری ببمەوە، لەویادا هەستم کرد گیانەوەرێکی بڕبڕەداری لاوازی گەنجم و لەوە زیاتر هیچی تر نیم. ئەو هەستەم ڕۆژانی دواتریش هەر بەدوامەوە بوو و نەمتوانی لە کۆڵی خۆمی بکەمەوە.
فڕۆکەخانەکەی (تاڤیونی) ناوی (ماتای)ە و لەوە دەچێت پڕاوپڕ بۆ ئەو جۆرە فڕۆکانە دروست کرابێت کە پێی دەڵێن (فڕۆکەی شقارتە). ئەو شوێنەی فڕۆکەی لێ دەنیشێتەوە جادەیەکی تەسکە و لە گیای خەتخەت پێکهاتووە، ئەملاولاکەشی داری گوێزی هیندییە و ڕەشەبا دەیانهێنێت و دەیانبات. بینای فڕۆکەخانەکەش هەر لە وێستگەیەکی پاس دەچێت، یەک دوو کورسیی دانیشتنی شینیان خستۆتە ژێر سەقفێکەوە، دوکانێکی بچکۆلەی تێدایە و ئافرەتێکی جوان دەیبات بەڕێوە کە ناوی (مارگریت پیتەرسن)ە. ئەو ڕۆژە (ئاندرێ براون)یش لەوێ بوو و زەمیلەیەک نانی گەرمی پێبوو، زەمیلەکەی لە گەڵای داری گوێزی هیندی چنرابوو. من تا ئەو کاتە فریای ئەوە نەکەوتبووم نانی بەیانی بخۆم و بەدەر لەوەش ناچار بووم نزیکەی سەعاتێک چاوەڕێی فڕۆکە گەورەکە بکەم کە جانتاکەمی تێدا بوو، دەبووایە ئەو فڕۆکەیە بۆ ماوەیەکی کەم لەسەر یەکێک لە دوورگەکانی تر بنیشتایەتەوە و ئینجا بگەیشتایەتە ئێرە. لەبەرئەوە هەستم کرد لە شوێنی خۆیدا بێت لەویادا ئەو دوو ئافرەتە میوانداریییەکی باشم بکەن. هاوکات لەگەڵ گەیشتنی فڕۆکەکەدا سەیارەیەکی (ماراڤیو پلانتەیشن ڕیسۆرت)یش گەیشتە جێ، من وام دانابوو سێ ڕۆژ لەو شوێنەدا بمێنمەوە.
لێرەدا نامەوێت پەیمانەکەم بشکێنم و بەڕاستی دەمەوێت هەموو شتێکت بەپێی کاتی ڕوودانیان بۆ بگێڕمەوە. کاتێک کە من هەوڵ دەدەم بەشێوەیەکی ساکار وێنەیەکی (بەهەشتی دوورگەکانی فیجی)ت نیشان بدەم، لەبەرئەوە نییە کە بمەوێت لاڕێیەک بگرمەبەر، بەڵکو کتومت دەخوازم (ئانا) و (خۆسێ) بهێنمە ناو ئەو ناوەندەوە، ئەو دوو کەسەی کە قەت لە یادەوەریی مندا لاناچن.

هەرچی دەربارەی ناوی (بەهەشتی دوورگەکان)یشە، ڕەنگە ناوێکی وەک (دواهەمین بەهەشت The Last Paradise) زۆر گشتیتر بووایە بۆی، لەلایەکی تریشەوە ئەو ناوە ناوێکی گونجاوتر دەبوو، چونکە زۆر ئاسانتر لە پاش نزیکەی چەند دە ساڵێکی تری داهاتوودا وشەی (دواهەمین The last) دەگۆردرا بە (ونبوو The lost). دڵنیات دەکەمەوە ئەو کاتە زۆربەی هەرە زۆری ئەو گەشتیارانەی ڕوو لەم دوورگەیە دەکەن، هەست بەو گۆرانکارییە بچکۆلەیە ناکەن.

مرۆڤایەتی جۆرە پەرۆشییەکی زۆر سەیری بەرامبەر ئەو شتانە هەیە کە (دواهەمین) و (ونبوو)ن. بۆ نموونە ئەو بەهایەی کە لە بینینی شتێکدا هەستی پێ دەکەین، مەبەستم لەو شتانەیە کە مەزەنە دەکرێت نەوەکانی داهاتووشمان بیبینن، هەر هیچ نییە لەچاو ئەو بەها گەورەیەی کە لە بینینی شتێکدا هەستی پێ دەکەین کە بەرەو نەمان و دارمان دەچێت. ئەو کەسەی دواجار شتەکان دەبینێت، بە باشترین شێوە دەیانبینێت. بۆ نموونە شتێکی هەر زۆر ئاساییە کاتێک کەسێک لە خێزانێکدا دەمرێت، کەسانی خێزانەکە مشتومڕێک بکەن لەسەر ئەوەی کە کامیان دواهەمین وشەی کەسە مردووەکەیان بەرگوێ کەوتووە.

بەوپێیەی بەرەبەرە جیهان بچووکتر دەبێتەوە و پیشەسازیی گەشتوگوزارییش بەردەوام شوێنی نایابتر و نوێتر دەدۆزێتەوە، لەم ڕوانگەیەوە من پێشبینیی ئەوە دەکەم کە لە داهاتوودا شوێن و شتە فەوتاوەکان پاشەڕۆژێکی پرشنگداریان هەبێت لە بواری گەشتوگوزارییدا، بۆ نموونە دەڵێن: «وەرن تەماشای دەریاچەی فەوتاوی (بایکاڵ) بکەن!»، «لە ماوەی چەند ساڵێکی کەمی داهاتوودا دوورگەکانی (مالدیف) نغرۆی ئاو دەبن، فریای بینینی بکەون!»، یاخود بۆ نموونە دەڵێن: «دەتوانیت دواهەمین کەس بیت کە پڵنگێکی زیندوو بە چاوی خۆت ببینیت!» هەتا بێت نموونەکان زیاترێک دەبن، چونکە هێدی هێدی شوێنە قەشەنگ و نایابەکان کەمتر و کەمتر دەبنەوە، بەڵام تێکچوون و کەمبوونەوەی ئەو شوێنانە نابنە بەربەستێک لەبەردەم گەشتوگوزارییدا، بەڵکو کتومت بەپێچەوانەوە دەبێت.

هەموو ئەو دوورگانەی کە سەردانم کردن، کاریگەریی تێکەڵبوونی جیهانی ڕۆژئاوایان پێوە دیارە، بەڵام لەنێوان هەموویاندا دوورگەی تاڤیونی هەر زۆر زیاترێک توانیویەتی وەک خۆی بمێنێتەوە، ئەمەش کۆمەڵێک هۆی لە پشتەوەیە. بەر لە هەموو شتێکی تر ئەم دوورگە بورکانییە زەوییەکی خواروخێچ و تەپۆڵکاوی هەیە، ئەمەش خۆی لە خۆیدا هەم ژمارەی گەشتیار و هەم بەرهەمهێنانی کشتوکاڵیش تا ئەندازەیەکی

زۆر کەم دەکاتەوە. هەروەها قەراغ ئاوە ڕەشەکەشی، بەهۆی بەرد و کانزای تواوەی بورکانەوە، کەمێک گەشتیار دوور دەخاتەوە، هەرچەندە بەڕاستی لە بەشی باکووری ڕۆژهەڵاتی دوورگەکەدا چەندین قەراغ ئاوی تێدایە کە لمێکی سپیی مەرجانی تێدا دەبینرێت، بەڵام کێشەی ئەو بەشە لەوەدایە کە بارانێکی یەکجار زۆری لێ دەبارێت. کتومت ئەو دوو هۆیەش، بارانی زۆر و زەوییەکی بەپیتی بورکانی، لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەدا هانی ئەوروپییەکانی دا لەوێ نیشتەجێ ببن و کەم تا زۆر چەند پرۆژەیەکی کشتوکاڵی بەرهەم بهێنن. لە سەرەتادا کەوتنە بەرهەمهێنانی لۆکە، دواتریش کە نرخی لۆکە شکا، تاڕادەیەک گرنگیان بە قامیشی شەکرەکانی خوارووی دوورگەکە دا. ئەمڕۆکەش گوێزی هیندی گرنگترین پیشەی دوورگەکەیە، هەڵبەتە لەگەڵ گەشتیاریشدا کە بەردەوام ڕوو لە زیادبوون دەکات. لێرەدا کە دەڵێم گەشتیاری، مەبەستم لەو جۆرەیە کە پێی دەگوترێت (گەشتیاری ژینگە)، چونکە لێرەدا جگە لە سروشتێکی بەپیت و فەڕ، هیچ شتێکی تری لێ نییە کە بیبینیت: بازاڕ و سەنتەری گەورەی شتکڕینی لێ نییە، خۆشی و ڕابواردنی شەوان و ئوتێلی مۆدێرنی چوار قاتی لێرەدا بوونی نییە، تەنانەت تەلەفیزیۆنیش لەم دوورگەیەدا وەرناگیرێت و کارەباشیان کەمە.

بەتایبەتیش نەبوونی ئەو دوو شتەی کە دواجار ناوم هێنان، بەشێوەیەکی بەرچاو بۆتە هۆی مانەوەی نەریتی گێڕانەوەی چیرۆک. لێرە هەر لە سەعات شەشی ئێوارەوە دونیا تاریک دەبێت، لەدوای ئەوەشەوە وشە زاڵ دەبێت. ڕەنگە یەکێکیان چووبێت بۆ ڕاوەماسی، لەوانەیە کەسێکی تریان شتێکی سەیری لەناو قووڵایی دارستانەکەدا بینیبێت، پێشی دەچێت کەسێکی تر لەلای پانتایی یەکێک لە ڕووبارەکانەوە ئەمریکییەکی بینیبێت کە ڕێگای ون کردبێت، هەموو ئەو کەسانە شتێکیان پێیە کە بیگێڕنەوە و بۆ ئەوانی تری باس بکەن. هەروەها حەکایەت و ئەفسانەی دێرینیش لە دوورگەی تاڤیونیدا ماونەتەوە، چونکە لێرەدا جگە لەو شتانەی کە خۆیان دەیخوڵقێنن، هیچ سەرچاوەیەکی تری ڕابواردنیان نییە. لە هەموو لایەکی جیهانەوە خەڵکانی زەریاوان ڕوو لێرە دەکەن تا بە ژێرەمەلە مەرجان و جیهانی ماسی پڕ لە ڕەنگ و ژیانی ئەم ناوچەیە ببینن. بەدەر لەوانەش لەسەر ئەم دوورگەیەدا دەتوانیت قەشەنگترین و تایبەتیترین باڵندەی سەر ئەم زەویە ببینیت، جۆرە ڕەگەزێکی هەر زۆر دەگمەنی شەمشەمەکوێرە لێرەدا دەژین، پیاسەی ناو دارستان و کێڵگەکان بێ وێنەن و بێگومان هەر لێرەدا دەتوانیت خۆشترین مەلە لە قەراغ ئاوەکاندا بکەیت،

یاخود بچیتە ژێر تاڤگە زۆروزەوەنەکانییەوە کە سەرمەستت دەکەن.
ژمارەی جۆری ئەو باڵندانەی لەسەر ئەم دوورگەیە دەژین، لە سەد دانە تێدەپەڕێت و هەندێک لەو ڕەگەزانە تەنها لەسەر ئەم دوورگەیە هەن. بۆ نموونە ئەو کۆترە بەناوبانگەی کە ڕەنگی سەر سنگی پرتەقاڵییە. زۆر گرنگە کە هەرگیز گیاندارێکی وەک (بانەوانک)[21]ی هیندییان نەهێناوەتە سەر ئەم دوورگەیە. بە مەبەستی قەڵاچۆکردنی مێش و مەگەزی ناو دارگوێزە هیندییەکان، قەلەباچکە و بۆقی کێوییان هێنایە سەر ئەم دوورگەیە. بێگومان قەلەباچکەکان شوێنی خۆیان گرتووە، لە کاتێکدا بۆقە کێوییەکان، بۆقە ڕەسەنەکانی ناوچەکەیان بەرەو قووڵایی دارستانەکە دوورخستۆتەوە، بەڵام ژیانی باڵندەکانی تاڤیونی بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر هەروەک خۆی ماوەتەوە. بەهەمان شێوە ژیانی شەمشەمەکوێرەکانیش وەک خۆیان ماوەتەوە، تەنانەت ئەو ڕەگەزەش کە پێی دەڵێن (سەگی باڵدار)، درێژی باڵەکانی دەگاتە مەترونیوێک و پێشی دەڵێن (بیکا). لەلای خەڵکانی بەتەمەنی ئەم ناوچەیە، (بیکا)ی کوڵاو یەکێکە لە خواردنە هەرە خۆشەکان.
لە تاڤیونیدا زیاتر لە هەزار جۆری ڕووەکی بەناوبانگی تێدایە، بڕێکی بەرچاویان ڕووەکی تایبەتن و تەنها لێرە دەڕوێن. بەدرێژایی قەراغ دەریاکان ژمارەیەکی زۆر لە درەختی (مانگرۆڤ)[22]و دارگوێزی هیندی ڕواون، لە کاتێکدا بەشی ناوەوەی دوورگەکە دارستانی بەپیت و تەڕوبڕ دایپۆشیوە کە پڕن لە (سەرخەس)[23]و چەندەها جۆری درەختی تایبەت بەو ناوچەیە کە لە ژمارە نایەن. ئەمڕۆکە بەدەر لەوانەش کۆمەڵێک ڕووەکی ناوچە گەرمەکانی پشتێنەی زەویش لێرەدا ڕواون، هەروەک (هیبیسکۆس) و (ئۆرکیدە). گوڵی نەتەوەیی دوورگەکانی (فیجی)یش، گوڵێکی تایبەتە و ناوی (تاجیموشیا)یە کە تەنها لێرە و لەسەر دوورگەی (ڤانوا لیڤو)ی تەنیشت ئێرە دەڕوێت.
بەشێوەیەکی گشتی لەم بەشەی جیهاندا، زۆربەی هەرە زۆری ڕەگەزە جیاوازەکانی گیانداران لەژێر ئاودا دەژین. تەنانەت پێویستت بەوە نییە بچیتە ژێر ئاوەوە تا کۆمەڵێک ماسیی هەمەڕەنگ و ژیشکی دەریا و گیاندارە نەرمۆڵەکان و ئیسفنجییەکان و مەرجان ببینیت. کاتێک باسی ژیانی دەریای خوارووی ئۆقیانووسی ئارام دەکەیت، یەکسەر زاراوەی وەک (هەموو ڕەنگەکانی پەلکەزێڕینە) و (تەختەی تێکەڵکردنی ڕەنگەکانی وێنەکێشێک) بە خەیاڵتا دێت و سەختە باسیان نەکەیت. بەتایبەتیش لە دەوروبەری دوورگەی تاڤیونیدا هەستم کرد ڕەنگی زۆربەی گیانەوەرەکان بە

فلّچەیەکی هەر زۆر تایبەتی و نایاب کێشراون.
گەر تەماشایەکی گیانەوەرە بڕبڕەدارە ڕەسەنەکانی دوورگەکەش بکەین، نموونەی هەموو پۆلەکانی تێدا دەبینین، بەڵام جگە لە باڵندە جۆراوجۆرەکان، لە هەر پۆلێک تەنها چەند نموونەیەکی کەمی ڕەگەزی ژێر پۆلەکانی لێرەدا دەژین. هەتا ئەو کاتەی لە ساڵی (١٩٣٦)دا بۆقە کێوییەکانیان هێنا تا قەلاچۆی مێش و مەگەزی قامیشی شەکرەکانی پێ بکەن، بۆقەکانی ئێرە نموونەی هەرە زۆری گیانەوەرە وشکاوەکییەکان بوون. هەرچی دەربارەی خشۆکەکانیشە، بەدەر لە مارمێلکەی (ئیگوانا)، چەند ڕەگەزێکی کەمی مار و شەوگەردی لێ بووە. ئەمڕۆکەش زۆرترین خشۆک کە بەرچاو دەکەوێت، جۆرە مارمێلکەیەکی جوانە و لە ماڵەکاندا دەژی کە پێی دەڵێن (هیمیداکتیلەس فریناتوس)، هەرچەندە بۆ یەکەمجار لە ساڵی (١٩٧٠)دا هێنایانە سەر دوورگەکانی فیجی. شەمشەمەکوێرەش لە بنەڕەتدا تەنها نموونەی گیانەوەرە شیردەرەکانی ئێرە بووە، بەڵام لە بەرامبەردا ڕۆڵێکی مەزنی لە سیستەمی ژینگەی ئێرەدا بینیوە، چونکە سەرەڕای گۆڕانکارییەکان، بەردەوام توانایەکی تایبەتی و بێ وێنەی خۆگونجاندنی هەبووە. پێش سێ هەزار و پێنج سەد ساڵ لەمەوبەریش، کە بۆ یەکەمین جار خەڵکی دەرەوە پێی خستە سەر ئەم دوورگانە، ڕەنگە لەگەڵ خۆیاندا جرجی (پۆلینیزی[٢٤])شیان هێنابێت.
کەواتە لە بنەڕەتدا گیاندارە بڕبڕەدارەکانی تاقیونی پێکهاتوون لە ماسی و بۆق و مارمێلکە و باڵندە و شەمشەمەکوێرە و دانیشتووانی فیجی، کە لە کاتی ئێستادا ژمارەیان دوانزە هەزار کەسە. بەو جۆرەش ئەم دوورگەیە بەشێوەیەکی هەر زۆر ڕوون و ورد وێنەیەکی نایابی گەشەکردنی گیاندارە بڕبڕەدارەکان نیشان دەدات. ئەگەر هەر هێندە بەئاگا بین لەم حاڵەتە، ئەوساکە هێندە سەخت نابێت بەلامانەوە کە لە شێوازی گەشەکردنی گیاندارە بڕبڕەدارەکانی سەر ئەم زەوییەمان تێبگەین، کە بە چەند قۆناغێکی ڕووندا تێپەڕیوە: لە ماسییەوە بۆ گیاندارە وشکاوەکیەکان و لە وشکاوەکیەکانیشەوە بۆ خشۆکەکان و لە دواجاریشدا لە خشۆکەکانەوە بۆ باڵندەکان و شەمشەمەکوێرە و خەڵکی فیجی.
تۆ قەت لەوەوپێش لە ڕوانگەیەکی پەتی گەشەکردنەوە بیرت لە ئەناتۆمی لەشی ئینسان کردۆتەوە کە چەندە (بەشێوە ئاسایی و باوەکەیدا ڕۆیشتوە)؟ مەبەستم لەوەیە خەیاڵت بۆ ئەوە چووە کە (کاتی خۆی) ئێمە چەندە لە گیانەوەرە بڕبڕەدارەکان چووین؟ گومانم نییە بیرت لە هاوشێوەی لەڕادەبەدەری نێوان شێوەی

هەیکەلی لەشی مرۆڤ و مارمێلکە و (قورِناویلکە)[٢٥] کردۆتەوە، هەروەها بۆ نموونە گەر بەراوردیان بکەین لەگەڵ فیل و حوشتردا، زۆر بەئاسانی دەبینین کە هەردووکیان لە بەری میوەیەکی سەیر دەچن کە زۆر زۆر لە دووری قەدی دارەکەوە کەوتبنە خوارەوە: ئەمە ئەگەر قەدی دارەکە بە خودی ئەو فۆرمە سەرەتاییە دابنێین کە بڕبڕەی پشت و چەڵەمەی شان و چوار پەل و پێنج پەنجەی دەست و قاچی هەبێت. شارێگای نێوان ژیانی پڕ لە هەڵبەزودابەزی ناو ئاوی سەردەمی (دێڤۆن) و تا دەگاتە ئەو کاتەی کە مرۆڤ پێی لەسەر مانگ دانا، جمەی هاتووە لە گیانەوەری وشکاوەکی وەک قورِناویلکە، لە گیانەوەری خشۆکی شیردەر ئاسایی و لە دواهەمین قۆناغیشدا پڕ بووە لە گیانەوەری شیردەر. بێگومان تۆڕێکی سەرسوڕهێنەری لاڕێ و هاتنەدەرەوەش لەو ڕێگایەوە هەبووە.

ئا لێرەدا هەست دەکەم گوێم لە دەنگی ناڕەزایی تۆیە و وەک کەسێک ناوزەدم دەکەیت کە لە بیروبۆچوونیدا مرۆڤ لە چەقدا دادەنێت و دەڵێیت: «بەر لە هەموو شتێک گەشەکردن نە بە هێڵێکی دیاریکراودا دەڕوات و نە بەرەو ئامانجێکی دیاریکراویش دەڕوات، گەشەکردنی ژیان زیاتر لە دەوەنێک یان سەلکە کەلەرمێک دەچێت وەک لەوەی لە چەند هێڵ و قەدێک بچێت». لەسەروو ئەوەشەوە من بە چ هەقێک لەناو ئەو هەموو پۆلی گیانەوەرانەدا ناوی ڕەگەزێک یان دوو ڕەگەز بهێنم و بڵێم ئا ئەمەیان لەچاو ئەوانی تردا زیاترێک دیارە یان نموونەیەکی باوترە؟ ئەوەی کە منیش لە بنەڕەتدا دەمەوێت بیڵێم تەنها ئەوەیە کە هەست دەکەم تاڕادەیەک خزمایەتییەکی زیاترم لەگەڵ مارمێلکەدا هەبێت وەک لەو خزمایەتییەی کە لەگەڵ گیانەوەرێکی شیردەری وەک شەمشەمەکوێرەی میوە یان نەهەنگی شیندا هەمە. ئێ خۆ من نە لە شەمشەمەکوێرە و نە لە نەهەنگی شینیشەوە هاتووم، هەروەها نە لە زەڕافە و نە لە مەیموونی نارنجی شێوە مرۆیشەوە هاتووم. بەڵکو من ڕاستەوخۆ نەوەی ماسییەکی پەڕەکەداری پەل پەلم، ئینجا نەوەی گیانەوەرێکی وشکاوەکیم، دواتریش نەوەی گیانەوەرێکی خشۆکێکی شیردەر ئاسام.

ژمارەی کەمی گیاندارە بڕبڕەدارەکانی سەر دوورگەکە، وای لێ کردم دوورگەکە وەک تەنها پۆستەرێکی زیندووی گەشەکردنی ژیانی سەر زەوی ببینم. خۆمم لە هۆڵی نمایشی داروینیزمدا بینییەوە. لەم کاتەدا تەنها بیر لە چوار پەلی بۆق و مارمێلکە و شەمشەمەکوێرە و خەڵکانی فیجی ناکەمەوە، کە هەموویان هەیکەلێکی بنەڕەتی پێنج پەنجەییان هەیە، بەڵکو بەڕاستی پێ و پەنجەی قاچی لەڕادەبەدەر درێژی

خەڵکی فیجی، کتومت منی خستە سەر ئەو باوەڕەی کە هەروەک پەلی مارمێلکەکان نایاب و سەرنجڕاکێشەرن.
دەکرێت زیاترێک دەربارەی خەڵکانی فیجی باس بکەین و بڵێین وەک سەرچاوەیەکی خواردنی گۆشت، جگە لە جرج و شەمشەمەکوێرە، تەنها گۆشتی یەکتریان لەبەردەستابووە. لەوەوپێش لەنێوانیاندا (کانیبالیزم) هەر زۆر بەربڵاو بووە و هەتا کۆتایی سەدەی نۆزدەش بەردەوام بووە، لێرەدا ئەو سەربازە یابانییە حساب ناکەم کە لە کاتێکی زۆر نوێی وەک کۆتایی جەنگی جیهانی دووهەمدا، (ڤیلیام لاماسالاتۆ)ی خەڵکی فیجی خواردی. بەتایبەتی ئەم هۆکارە وای کردووە کە دارستانە پڕبارانەکانی و ژینگەکەی بێ گۆڕانکاری وەک خۆیان بمێننەوە، لێرەشدا بە پلەی یەکەم بیر لەوە ناکەمەوە کە ژمارەی دانیشتووانیان بەهۆی شتێکەوە کەمی کردبێتەوە کە دەکرێت ناوی بنێین (خۆراکی دوولایەنە یان هاوبەش)، بەڵکو گرنگترین شت لێرەدا ئەوەیە کە کانیبالیزم بەشێوەیەک لە شێوەکان بۆتە هۆی پاراستنی ژینگە و داگیرکەرانێکی وەک پیاوی سپییان دوور خستۆتەوە. لە ساڵی (١٦٤٣)دا (ئابیل تاسمان) و هەروەها لە ساڵی (١٧٧٤)دا (جەیمس کوک) بە کەشتی بەلای ئەو دوورگانەدا تێپەڕیون، بەڵام هیچیان نەیانوێراوە لەویادا لەنگەر دابنێن و پێ بخنە ناو دوورگەکانەوە، چونکە دەنگۆی ئەوەیان بیستبوو کە خەڵکی ئەوێ (گۆشتی مرۆڤ دەخۆن). لە ساڵی (١٧٨٩)شدا لەدوای یاخیبوونێک لەناو کەشتی (بۆنتی)دا، کابتن (بلای) و سەرهەنگەکانی بە بەلەمێکی بچکۆلە بەلای چەند دوورگەیەکی ئەو ناوەدا ڕۆشتوون، هەرچەند هیلاک و شەکەت بوون و برسیشیان بووە، بەڵام نەیانوێراوە تەنانەت گوێزێکی هیندیش بدزن. لە سەرەتای سەدەی نۆزدەدا سەرەتای کۆچی ئەوروپییەکان بەرەو مەملەکەتی دوورگەکان دەستی پێ کرد. دەڵێن هەندێک پیاوانی ئایینی بوون و بە مەبەستی بڵاوکردنەوەی دین گەشتبوونە ئەوێ، پێشوازییەکی گەرموگوڕیان لێ کردبوون و بەڕاستی (خواردنێکی پیاوانە)شیان دەرخوارد دابوون. ئەو ناوە زۆر بەوردی هەڵبژێردراوە، چونکە لەدوای نانخواردنەکە زۆر بە جیددی پێیان وتبوون کە ژەمە خواردنی پێش نانخواردنی سەرەکیان مەمکی ئافرەت بووە و خواردنی سەرەکیش ڕانی پیاو و دوای نانخواردنی سەرەکیش دەماغی مرۆڤیان دەرخوارد داون، کە خەڵکانی ئەوێ چەتاڵێکی چوار دانییان بۆ داهێناوە تا ئاسانتر بخورێت. چ ئایرۆنییەکی سەیرە کە یەکێک لە پیاوە ئایینییەکان ناوی (پاستۆر بەیکەر) دەبێت و پاشان لە ساڵی (١٨٦٧)دا خۆی دەبێتە خۆراکی مرۆڤ. دواتریش تۆپ و فیشەک و باروت گەیشت و ئینجا پاشماوەی مێژووی

کۆلۆنییەکان دەستی پێ کرد. یەکەمین شت کە ئەورووپییەکان لەسەر دوورگەکانی فیجیدا کردیان ئەوە بوو کە کەوتنە بنەبڕکردنی داری بەنرخی (سەنەڵ). دواتریش بەرەبەرە شەست هەزار کەسیان لە هیندستانەوە هێنا تا لە کێڵگەکاندا کار بکەن، هەر لەبەر ئەمەشە ئەمڕۆکە زیاتر لە نیوەی دانیشتووانی مەملەکەتی دوورگەکان هیندین. ئەو کۆچە گەورەیە کۆمەڵێک پەتا و نەخۆشیشی لەگەڵ خۆیدا هێنا، لە سەرەتادا نەخۆشی کۆلێرا کە بەدوای خۆیدا چەندین دوورگەی بەچۆڵ و هۆڵی جێهێشت، وە لە ساڵی (١٨٩٠)یشدا نەخۆشی سوورێژە یەک لەسەر سێی دانیشتووانی دوورگەکانی فیجی لەناوبرد.

شتێک بە خەیاڵمدا دێت و بە بڕوای من پارادۆکسێکە و شایانی تێڕامانە: هاوسەنگی ژینگە لەسەر تاکوتەرای دوورگەکانی فیجیدا تاڕادەیەک وەک خۆی ماوەتەوە، بەڵام هۆکەی دەگەڕێتەوە بۆ کانیبالیزم، یان وردترێک بیڵێم بەهۆی ئەوەوە ماوەتەوە کە خەڵکی سپیپێست نەیانوێراوە پێ لەسەر ئەو دوورگانە دابنێن. ئا ئەمە خۆی بۆ خۆی پارادۆکسێکە، هەرچەندە تا ئەندازەیەک لایەنگری ئەوەم کە ڕەگەزێکی گیانەوەر لە کاتی پێویستیدا وای بەباش بزانێت سوود لە یەکتری ببینێت وەک لەوەی هەوڵ بدات هەموو ڕەگەزەکانی تر قەڵاچۆ بکات. هەڵبەتە من بەوە ڕازیم کە کانیبالیزم بەشێوەیەک لە شێوەکان شکاندنی ئەو شتەیە کە ئێمە پێی دەڵێین (هەقی سروشتی)، بەڵام هاوکات بێباکی و خەمساردی جیهانی ڕۆژئاواش بەرامبەر بە ژینگە بەهەمان شێوە شکاندنێکی ڕوون و ئاشکرای ئەو شتەیە کە ناوی دەنێین (بەرپرسیارێتیی مرۆیانە). مێژووی زاراوەی (هەقی سروشتی) بۆ زیاتر لە دوو هەزار ساڵ لەمەوبەر دەگەڕێتەوە، و پرسیارەکەی منیش هەر زۆر ساکارە و بەم شێوەیەیە:

کەی هێندە پێدەگەین کە زاراوەی (بەرپرسیارێتیی سروشتی) بەکار بهێنین؟

خۆ من تازە بەشێوەیەکی سەرپێیی ناوی ئەو دوو هەزار ساڵەم هێنا، لەبەرئەوە لە کۆتاییدا دەمەوێت ئاماژە بۆ پارادۆکسێکی تر بکەم کە بەهەمان شێوە مایەی تێڕامانە و پەیوەندی بە (بەهەشتی دوورگەکانی فیجی)یەوە هەیە. چارەنووس وای کردووە کە ئەم دوورگەیە بکەوێتە سەر هێڵی (بەرودوا)[٢٦]، و هەر بە ڕێکەوتیش کتومت (١٨٠) پلە لە (ڕوانگە)ی مەلەکی گرینیچەوە دوورە. زۆر بەوردی واتە نیوەی دوورگەکە لە ئەمڕۆدا دەژین و نیوەکەی تریشی لە دوێنێدا. یان بێگومان بەپێچەوانەوە: نیوەی دوورگەکە لە ئەمڕۆدا دەژی و نیوەکەی تریشی لە بەیانیدا دەژی. من بۆیە ئەمە وەک شتێکی هەر زۆر گرنگ باس دەکەم، چونکە دوورگەی

تاڤیونی یەکەمین شوێنی زەویە کە خەڵکی تێدا بژی و پێ بنێتە ناو هەزارەی سێهەمەوە. ئەمەش نابێت هەروا بەئاسانی تێپەڕێت.

***

ئەو ڕۆژە من تەنها کەس نەبووم کە بە لاندرۆڤەرەکە گواستیانمەوە، دوو میوانی تریش لەگەڵمدا بوون و ئەوانیش هەر بۆ هەمان شوێن دەچوون. لەو کاتەدا کە لە فڕۆکەخانەکەدا چاوەڕوانیی جانتاکانمان دەکرد، کەمێک پێکەوە قسەمان کرد، هەروەها لەو کاتەشدا کە بە سەیارەکە چەند کیلۆمەترێک گواستیانینەوە، نەختێک یەکتریمان دواند. یەکێکیان ناوی (لاورا) بوو و زۆر بەپەرۆشەوە لە فڕۆکەکەدا وا خۆی نیشانی کاپتنە پیرەکە دا کە گرنگی بە فڕین و فڕۆکە دەدات، منیش دانیشتبووم و تابلۆ لەدوای تابلۆی ئەلبومی ئەم زەویەم هەڵدەدایەوە و تەماشام دەکردن، هەر لە دابەشبوونی یەکەمین خانەوە لە سەردەمی هەرە دێرینی (پریکامبرییان)[27]ەوە هەتا ئەم کاتەی کە پێم بەخشراوە لەسەر ئەم زەویە بژیم.

لاورا خەڵکی (ئادیلاید) بوو، ئافرەتێکی سەرنجڕاکێش بوو و تەمەنی لە کۆتایی بیستەکاندا بوو. پێستێکی ئاڵتونی و پرچێکی ڕەشی درێژی پێوە بوو، هەر ئەوەش وای لێ کردبوو کەمێک لە کچە هیندییەکان بچێت. ئەو کچە نیشانەیەکی زۆر تایبەتی پێوە بوو: چاوێکی سەوز و چاوەکەی تری قاوەیی بوو. ڕەنگە نەختێک سەوزایی لە چاوە قاوەییەکەیدا بەدی بکرایە و کەمێکیش ڕەنگی قاوەیی لە چاوە سەوزەکەیدا ببینرایە، بەڵام بەڕاستی چاوێکی سەوز و ئەوی تری قاوەیی بوو، ئەوەش سیفەتێکی بۆماوەیی هەر زۆر دەگمەنە و بیرم نایەت لەوەوپێش لە ژیانمدا شتێکی وەهام بینیبێت. جگە لەوە شتێکی تریش لەو کچەدا سەرنجی ڕاکێشام: لەسەر کۆڵەپشتەکەی کە بەشێوەیەکی نایاب لە قوماش دروست کرابوو، نیشانەیەکی (ڕێکخراوی جیهانی پاراستنی ژینگە)ی پێوە بوو. لاورا کەسێکی هێندە دڵفڕێن و سەیر دەهاتە بەرچاو، کە ویستم لێی نزیک ببمەوە، بەڵام ئەو گرنگییەکی زۆری بەو یەکترناسینە سەرپێیانەی ناو فڕۆکەخانەکان نەدا، لەبری ئەو جۆرە شتانە کتێبی (ئەستێرەی گەڕۆکی تاقانە)ی بەدەستەوە بوو و سەقاڵی خوێندنەوە بوو، زانیاری دەربارەی ئەو دوورگەیە دەخوێندەوە کە سەفەری بۆ دەکرد.

ئەو کەسەی تریش کە لەگەڵماندا بوو ناوی (بیڵ) بوو، وابزانم ناوی باپیرەشی (پێوتین)، بەڵام من دەمێکە بیرم چۆتەوە. تەمەنی لە کۆتایی پەنجاکاندا بوو، خەڵکی ناوچەی (مۆنتێری) کالیفۆرنیا بوو. دیاربوو کەسێکی دەوڵەمەندی تازە

خانەنشینکراو بوو و تامەزرۆی بینینی دونیا بوو. هەر زوو وێنەیەکم دەربارەی هاتە بەرچاو و وەک نموونەی کەسێکی تایبەت و باوی باکووری ئەمریکا هاتە بەر دیدەم، کە تا بۆی بلوێت دەیەوێت چێژ لە بینینی دونیا ببینێت بەبێ ئەوەی پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکانی وەک هاوسەر و منداڵ و برادەری نزیک ببنە ڕێگری. بیلْ زیاتر لە کوڕێکی دڵخۆشی ئەو خوایە دەچوو. لەیادمە لەویادا بیرم لەوە کردەوە کە هەندێک کەس قەت پێناگەن، بەڵکو تەنها دەوڵەمەنتر دەبن - زۆرجاریش لەڕادەبەدەر بەتەمەن دەبن و تەواو.

ئەو پیاوەی کە هات بە شوێنماندا ناوی (جۆن) بوو. پیاوێکی چوارشانە بوو و تەمەنی لە ناوەڕاستی شەستەکاندا بوو، بەلایەنی کەمەوە باڵای، بەبێ پێڵاوەکانی، مەترێک و نەوەد سانتیمەتر دەبوو، قژێکی ماشوبرنجی و دوو لاجانگی نیمچە سپیشی پێوە بوو. دواتر لە هەمان ڕۆژدا بۆم دەرکەوت کە کارمەندێکی (ماراڤیو) نییە، بەڵکو ئەویش وەک ئێمە میوان بوو، هەر ئەوەندە بوو لەبەرئەوەی باری کارمەندانی ئەوێ نالەبار بووبوو، پێشنیاری کردبوو لەبری ئەوان ئەو دوو کلیۆمەترە لێبخورێت تا فرۆکەخانەکە و ئێمە بگەیەنێتە (ماراڤیو). وا هاتە بەرچاوم پەرۆشی ئەوە بێت کە بە زووترین کات وێنەیەک دەربارەی میوانە نوێکان لەلای خۆی بنیات بنێت.

هەر ئەوەندەی سەیارەکە بە لاڕێکەدا بەرەو (ماراڤیو پلانتەیشن ڕیسۆرت) وەرچەرخا، یەکسەر جوانی ئەو ناوە سەرسامی کردم. شوێنی گەشتەکەمان لە دە کوخ و بینایەکی سەرەکی پێکهاتبوو، هەموو بەشەکانیش لەناو دارستانێکی دێرینی گوێزی هیندیدا بەشێوەیەکی دوور لەیەک دروست کرابوون. کوخەکان، یاخود هەروەک بە زمانی ئێرە کە پێی دەڵێن (بوری)، لەسەر تەپۆڵکەیەک دروست کراون کە بەسەر دەریادا دەڕوانێت و کەوتوونەتە نێو دەوەنی چڕ و داری گوێزی هیندیی لارەوە، بەو شێوەیەش لە کوخێکەوە کوخێکی تر نابینیت، بەلایەنی کەمەوە لە دەرگای کوخێکەوە دەرگای کوخێکی تر نابینرێت. بینا سەرەکییەکەش لەسەر دەستووری خانەیەکی کۆبوونەوەی ئاسایی سەر دوورگەکە دروست کراوە، دیوارەکانی بەرز و کراوەیە و سەقفەکەشیان بە گەڵای دارگوێزی هیندی داپۆشیوە. ئەرزی هۆڵە گەورەکەش تەختەڕێژ کراوە، بەبێ هیچ دیوارێک لەنێوانیاندا، شوێنی پێشوازی و باڕ و چێشتخانەیەکی لێبوو - کە ناوەکەی لەبەرگوێدا دەزرنگایەوە، پێیان دەگوت (وانانانڤیو)- هەروەها شوێنێکی گەورەشیان بۆ سەماکردن تەرخان کردبوو.

ڕێوڕەسمی ناونووسینمان لە بەشی پێشوازیدا کۆتایی هات، دواتر لە باڕەکەدا پێشوازیمان لێ کرا و هەریەکەو گوێزێکی هیندیان پێشکەش کردین کە قامیشێکی تێدا بوو و زۆر بەجوانی بە گوڵی تۆڵەکە ڕازێنرابووەوە. لەویادا کەمێک دانیشتین و نەختێک پێکەوە قسەمان کرد، هاوکاتیش هەموو ئەو کارمەندانەی کە ئەو پێشنیوەڕۆیە لەوێ بوون، یەکەیەکە بەسەرە هاتن و بەخێرهاتنیان کردین. دەیانوت (بولا! بولا!)، ئەو وشەیە زۆرجار لەسەر دوورگەکانی فیجی دووبارە دەکرێتەوە، تاڕادەیەک وەک دروشمێکی لێهاتووە. بەدەر لەوەش لەچاو هەمان وشەی زۆربەی زمانەکانی تردا مانایەکی فراوانتری هەیە. وشەی (بولا) هەر لە (سەلام) و (ئەم کاتەت باش) و (ڕۆژباش)ەوە دەگرێتەوە هەتا (چۆنیت) و (ڕۆژێکی خۆشت بۆ دەخوازم) و (خواحافیز)یش.

هەموویان دەیانزانی کە من ناوم (فرانک)ە و کە (بیڵ) ناوی (بیڵ)ە و (لاورا)ش ناوی لاورایە. هەر دەتوت لە ماوەی چەند حەفتەی پێشوودا هیچ شتێکیان نەکردووە، تەنها ئەوەندە نەبێت کە خۆیان بۆ پێشوازیکردنمان ئامادە کردبێت. هەستمان کرد چەند کەسایەتییەکی تایبەتی و دەگمەن و هەڵبژێردراوین و تەنها بۆ ئەو مەبەستە ڕوومان لە تاقیونی کردووە کە ڕۆحمان پاک بکەینەوە و دیسانەوە وەک کەسایەتییەکی نوێ لەدایک ببینەوە. بیڵ هێندەی بۆ دەرکەوت کە وشەی (ماراڤیو) بە زمانی فیجی واتە (هێمن و ئارام). (لاورا)ش دەیویست بزانێت چ کاتێک و چ شوێنێک گونجاوترە تا توتییە بەناوبانگەکانی دوورگەکە ببینێت.

منیان بەلای مەلەوانگەیەکدا برد و دواتر بەناو کۆمەڵێک داری گوێزی هیندییدا گەیاندمیانە (بوری) ژمارە سێ، هیچ شتێکی وام نەکرد شایانی باس بێت، کوخەکە بەرهەیوانێکی هەبوو کە سەری گیرابوو، لەویادا دانیشتم و زۆر بە قووڵی و تێڕامانەوە تەماشای دەریام کرد، چێژم لەو سەرچاوە سروشتییە بینی کە نموونەیەکی یەکجار کەمی لە جیهاندا ماوەتەوە. لەویادا بیرم لە بێدەنگی کردەوە، ئەوەش شتێکە کە مرۆڤ تا ئەندازەیەک بنەبڕی کردووە.

وا دیسان خۆمم لەسەر زەوی بینییەوە، هەرچەندە نامەوێت دان بەوەدا بنێم کە نیشتبوومەوە و بەهیچ جۆرێکیش نامەوێت بڵێم کە سەفەری فڕۆکەکەم لەیاد کردووە، تەنانەت بەوەش دڵم ئاو ناخواتەوە کە بەدڵنیاییەوە بزانم شوێنێکم لەو فڕۆکەیەدا گرتووە کە بۆ (نادی) دەگەڕێتەوە. من خۆمم لە حاڵەتێکی نائارام و شڵەژاودا بینییەوە، لە حاڵەتێکی دەروونی ئاوهادا بووم کە هەرگیز قەناعەتم

نەدەکرد لەتوانامدا بێت بەسەریدا زاڵ ببم. دەتوت سەرخۆشم و چێژ لە بێ خەمی و ڕوونبینین دەبینم، ڕێک وەک ئەو حاڵەتەی کە ئەلکهول دەیبەخشێت، هاوکاتیش سوور دەمزانی ئەو کەڕەتە شەرابێکی وام خواردۆتەوە کە هەرگیزا و هەرگیز لە جەستەمدا دەرناچێت.

من لەوەوپێش بیستوومە کە هەندێک پزیشک تووشی نەخۆشی (واسواسی) دەبن، هەروەها بیستوشمە کە هەندێک شاخەوان لەپڕێکدا تووشی حاڵەتێک دەبن و لە بەرزایی دەترسن، ئەوەشم بیستووە کە هەندێک قەشە باوەڕی منداڵییان لەدەست دەدەن، بەڵام لەویادا خۆشم شتێکی وەک ئەوانەم بەسەردا هات. من زانایەکی پالیۆنتۆلۆجی بووم و لەناکاودا لە ئێسقان دەترسام. زانایەک بووم لە بواری گیانەوەراندا و نەمدەتوانی دان بەوەدا بنێم کە گیانەوەرێکم. زانایەکی زیندەوەرناس بووم لە بواری گەشەکردنی ژیاندا و بۆم سەخت بوو هێندە ببینم کە کاتی منیش لەسەر ئەم زەویە کاتێکی دیاریکراوە. نیوەی ژیانم لە خوێندنی ئێسقانی بۆماوەیی گیاندارە بڕبڕەدارەکاندا بردەسەر، بەوپەڕی پەرۆشییەوە پاشماوەی گیانەوەرانی مردووم شی دەکردەوە، کەچی ڕێک خۆم لەوە دەترسام کە ڕۆژێک لە ڕۆژان ناچار دەبم و دەبێت ئەم پاشماوە کەمەی خۆم بەجێ بهێڵم، پاشماوەیەک کە لە هەمان ئەو ماددەیە پێکهاتووە کە خۆم چێژم لە وردبوونەوەی دەبینی. من تێکشکابووم، بەهیچ جۆرێکیش هەستم نەدەکرد حاڵەتێکی وەسوەسە بێت، بەڵکو وەک بینینێکی ڕوون و پەتی دەهاتە بەرچاوم. کاتی خۆی بودا پیاوێکی نەخۆشی بینی، ئینجا پیاوێکی پیر و دواتریش تەرمێک. منیش لە کاتی منداڵیمدا لەناو دارستانێکدا لە کارمامزێکی مردارەوەبوو هەڵکەوتم، وا لەوێشدا برینە کۆنەکەم دیسانەوە سەری هەڵدایەوە.

سەرلەنوێ فیلمی دوورودرێژی سەرهەڵدانی ژیانی سەر زەویم گەڕاندەوە بۆ دواوە و خستمەوە سەر چوار ملیارد ساڵ لەمەوبەر. لێرەدا مەبەستم لە مێژووی خۆمە، مەبەستم لە باوباپیرانی خۆمە و تەنها بیر لەوە ناکەمەوە کە من ڕاستەوخۆ وەچەی چەند خشۆکێکی بچکۆلەم کە لە گیانەوەری شیردەر چوون و دوو سەد ملیۆن ساڵێک لەمەوبەر لەسەر ئەم زەویە ژیاون، بەڵکو زیاترێک دەچمە دواوە و دەگەڕێمەوە سەر خشۆکێکی سەرەتایی، گیانەوەرێکی وشکاوەکی، ماسییەکی پەڕەکەداری پەلپەل، ئینجا گیانەوەرێکی بێ بڕبڕە و دواجاریش دەگەڕێمەوە سەر یەکەمین خانەی زیندووی سەر ئەم گۆی زەوییە. من هەر ئەوەندە نییە کە وەچەی

ژیانێکی سەرەتایی بم کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ چوار ملیارد ساڵ لەمەوبەر، بەڵکو هاوکات هەموو جینەکانی ناو هەر خانەیەکی لەشیشم کتومت هەمان تەمەنیان هەیە. من دواهەمین ئەڵقەی زنجیرەی دابەشبوونی بەردەوامیی خانەکانم، کە کەم تا زۆر بە پرۆسەیەکی بە بەرنامەی بیۆکیمیاییدا ڕۆیشتووە و دواجاریش بە پرۆسەیەکی بایۆلۆجی مۆلیکیولیدا تێپەڕیووە. سەرم لەوە سوڕما کە من بەشێوەیەکی مەبدەئی هیچ جیاوازییەکی ئەوتۆم لەگەڵ ئەو ئۆرگانیزمە یەک خانەیی و سادانەدا نییە کە لە بنەڕەتدا خۆمی لێوە هاتووم. بەشێوەیەکی وردتر بیڵێم من تەنها کۆلۆنییەکی خانەییم و هیچی تر، هەڵبەتە تەنها یەک جیاوازیی گرنگم هەیە کە خانەکانی من لە چاو خانەکانی بەکتریایەکدا زۆر زیاترێک کامڵترن و زۆرترێکیش لە هاوئاهەنگی و هاریکاریدا پێکەوە دەژین، خانەکانی من تایبەتمەندترن و بەو شێوەیەش توانایەکی سەرەکی دابەشکردنی بەرپرسیارێتیان هەیە، بەڵام خۆ منیش لە خانەی تاک تاک پێکهاتووم و هەریەک لەو خانانە بەدەوری شتێکی بچکۆلەی هاوبەشدا هەڵچنراون، کتومت مەبەستم لە کۆدە جینییەکانە، دیسانەوە مەبەستم لە خودی ئەو پلانە جینییەیە کە لەناو هەریەکێک لە خانەکانی لەشدا چێنراوە. کۆدی (DNA) تەنها شتێکی کەڵەکبووی میکرۆسکۆبییە، کە لە ئەنجامی گەمەیەکی هەڵەشەی سەدان ملیۆن ساڵی ترشی ناوەکییەوە سەری هەڵداوە. لەگەڵ ئەوەشدا: لە ڕوانگەیەکی جینییەوە من تەنها بەرهەمی دابەشبوونێکی مەزنی دوو خانەی وەک یەکم و هیچی تر، بەڵام ئەو دوو خانە مەزنەی کە توانای دابەشبوونیان هەبووە، چۆن توانیویانە پەیوەندی بەیەکەوە بکەن؟ بەدەر لەوەش چۆن لە توانایاندا بووە کە بەپێی سوودی گشتی هەموو خانەکان، جینەکانی خۆیان چالاک یان ناچالاک بکەن؟ ئەوە یەکێکە لە هەرە گەورەترین نهێنییەکانی سەر ئەم زەوییە.

ئەو هێزە سەرەکییەی پرۆسەی گەشەکردنی ژیان بەڕێوە دەبات، لەو حەقیقەتە سادەیەدایە کە تەنها بەشێکی کەمی هەموو نەوەیەکی نوێ توانای گەورەبوون و زاوزێیان هەبووە. ئەگەر وا نەبووایە، ئەو کاتە ئەو شتە ڕووی نەدەدا کە پێی دەگوترێت هەڵبژاردنی سروشتی، وە ئەگەر ئەو هەڵبژاردنی سروشتیەش نەبووایە، ئەوسا هیچ گەشەکردنێک ڕووینەدەدا. بڕبڕەی گەشەکردنی ژیان لەوەدایە کە بەردەوام کۆمەڵێک لە نەوەی نوێ دەفەوتێت و هاوکاتیش بەردەوام شەڕێکمان هەیە لەپێناوی مانەوەدا، بەڵام وا من لێرەدا دانیشتووم. وا من لەسەر یەکێک لە دوورگەکانی خوارووی ئۆقیانووسی ئارامدا دانیشتووم، هەر دەڵێیت بەشێوەیەکی

یەکجار دەگمەن لەو ڕێسایە لامداوە کە دەڵێت: «ناکرێت هەزار کەڕەت لەسەریەک لە یانسیبێکدا بیبەیتەوە». من -هەڵبەتە مەبەستم لە ڕەچەڵەکمە، لە باوپیرانی هەرە گەورەمە، مەبەستم لەو زنجیرەیەی خۆمە کە پڕ بووە لە پیتاندنی هێلکە و دابەشبوونی خانە- من چەندەها ملیۆن نەوەیە ماومەتەوە. بەرلە هەموو شتێک لە هەموو یەکێک لەو نەوانەدا توانیومە خانەکانم دابەش بکەم، دواتریش زاوزێ بکەم، هێلکە بپیتێنم یاخود هێڵکە بەرهەم بهێنم و لە دواجاریشدا منداڵی نوێم خستۆتەوە. ئەگەر تەنها یەکێک لەو ملیۆنەها نەوەیەی پێشووم، هەر بۆ نموونە یەکێک لەو وشکاوەکیانەی کە ژیانێکی تەڕی لە سەردەمی دێڤۆندا هەبووە، یاخود یەکێک لەو خشۆکانەی کە لەنێوان (گوڵداڕوو)[28]ەکاندا گاگۆڵکێی کردووە لە سەردەمی (پێرمیەن)[29]دا، ئەگەر تەنها یەکێک لەو نەوە دێرینانەم بەرلەوەی توانای پیتاندنی پێ بگات بمردایە - هەروەک ئەو کارمامزە نەگبەتەی کە لە (فێستفۆلد)ی نەرویجدا مرد- ئەوا ئێستاکە لەم بەرهەیوانەدا دانەدەنیشتم. بەیارمەتیت لێرەدا پێم مەڵێ کە لە ڕوانگەیەکی دوورەوە دەڕوانم، چونکە بەڕاستی دەتوانم زیاترێک بگەڕێمەوە دواوە: ئەگەر دوو یان سێ ملیارد ساڵ لەمەوبەر تەنها یەک گۆڕانی کتوپڕی کوشندەی بایۆلۆجی لە دابەشبوونی خانەکانی بەکتریایەکی دیاریکراودا ڕووی بدایە، ئەوا قەت چاوم بە ڕووناکی ئەم ڕۆژە نەدەکەوت. ئێ من خۆم بە ڕەچەڵەک لەو تاکە بەکتریا تایبەتەوە هاتووم، مەبەستم لەوەیە تەنها و تەنها لەو خانە دیاریکراوەوە هاتووم، با ناوی بنێین خانەی (ZYG ٣١، ٥١٤، ٧١٨، ١٢٠، ٢١١، ٢١٢، ٠٩١، ٥١٤) کە لەناو کۆلۆنی خانەی (KAR ٢٥١، ٥٢١، ١١٨، ٥١٢، ٣٩١، ٤١٤، ٥١٨) دایە و کەوتۆتە سەر پلەی (١٨٠)ی هێڵی درێژی زەوی، چەند پلەیەک لەسەرووی (سورگەی کارژۆڵە)[30]وە. ئەوە تاکە دەرفەت بوو کە بە من بەخشرا و هەرگیزاو هەرگیزیش شەنسێکی ترم پێ نابەخشرێتەوە. بەو شێوەیەش هەر تا ئێستاکە چەندەها ملیۆن کەڕەت لە مەترسیی گەورە گەورەی فەوتان قورتار بووم، بەڵام ئەوە شتێک نییە بیری لێ بکەمەوە، چونکە نەوەکانی پێشووترم هەمیشە توانیویانە خۆیان بپارێزن - بەڵێ ڤیرا، بەڕاستی هەمیشە توانیویانە لە پاش خۆیان بۆماوە جینییەکان بۆ نەوەی دواتریان بە سەلامەتی بگوێزنەوە، هەمیشە بە سەلامەتی داویانە بە نەوەکانی دوای خۆیان، هەرچەندە ماوە ناماوەیەک گۆڕانکارییەکی هەر زۆر بچکۆلەی بەسوودیان بەسەر مادە بۆماوەکەدا هێناوە. بەو جۆرەش هەمیشە قۆناغی نوێی بەردەوامی هاتۆتە ئاراوە، چونکە هەتا گەیشتە سەرەی من، بەپێچەوانەی هەموو

ئەو گریمانانەوە کە ناچنە ئەقڵەوە، بە چەندەها ملیۆن قۆناغدا ڕۆیشتووە، بەڵام قۆناغێکی نویٚ هاتە ئاراوە و بەدواشیدا قۆناغێکی تریش سەری هەڵدا، وە ڕەنگە نەوەی داهاتووش فریای ئەوە بکەوێت کە گەورە ببێت، هەرچەندە گەر ئەوە ڕوویدات سەرمان دەسوڕمێت. بەڕاستی بەو شێوەیە بووە، بەو جۆرە کەڕەت لەدوای کەڕەت ڕوویداوەتەوە، چونکە هیچ کەسێک لەوانە نەکەوتوونەتە تەڵەکەوە، هەموویان پارێزگاریان لە خۆیان کردووە و ماددەی بۆماوەی جینەکانیش بە سەدان ملیۆن جار لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی تر گواستراوەتەوە: هەر بەو بەڵگەیەی کە من ئێستاکە لێرەدا دانیشتووم.

من بەو شێوەیە بیرم دەکردەوە، لەسەرێکیشەوە خەتای هێڵی ئاسمانی (سەن فلاوەر) بوو، چونکە فڕۆکەیەکی ئەو هێڵی ئاسمانییە قوماری بە ماددەی بۆماوەی کەڵەکەبووی منەوە کرد، ئەو ماددەیەی کە تەمەنی دەگەڕێتەوە بۆ ملیۆنەها ساڵ لەمەوبەر. لە دڵی خۆمدا وتم: «باش چوومەتە ناو ئەندێشەی قووڵی ئەم پێش نیوەڕۆیەوە»، ئەو کاتەی دوو ماسیی پەڕەکەداری پەل پەل کە باپیرە و داپیرە هەرە هەرە هەرە گەورەکانی منن —وە بە ڕێکەوت دراوسێی یەکتری بوون — لە سەردەمی دێڤۆندا لە دەریاچەیەکی بچکۆلەوە بۆ دەریاچەیەکی بچکۆلەی تر هەڵدەبەزینەوە تا لەبەر کەمی ئۆکسجین نەخنکێن، بەڵام —ئا لێرەدا بەشە ناخۆشەکە دێت— ئەو سەفەرە دوورودرێژەی ئەو ماددە بۆمایەوە و لەهەمانکاتیشدا ئەو سەفەرە نیمچە ڕوون و ئاشکرا و سەختە بەرەو کۆتایی دەچوو. ئەو یاری دۆمینۆیە بێ کۆتاییەی کە ماوەی سێ ملیارد ساڵ بوو بەبێ ئەوەی بۆ چرکەیەکیش بوەستێت بەردەوام بوو و دانە بەدوای دانەیدا دەکەوتن، وا دواجار بە دیوارێک گەیشت و منیش کەوتبوومە کۆکردنەوەی پارچەکانی.

هەستم دەکرد وەک ئەزموون و مێژوو زۆر دەوڵەمەند بم. ژمارەی نەوەکانی پێشووم لە سەردەمی وشکاوەکییە سەرەتاییەکانەوە چەندە دەبوون؟ ئەی هەر لەگەڵ یەکەمین پیتاندنی هێلکەوە، چەندە جار دەتوانم دابەشبوونی خانەکان بخەمە سەر مێژووی خۆم؟ ڕابردووم هێندە دەوڵەمەندە تا ئەندازەیەک دەمترسێنێت، بەڵام هیچ پاشەڕۆژێکم نییە. دواتریش دەبمە هیچ.

دانیشتبووم و بیرم لەو بابەتانە دەکردەوە، ڕەنگە شوێنی خۆی بێت بڵێم لە ڕاستیدا بیرم لە هەردووکمان دەکردەوە. بێگومان بیرم لەوەش کردەوە کە چیتر منداڵم نییە. ئەو ڕاستییە هێندەی تر ئازاری دامێ کە من هەتا ئێستا لەناو سەدان ملیۆن نەوەی

پێشوومدا، یەکەمین نەوەم کە منداڵم نییە. وەک دەزانیت حاڵەتی منداڵنەبوون سیفەتێکی بۆماوە نییە، بەڵکو یەکێکە لە یاساکانی گەشەکردنی بایۆلۆجی: نەزۆکی سیفەتێکی هێندە بێکەڵکە کە یەکسەر جودا دەکرێتەوە. تەنها ئەو کەسانەی کە منداڵیان دەبێت، دەتوانن خەون بە بینینی منداڵی منداڵەکانیانەوە ببینن، وە بەبێ منداڵی منداڵیش قەت نابیتە داپیرە یان باپیرە.
لە دڵی خۆمدا وتم، بەداخەوە ڕێک لەم کاتەشدا ڕوودەدات کە هەموو شتەکان بەباشی هاتبوونە پێشەوە، ڕێک لەم کاتەدا کە سەرسامی ئەو بۆماوە بەنرخە بووم کە بۆم بەجێمابوو و تێم دەڕوانی. لە سەرێکەوە هەستم دەکرد دەوڵەمەندم، بە ملیۆنەها گەوهەرم لە نەوەکانی پێش خۆمەوە بۆ مابووەوە، بەڵام خەریک بوو بەسەر دەچووم. تەمەنم نزیکەی چل ساڵە و لە هیچ سوچ و کونێکەوە سیمای نەوەی دوای خۆم دیار نییە. هەست دەکەم لەم جیهانەدا تەنهام، لە ئەندازەبەدەر تەنیام.

# کاتی خۆی ئادەم سەرسام نەبووە

پێشتر لە شاری (ئاوکلاند)دا کۆمەڵێک چاوپێکەوتنم لەگەڵ بەڕێوەبەرایەتی ژینگەپارێزانی ئەوێدا ساز دا و دواتر هەندێک تێبینیی خۆمم نووسییەوە، ویستم چاوێک بەسەر ئەو تێبینیانەی دواجارمدا بخشێنم و لەو کاتەدا گوێم لە یەک دوو تەپەی گەورە بوو. لە سەرەتادا وامزانی دەنگی هەورەگرمەیەکی دوورە، بەڵام دواتر بۆم دەرکەوت کە تەپەی کەوتنەخوارەوەی گوێزی هیندییە کە لە دارە بەرزەکانەوە بەردەبوونەوە.

لەدوای کەوتنە خوارەوەی گوێزی سێهەمەوە، گوێم لە دەنگێک بوو کە هێدی هێدی لێم نزیک دەبووەوە، پاش نەختێک ژن و پیاوێکم دی بەلای کوخەکەمدا تێپەڕین و بەناو دارگوێزە هیندییەکاندا چوونە سەر ڕێگایەکی باریک کە ڕێک دەچووە سەر دەریا و ڕێگا سەرەکیەکەی خوارەوە. پیاوەکە دەستی ڕاستی خستبووە سەر شانی ژنەکە و زۆر بەتەنیشت یەکەوە دەڕۆیشتن، بەیەکەوە نووسابوون و زۆر توند باوەشی پیا کردبوو، تاڕادەیەک من شەرمم دەکرد کە لەویادا دانیشتبووم. یەکسەر ئەندێشەم چووە سەر ئەو کاتەی کە خوا بە ناو بەهەشتەکەیدا سوڕاوەتەوە و موڕاقەبەی مەخلوقاتەکانی کردووە. لەویادا من ئەو ڕۆڵەی ئەوم دەبینی، هەرچەندە لەوەدەچوو لەدوای گوناحە گەورەکەوە بێت، چونکە ئەو دوو مەخلوقە هەر ئەوەندە نەبوو کە بەتەنیشت یەکەوە دەڕۆیشتن، بەڵکو جلیشیان لەبەردا بوو. خودا ماکسییەکی سووری کردبووە بەری ژنەکە کە هەر لە ڕەنگی گوڵە مێلاق دەچوو، هەروەها سێتێک جلی ڕەشی کەتانیشی بە پیاوەکە بەخشیبوو. گوێم لێ بوو بە زمانی ئیسپانی قسەیان دەکرد، منیش گوێم بۆ هەڵخستن.

لەناکاودا پیاوەکە لە ناوەڕاستی ڕێگاکەدا وەستا. دەستی ڕاستی لەسەر شانی حەوا بەرز کردەوە، ئاماژەی بۆ باخ و دەریاکەی خوارەوە کرد و بە دەنگێکی ڕوون و بەرز وتی:

– مایەی سەرسوڕمان نییە کە خالق، وەک دەڵێن پاش ئەوەی مرۆی لە قوڕ دروست کرد و فووی ژیانی لە لوتییەوە پێدا کرد و بووە بوونەوەرێکی زیندوو، یەک دوو هەنگاو هاتە دواوە. ئەو شتەی لەو ڕووداوەدا زیاترێک مایەی سەرسوڕمانە، ئەوەیە

کە کاتی خۆی ئادەم سەرسام نەبووە.
دونیا گەرم بوو، چونکە پاش یەک دوو لێزمەی بارانی بەیانی خۆشی کردبووەوە، بەڵام من لەویادا موچورکەیەکی سارد بە لەشمدا هات. هەستم کرد ئەندێشەکانی منی خوێندبێتەوە.
ژنەکە پێکەنی. تەماشایەکی پیاوەکەی کرد و وتی:
- بێگومان دەبێت دان بەوەدا بنێین کە خەلقکردنی جیهانێکی تەواو کارێکی یەکجار مەزنە و شایانی هەموو ڕێز و پێزانینێکە، بەڵام ئەگەر جیهانێکی تەواو لە توانایدا بووایە خۆی خۆی بخوڵقێنێت، دەبووایە ڕێزێکی گەورەتری لێ بگیرایە. وە بەپێچەوانەشەوە دەتوانین بڵێین: ئەو ئەزموونەی لەدوای خەلقکردنەوە هەستی پێ دەکرێت، هەر هیچ نییە لەچاو ئەو ئەزموونە مەزنەدا کە خۆت بتوانیت لە هیچی نەبووەوە خۆت خەلق بکەیت و لەسەر پێی خۆت بوەستیت.
ئینجا پیاوەکە پێکەنی. بە تێڕامانەوە سەرێکی بۆ لەقاند و دیسانەوە دەستی خستەوە سەر شانی ژنەکە. دواتر سەرلەنوێ بەناو دارگوێزە هیندییەکاندا ڕۆیشتن و هەر زوو دیارنەمان، بەڵام بەرلەوە گوێم لێ بوو پیاوەکە وتی:
- ڕەهەندەکان هەر زۆر زۆر ئاڵۆزن، لەبەرئەوە دەبێت هەموو بوارەکان بە کراوەیی بەجێ بهێڵین: ئەگەر خالقێک هەبێت، کەواتە کێیە؟ وە ئەگەر هیچ خالقێک بوونی نەبێت، کەواتە ئەم جیهانە چییە؟
بەهیچ شێوەیەک نەمزانی ئەو دوو فاڵگرەوەیە کێ بوون، بەڵام سەرسامی قسەکانیان بووم.
لە دڵی خۆمدا وتم: «بڵێی ئەمەی کە بینیم جۆرە مەشقێکی سروتی بەیانیان بێت؟ یاخود هەر بە ڕێکەوت گوێم لە یەک دوو بەشی دیالۆگێکی دووروودرێژ بوو؟!».
لەو حاڵەتەی دووهەمیاندا پێم خۆش بوو گوێم لە سەرتاپای گفتوگۆکەیان بووایە.
دەستم دایە دەفتەری یاداشتە بچکۆلەکەم و هەوڵم دا وەک تێبینییەک قسەکانیان بنووسمەوە.
دواتر کە بە مەبەستی پشکنینێکی فراوانی ناوچەکە چوومە دەرەوە، سەرلەنوێ بینیمنەوە، ئەوجارەیان ڕاستەوڕاست ڕووبەڕووی یەکتر بووینەوە. من چووبوومە سەر ڕێگا سەرەکیەکەی کە بە چواردەوری کەناری هەموو دوورگەکەدا دەڕوات، هەڵبەتە جگە لە ناوچە لێژەکەی خوارووی ڕۆژهەڵاتی دوورگەکە. یەک دوو کیلۆمەترێک بەو ڕێگایەدا ڕۆیشتم و بەپێی نەخشەکەی بەردەستم، دەبووایە لەو شوێنەدابوومایە

کە پێی دەڵێن (قەراغ ئاوی پرێنس چارلس). بەلای منەوە ناوێکی بەشکۆیان بۆ پانتاییەکی بچکۆلەی ئاو بەکارهێنابوو، کە پێم وا نییە تەنانەت میوانەکانیش ڕۆژانە بە مەبەستی مەلەکردن ڕووی تێ بکەن، بەڵام خۆ ڕەنگە لەوەوپێش خەڵکانی تاڤیونی جێنشینی شەرعی ئیمپراتۆری بەریتانیان هێنابێتە ئێرە تا هێمنترین و ئارامترین ڕۆخی دەریای دوورگەکەی نیشان بدەن. وابزانم گونجاوترین شوێنیان نیشان داوە.

لەنێو دار (مانگرۆف)ەکانەوە بە ناڕوونی ئادەم و حەوام دەبینی بە پێی پەتی بەلای قەراغ ئاوەکەدا دەڕۆیشتن، لەوەدەچوو سەدەف کۆبکەنەوە. هەستم کرد بەلای خۆیاندا ڕامدەکێشن و بڕیارم دا بەرەو قەراغی ئاوەکە بڕۆم، وا خۆمم نیشان دا هەروەک ئەوەی بە ڕێکەوت ڕێم کەوتبێتە ئەوێ. لەو کاتەدا کە لەنێو دارەکاندا هاتمە دەرەوە، بیرۆکەیەکی نایابم بۆ هات و لە دڵی خۆمدا وتم: «چ پێویست دەکات خۆمیان بۆ ئاشکرا بکەم و بڵێم زمانی ئیسپانی دەزانم؟ خۆ ڕەنگە هێشتنەوەی ئەو وەرەقەیە سوودی خۆی هەبێت، بەلایەنی کەمەوە لەو کاتەدا».

گوێیان لێبوو کە لێیان نزیک دەبمەوە و بە نیگایەکی پڕ لە سەرنجەوە تەماشایەکیان کردم. دڵنیا نیم، بەڵام وابزانم لەویادا ژنەکە بە پیاوەکەی وت: «چیتر بە تەنها نین».

ئەو ژنە، هەروەک ژنی ئەفسانەیەکی کۆن قەشەنگ بوو: قژێکی لوولی ڕەشی چڕ بەسەر ماکسییە سوورەکەیدا هاتبووە خوارەوە، دانەکانی وەک بەفر سپی و دوو چاوی ڕەشی تۆخی پێوە بوو. باڵایەکی ئاڵتونی بەرز و شۆخوشەنگ و نایابی هەبوو، وا دەهاتە بەرچاوم بە شێوە لەنجەولارێکی هەر زۆر ناوازە بە ڕێگادا بڕوات. باڵای پیاوەکە لە باڵای ئەو کورتترێک بوو، وا دەردەکەوت کەسێکی گۆشەگیر و نیمچە وریا بێت، هەرچەندە لەو کاتەدا کە بەرەوڕوویان ڕۆیشتم خەندەیەکی بەماناوە خستە سەر سیمای دەموچاوە بچکۆلەکەی. ڕەنگی پێستی کاڵ و قژێکی زەرد و دوو چاوی شینی پێوە بوو. وابزانم بە تەمەن هەر هێندەی من دەبوو، بەلایەنی کەمەوە دەساڵێک لە ژنەکە گەورەتر بوو.

هەر لەو یەکەمین دیدارەوە یەکسەر هەستم کرد لەوەوپێش ئەو ژنە گەنجەم دیبوو. هەرچەندە من باوەڕم بەو جۆرە شتانە نییە کە چەند ژیانێکمان هەبێت، بەڵام هەستم دەکرد لە ژیانێکی پێشوومدا ناسیومە، یاخود لە جۆرە بوونێکی تردا بینیومە. بەپەلە هەموو پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان و ماوەی چەند ساڵی دواتری

ژیانم هێنایەوە بەرچاوی خۆم و نەمتوانی لە یادەوەریمدا بیبینمەوە، بەڵام دڵنیا بووم کە لەوەوپێش بینیبووم، وە بەپێی تەمەنە گەنجەکەشی ڕێی تێ نەدەچوو زۆر لەوەوپێش بینیبێتم.

بە زمانی ئینگلیزی سەلامم لێ کردن و بەکورتی باسی خۆشی ئاووهەوام کرد و هێندەشم پێوتن کە ئەوەندە نابێت گەیشتوومەتە سەر ئەو دوورگەیە. ئەوان وەک (ئانا) و (خۆسێ) خۆیان پێ ناساندم و منیش پێم وتن کە ناوم (فرانک)ە. هەر زۆر زوو ئەوەمان بۆ دەرکەوت کە هەرسێکمان لە (ماراڤیو) لاماندا‌وە، لە ڕاستیشدا تەنها شوێن بوو لەو ناوەدا کە میوان ڕووی تێبکات و تێیدا بمێنێتەوە. هەردووکیان بە زمانێکی ئینگلیزی پاراو قسەیان دەکرد.

خۆسێ لێی پرسیم:

- بۆ پشوو هاتوویتەتە ئێرە؟

هەناسەیەکی قووڵم هەڵکێشا، بە پێویستم نەزانی هێندە درێژە بە قسەکانم بدەم، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا باسی ئەوەم بۆ کردن کە چەند حەفتەیەکە بە مەبەستی لێکۆڵینەوەی مەیدانی لەسەر ئەو دوورگانەی خوارووی ئۆقیانووسی ئارامم و وا بەرەو ماڵەوە دەگەڕێمەوە. دواتریش هەر ئەوەندەی یەک دوو وشەم دەربارەی هەڕەشەی فەوتانی ڕووەک و گیانەوەری دێرینی ئەو بەشەی جیهان کرد، یەکسەر هەردووکیان بە سەرنجەوە گوێ قولاغ بوون. لەژێرەوە نیگایان دەگرتە یەک و لەوێشدا دیسانەوە هەستم بە شەرم کردەوە، چونکە بەشێوەیەکی گشتی وا هاتە بەرچاوم کە زۆر هۆگری یەک بن. لەویادا بیرم لە لایەنی باشی پەیوەندیی نێوان دوو کەس دەکردەوە، بەتایبەتی لەو جۆرە حاڵەتانەدا. ئینجا من پرسیارم لێ کردن و وتم:

- ئەی ئێوە؟ بۆ بەسەربردنی مانگی هەنگوینی هاتوونەتە ئێرە؟

ئانا سەرێکی ڕاوەشاند و وتی:

- ئێمە فیلم دەگرین.

- فیلم دەگرن؟

ئەو دوو وشەیەم لەدوایەوە وتەوە و وەک دوا هەوڵێک ویستم بزانم لەوەوپێش لە چ شوێنێکدا ئەو ئافرەتە شۆخوشەنگەم دیوە. لە دڵی خۆمدا وتم: «بڵێیت ئەستێرەیەکی بەناوبانگی سینەما بێت و لە کاتی ئێستادا هەروا بۆ پشوو سەردانی دەریاکانی خواروو بکات؟! چوزانم، خۆ ڕەنگە (خۆسێ)ی کوڕی نازانم کێی مێردی، کە لە خۆی بەتەمەنترە، دەرهێنەرێک یان وێنەگرێکی سینەمایی بێت و پێکەوە بۆ

پشوو سەفەریان بۆ ئێرە کردبێت؟ ئێ خۆ مەرج نییە من لە ژیانی ڕاستەقینەدا بینیبێتم، لەوانەیە زۆر بەئاسانی لەسەر شاشەی سینەمایەک چاوم پێ کەوتبێت، بەڵام ئەوەیان بەهیچ جۆرێک ڕێی تێ نەدەچوو، چونکە من قەت خولیای بینینی فیلمە سینەماییەکان نەبووم، بەتایبەتیش لەو کاتەدا نەچووم بۆ سینەما کە لەگەڵ ئەو تەمەنە گەنجەی (ئانا)دا یەک بگرێتەوە».

سەیرێکی مێردەکەی کرد و کەمێک بیری کردەوە ئینجا ڕووی بەلای مندا وەرچەرخاندەوە و وەک ئەوەی تەحەدام بکات سەرێکی بۆ لەقاندم و وتی:

– ئێمە کار بۆ کەناڵێکی تەلەفیزیۆنی ئیسپانی دەکەین.

وە هەروەک ئەوەی بیەوێت جەخت لەسەر ڕاستی قسەکەی بکاتەوە، کامێرایەکی بچکۆلەی تۆکمەی دەرهێنا و چەند وێنەیەکی کەناری دەریاکە و خۆسێ و منی گرت. خەندەیەکی مەکراوی خستە سەر لێوانی و منیش گومانی ئەوەم کرد لەویادا پێم ڕابوێرێت. ئەگەر وا بووبێت، ئەوا ئاسان بوو بەلامەوە کە لێی ببورم، چونکە من تەنها مەرجانە سپییەکان و خۆری ئەو نیوەڕۆیە سەرسام و کوێری نەکردبووم.

پیاوەکە لە ژنەکەی پرسی: «ئەرێ کاتژمێر چەندە؟»، باشم لە یادە کە ئەو پرسیارەم کەمێک بەلاوە سەیر بوو، چونکە هەر لەوەوپێش سەرنجم دابوو کە هیچیان سەعاتیان لەدەستدا نەبوو. وتم: «دوانزە و چارەکە»، خواحافیزیم لێ کردن و وتم دەمەوێت بەردەوام بم لەسەر پشکنینی دوورگەکە. لەو کاتەدا کە پشتم تێکردن و بەسەر ڕێگا سەرەکییەکەدا ڕۆیشتم، گوێم لێبوو ژنەکە بە چرپەچرپێک وتی:

– هەروەک چۆن وێنەگرتنی دیمەنێک تەواو دەبێت و پەردەکان دادەماڵن و دەیانسوتێنن، ئێمەش بەهەمان شێوە ئەو کاتەی کە دەمرین لە یادەوەریی نەوەکانی داهاتوودا دەبینە چەند وێنەیەکی فەنتازی.. گیانەکەم، دەبینە تارمایی، دەبینە ئەفسانە، بەڵام هێشتا هەر پێکەوەین، ڕابردوومان پێکەوەیە، ڕابردوویەکی دووردوور.

من لەژێر قوبەی ڕابردوویەکی پڕ نهێنی و تەمومژدا هێشتا هەر گوێم لە دەنگتە.

من بەڕێی خۆمدا ڕۆیشتم، وام نیشان دان کە گوێم لە هیچ نەبوو، یان لایەنی کەم وام دەرخست هیچی لێ تێنەگەیشتم. هەر ئەوەندەی گەیشتمە یەکەمین پێچی ڕێگاکە، خێرا دەفتەری تێبینییە بچکۆلەکەم دەرهێنا و هەموو ئەو وشانەم نووسییەوە کە ئەو وتی و لەیادم بوو...

«من لەژێر قوبەی ڕابردوویەکی پڕنهێنی و تەمومژدا هێشتا هەر گوێم لە دەنگتە...»
لە خەیاڵمدا یاریم بەو ئەندێشەیە کرد و وام دانا ئانا لە ڕێگەی قسەکانیەوە نیشانەیەکی دامێ کە دوای بکەوم. کێ دەزانێ؟ خۆ ڕەنگە ڕابردوویەکی پڕ نهێنی و تەمومژاوی کلیلێکی لە خۆیدا حەشاردابێت و لەو ڕێگەیەوە بتوانم بیناسمەوە.
من هیچ گومانێکم نەبوو کە لەوەوپێش بینیبووم، بەڵام لەهەمان کاتدا لەبەر هۆیەک لە هۆکان هەستم دەکرد ڕێی تێ نەدەچوو. هەستێکی ناخۆش دایگرتبووم و نەمدەتوانی ئەو خەیاڵە لە مێشکمدا دەربکەم کە لەوەوپێش شتێکی بەسەردا هاتووە.

***

بینینی ئەو دوو ئیسپانییە هەژاندمی، لەبەرئەوە بڕیارم دا پێنج کیلۆمەتر بە درێژایی کەناری دەریاکەدا بڕۆم تا دەگەمە سەر هێڵی درێژی (١٨٠) پلە، ڕێک تا ئەو شوێنەی کە دەڵێن پەیکەرێکیان بۆ جیاکردنەوەی سنووری نێوان دوو ڕۆژەکە داناوە. پیاسەیەکی دووروودرێژ دەرچوو، بەڵام بوارێکی بۆ ڕەخساندم کە بۆچوونێک دەربارەی شێوەی ژیانی خەڵکی سەر دوورگەکە وەربگرم. بەلای یەک دوو لادێی پڕ لە ژیاندا تێپەڕیم، خەڵکەکە جلوبەرگی ڕەنگاوڕەنگیان لەبەردا بوو و بە ڕوویەکی خۆشەوە سەلامیان لێ کردم. هەندێک لە جۆگەکانیش جمەیان دەهات لە منداڵ و خەریکی مەلەکردن بوون، تاکوتەرای خەڵکی گەورەشم لەناو جۆگەکاندا بینی. سەرنجم دا زۆربەی هەرەزۆری منداڵەکان بە باوەشی پیاوەکانەوە بوون. ژنەکانی ئێرە کاری تریان هەیە کە ڕایبپەڕێنن.
ئەو پاشنیوەڕۆیە هەلێکی باشم بۆ هەڵکەوت کە لە سیمای چەندەها کەسی ئەوێ ورد ببمەوە، بەڵام لەنێوان ئەو هەموو کەسەی کە بینیمن تەنانەت یەک کەسم نەدی کە نیگەرانی بە دەموچاویەوە دیار بێت. لە هەموو شوێنێکدا بڕێکی زۆری گوڵ و گوێزی هیندی و ماسی و سەوزە دەبینرا، بەڵام وەکی تر، هەڵبەتە لە چاوی کەسێکی ڕۆژئاواییەوە، گرنگترین شت لەویادا نوقسان بوو. باشە ئادەم و حەواش کتومت لە شوێنێکی ئاوهادا نەدەژیان لە باخچەی عەدەندا، بەرلەوەی لەبەری داری مەعریفە بخۆن و حوکم بەسەریاندا بدرێت کە سەرتاپای ژیانیان لەسەر ئەم زەویە بەسەر بەرن و بە ئارەقی ناوچەوانیان نانی خۆیان پەیدا بکەن؟ من بەهیچ جۆرێک پێم وانییە ژنانی سەر ئەم دوورگەیە لە کاتی منداڵبووندا پێویستیان بە گازی

هێمنکەرەوە یان دەرمانی (پیتیدین) بێت. لە دڵی خۆمدا وتم: «ژیان یارییەکە و هیچی تر، هەموو شتێک وەک حەڵوا و شیرینی وایە».
کە گەیشتمە لادێی (واییقۆ) قاچم ئارەقی کردبووەوە، هێشتا نزیکەی کیلۆمەترێکم مابوو بگەمە هێڵی درێژی (١٨٠). لەویادا لەگەڵ ئافرەتێکی ئوسترالی ڕووخۆشدا کەوتمە قسە کە ناوی (لیبی لیسوما) بوو، کاتی خۆی شووی بە پیاوێکی خەڵکی ئێرە کردووە و پێکەوە کۆگایەک و دووکانێکی بچکۆلەی دیاری لە لادێکەدا دەبەن بەڕێوە. چواردەوری بە منداڵ گیرا بوو، یەکێک لە منداڵەکان چوو تۆپێک لەژێر دارگوێزێکی هیندیدا بهێنێتەوە، لەویادا ئاماژەم بۆ دارەکە کرد و لە ژنەکەم پرسی: «ناترسیت گوێزێکی هیندی لە دارەکە بکەوێتە خوارەوە و بەر سەری یەکێک لە منداڵەکان بکەوێت؟» پێکەنی و وتی: «قەت بیرم لەوە نەکردۆتەوە، بەڵام زیاتر لە ماسیی قرشی ناو دەریاکە دەترسم». هەروەها وتی: «ڕاستە دەترسم، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ڕێگەیان لێ ناگرم کە مەلە لە دەریاکەدا بکەن، بەڵام ئەگەر بچووکترین برینداریان پێوە بێت ناهێڵم بچنە ناو ئاوەکەوە، چونکە ماسیی قرش لە دوورییەکی یەکجار زۆرەوە بۆنی خوێن دەکات». منیش سەرێکم بۆ لەقاند و نیشانم دا کە لەگەڵ قسەکانیدا تەبام. کاتێکیش کە پێم وت لە ماراقیوەوە بە پێ هاتووم، یەکسەر وتی: «برسیت نییە؟»، وابزانم بەهۆی ئەوەوە بوو کە کەمێک لەوەوبەر باسی ماسیی قرشمان کرد. لە وەڵامدا وتم: «بەڵێ خەریکە لەبرساندا دەمرم»، ئینجا هەروا بۆ خۆشی وتم: «بەڵام قەت مەزەنەم نەدەکرد لەسەر ئەم ڕێگایەدا تووشی چێشتخانەیەکی بچووک ببم». وەک دایکێکی میهرەبان خەندەیەکی گەرمی خستە سەر لێوانی و هەروەک فریشتەیەکی ڕۆحسوکی ئەفسانەیەک تا لای کوخێکی بچکۆلەی بردم، کەوتبووە پشتی دوو دووکانەکەوە و لە خواری خوارەوە ڕێک لەسەر قەراغی دەریاکە بوو. من تەنها میوان بووم و نانێکی سادەی نیوەڕۆم لەوێ خوارد، بەردەوامیش خۆمم هان دەدا کە بکەومەوە ڕێ تا دوا کیلۆمەتری ڕێگاکەم ببڕم و بگەمە سەر هێڵی درێژی (١٨٠). کوخەکە ناوی (قاوەخانەی مرۆڤخۆرەکان) بوو، لەسەر تابلۆیەکی قەشەنگ و جوان بە پیتی سوور و گەورە نووسیبوویان (زۆرمان پێ خۆشە بۆ نانی ئێوارە میوانمان بیت).
سەیرم لەو پەیوەندییە بێ مانایە دەهات کە منداڵی منداڵەکانی مرۆڤخۆرەکان لەگەڵ هونەری خواردنلێنانی ڕابردوویاندا هەیان بوو. بەڕاست، سەیر نییە ئەو کەسانەی کە هەمیشە دەم بە پێکەنین و دڵخۆش بوون و تا ئەوپەڕی ڕادە ڕێزیان لێ دەگرتیت،

تەنها دوو نەوە دوور بوون لەو نەوەیەوە کە ئاسایی بووە بەلایانەوە کەسێکی وەک من بخەنە ناو مەنجەڵی خواردنەکەیانەوە؟ بەهەرحاڵ شێوەی بەخێرهاتنی گەرموگوڕ و میوانداریێتیان ڕاستەوڕاست ئەو جۆرە خەیاڵانەی بە مێشکدا دەهێنا. من بەردەوام هەستم دەکرد بە شێوازێکی میهرەبانانە ڕەفتاریان لەگەڵ کەسانی بیانیدا دەکرد، هەروەها هەستم دەکرد هەروەک چۆن من حەزم لە بۆنی گۆشتی مەڕە، ئەوانیش بەهەمان شێوە حەزیان لە گەشتیار بوو. کاتێکیش خەڵکانی فیجی بەردەوام سەلامیان دەکرد و دەیانوت (بولا)، تاوناتاوێک لە خەیاڵی خۆمدا دەموت بڵێیت کەمێکی تر لێویان نەلێسنەوە؟ نازانم ئەگەر تامی گۆشتی مرۆڤ شتێک بێت کە لە دواجاردا تێکەڵی جینەکان بێت یان نا، بەڵام بیرم لەوە دەکردەوە ئەو کەسانەی کە ماونەتەوە، بڵێیت ئەوانە بووبن کە بەشێوەیەکی سروشتی ئەو مەیلەیان هەبووبێت؟ ڕەنگە ئەو کەسانەی کە ڕقیان لە گۆشتی مرۆڤ بووە دووچاری کەمی ڤیتامین هاتبن و بەهۆی کەمی پرۆتینەوە لەناوچووبن: ئەوە هەر نامەوێت باسی ئەو کەسانەش بکەم کە بەرلەوەی منداڵیان ببێت، خۆیان بوونەتە خۆراک و خوراون. ئەوانیش بەهەمان شێوە شەنسی بەکارهێنانی مافە جینییەکانی خۆیان لەدەست داوە.

ئەو پەیکەرەی لەسەر هێڵی (بەرودوا)دا بینیم، هەتا بڵێیت شتێکی ڕیکلامی بوو. لە پشتی تاشەبەردێکی سوورەوە تابلۆیەکیان قنج کردبووەوە و نەخشەیەکی سێ تەوەرەیی (تاڤیونی)یان پیا هەڵواسیبوو. بەر لە هەموو شتێک نەخشەکە وێنەیەکی (دوورگەی بەهەشت)ی لە دیدی باڵندەکانی ئاسمانەوە نیشان دەدا، ئەو دیمەنەی دەخستەڕوو کە من نەمویست ببینم کاتێک لە فڕۆکە شقارتەییەکەدا دانیشتبووم. بەدرێژایی ئەو مۆدێلەی کە وێنەی ڕێگا و چەم و دەریاچەکانی دوورگەکەی لەسەر نەخشێنرابوو، هێڵێکیان لە باشوورەوە بۆ باکووری نەخشەکە کێشابوو. لە ڕاستیدا ئەو هێڵە بەشێکی هەر زۆر بچووکی بازنەیەکە، ئەو بازنەیەی کە دەوری زەوی داوە و بەسەر پنتی هەردوو پۆلەکەدا تێدەپەڕێت و دواتر هێڵی سفری درێژی پێکدەهێنێت کە گرینیچ دەبڕێت. لەلای ڕاستی ئەو هێڵەوە، مەبەستم لەو لا بەشە بازنەییەیە کە من بە پێ لێوەی هاتم، ڕۆژ ڕۆژی ئەمڕۆیە و لە بەشی لای چەپیشەوە ڕۆژ ڕۆژی بەیانییە. لەژێر پەیکەرەکەدا نووسراوە: (هێڵی (بەرودوا)ی نێودەوڵەتی، هەموو ڕۆژێکی نوێ لێرەوە دەست پێ دەکات).

نامەوێت بڵێم ئەو ئەزموونەم شتێکی یەکجار سەیر و سەرسوڕهێنەر بوو کە لە شوێنێکدا وەستا بووم و قاچێکم لەمڕۆدا بوو و قاچەکەی تریشم لە بەیانیدا، بەڵام

بیرم لەوە دەکردەوە کە هەزارەی سێهەم کتومت لەسەر ئەو کەنار دەریایەوە دەست پێ دەکات. ماوەیەکی تر ئا لێرەدا پارابۆڵە هەواییەکان بەشێوەیەکی چڕ و خێرا ئەم ناوە دەگرنەوە، لە چ شوێنێکیشدا.. لەو شوێنە هەرە هەرە دەگمەنانەی سەر ئەم زەوییە کە تا ئێستا خەڵکی لەسەر دەژی و تۆڕێکی ئاسایی تەلەفیزیۆنی تێدا نییە. ڕاپۆرتەکان لە دواهەمین بەهەشتەوە بەرەو جیهانی دۆڕاوی دەرەوە دەنێردرێن، هەر کتومت بەهۆی ئەو ڕاپۆرتانەشەوە کە لە دواهەمین قەراغی بریندار و ترساوی جیهانەوە دەنێردرێن، هەموو بەرائەتێکی بەهەشتییانەی ئەم دوورگەیە هەڵدەگێڕنەوە. لە دڵی خۆمدا وتم: «ئاخر چۆن دەکرێت لە خەونێکەوە ڕاپۆرتێک بنێردرێت؟ بێگومان دەبێت لە پێشدا کۆتایی پێ بهێنرێت».

شتێکم بیر کەوتەوە کە لەوەوپێش لەسەر پلانی دوورگەکانی فیجی خوێندبوومەوە و تایبەت بوو بە ئاهەنگەکانی ئەو هەزارەیە. من خۆم هەمیشە لەو بڕوایەدا بووم کە شتە گرنگەکان لەیاد نەکەم و بەوپێیە ڕستەیەکی دیاریکراو لە یادەوەریمدا مابووەوە. بەڕێز (سیتیڤینی یاکۆنا)، بەڕێوەبەری کۆمیتەی نەتەوەیی ئاهەنگەکانی هاتنی ئەو هەزارەیە بەم شێوەیە دوابوو: «بەهۆی ئەوەی کە فیجی ڕاستەوڕاست کەوتۆتە سەر هێڵی درێژی (١٨٠)، یەکەمین شوێنی سەر زەوی دەبێت کە ئاهەنگی هاتنی یەکەمین دەقەی سەری ساڵی (٢٠٠٠) دەگێڕێت. لەم بارەیەوە کۆمیتەکەمان چەند شێوازێکی ئاهەنگگێڕانی ئەو هەزارەیەی لەسەر فیجی تاووتوێ کردووە». هەڵبەتە لە قسەکانیدا ناوی فیجی هێنابوو و مەبەستی لە دوورگەی (تاڤیونی) بوو (کە ڕاستەوڕاست دەکەوێتە سەر هێڵی درێژی ١٨٠). من نیگەرانی ئەوە بووم کە هەموو جیهان لەسەر ئەم دوورگە زامدارەدا هەڵپەڕن و سەرمەست بن، بێگومان پەرۆشن و دەیانەوێت زۆر بەوردی بزانن داهاتوو لە چ شوێنێک و لە چ کاتێکدا دەست پێ دەکات. هەموو فەرتەنەکە لێرەدا ڕوودەدات، هەر بەمانای وشە ڕاست و دروست لەلای ئەم نیشانەیەوە دەبێت کە هەزارەی دووهەم و سێهەم جیا دەکاتەوە. هەروەک خۆی وتی: «یەکەمین دەقەی سەری ساڵی (٢٠٠٠) لەسەر ئەم زەوییەدا لێرەوە دەست پێ دەکات».

خۆم بە خۆمم وت: «بەدەر لەوەی ئەم نەوەیەی ئێستامان شەیدای گەڕانن بەدوای (دواهەمین) شت و شتە (ونبووەکان)دا، جۆرە ویستێکی نەخۆشیی تریشمان هەیە کە بەردەوام دەمانەوێت (یەکەمین) کەس بین لە کردنی شتێک لە شتەکاندا».

دواتریش کە وردتریک بیرم لێ کردەوە، بۆم دەرکەوت هەردووکیان (یەکەمین و

دواهەمین) لە بنەڕەتدا هەر هەمان شتن. (ڕۆواڵد ئامۆندسن) یەکەمین کەس بوو کە گەیشتە پۆڵی خواروو، بەو شێوەیە دواهەمین کەسیش بوو. ئەو دواهەمین مرۆڤی سەر ئەم زەوییە بوو کە بۆی ڕەخسا بەسەر ئەو بەشەی سروشتدا بسوڕێتەوە کە لەوەوبەر کەس پێی تێنەخستبوو، دوابەدوای ئەویش (سکۆت) پاش نزیکەی مانگێک بە سەختی و ئازارێکی زۆرەوە هەمان شتی ئەزموون کرد. بەو شێوەیە یەکەمین کەس دواهەمین کەس دەبێت. هەمان شتیش بوو کاتێک مرۆڤ گەیشتە سەر مانگ. دواهەمین کەس، کە بۆ یەکەمین جار لەسەر مانگ بوو، (نیل ئارمسترۆنگ) بوو — شتێک بوو کە هیچ کەسێکی تر ناتوانێت لەدوای ئەوەوە دووبارەی بکاتەوە. بەڕاست، لە سەلامە بەناوبانگەکەیدا کە بۆ مرۆڤایەتی ناردەوە جۆرە گەورەیی و بەخشندەییەک هەست پێ ناکرێت؟ کاتێک لەسەر مانگەوە دەستی ڕاوەشاند، سڵاوی لە (هۆستن) کرد و وتی: «یەکەم هەنگاوی مرۆڤ لەسەر مانگ، هەنگاوێکی بچکۆلەیە بۆ تەنها یەک کەس، بەڵام هاوکات هەنگاوێکی مەزنە بۆ مرۆڤایەتی».

ڕەنگە لە ڕۆژی یەکی یەکی ساڵی (٢٠٠٠)دا و ئا لەو شوێنەدا کە منی تێدا وەستا بووم، جمەی بێت لە خەڵک، بەڵام خۆ دەبێت ئامادەکاری بۆ ئەو ئاهەنگە بکرێت و لە ڕاستیشدا هەر لە ئێستاوە خەریکی خۆئامادەکردن بوون. هەر زوو بیستم کۆمەڵێک ڕیپۆرتاژی تەلەفیزیۆنی لەو بارەیەوە ساز کراوە، هەروەها هەواڵی نمایشکردنی کۆمەڵێک پرۆڤەی ئاهەنگی سەر ئەم دوورگەی (بەرودوا)یەم بەرگوێ کەوت. لەلایەکی تریشەوە کەرتی سەفەر و گەشتوگوزاری ئێرە، کە هەر خۆی لە خۆیدا لەژێر فشارێکی زۆردایە، بێ ئومێدانە هاواریان لێ بەرز بۆتەوە و چاوەڕوان دەکەن (گەشتیارانی ساڵی ٢٠٠٠) بە لێشاو ڕووبکەنە ئێرە. لەسەر تابلۆی ڕیکلامەکان بینیم نووسرا بوو: (وەرە و ئاهەنگی سەرەتای هەزارەی نوێ لەسەر سێ کیشوەر بەسەربەرە!) هەر زۆر لە زووەوە هەموو جۆرە بلیتەکانی ئێرە فرۆشرابوون و نرخەکانیشیان بەردەوام بەرز دەبووەوە. ئاخر خەڵکانێکی زۆری سەر ئەم زەوییە ئامادەن چەند هەزار دۆلارێک بدەن بە بلیتێک و وەک شتێکی کۆمەڵایەتیی خۆیان لەو حاڵەتە بدزنەوە کە پێی دەڵێن (خۆبەکەمزانین)، چونکە ئاهەنگی سەرەتای ئەم هەزارەیە تەنها یەک کەڕەت ڕوودەدات و لەسەر یەک کیشوەریش دەبێت.

تەواو ئامادەبووم ڕێگا دوورودرێژەکەم بەرەو (ماراڤیو) بگرمەوەبەر، بەڵام لەو کاتەدا کە بە گومانەوە خەریکی هەندێک حسابات و هێنان و بردنی کات و شوێن بووم، سەیارەیەکی جێبی ڕەش لەبەردەمی پەیکەرەکەدا وەستا و ئانا و خۆسێ بەپەلە لە

سەیارەکە هاتنە دەرەوە. لەگەڵ گەیشتنی ئەواندا هەستم کرد ترپەی دڵم خێراتر لێدەدات.
ئانا زۆر بەگەرمی سڵاوی لێ کردم، کامێراکەی دەستی بادا و وتی:
- (لیبی) پێی وتین لەوانەیە لێرەدا چاومان پێت بکەوێت.
سەرەتا من بەهیچ شێوەیەک لە مەبەستی نەگەیشتم و نەمزانی باسی کێ دەکات، بەڵام دواتر فریشتە ڕۆح سوکەکەی (واییڤۆ)م بیرکەوتەوە.
ئانا زیاترێکی بۆ ڕوون کردمەوە و وتی:
- بۆ کارێکی بچکۆلە هاتبووینە ئەم لادێیەوە. کاتێکیش بیستمان کە تۆش بێرەدا تێپەڕیویت، وتمان لەوانەیە پێویستت بە سەیارەیەک بێت تا بتگەێنێتەوە.
گومانم نییە زۆر پەشۆکابووم، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا سوپاسی پێشنیارەکەیم کرد و پێم خۆش بوو لەگەڵیاندا بە سەیارە بگەڕێمەوە ماراڤیو، چونکە بەهەڵە حسابی کاتم کردبوو و نەشمدەزانی قاچەکانم چەندە توانای ڕۆیشتنیان بەو لاڕێگا خۆڵەدا هەیە، بەدەر لەوانەش تەنها دوو سەعاتی مابوو بۆ کاتی نانخواردنی ئێوارە.
دیسانەوە ئانا چرکەی لە کامێراکەی هەڵساندەوە، ڕەسمی پەیکەرەکە و جێبەکە و خۆسێ و منی گرت.
خۆسێ کەوتە ڕوونکردنەوە وتی: «بەرلەوەی لە کۆتایی ساڵدا ڕیپۆرتاژێکی گەورە دەربارەی هاتنی هەزارەی نوێ پێشکەش بکەین، هەر لە ئێستاوە بارودۆخی دوورگەکە دەپشکنین و لێرە و لەوێ کۆمەڵێک گرێبەست و کۆڕ و کۆبوونەوە ساز دەکەین». هەروەها وتی: «ڕاپۆرتەکەمان لە ڕێگەی کۆمەڵێک پرۆگرامی یەک بەدوای یەکەوە پێشکەش دەکەین و دەمانەوێت ئەو بەربەرەکانێیانە بخەینە ڕوو کە لە هەزارەی نوێدا ڕووبەڕووی مرۆڤایەتی دەبنەوە».
ئانا ئاماژەی بۆ نەخشەی دوورگەکە کرد، پەنجەی خستە سەر خاڵێک و وتی:
- ئا ئێستاکە ئێمە لێرەداین و هەر لێرەشدا هەزارەی سێهەم دەست پێ دەکات. ئێرە تەنها شوێنە کە بتوانیت لەمڕۆوە بۆ بەیانی هەنگاو بنێیت و پێویستت بە پێڵاوی ناو بەفر نەبێت.
لەوەوپێش ئەو دروشمەم بیستبوو. بەدەر لە یەک دوو دوورگەی فیجی، هێڵی (١٨٠) پلەی درێژی، تەنها هەرێمی جەمسەری باشوور و باکووری سیبریا دەبڕێت.
پرسیارێکم لێ کرد و وتم:
- باشە خەڵکی گرنگییەکی زۆر بەو جۆرە ڕیپۆرتاژانە دەدەن؟

خۆسێ بە خەمبارییەکەوە سەری بۆ لەقاندم و وتی:
- بەڵێ، هەر یەکجار زۆریش.
بە چاوێکی پڕ لە پرسیارەوە تەماشم کرد، کەچی خۆی وتی:
- ناچارین وەک ئاگادارکردنەوەیەک پەنجەمان ڕاوەشێنین.
پێم خۆش بوو کتومت لە مەبەستی تێبگەم، لەبەرئەوە پرسیم:
- دژی چ شتێک پەنجەتان ڕاوەشێنن؟
لە وەڵامدا وتی:
- هاتنی هەزارەی نوێ بەشێوەیەک لە شێوەکان پەیوەندی بە هەموو ئەم زەوییەوە هەیە و هەموو کەسێکیش وەک جۆرە مافێکی خۆیانی دەبینن کە هەر لە چرکەی یەکەمەوە بەشدار بن لەو بۆنەیەدا، بەڵام لەهەمانکاتدا ڕەنگە کارەساتێکی کوشندە بێت ئەگەر سەرنجی تەواوی هەموو دونیا بخرێتە سەر شانی دوورگەیەکی ناسک و لاوازی ئەم دەریای خواروەوە. باشتر دەبوو ئەگەر ئەو هێڵی (بەرودوا)یە بە شارێکی وەک لەندەن یان پاریسدا تێپەڕیبایە، بەڵام لە سەردەمی ڕۆژانی ئیستیعماردا گونجاوتر بوو ئەو هێڵە بەناو دەوەن و دارستانێکی هەر زۆر دوورەدەستدا بکێشرێت. نازانم لە مەبەستم تێدەگەیت، یان نا؟
هەر زۆر باش لێی تێگەیشتم. بەڕاستی تێگەیشتن لە مەبەستی کەسێک کە لاساییت دەکاتەوە هێندە سەخت نییە. دیسانەوە هەستم کرد کە بیرکردنەوەکانم دەبینرێن، هەرچەندە قەت لەوەوپێش بڕوام بەو جۆرە شتانە نەبووە، بەڵام ئەو حاڵەتە وای لێ کردم زۆر ڕاشکاوانەتر قسە بکەم، چونکە لە دڵی خۆمدا وتم ئەگەر بەڕاستی توانای ئەوەمان هەبێت بیرکردنەوەی یەکتری ببینین، کەواتە هەر زۆر باشترە کە ڕاست و دروست و بەڕاشکاوی لەگەڵ یەکدا قسە بکەین، لەبەرئەوە وتم:
- ئێ خۆ ڕەنگە سوودێکی واشی نەبێت ئەگەر هەموو کۆمپانیا تەلەفیزیۆنییەکان سەرباری داپۆشینی ئەوبۆنەیە، بێن وهەریەکەیان بەرنامەی تایبەتی و سەرنجڕاکێشی خۆیان لەسەر چۆنییەتی و گەورەیی ئەو دارمانی کەلتووری و ژینگەیە دەربکەن. ئایا ئەو شێوە بەرنامانەش جۆرە بەهایەکی بەزم و خۆشیشی تێدا نییە؟
وامزانی لە هێڵی سوور لامداوە کاتێک کە درێژەم بە قسەکانم دا و وتم:
- باشە هیچ شتێک هەیە کە بەهایەکی بەزم و خۆشی تێدا نەبێت؟
ئەو ڕستەیەم بە خەندەیەکی غەمگینەوە وت و ئانا پێکەنی. خۆسێش خەندە گرتی. وابزانم تا ئەندازەیەک هەموومان لەسەر ترۆپکی جۆرە شەپۆلێکی بەرز بووین.

ئانا بەپەلە خۆی گەیاندە جێبەکە و لەوسەرەوە بە کامێرایەکی ڤیدیۆی بچکۆلەوە گەڕایەوە، هەروا لە کامێرایەکی ئاسایی ماڵان دەچوو. ڕووی کامێراکەی کردە من و وتی:

– زانای زیندەوەرناسی نەرویجی (فرانک ئاندەرسن) لەم دوادواییەدا لێکۆڵینەوەیەکی بەرفراوانی لەسەر سیستەمی ژینگە و سروشتی چەندین دوورگەی بەشی خوارووی ئۆقیانووسی ئارامدا کردووە. تۆ لەم بارەیەوە چی بە بینەرانی تەلەفیزیۆنی ئیسپانی دەڵێیت؟

سەرم سوڕما لە قسەکانی و هاوکاتیش هێندە پەشۆکام نەمزانی بە چ شێوەیەک وەڵامی بدەمەوە. لەکوێوە زانی کە من خەڵکی نەرویجم؟ ئەی ناوی باپیرەمی چۆن زانی؟ لە دڵی خۆمدا وتم: «بڵێیت تەماشای دەفتەری میوانەکانی (ماراڤیو)ی کردبێت؟ یان بڵێیت ئەو شوێنەی لەیاد بێت کە لەوەوبەر یەکتریمان تێدا بینیبوو، نازانم؟»

کارەکەی هەر زۆر منداڵانە و سروشتیانە هاتە بەرچاوم، لەبەرئەوە بەهیچ شێوەیەک بیرم لەوە نەکردەوە کە لە یارییەکەی هەڵبێم. وابزانم شەش حەوت دەقەیەک قسەم کرد، بە واتایەکی تر بیڵێم بۆ ماوەیەکی درێژ قسەم کرد، دەرگای بابەتێکی گەورەم واڵا کرد و لە بواری وەک وێرانکردنی ژینگەی دوورگەکانی خوارووی ئۆقیانووسی ئارامدا باسەکەم قووڵ کردەوە، باسی ڕەگەزە بایۆلۆجییە جیاوازەکانم کرد و دواتریش هاتمە سەر مافی مرۆڤ بەرامبەر بە ئەرکەکانی.

هەرکە لە قسەکانم تەواو بووم، ئانا کامێراکەی لەسەر زەوییەکە دانا و چەپڵەی بۆ لێدام، بە دەنگی بەرز وتی:

– ئافەرم! هەر زۆر زۆر نایاب بوو.

لە پشتەوە گوێم لە خۆسێ بوو کە لەسەر قسەکانی من شتێکی وت:

– منیش مەبەستم لە شتێکی ئاوها بوو کە وتم دەبێت پەنجەی ئاگادارکردنەوەیان لێ ڕابوەشێنین.

دیسانەوە پێم خۆش بوو ئەو چاوە ڕەشانەی فریوم بدەنەوە. لێم پرسی:

– بەڕاستی وێنەت گرت؟

بەشێوەیەکی زۆر پڕ نهێنی سەری بۆ لەقاندم. بەهیچ شێوەیەک نەدەچوو بە خەیاڵمدا کە کامێرایەکی بچکۆلەی لەو شێوەیە هیچ پەیوەندییەکی بەو شتەوە هەبێت کە پێی دەڵێن ڕیپۆرتاژ و بەرنامەی تەلەفیزیۆنی. نازانم، هەر بەشێوەیەکی

گشتیش هەستم دەکرد شتێک وای لێ دەکردم کە ئەم کارە تەلەفیزیۆنییەیان زۆر بە جیددی وەرنەگرم. لە سەرەتادا پێم ڕاگەیاندن کە من بە مەبەستی لێکۆڵینەوە هاتوومەتە ئێرە و ئەوانیش هەوڵیان دا وا خۆیان نیشان بدەن کە بۆ شتێکی گرنگی هاوشانی وەک ئەوەی من هاتوونەتە ئێرە. خۆ ڕێشی تێدەچێت کە بڕوایان پێ نەکردبم، بەڵێ، زیاترێک ڕێی تێدەچێت وای بۆ چووبن کە هەڵم خڵەتاندبن، چونکە شتێکی هەر زۆر ئاساییە کە پیاوێکی تەنهای وەک من لەم ناوچەی ئۆقیانووسی ئارامەدا هەستی بەوە کردبێت کە خۆی بەشێوەیەکی تر بناسێنێت و وایدەربخات کە سەفەرە دووروودرێژەکەی بۆ ئامانجێکی هەر زۆر گرنگ کردووە و هەروا تەنها بۆ پشوودان نەهاتبێتە ئەم خوارانە.
شتێکی تریش لە خەیاڵمدابوو: بڵێیت هەر لە سەرەتاوە ئەم دوو ئیسپانییە هەروا بە ڕێکەوت بەلای کوخەکەمدا تێپەڕی بن؟ لەو کاتەدا بوو کە بە وتە قووڵ و پڕ ماناکانیان باسی بوونی خودا و سەرسامنەبوونی ئادەمیان کرد. ئەی بڵێیت هەروا بە ڕێکەوتیش لەسەر ئەم هێڵی (بەرودوا)یەدا لەبەردەممدا قوت بووبنەوە؟ یان بڵێیت بەشێوەیەک لە شێوەکان پێم ڕانەبوێرن؟
لە هەموو بارێکدا وەک دوو کەس دەهاتنە بەرچاوم کە شێتی یاری بن. ئانا وەک یارییەک وای تێگەیاندم کە بۆ ئەنجامدانی چەند ڕیپۆرتاژێکی تەلەفیزیۆنی هاتوونەتە ئەم ناوچەیەی ئۆقیانووسی ئارام، منیش یاریم لەگەڵدا کرد، چونکە من بەڕاستی وامدەزانی کە بۆ بەسەربردنی مانگی هەنگوینی هاتوونەتە ئێرە. کاتی خۆی وتی: «بەڵام هێشتا هەر پێکەوەین...» ئەگەر بیانزانیبایە کە لە قسەکانیان تێدەگەم، ئەوا بێگومان زۆر خۆشحاڵتر دەبووم و هیچ گومانێکیشم نییە کە ئەوانیش هەر هەمان هەستیان دەبوو.
خۆسێ ڕۆیشتبووە لای قەراغی دەریاکەوە، پشتی لە ئێمە بوو و بە زمانی ئیسپانی چەند شتێکی وت. هەر بە تۆنی دەنگیدا دیاربوو کە دەیەوێت دەرئەنجامێک بدرکێنێت. دیسانەوە لەوێشدا لەوەدەچوو کە ئەو قسەیەی یان چەند جارێک لەوەوبەر کردبێت یاخود شتێک بڵێت کە لەبەری بوو:
– جیهانێک بوونی هەیە. خۆ ئەگەر وەک (ئەگەرێک) بیری لێ بکەینەوە، زۆر لە سنووری مەحاڵ نزیک دەبێتەوە. بە مانایەکی تر، زۆر زیاتر ڕێی تێدەچوو کە هەر لە بنەڕەتدا بە ڕێکەوت هیچ شتێک بوونی نەبووایە، بەڵام ئەو کاتە هیچ کەسێک بە هیچ شێوەیەک نەیدەپرسی: بۆچی هیچ شتێک بوونی نییە؟

هەوڵم دا لە سەرتاپای قسەکانی تێبگەم، بەڵام ئەوە کارێکی ئاسان نەبوو، چونکە هاوکات ئەو ژنە جوانە بەردەوام چاوی تێبڕیبووم، هەروەک ئەوەی چاوەڕوانی قسەیەکی من بێت لەسەر قسەکانی ئەو. بەهیچ شێوەیەک گومان لەوەدا نەبوو کە گوێم لە قسەکانی بوو، بەڵام ئایا تێی گەیشتم یان نا؟ ئەگەر نا، ئەوا بڵێیت ئانا چاوەڕوانی ئەوە نەبووبێت کە لێی بپرسم: «ئەرێ ئەوە خۆسێ چی وت؟»

لە ڕاستیدا، سەخت بوو بەلامەوە کە بەردەوام تەماشای چاوە ڕەشەکانی ئانا بکەم بەبێ ئەوەی هێندەی نیشان نەدەم کە لە وشەکانی تێگەیشتووم. ئاخر من ڕێک لەو کاتەدا تا ئەوپەڕی ڕادە هەوڵم دەدا لەو وشانە بگەم. مێشکم وروژابوو و هاوکاتیش نەمدەتوانی چاوم لەسەر چاوە بەدیقەتەکانی ئانا هەڵگرم.

وابزانم لەو ڕووبەڕووبوونەوەیەدا من بردمەوە، چونکە ساتێک دوای ئەوە ئانا کامێراکەی لەسەر زەوییەکە هەڵگرتەوە و خستییەوە سەر کوشنی پێشەوەی سەیارەکە. بۆ ماوەیەکی کەم خۆی بەسەر سەیارەکەدا چەمانەوە، هەروەک ئەوەی کە سەری گێژ بخوات. دڵنیا نیم، بەڵام وابزانم دەموچاویشی کەمێک زەرد هەڵگەڕا. هەمووی یەک دوو چرکەیەکی خایاند، دواتر دەستی لە سەیارەکە هەڵگرت و منی لەیاد کرد. بەپەلە هەشت هەنگاوی نا و خۆی گەیاندە لای خۆسێ و بە دەستی چەپی، دەستی ڕاستی ئەوی گرت. بۆ ماوەیەکی کەم هەروەک پەیکەرێکی زیندووی (ئامۆر) و (سایکە)[31] لەبەر ڕۆشنایی ئەو پاشنیوەڕۆ گەرمەدا وەستان. پاش نەختێک (سایکە) کەوتە قسە، هەروەک ئەوەی وەڵامێکی ئامادەی قسەکانی (ئامۆر) بداتەوە کە وتی جیهانێک بوونی هەیە و زۆر زیاتر ڕێی تێدەچوو کە هەر لە بنەڕەتدا بە ڕێکەوت هیچ شتێک بوونی نەبووایە. (سایکە)* وتی:

– ئێمە ڕۆحێکمان هەڵگرتووە، هەر هەمان ڕۆحیش هەڵیگرتووین و نایناسین. سەرەی ئێمە ئەو کاتە دێت کە نهێنییەکە لەسەر دوو پێ دەوەستێت و هەڵناهێنرێت. ئەوە ئێمەین کە وەک وێنە خەونییەکان چرنوق لە دەستی خۆمان دەگرین و خەبەرمان نابێتەوە. ئێمە ئەو نهێنییەین کە کەس هەڵیناهێنێت. ئێمە ئەو حەکایەتەین کە لەناو وێنەی خۆیدا قەتیس کراوە. ئێمە ئەو شتەین کە بەردەوام دەڕۆین و دەڕۆین، بەبێ ئەوەی بگەینە تێگەیشتنێک و بینینێکی ڕوون.

لەو کاتەدا کە هێشتا پشتیان لە من بوو، بە هێواشی دەفتەری تێبینییەکەم دەهێنا. بە باشترین شێوە هەموو ئەو وشانەم نووسییەوە کە لە دڵەوە وتیان و هەر لە ئەفسانە دەچوون، بەڵام لەهەمانکاتیشدا بەشێوەیەکی یەکجاری و وەک جۆرە

بڕوایەک گوزارشتیان لێ دەکرد. «ئێمە ئەو شتەین کە بەردەوام دەڕۆین و دەڕۆین بەبێ ئەوەی بگەینە تێگەیشتن و بینینێکی ڕوون...»
لە دڵی خۆمدا وتم ڕەنگە چەند شیعرێکی ئیسپانیان لەبەر بێت و بەردەوام بۆ یەکتری بخوێننەوە، کێ دەزانێت؟ بەڵام ئەو شێوە نیمچە سروتییەی کە حیکمەتەکانیان پێ هەڵدەڕشت، بەتەواوەتی قەناعەتی پێ کردم کە وشەکان هی خۆیانە و هەر بۆ خۆشیانی دەڵێن.
لە سەیارەکەدا دانیشتین و بەرەو ماراڤیو کەوتینەوە ڕێ، لە ڕێگا باسی چەندین شتی جۆراوجۆرمان کرد، بەڵام بەتایبەتی قسەمان لەسەر لێکۆڵینەوە سروشتییەکانی من کرد. خۆر هێدی هێدی بەرەو ئاوابوون دەچوو و دەمزانی ئاوها لە ماوەی سەعاتێکدا دونیا بەتەواوەتی تاریک دەبێت. لەبەر ئەو ڕۆشناییە ئاڵتونییە تیژەدا چەند ژنێکمان بینی جلیان لە تەنافەکان دەکردەوە، کۆمەڵێک منداڵمان بەدی کرد تا ئەو کاتە خۆیان لە ڕووبارەکاندا فێنک دەکردەوە، هەروەها چەند کوڕێکی گەنجمان بینی کە هێشتا سەرگەرمی فوتبۆڵێنی ئەمریکی بوون.
«ئێمە ئەو نهێنییەین کە کەس هەڵیناهێنێت..»
لەپڕێکدا هەستم کرد کە من لەوەوپێش چەندە گیرۆدەی ڕەهەندێکی بچکۆلە بووم، هەم بۆ تێڕوانینم بۆ جیهان بەشێوەیەکی گشتی و هەم بەرامبەر ئەم ژیانە کورتەی خۆشم لەسەر ئەم زەوییە. ئانا و خۆسێ ئەزموونێکی خەفەکراوی حەکایەتی ژیانیان لە ناوەوەمدا خەبەر کردەوە. نەک تەنها لەم بەهەشتی دەریای خوارووەدا، بەڵکو لە خودی ژیانی سەر ئەم زەوییەشدا، تەنانەت لەو ژیانەشدا کە لە شارە گەورەکاندا بەسەری دەبەین.
لەو کاتەدا کە بەناو لادێی (سۆمۆسۆمۆ)دا تێپەڕین، خۆسێ ڕووی کردە ئانا و ئاماژەی بۆ چەند کەسێک کرد کە لە گۆڕەپانی بەردەم کڵێسەیەکی (بابتیست)[٣٢] دا وەستا بوون. دیسانەوە شتێکی بە زمانی ئیسپانی وتەوە، ئەمجارەیان تاڕادەیەک پێچەوانەی بیرکردنەوەکانی من بوو کە لە پشتیانەوە دانیشتبووم و لەگەڵ هەموو تاسەیەکدا سەرم بەر سەقفی سەیارەکە دەکەوت. وتی:
- هەمیشە پەرییەکان زیاترێک هەستیارن وەک لەوەی ئەقڵانی بن، زیاترێک لە حەکایەت دەچن وەک لەوەی بە بەڵگەوە بسەلمێنرێن، پڕ نهێنیترن وەک لەوەی ئەقڵە بچکۆلەکەی خۆیان مەزەندەی دەکات. هەروەک چۆن هەنگە گەورەکان بە لارەلار لە پاشنیوەڕۆیەکی خەواڵوی مانگی هەشتدا لە گوڵێکەوە بۆ گوڵێکی تر بە

گیزەگیز دەفڕن، بەهەمان شێوەش شەکرەپەرییەکانی ئەم وەرزە خۆیان دەبەستنەوە بە خانە ئاسمانییە بەئەدەبەکانیانەوە. تەنها جۆکەر خۆی ڕزگارکردووە...

«شەکرەپەرییەکانی ئەم وەرزە..» ئەو دەربڕینە سەیرە سەرسامی کردم. بیرمە خەریک بوو دەستێکم بخەمە سەر دەمم نەبا وشەکانی بە دەنگێکی بەرز بەدوایدا بڵێمەوە، ڕەنگە ئێستا بڵێیت: «جا باشە بۆ بەدوایدا نەتوتەوە؟ بۆچی نەتدەتوانی ڕووبەڕووی شیعرە سەرنجڕاکێشەرەکانی ئانا و خۆسێ ببیتەوە کە تاوناتاوێک دەریاندەپەڕاند؟» زۆر بەئاسانی ئەگەر لێم بپرسینایە: «ئەوە چیتان وت؟»، ئەوا گومانم نییە کە بۆیان وەردەگێڕامە سەر زمانی ئینگلیزی و ڕەنگە لەسەروو ئەوەشەوە بەشێوەیەک بۆیان لێک بدامایەتەوە کە بەتەواوەتی جێگەی ڕەزامەندیم بووایە. هەر بۆ نموونە دەربڕینێکی وەک «شەکرەپەرییەکانی ئەم وەرزە» بواری ڕوونکردنەوەی زۆری تێدایە.

من خۆم چەندین جار ئەو پرسیارەم لە خۆم کرد و نەمدەزانی وەڵامێکی پڕاوپڕم بۆی هەیە یان نا، بەڵام وابزانم بەم شێوەیە بیرم دەکردەوە: بەر لە هەموو شتێک ئەو شێوازی پەیوەندییە ناوازەیەی ئانا و خۆسێ هەڵیان بژاردبوو، شتێک بوو کە پەیوەندی بە هەردووکیانەوە بوو. هەردووکیان، ڤیرا، پێم وابێت من بەردەوام دەمویست باسی ئەم خاڵە بکەم، دوو کەس بوون کە گونجانی ئەقڵییان هێندە تێکەڵ بووبوو کە مەحاڵ بوو لە یەک جودا بکرێنەوە. هەر لە بنەڕەتدا ئەو شێوازی پەیوەندییە دەنگییە سەیروسەمەرەیەی نێوانیان، نیشانەی پەیوەندییەکی قووڵی شەخسیی نێوان دوو عاشق بوو، ئێ خۆ ناکرێت هەروا بەئاسانی ڕێگا بە خۆمان بدەین و نامەی دڵداری خەڵکانی تر بخوێنینەوە، بەلایەنی کەمەوە لەبەرچاوی خۆیاندا شتی وا ناکرێت. لەلایەکی تریشەوە ئەگەر ئەو نهێنییەم بۆ ئاشکرا بکردنایە و پێم بوتنایە کە لە قسەکانیان تێدەگەم، ئەو کاتە پێی دەچوو چیتر لەو جۆرە شتانەیان نەگوتایە.

ڕەنگە ئێستا لە دڵی خۆتا بڵێیت: «باشە، با بڵێین پێویستی نەدەکرد کە پێیان بڵێیت لە زمانەکەیان تێدەگەیت یان نا، بەڵام هەر هیچ نەبێت خۆ دەکرا جارجارێک پێت بگوتنایە: (ئەوە باسی چی دەکەن؟) ئاخر بەلاتەوە سەیر نییە کە گوێت لەو هەموو شتانە ببێت و هیچ هیچ نەڵێیت؟» ڕاست دەکەیت، بەشێوەیەکی گشتی کاتێک دوو کەس یەکێکی تر دەبینن و زمانەکەیان نازانێت، لە زۆربەی کاتەکاندا بە ئینگلیزی قسە دەکەن، بەڵام هەر زۆر ئاساییە کە تاوناتاوێکیش یەک دوو وشە

بە زمانەکەی خۆیان لەگەڵ یەکتریدا بڵێن. ئەوە پێی دەگوترێت ژیانی تایبەتی، بەشێکی هەر زۆر تایبەتی ژیانی مرۆڤ، ئەوەش شتێکە وەک دەزانیت نەدەبووایە من لێی تێبگەم. خۆ ڕەنگە یەکێکیان بڵێت (سکم دێشێت) یان ئەوی تریان بڵێت (زۆر تینومە و زۆر برسیشمە، دە با شتێک بخۆین). بەدەر لە هەموو ئەوانەش وەک وتم بەڕاستی حەزم دەکرد بابەتی زیاترم گوێ لێ بووایە، لەلای خۆمەوە بەتەواوەتی بڕیارم دابوو و دەمویست لەو بارەیەوە هەتا بکرێت زیاترێکم گوێ لێ بووایە. هەروەک چۆن کاتێک ئەو کەسەی هاوبەشی جێگای خەومانە و لەپڕێکدا بەدەم خەوەوە دەکەوێتە قسەکردن، یەکسەر خەبەری ناکەینەوە، هەرچەندە لەوانەیە ئەوە باشترین شت بێت، بەڵام بەتەواوەتی بێدەنگ دەبین تا زۆرترین بەشی پەیامی کەسە خەوتووەکەمان گوێ لێ بێت، هەر هیچ نەبێت لەو حاڵەتەدا قسەکانی بەبێ هیچ پەردەپۆشییەک دەردەبڕێت.
ئانا بەرەو لای خۆسێدا خۆی لار کردەوە و ئەویش دەستی چەپی خستە سەر شانی، بە دەستی ڕاستیشی توند سوکانی سەیارەکەی گرتبوو. ئانا بە چاوێکی پڕ لە میهرەوە تەماشایەکی کرد وتی:
- ئێستاکە پەرییەکان لەنێو حەکایەتەکەدان، هەربۆیە ناتوانین بە وشە گوزارشتیان لێ بکەین. ئەگەر خۆیان توانایان هەبووایە کە خۆیان ببینن، بڵێیت ئەو کاتە حەکایەتەکەیان ببووایەتە حەکایەتێکی ڕاستەقینە؟ بڵێیت ژیانی ڕۆژانە شتێکی ناوازە و تایبەت بووایە، ئەگەر بەردەوام بەڕوونی لە ماناکەی بگەیشتینایە؟
بەباشی پاڵم دایەوە و هەوڵم دا بیر لەو هەموو بۆقە کێویانە بکەمەوە کە لێرە و لەوێ سەیارە کردبوونی بە ژێرەوە و دەهاتنە بەرچاوم، لەو کاتەوەی بەرەو هێڵی «بەرودوا» ڕۆیشتم زیاتر لە سەد دانەم بینی و هەر هەموویان پاش ئەوەی ئاوەکەیان چۆڕابووەوە، بەتەواوەتی پان پان بووبوونەوە، بەڵام من لەویادا بیرم لە خودی بۆقە کێوییەکان نەدەکردەوە، بەڵکو ئەو پرسیارەی لە خۆمم دەکرد ئەمە بوو: (بڵێیت من لە ئەندازەبەدەر لە زانستەکەمدا قووڵ بووبمەوە و بەو شێوەیەش توانای بینینی حەکایەتە ئەفسووناوییەکانی سەر ئەم زەوییەم لەدەست چووبێت کە لە هەموو چرکەیەکدا ڕوودەدەن؟ سەرم لەوە سوڕما بوو کە پرۆگرامی زانستە سروشتییەکان هێندە زۆر ڕۆیشتوون کە پێیان وایە هەموو شتێک شیاوی لێکدانەوە بێت. بێگومان لێرەدا مەترسییەکی شاراوە هەیە کە بەتەواوەتی کوێر بین لە ئاستی سەرتاپای ئەو شتانەی کە لێک نادرێنەوە).

لەو کاتەدا کە بەناو دواهەمین شارۆچکەدا تێپەڕین، ناچار بووین هێواش هێواش لێبخوڕین، خەریک بوو بەتەواوەتی بوەستین، چونکە کۆمەڵێک ژن و منداڵ بە ناوەڕاستی جادەکەدا دەڕۆیشتن. دەستیان بۆ ڕاوەشانین و بەدەممانەوە پێکەنین، ئێمەش دەستمان بۆ ڕاوەشاندنەوە و بۆیان پێکەنینەوە. لە جامی سەیارەکەوە هاواریان کرد (بولا)؟، (بولا) یەکێک لە ژنەکان دووگیان بوو و لەوەدەچوو لە مانگی هەشت یان نۆیدا بێت.
ئانا لەسەر کوشنەکە خۆی ڕاست کردەوە و دەستی خۆسێی لەسەر شانی لادا، ئەویش دیسانەوە هەردوو دەستی بە سوکانەکەوە گرتەوە. لەو کاتەدا کە ئاوڕی دایەوە و تەماشای ئافرەتەکانی کرد وتی:
- بەردەوام لەناو تاریکی ئەو سکە هەڵئاوساوانەدا، ملیۆنەها قۆزاخەی نوێی ئاگایی جیهانی مەلە دەکەن. شەکرەپەرییە بێدەسەڵاتەکان هەر ئەوەندەی کە پێدەگەن و توانای هەناسەدانیان دەبێت، یەک بەدوای یەکدا دێنە دەرەوە. ئەوان شیری شیرینی پەری دەخۆنەوە کە لە دوو گۆپکەی نەرمی گۆشتی پەرییەوە دێنەدەرەوە، بەدەر لەوە ناتوانن هیچ شتێکی تر بخۆن.
ڤیرا، ئەو وتی (گۆشتی پەری). من وای بۆ چوو بووم کە (پەرییەکانی) ئەم گەردوونە ئێمە بین، مەبەستم لە مرۆڤی سەر زەوییە، بەڵام لە کاتێکدا لەویادا باس باسی خەڵکانی فیجی بوو، من پێم وابوو کە داپیران و باپیرانیان زۆر بەئاسانی و زۆر بەشێوەیەکی چاوبرسیانە گۆشت و خوێنی پەرییان خواردووە، ئەوە بەلامەوە شتێکی تا بڵێیت دڕندانە و دڵڕەقانەتر بوو. باشە ئەو گۆشتە نەرمونۆڵە ئاسمانی و ناسکە، هێندە بەنرخ نییە کە نەتوانیت نەیخۆیت؟
بەرەو ماراڤیو سەرکەوتین و هەر ئەوەندەی گەیشتمەوە کوخەکەم، بۆ چەند دەقەیەک لەبەر هەیوانەکەدا وەستام و تەماشای خۆرم کرد کە خەریک بوو ئاوا دەبوو. هەستم کرد قەرزاربارى ڕۆژەکەم و شایانی ئەوەیە بەشێوەیەکی ڕێکوپێک دوا ڕێزی لێ بگرم، چونکە لایەنی کەم سەفەرە ئاسمانییە بێ پەرواکەم بە باشی شکایەوە. سەفەرەکەم لە سەرەتای بەیانیدا دەستی پێ کرد، هەر ڕێک پاش ئەوەی کە خۆر تازە هەڵهاتبوو. وا لەوێشدا چاوم بڕیبووە ئەو خەپلە زەردهەڵگەڕاوە گەشاوەیەی کە هێدی هێدی خۆی بە پشتدا دەخست و دواتر خۆی خستە ژێر ئاسۆی دەریاوە. ڕاستە خۆر تەنها ئەستێرەیەکە لەنێو سەدان ملیارد ئەستێرەی ئەم گەلەهەسارەیەدا و تەنانەت گەورەترین ئەستێرەش نییە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەستێرەی منە.

ئاخۆ چەند کەڕەتی تریش وەک موسافیر لەسەر ئەم زەوییە دەبم کە بە دەوری ئەستێرەیەکی (ڕێگای کاکێشاندا) دەخولێتەوە؟ تا ئێستا نزیکەی چل کەڕەتێک بە دەوری خۆردا خولاومەتەوە، چل جار بەهێواشی بە دەوری خۆردا سوڕاومەتەوە. کەواتە بەلایەنی کەمەوە نیوەی سەفەرەکەم ماوە.

جانتاکەم کردەوە و بەپەلە خۆم شۆری، پاشان ئەو کراسە سپییەم لەبەر کرد کە لە شاری (ئاوکلاند) کڕیبووم. بەرلەوەی بچم بۆ نانخواردنی ئێوارە پێکێکی بچکۆلەم لەو جنە خواردەوە کە لەگەڵ خۆمدا هێنابووم و بتڵەکەم لەسەر تەپڵەکە بچکۆلەکەی تەنیشت جێگاکەوە دانا. من هەمیشە کە سەفەرم دەکرد، زۆر بەوردی ئەو سروتەم پەیڕەو دەکرد. دەمزانی کە دەگەڕێمەوە و بەرلەوەی بخەوم پێکێکی گەورە دەخۆمەوە. ئەوە تەنها دەرمانێکی هێورکەرەوەی بەردەستم بوو.

لێرەدا ئەو کاتەم بیرکەوتەوە کە لەناو فڕۆکەکەی (نادی)دا دانیشتبووم، هەستم دەکرد تەنهام و تاسەی بتڵەکەم دەکرد. لە ماوەی چەند چارەکێکی دڵتەزێندا من و بتڵەکە لە یەکتری دابڕاین و لەو کاتەدا هێڵی ئاسمانی (سەن فلاوەر) زۆر لە من زیاترێک ئاگاداری ئەو بتڵە بوو.

لەو کاتەدا کە بەرەوڕووی دارگوێزە هیندییەکان چوومە دەرەوە و دەرگاکەم بەدوای خۆمدا داخست، گوێم لە ترپەی شتێک بوو بە یەکێک لە کۆڵەکە دارینەکانی سەقفی خانووەکەدا بەخێرایی خل بووەوە، تاڕادەیەک دەمزانی ئەو شتە چییە، بەڵام هاوکات نەگەڕامەوە کوخەکە تا بەتەواوەتی لێی ورد ببمەوە.

# گیانەوەرە وشکاوەکییە سەرەتاییەکان

دەرەوە بەتەواوەتی تاریک بوو. تەنها سەرچاوەی ڕووناکی لەناو باخی دارگوێزە هیندییەکاندا دوو مەشخەڵ بوو کە لەسەرخۆ دەسووتان، بەڵام لەسەروو ترۆپکی دارگوێزە هیندییەکانیشەوە هەزارەها ڕووناکی زۆر بچووک بچووک لەناو کۆمەڵێک ئەستێرەی چڕدا دەدرەوشانەوە. لە دڵی خۆمدا وتم: (هەر ئەوەندەی لە شارە گەورەکان دێینە دەرەوە و دونیا تاریک دەبێت، خۆمان لەناو قووڵایی گەردووندا دەبینینەوە). کەچی لەگەڵ ئەوەشدا بەشێکی هەرە زۆری مرۆڤایەتی لەناو جۆرە خانوویەکی شووشەی ڕووندا خۆیان حەشار داوە، مەبەستم لەوەیە بەو شێوەیە بیرمان دەچێتەوە کە ئێمە کێین و لەکوێوە هاتووین. بەلای خەڵکانێکی زۆرەوە سروشت بۆتە وێنەی ناو تەلەفیزیۆن و گوڵی ناو ئینجانە و قەفەزی تەیر و تیور، خۆ ئەگەر بشیانەوێت گەردوون ببینن، ئەوا هانا بۆ گەلەریی تایبەت دەبەن کە لە ڕێگەی وێنە و فیلمەوە نمایشی گەردوون و ئەستێرەکانی ئاسمان دەکەن.

نەمتوانی بەئاسانی ڕێگای چێشتخانەکە بدۆزمەوە، بەڵام وەک کوێرێک بەدەستەکوتێ بەرەو لای ڕووناکییەکی زۆر لاواز کەوتمە ڕێ کە لە دوورەوە لە هۆڵی کۆبوونەوەکەوە دەهاتە بەرچاو. بەهێواشی بەناو دەوەنێکی چڕی نێوان دارگوێزە هیندییەکاندا ڕۆیشتم و دواجار گەیشتمە مەلەوانگە ڕووناکەکە. لە ئاوەکەدا سێ چوار بۆقی کێوی بەردەوام لەمسەرەوە بۆ ئەوسەری ئاوەکە مەلەیان دەکرد. لەوەدەچوو سەرقاڵی پێشبڕکێیەکی مەلەوانی بن، چونکە بەڕاستی بۆقێکی کێوی گەورە لەسەر قەراغی مەلەوانگەکە دانیشتبوو و بەوردی چاودێری دەکردن. پێم وابوو هەموو شتەکان زۆر بە ڕێکوپێکی ڕێک خرابن: بە ڕۆژ گیاندارە شیردەرە باڵاکان مەلەوانگەکەیان بۆ خۆیان داگیر کردبوو و بۆقە کێوییەکان بۆیان نەبوو لەو ناوەدا خۆیان دەربخەن، بە شەوانیش سەرەی گیانەوەرە وشکاوەکییەکان بوو کە سوود لەو خزمەتگوزارییە وەربگرن.

خۆم کرد بە چێشتخانە کراوەکەدا، لەسەر هەر دە مێزەکەی ناویدا مۆمیان داگیرساندبوو. دە کوخ لە ماراقیودا هەبوو، هەربۆیە لە چێشتخانەکەشدا دە مێزیان دانابوو.

ئانا و خۆسێ لەسەر مێزێک دانیشتبوون. هێشتا ئانا ماکسییە سوورەکەی هەر لەبەردابوو و سەرنجم دا لەویادا جووتێک پێڵاوی ڕەشی پاژنە بەرزیشی لەپێ

کردبوو. خۆسێش هەروەک پاشنیوەڕۆ هەر هەمان قاتە ڕەشەکەی لەبەردابوو، تەنها شتێک کە زیادی کردبوو ملپێچێکی سوور بوو کە لە ملیەوە پێچابووی. ملپێچەکەی زۆر لەگەڵ ماکسییەکەی ئانادا ڕێک دەکەوت، لەوەدەچوو هەر لە هەمان پارچە قوماش دروست کرابێت.
من لەسەر مێزەکەی تەنیشتیان دانیشتم و یەک دوو جار سەرمان بۆ یەکتری لەقاند. وەک موسافیرێکی تاک و تەنها فێری ئەو هونەرە بووبووم کە بە ئەدەبەوە سواڵی ئەوە نەکەم کە لەسەر مێزی خەڵکانی تر دابنیشم. لەویادا ئێوارە بوو و سەیرانەکەی پاشنیوەڕۆ تەواو بووبوو، ئانا و خۆسێ چیتر بە منەوە نەبەسترابوونەوە و هەقی خۆی بوو بە تەنها پێکەوە بن.
سەرێکم بۆ (لاورا)ش لەقاند، کە بە تەنها لەسەر مێزێکی ئەوسەری چێشتخانەکەدا دانیشتبوو. لەسەر مێزی سێهەمیش پیاوێکی ئەسمەر دانیشتبوو، ڕیشێکی ماش و برنجی پێوە بوو، لەوەدەچوو دە ساڵێک لە من بەتەمەنتر بێت. دواترێک هەر لەو ئێوارەیەدا ناسیم، بۆم دەرکەوت کە خەڵکی ئیتالیایە و ناوی (ماریۆ)یە. لە تەنیشت مێزەکەی ئەوەوە کوڕ و کچێکی گەنج دانیشتبوون، تاڕادەیەک گومانم نەبوو کە بۆ بەسەربردنی مانگی هەنگوینی هاتبوونە ئەوێ، چونکە تەمەنیان هەر لە سەرەتای بیستەکاندا بوو، هەروەها هەر بەوەشەوە نەدەوەستان کە دەستیان لەناو دەستی یەکتریدا بێت، بەڵکو جارجارێک سەری هەردووکیان لە ماچێکی تەڕ و پڕ هەوەسدا دەتوایەوە و دەبوو بە یەک. بۆ ئێوارەی دواتر یەک دوو قسەم لەگەڵدا کردن، خەڵکی (سیاتڵ[٣٣]) بوون و ناویان (مارک) و (ئێڤیلین) بوو.
تۆزێک لەولاترەوە (جۆن) دانیشتبوو، ئەو پیاوە ئینگلیزییەی کە لە فڕۆکەخانەکەدا پێشوازی لێ کردین. زۆر بەڕوونی بیرمە دانیشتبوو و خەریکی نووسینی تێبینی و شتی وابوو. دەمزانی چەند تێبینییەک دەنووسێت، چونکە خۆشم چەندەها جار کە دانیشتووم و چاوەڕوانی خواردنی نیوەڕۆ یان ئێوارەم کردووە، لەو کاتانەدا تێبینی و شتی وام نووسیووە. هەرگیزیش مێشکم هێندە ئارام نەبووە کە دابنیشم و لە ڕۆمانێکدا قووڵ ببمەوە. دواتر بۆم ڕوون بووەوە کە ئەو پیاوە بەریتانییە (جۆن سپۆک)ی نووسەرە کە دانیشتووی شاری لەندەنە، وردترێک بیڵێم لە ناوچەی (کرۆیدن)ی خوارووی سەنتەری لەندەندا دەژی. کە بۆم دەرکەوت نووسەرە، یەکسەر وام دانا کە سەر بە گروپێکی کەمی ئەو نووسەرانە بێت کە کتێبەکانیان ڕەواجێکی باشیان هەیە و لە بەشی دووهەمی ساڵەکەدا چەند مانگێکی بە خۆی

بەخشیوە کە لەسەر دوورگەکانی ئەم خوارانە بەسەر بەرێت تا سروشی ڕۆمانێکی نوێ گەڵاڵە بکات. کەچی بۆم دەرکەوت کە بۆ یەک دوو ڕۆژێک هاتۆتە ئێرە تا بەشداری لە بەرنامەیەکی تەلەفیزیۆنیدا بکات. بەڵێ بەڵێ، دەربارەی هەزارەی نوێ و هێڵی (بەرودوا) و ئەو بەربەرەکانێیانەی کە ڕووبەڕووی جیهان دەبنەوە و ئەو شتانە. بۆ ئەو شتانە ڤیرا، بۆ ئەو شتانە هاتبوو!

(بیل)م نەدی. ڕەنگە لە ژوورەکەیدا خەریکی ڕاهێنانی یۆگا بووبێت بەو ئومێدەی شەست ساڵێکی تریش بژی.

دوو پیاوی باڵابەرزی خەڵکی ناوچەکە نانی ئێوارەیان بۆ هێنایین، هەردووکیان جلوبەرگی تایبەت بە دابونەریتی (فیجی)یان لەبەردا بوو و هەردووکیشیان گوڵێکی سووریان لە پشتی گوێچکەیاندا دانابوو. یەکێکیان لە پشت گوێچکەی چەپیەوە بوو، ئەوەش نیشانەیەک بوو بۆ ئەوەی کە هێشتا بە هیچ ئافرەتێکەوە نەبەسترابووەوە. ئەوی تریشیان گوڵەکەی لە پشت گوێچکەی ڕاستییەوە دانابوو، دیسان ئەمەش مانای ئەوە بوو کە ژنی هێنابوو. خۆ ئەگەر من لەسەر دوورگەی تاڤیونی بژیابامایە، ئەو کاتە چەند مانگێک لەمەوبەر ناچار دەبووم ئەو گوڵە لە پشتی گوێچکەی ڕاستمەوە بۆ پشتی گوێچکەی چەپ بگوێزمەوە، لێرەشەوە تووشی شێوەیەک لە شێوەکانی بەسوک سەیرکردنی کۆمەڵایەتی دەبووم.

من داوای نیو بتڵ شەرابی (بۆردوو) و بتڵێک ئاوی کانزاییم کرد. بۆ خواردنیش هەمیشە لە ماراڤیودا بەم شێوەیە بوو: بە ئارەزووی خۆت لەنێوان دوو جۆر خواردندا یەکێکیانت هەڵدەبژارد و ئێمەش هەر لەو کاتەوەی کە گەیشتین و ناومان نووسی، خواردنی خۆمان هەڵبژاردبوو. من ئەو کاتە مێشکم پڕبوو لە وێنەی ڕەنگاوڕەنگی شێواز و جۆری خواردنی باوی دوورگەکانی فیجی، لەبەرئەوە هەر بۆ دڵنیایی ماسیم هەڵبژارد.

ئانا و خۆسێ زۆر بە ئەسپایی قسەیان لەگەڵ یەکتریدا دەکرد، لەبەرئەوە لە سەرەتادا تەنها لە بەشێکی هەر زۆر کەمی قسەکانیان تێگەیشتم، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەو وشە کەمانە بەس بوون بۆ ئەوەی پەرۆشیم بوروژێنن. لەوەدەچوو دان و سات لەسەر شتێک بکەن، یان پێدەچوو کە دوا وشە و جوانکاری بخەنە سەر جۆرە ڕاگەیاندنێکی هاوبەشی خۆیان.

خۆسێ وتی:

– ئێمە بەرهەمی هونەرێکین کە بەردەوام پەرەی پێ دراوە و چەندەها ملیارد ساڵی

پێچووە تا هاتۆتە بەرهەم، بەڵام لە ماددەیەکی هەر زۆر لاوازدا کۆکراوینەتەوە.
ئا لێرەدا یەک دوو بەشی قسەکانیانم گوێ لێ نەبوو، بەڵام دواتر دیسانەوە گوێم لە خۆسێ بوو کە وتی:
- دەرگای هاتنە دەرەوە لە حەکایەتەکەدا بەتەواوەتی لەسەرپشتە.
ئانا بە ڕێزەوە سەرێکی بۆ لەقاند و وتی:
- ئێمە لە کاتژمێرە لمییەکەدا، ئەڵماسی ڕۆحین.
تاڕادەیەک قسەکانیان بەو شێوەیە بوو، یان ڕاستتریک بیڵێم ئەو بەشە کەمانەی کە گوێم لێ بوو بەو شێوەیە بوو.
لەو کاتەدا کە ئەوان ئاوها دانیشتبوون و ڕستەی کورت کورتیان بۆ یەکتری دەگوت، (بیڵ) بە پیاسە لەناو دارگوێزە هیندییەکانەوە دەرکەوت و خۆی کرد بە چێشتخانەکەدا، شۆرتێکی زەردی (بەرمۆدا) و کراسێکی (هاوای) گوڵگوڵی شینی لەبەردا بوو. پێم وابێت لاورا لە پێش منەوە چاوی پێکەوت، چونکە هەر ڕێک بەرلەوەی ئەو بگات، سەرنجم دا دەستی دایە کتێبی ئەستێرەی گەڕۆکی تاقانەکەی و بەگوڕ کەوتە خوێندنەوەی، دڵنیام هێندە بەگوڕ دەیخوێندەوە کە لە هیچ وشەیەکی تێنەدەگەیشت، بەڵام کتێب خوێندنەوەکەی هێندە یارمەتی نەدا.
بیڵ بۆ چەند چرکەیەک لەناو دەرگاکەدا ڕاوەستا و بە چاوێکی پڕ لە چڵێسەوە تەماشایەکی سەرتاپای مێزەکانی کرد، بێ سێ و دوو ڕێک چووە سەر مێزەکەی لاورا و بەرامبەری دانیشت. ئەویش خۆی غەرق کردبوو لە کتێبەکەیدا و هێندە سەری بەسەردا شۆڕ کردبووە کە چیتر نەمدەتوانی ملی ببینم، بەهەرحاڵ بەهیچ شێوەیەک تەماشای (بیڵ)ی نەکرد. سیناریۆکە لە کیسەڵێکی دڵشکاو و تورە دەچوو کە بەناچاری سەری بخاتەوە ناو قاوغەکەی، بیرمە لەویادا کەمێک بەزەییم پێدا هاتەوە، بەڵام هاوکات لە دڵی خۆمدا وتم:
- ئەگەر لە فڕۆکەخانەکەدا هێندە ساردوسڕ نەبووایە بەرامبەر بە توێژەرەوەیەکی بواری بایۆلۆجی، ئێستا کاتێکی خۆشتری بەسەر دەبرد.
باشم لەیاد نییە، بەڵام خۆ پێی دەچێت لەو کاتەدا بەشێوەیەک لە شێوەکان چێژم لە شکستی ئەو بینیبێت.
هێدی هێدی لە مێزەکەی تەنیشتمەوە قسەکانیان بە شێوازێکی یەکلاکەرەوە دەردەبڕی. ئانا وتی:
چەند ملیارد ساڵێکی پێدەچێت تا مرۆڤێک ئافەریدە دەکرێت، کەچی لە ماوەی یەک

دوو چرکەدا دەمرێت.
زۆر بە هێواشی دەفتەری تێبینییەکەم لە گیرفانی کراسەکەمدا دەرهێنا، بەڵام بۆم دەرکەوت قەڵەمەکەم بیر چووبوو! زیاترێکیش پەست بووم کاتێک کە خۆسێ کەمێک دەنگی بەرز کردەوە و زۆر بەڕوونی ئەم وشە پڕ حیکمەتانەی هەڵڕشت:
- لە ڕوانگەیەکی بێ لایەنەوە بڕوانین، ئەم جیهانە نەک هەروەک دیاردەیەکی ناوازە و نەشیاو دێتە بەرچاو، بەڵکو بەردەوام وەک کێشە و گرفتێک ڕووبەڕوووی هزر دەبێتەوە. هەڵبەتە ئەمە ئەگەر هەر لە بنەڕەتدا هزرێک بوونی هەبێت، مەبەستم لەوەیە ئەگەر هزرێکی بێلایەن بوونی هەبێت. دەنگەکەی ناوەوە ئاوها دەڵێت. دەنگی جۆکەر بەو شێوەیەیە.
ئانا بە سەرلەقاندنێک قسەکانی پەسەند کرد، بەوەشەوە نەوەستا، بەڵکو لەلای خۆیەوە شتێکی خستە سەر وتەکانی و وتی:
- جۆکەر هەست دەکات کە خۆشی گەورە دەبێت، هەست بە گەشەسەندنی دەست و قاچەکانی دەکات، هەست دەکات شتێک نییە کە تەنها خۆی مەزەندەی بوونی خۆی بکات. هەست بە سەرهەڵدانی مینا و عاجی ناودەمە ئاژەڵییە شێوە مرۆییەکەی خۆی دەکات. لەژێر ڕۆبەکەی بەیانیانیدا هەست بە سوکی کێشی پەراسوی گیاندارە شیردەرەکەی خۆی دەکات. هەست بە ترپە ڕێکوپێکەکانی دڵی دەکات کە بەردەوام هەر لێدەدات و لێدەدات، بەو شێوەیەش وەک پەمپێک لەناو لەشیدا پاڵ بە شلەیەکی گەرمەوە دەنێت.
پێم وا نییە دوای ئەوە هێندە ڕوون بیرم کردبێتەوە، چونکە ڕێک هەستام و خۆم گەیاندە لای مێزی پیاوە ئینگلیزەکە، چوومە سەر مێزی ئەو پیاوەی کە بەرلەوەی نانی بۆ بهێنن، بەگوڕ تێبینی دەنووسی. ژەمە خواردنە سوکەڵەکەی پێش نانخواردنی سەرەکی تەواو کردبوو و قەڵەم و کاغەزەکەی لەلاوە دانابوو. سەرێکم بۆ لەقاند و وتم:
- ببورە... کەمێک لەمەوبەر بینیمیت شتت دەنووسی. دەکرێت بۆ ساتێک قەڵەمەکەتم بدەیتێ؟
زۆر بە گەرمی و بە چاوێکی پڕ لە پرسەوە تەماشایەکی کردم و وتی:
- زۆر بە خۆشحاڵییەوە، فەرموو ئەمە بەرە!
قەڵەمێکی ڕەشی مارکەی (پیلۆت)ی لە گیرفانی ناوەوەیدا دەرهێنا. وەک ئەوەی

شێوەی بەکارهێنانی نیشان بدات، یەک دوو چرکەیەک یاری پێ کرد و ئەوجا دایە دەستم.
منیش هەر بۆ دڵنیابوونی ئەو وتم:
- بێگومان بۆت دەهێنمەوە.
بەڵام ئەو وەک کەسێکی پڕ ئەزموون سەری بۆ ڕاوەشاندم و وتی: «ئەگەر شتێک هەبێت و بتوانم بەسەر خەڵکیدا بڵاوی بکەمەوە، بەتایبەتیش لە شوێنێکی دابڕاوی وەک ئێرەدا، ئەوا دەبێت قەڵەمی ڕەش بێت». منیش لە دڵەوە سوپاسم کرد، پاشانیش لەچاو یەکترناسینە سەرپێییانەکەی فرۆکەخانەکەدا، بەشێوەیەکی باشتر و قووڵتر خۆمان بە یەکتری ناساند.
هەوڵم دا بە چەند وشەیەکی کەم وەسفی بازنەی لێکۆڵینەوەکانی خۆمی بۆ بکەم. ئەو پیاوە گەورەیەش کە موی سەر کوڵمەکانی سپی بووبوون، زۆر بە سەرنجەوە، لە ڕاستیدا زۆر زۆر بە سەرنجەوە گوێی بۆ قسەکانم شل کرد. بێگومان منیش گەیشتبوومە تەمەنێک کە سەرنجی خەڵکانی ترم بەشێوەیەکی نوێ هەڵدەسەنگاند.
بۆ تەوقەکردن دەستی بۆ ڕاکێشام و خۆی پێ ناساندم و وتی:
- جۆن سپۆک، نووسەرم و خەڵکی بەریتانیام.
لەویادا پرسیم:
- لێرە لەسەر ئەم دوورگەیە دەنووسی؟
سەری بۆ ڕاوەشاندم و وتی:
- لەسەر حسابی (بی بی سی) هاتوومەتە ئێرە تا بەشداریی پرۆگرامێکی تەلەفیزیۆنی بکەم لەسەر هەزارەی نوێ.
ئینجا بە دەنگێکی ڕەخنەئامێز و ئایرۆنییەوە وتی:
- دەڵێن گوایە پاشەڕۆژ لێرەوە دەست پێ دەکات و ئەوجا پاش دوانزە سەعات هەزارەی سێهەم لە لەندەن سەرهەڵدەدات.
بەدەر لەوانەش ناوی یەک دوو ڕۆمانی خۆی پێ وتم کە لەوەوپێش نووسیبوونی و یەکێکیشیان وەرگێڕدرابووە سەر زمانی نەرویجی.
جارێکی تریش سوپاسم کردەوە بۆ قەڵەمەکەی و لەو کاتەدا کە خەریک بوو بەرەو مێزەکەی خۆم بگەڕێمەوە وتی:
- شتێکی جوان بنووسە...
بەپەلە ئاوڕم دایەوە، کەچی لەسەر قسەکانی بەردەوام بوو وتی:

- ... سەلامی منیش بگەیەنە!
نازانم ڤیرا، ڕەنگە هەر بۆ قسەکەی ئەو و لەبەرامبەر ئەو قەڵەمەیدا سەلامێکت لەو پیاوە ئینگلیزییە ڕۆح سوکەوە پێ بگەیێنم، هەرچەندە ئەگەر ڕاست بڵێین من لەو کاتەدا بۆ تۆم نەدەنووسی، بەڵام خۆ لە کاتی ئێستادا بۆ تۆ دەنووسم، تا باشترێک لەو ڕووداوە تێبگەیت کە چەند مانگێک دواتر لە (سالامانکا)دا ڕوویدا، باسی ئەو کاتەت بۆ دەنووسم کە لە یەکەمین ئێوارەدا لە (ماراڤیو پلانتەیشن ڕیسۆرت)دا ئەزموونم کرد.
(بیڵ) هەوڵێکی زۆری دا تا (لاورا) لە کتێبی (ئەستێرەی گەڕۆکی تاقانە) بکاتەوە. لەوەدەچوو لاورا بتوانێت بە کەمترین وشە کۆتایی بە گفتوگۆکان بهێنێت و بە ڕستەی کورت کورت وەڵامی پیاوی سەر مێزەکەی دەدایەوە کە بەردەوام بەگوڕەوە هەوڵی دەدا باسێکی دوورودرێژ و ئاسایی لەگەڵدا دابمەزرێنێت.
بووک و زاوا گەنجەکەش زۆر چلێسانە بەسەر قاپی زەڵاتەکەدا چەمابوونەوە و یەکتریان ماچ دەکرد، دیسانەوە ئەوەش خەیاڵمی خستەوە سەر کانیبالیزم. من خۆم سەر بە کەلتوورێکم کە لێسانەوە و ماچوموچی یەکتری وەک لایەنێکی کۆمەڵایەتی قبووڵ دەکات، تەنانەت ئەگەر لە شوێنێکی گشتیشدا بێت، وە تەنانەت ئەگەر لەسەر مێزێکی نانخواردنیش بێت، بەڵام ئەگەر چالاکیەکەیان بگاتە ئاستێک کە شتێکی وا ڕووبدات و بەهیچ جۆرێک چاک نەکرێتەوە، ئەوا لە کەلتوورەکەمدا دەچێتە بازنەی سنووری تابۆوە. پێم وابێت لە کەلتووری کۆنی فیجیدا ئەم حاڵەتە تەواو پێچەوانە بووبێت. ئەو کاتە خەڵکی لە شوێنە گشتییەکاندا یەکتریان نەلێساوەتەوە و ماچی یەکتریان نەکردووە، بەتایبەتیش لەسەر مێزی نانخواردن شتی وایان نەکردووە. کەچی لەبەرامبەردا ڕای گشتیی ئەو کاتە قبووڵی بووە کە ئۆرگان و ئەندامەکانی ناوەوەی مرۆڤێکی مردوو بخورێت.
پیاوە ئیتاڵییەکە دانیشتبوو و بە ماتییەکەوە چاوی بڕیبووە پەرداخی شەرابە سوورەکەی بەردەمی. بەڕوونی لەنێو هەمواندا وەک تەنهاترین کەسی ئەوێ دیاربوو. هەروەک سەگێکی بێ خاوەنیش هاتە بەرچاوم کاتێک کە بە لاچاوێک یەک دوو جار تەماشایەکی گەنجە ئەمریکییەکانی کرد.
گەڕامەوە سەر مێزەکەم و گوێم لێبوو خۆسێ شتێکی لەسەر (ڕووداوە سەیروسەمەرەکانی ڕۆژانە) دەربڕی. دوای ئەوە منگەمنگێکی دوورودرێژیان کرد و هیچیان لێ تێنەگەیشتم، بەڵام پاش کەمێک خۆسێ شتێکی وت و دیاربوو ئافرەتە

کراس سوورەکەی هەژاند، چونکە یەکسەر دوای قسەکەی خەندەیەکی گەورە کەوتە سەر لێوانی و خۆی قنج کردەوە، وەک ئەوەی قەناعەتێکی گەورەی بە خۆی هەبێت وتی:

- تاسەیەک جیهانی تەنیوە. هەتاوەکو شتەکانیش گەورەتر و مەزنتر بن، هەستی ڕزگاربوون لەو تاسەیە قووڵترێک دەبێتەوە. کێ گوێ لە تاسەی زیخێک دەگرێت؟ کێ گوێ بۆ تاسەی ئەسپێیەک شل دەکات؟ خۆ ئەگەر هیچ شتێک بوونی نەبووایە، ئەو کاتە هیچ کەسێک تاسەی هیچ شتێکی نەدەکرد.

بەپەلە یەک دوو جارێک تەماشای ئەملاولای هۆڵەکەی کرد، بەڵام یەکسەر ڕووی وەرگێڕایەوە و بەهیچ شێوەیەک پێی نەدەچوو سەرنجی ئەوەی دابێت کە من دانیشتبم سەرتاپای قسەکانی ئەو بنووسمەوە. ئەو نەیدەزانی کە من زمانی ئیسپانی دەزانم و هاوکاتیش دڵنیا نەبوو لەوەی کە گوێم لە تەواوی قسەکانیانە. بەدەر لەوانەش زۆر ڕێی تێدەچوو وابزانێت کە سەرقاڵی تێبینییەکانی خۆم بم، هەر بۆ نموونە خۆ پێی دەچوو شتێک دەربارەی ڕەگەزە جیاوازەکانی ئەو مارمێلکانە بنووسم کە لە بەشی خوارووی ئۆقیانووسی ئارامدا بینیبوومن.

دیسانەوە بۆ ماوەیەکی دووروودرێژ ڕەش و سوور بەهێواشی کەوتنەوە قسەکردن، منیش ناچار بووم بەو بەشە کەمە ڕازی بم کە بەرگوێم دەکەوت. ئانا بە چاوێکی پڕ لە پرسیارەوە تەماشایەکی برادەرەکەی بەرامبەری کرد و وتی:

- هەتاوەکو پەرییەکان زیاترێک لە عەدەمی هەتاهەتایی نزیک ببنەوە، قسەکانیان زیاترێک بێ مانا دەبێت.

ئەویش وتی:

- ئەگەر دڵدانەوەی ئەو قەشمەرە ناوازەیە نەبووایە، جیهانی پەرییەکان وەک بەهەشتێکی پڕ نهێنی ون دەبوو.

من وای بۆ چووم ئەو بەشە پچڕپچڕانەی بەرگوێم کەوت، چەند بەشێکی کەمی وێنەیەکی گەورەتر بێت، لە مۆزایکێک دەچوو کە بێگومان سەخت بوو بۆم بەو پارچە کەمانەوە دایبڕێژم، چونکە زۆر بەئاسانی چەندەها پارچەم نوقسان بوو. کەمێک دواتر خواردنیان خستە سەر مێزەکان و دەفتەری تێبینییەکەم وەلاوە نا. بیرم لەوە کردەوە ئەو بەشە کەمانەی کە گوێم لێ بوو، هیچ پەیوەندییەکیان بەیەکەوە نەبوو. بەهەرحاڵ، نانخواردن بەرەو کۆتایی دەچوو و ئەوجا خۆسێ دیسان دەنگی بەرز کردەوە و وتی:

- جۆکەر هەروەک سیخوڕێک لە حەکایەتەکەدا بێ وچان بە دزییەوە بەناو شەکرە پەرییەکاندا دەڕوات. دەگاتە چەند دەرئەنجامێک، بەڵام کەس شک نابات تا بۆی هەڵڕێژێت. تەنها جۆکەر دەزانێت کە خۆی چی دەبینێت. تەنها جۆکەر خۆی بەو شێوەیە دەبینێت کە هەیە.

ئانا بەرلەوەی وەڵامی بداتەوە، بۆ ساتێک بیری کردەوە و دواتر وتی:

- پەرییەکان بیر لە شتی سەخت دەکەنەوە. هێندە سەخت، کە خۆشیان ناتوانن بیریان لێ بکەنەوە. ئەوان ناتوانن ئەوە بکەن. ئێ خۆ وێنەکانی سەر شاشەیەکی سینەما، لە شاشەکەوە خۆیان هەڵنادەن و بە چەپ و ڕاستدا پەلاماری ئامێری پەخشکردنی وێنەکان بدەن. تەنها جۆکەر دەتوانێت ڕێگای خۆی لەنێوان ڕیزی کورسییەکاندا بدۆزێتەوە.

سوێند ناخۆم کە لەویادا کتومت ئەو وشانەیان لە زار کەوتە خوارەوە، بەڵام بەڕاستی باسی ئەو جۆرە شتانەیان دەکرد.

مێزەکانیان پاک کردەوە و پیاوە ئیتالییەکە بەرەو ڕووم هات. وەک ئەوەی بەربەرەکانێی ئانا و خۆسێ بکات، سەرێکی بۆ لەقاندن و بەپەلە خۆی گەیاندە سەر مێزەکەم، دەستێکی بۆ ڕاکێشام و خۆی پێ ناساندم. وەک وتم ناوی (ماریۆ) بوو و ماوەی پانزە ساڵ بوو بەڕێوەبەری جۆرە کۆمپانیایەکی بچکۆلەی دەریاوانی بوو کە لە شاری (سوڤا)وە دەردەچوو، لە ڕاستیدا هەر خۆشی یەختەکەی دروست کردبوو. ئەو ئیشەی شتێک نەبوو کە قەت پێشوەخت پلانی بۆ دانابێت، بەڵکو هەر ئەوەندە بوو کە پانزە- بیست ساڵێک لەوەوبەر بە پاپۆڕ لە کەناڵی سوێسەوە بۆ هیندستان و ئیندۆنیسیا و دوورگەکانی خوارووی ئۆقیانووسی ئارام سەفەری کردبوو، بەڵام تا ئەو کاتەش نەیتوانیبوو هێندە پارە کۆبکاتەوە کە بتوانێت دیسانەوە سەفەر بکاتەوە بۆ شاری ناپۆلی لە ئیتاڵیا.

بۆ شتێک هاتبوو بۆ لام و پرسی:

- تۆ یاری (بریج)[٣٤] دەکەیت؟

وابزانم هەروا بە گومانەوە شانێکم بۆ هەڵتەکاند. هەرچەندە لە ڕاستیدا من زۆر شارەزای یاری (بریج)م، بەڵام ڕێک ئەو ئێوارەیە خواستی یەکەمم ئەوە نەبوو کە یاری وەرەقە بکەم، بەتایبەتیش یەکێک بوو لە ئێوارە ئەفسووناوییەکانی ناوچە گەرمەکان، بەڵام هەر ئەوەندەی وتی: «لەگەڵ کوڕ و کچە ئیسپانییەکەدا یاری دەکەین، یەکسەر بێ سێ و دوو ڕازی بووم. ماریۆ وتی ئێوارانی پێشوو لەگەڵ

هۆڵەندییەکدا یاریان کردووە، بەڵام سەرلەبەیانی زوو ئەو هۆڵەندییە بە بەلەم سەفەری کردووە بۆ (ڤانوا لیڤیو)».

لەگەڵ ئیسپانییەکاندا دانیشتین و چەند دەستەیەک یاریمان کرد. هەموو دەستەیەکیش یان یەکسەر ئانا و خۆسێ دەیانبردەوە، یان لە دواهەمین پێڕدا لولیان دەکردین. ئەوان نەک هەر بە وردییەکی سەرسوڕهێنەرەوە یاریان دەکرد، بەڵکو بەشێوەیەکی هێندە هێمن و ئەفسانەیی یارییان دەکرد کە تاوناتاوێک پاڵیان دەدایەوە و لەگەڵ یەکدا یارییە شێتانەکەی خۆیان بە حیکمەتە ئیسپانییەکان دەکرد. من بەتایبەتی سەرنجم چووە سەر کۆمەڵێک دەربڕینی وەک (تەپڵە هەرە دێرینەکە)، (ئەو قۆزاخە بێ شەرمەی کە بە هەموو ئاراستەکاندا هەر گەورە دەبێت و گەورە دەبێت)، (گیاندارە شیردەرە زرنگەکە)، (زرِبراکەی نیاندەرتاڵ کە لە ئەندازەبەدەر خۆی دەردەخات)، (خەوی قووڵ و دوورودرێژی ژیانی ڕۆژانە)، (تەزوویەکی گەرمی کۆمەڵە وڕێنەیەکی نیوە هەزمکراو)، پلازمای ڕۆح، (ئەو باڵۆنە هەواییەی فیستیڤاڵی پرِۆتین دەپارێزێت)، (هارددیسکی ئۆرگانی)، (دەڵەمەی تێگەیشتن).

دوو کەڕەت لە یارییەکەدا دەستەکەیان هەڵهێنام، لەبەرئەوە بوارم بۆ ڕەخسا خۆم لە مێزەکە بدزمەوە و ئەو وشانە بنووسمەوە کە بەرگوێم کەوتن. هەر ڕاست و دروست لەو جۆرە وشانەیان دەوت. من لەلای خۆمەوە حاڵەتەکەی ئانا و خۆسێم دەستنیشان کردبوو و وەک دوو شاعیر دەمبینین کە تووشی نەخۆشی (تورێت)[٣٥] بووبن. خۆ ڕەنگە زۆر زۆر باشتر بمتوانیبایە یاری بکەم ئەگەر هێندە سەرنجم نەدایەتە ئەو وشانەی کە بە منگەمنگ لەنێوان باکوور و باشووردا دەوترا. وام بە خەیاڵدا هات کە مەبەستی ئەو قسە کورت کورتانەیان تەنها بۆ ئەوە بووبێت کە سەرنجی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا بشێوێنن.

دواجار ماریۆ بڕیاری دا کۆتایی بە یارییەکە بهێنێت. نامەوێت بڵێم وەرەقەکانی بەتوندی فڕێدایە سەر مێزەکە، بەڵام بەجۆرێک لەسەر مێزەکە داینان کە دایچڵەکاندم. بە بێزارییەکەوە سەری ڕاوەشاند و وتی:

– ئەوانە (کلاڤۆیانت)[٣٦]ن!

ئانا تا ئەندازەیەک بە چاوێکی تێکەڵ لە دڵڕەقی و خۆشحاڵییەوە تەماشایەکی کرد، ماریۆش هەوڵی دا کە من پشتی بگرم. تاڕادەیەک نەڕاندی و وتی:

– فەرموو پێنج وەرەقەی سینەک! بەڵام خۆ دوای ئەو فەڕەیە زۆر ڕێشی تێدەچوو

کە بللیەکە لە دەستی فڕانکدا بێت. ئێ لەوەدەچێت ئەم دووانە بەردەوام بزانن چیمان لەدەستدایە.
وام بەخەیاڵدا هات قسەکانی ڕاستتریێک بێت لەوەی کە خۆی مەزەندەی دەکرد، چونکە پێی دەچوو ئەو ژن و پیاوە، کە لەڕادەبەدەر تێکەڵ و گیانی بەگیانی بوون، بەڕاستی توانای ئەوەیان هەبێت کە بیرکردنەوەی یەکتری بخوێننەوە. لە دڵی خۆمدا بە جورئەتەوە بیرم کردەوە و وتم: «بۆ نا؟». لەویادا ئێمە چوار گیانەوەری بەئاگای سەر بە پۆلی شیردەرەکان بووین و لە ئێوارەیەکی ئەفسووناویی ناوچەیەکی گەرمدا لەژێر فەرشێکی پڕ بریقوباقی ئەستێرەی گەلەهەسارەی کاکێشانی خۆماندا دانیشتبووین کە تا ئەندازەیەک لە شێوەی لولپێچێکی بەرتەسکدا دەهاتە بەرچاو. لەم سەر زەوییەوە کە ئێمە بەهێواشی و بە سەختییەوە لە گیانەوەرە بڕبڕەدارە سەرەتاییەکانەوە گەشەمان کردووە، لەم دەریاچە تەنکە هیچەوە کە کەوتۆتە ناو کۆمەڵێک دوورگەی گەلەهەسارەییەوە، هاوڕەگەزەکانمان لە هەوڵێکی جیدیدا کەشتی ئاسمانی بێ مرۆیی و شەپۆلی ڕادیۆییان ناردۆتە دەرەوە تا بەشێوەیەک لە شێوەکان درک بە جۆرە پێگەیشتنێک بکەین لەگەڵ بوونەوەری بایۆلۆجی پێشکەوتووی وەک خۆمان، کە لە کۆمەڵەیەکی خۆریی تردان و چەندەها ساڵی تیشکی لەم بازنەیەی ئێمەوە دوورن - هەرچەندە پێشی دەچێت زۆر بەئاسانی زیاترێک لە گیانەوەری ئەستێرەی ئاوی بچن وەک لەوەی لە شێوەی گیانەوەرێکی شیردەری وەک خۆمان بن. کەواتە، باشە بۆچی دوو ڕۆحی دووانە، کە نەک تەنها هەر هەمان ژینگەی بایۆلۆجیان هەیە، بەڵکو لە هەمان ڕەگەز و خەڵکی هەمان شوێنیشن و بەدەر لەوانەش تا ئەندازەیەک بەردەوام دێن و دەڕۆن و خۆیان لە یەکتریدا دەبیننەوە، بۆچی نەتوانن چەند هێمایەکی ئەلیکترۆموگناتیسی سادە لەسەر مێزێکی یاریی کاغەز بۆ یەکتری بنێرن کە دەربارەی تەنها پەنجاو دوو ڕەنگ و ژمارەی جیاوازە؟ من هەر لەویادا هەستم بە خۆشی و نەشئەیەکی گەورەی شەوانی ناوچە گەرمەکان کرد، ئەوەش یەکەمین جارم نەبوو کە تووشی ئەو جۆرە هەستە تایبەتییە ببم و نەتوانم شتەکان بەئاسانی جودا بکەمەوە.
حاڵەتەکەشم یەکسەر بەرەو باشبوون نەچوو، چونکە لەویادا کۆمەڵێک پرسیاری تریش سەریان هەڵدا کە گرێدراوی ئەو بابەتە بوون: ئەگەر هەموو ئەوانەی لەسەر ئەو مێزە دانیشتبوون و یاری بریجیان دەکرد لە هەمان ئاستدا بوونایە، ئایا ئەو کاتە چەندە ڕێی تێدەچوو کە دەستەیەکیان هەشت یاری لەسەر یەک بەرێتەوە؟ ماریۆ

دەبویست وەڵامی ئەو پرسیارە بزانێت. من خۆم پێم وابوو هەمووی پەیوەندی بە دابەشکردنی وەرەقەکانەوە هەبێت، بەڵام لە ڕاستیدا شەنسی ئەوەی کە تیپێکیان هەشت کەڕەت لەسەر یەک وەرەقەی باشی بەر بکەوێت هەر زۆر زۆر کەمە، لەبەرئەوە لە هەموو بارێکدا باشتر بوو دان بەوەدا بنێین کە ئانا و خۆسێ باشترێک یاریان دەکرد.

ئانا چێژی لە بردنەوەکەیان دەبینی. تەنانەت هەوڵی نەدەدا کە خۆشبەختییە مەزنەکەشی بشارێتەوە و بەئاشکرا دیاربوو کە ئەوە یەکەمجاریان نەبوو کە یاری وەرەقە ببەنەوە. لەسەروو ئەوەشەوە وەک دڵدانەوەیەک دەستێکی خستە سەر شانی ماریۆ، ئەویش بە پەستییەکەوە هەوڵەکەی ڕەت کردەوە و شانی دوور خستەوە.

پاشان خۆسێ بابەتی (ئەگەر) و دابەشکردنی وەرەقەکانی بە شتێکەوە بەستەوە کە پەیوەندی بە زانستەکەی منەوە هەبوو. هێندەی بیرم بێت یەکەمجار پرسیاری لێ کردم و وتی:

- بە بڕوای تۆ گەشەسەندنی ژیانی سەر ئەم زەوییە تەنهاو تەنها لە ئەنجامی زنجیرەیەک گۆڕانکاریی کتوپڕی بایۆلۆجیی چاوەڕواننەکراوەوە سەری هەڵداوە؟ یاخود پێی دەچێت بەشێوەیەک لە شێوەکان جۆرە میکانیزمێک لەئارادا بێت کە زانستە سروشتییەکان بەسەریاندا تێپەڕیبێت؟»

هەروەها وتی:

- باشە بۆ نموونە بە بڕوای تۆ لە جێگەی خۆیدایە یان نا ئەگەر پرسیار دەربارەی مەبەست یان نیەتی شاراوەی گەشەسەندنی ژیان بوروژێنین؟

وابزانم لەویادا هەناسەیەکم هەڵکێشا، نەک هەر لەبەرئەوەی لە بنەڕەتدا پێم وابوو پرسیارەکەی ساویلکانە بێت، بەڵکو لەبەرئەوەی دیسانەوە ئاقاری بابەتەکەی بەرەو شتێک برد کە بەلای منەوە لەو ڕۆژەدا زۆر بابەتێکی هەستیار بوو. هەربۆیە وەڵامێکی شێوە کلاسیکی ناو کتێبی قوتابخانەکانم دایەوە و وام دانا بابەتەکە کۆتایی پێ هاتبێت، بەڵام وا نەشکایەوە، چونکە وتی:

- ئێمە دوو قاچ و دوو دەستمان هەیە، بەلایەنی کەمەوە وەک شتێکی گونجاو بەکاریان دەهێنین کاتێک کە لەسەر مێزێک دادەنیشین و یاری بریج دەکەین. هەروەها سوودێکی تایبەتی خۆشیان هەیە بۆ لێخوڕینی کەشتییەکی ئاسمانی بەرەو مانگ، بەڵام ئایا ئەوە شتێکی ڕێکەوتە؟

منیش لە وەڵامدا وتم:

- کەوتۆتە سەر ئەوەی تۆ مەبەستت چییە لە (ڕێکەوت). گۆڕانکارییە بایۆلۆجییە کتوپڕەکان بە ڕێکەوت ڕوودەدەن. پاشانیش هەمیشە ژینگە بڕیاری ئەوە دەدات کام یەکێک لەو گۆڕانکاریانە مافی ژیانیان هەبێت یان نا.

بەردەوامی بە قسەکانی دا و وتی:

- بەڵام ئایا تۆ پێت وایە کە سەرجەمی زنجیرە ڕێکەوتێک بووبێتە هۆی ئەوەی کە ئەم گەردوونە لە کاتی ئێستادا تاڕادەیەک جۆرە تێگەیشتنێکی دەربارەی مێژوو و درێژبوونەوەی خۆی لە کات و شوێندا هەبێت؟

خۆسێ دەستێکی ڕاوەشاند، هەروەک ئەوەی ئاماژە بۆ تاریکایی ئاسمان بکات. لە ڕاستیشدا هەر قسەی بۆ ئەو دەکرد.

خەریک بوو شتێک دەربارەی گۆڕانکارییە بایۆلۆجییە کتوپڕەکان و هەڵبژاردنە سروشتییەکان بڵێم، بەڵام فریا نەکەوتم و وتی:

- ئەگەر ئامانجەکە گەیشتن بە شێوەیەک لە شێوەکانی عەقڵێکی بابەتی بووبێت، ئەو کاتە گومانم هەیە کە کەم تا زۆر لەم ڕووخسارەی ئێستامان جیاوازتر بووینایە.

ئانا خەندەیەکی مەکراوی و پڕ نهێنی خستە سەر لێوانی. دەستێکی لە ملی خۆسێوە ئاڵاند و هەروەک ئەوەی بیەوێت بێدەنگی بکات، ماچێکی بچکۆلەی ڕوومەتی کرد. دواتریش ئاوڕێکی لە من دایەوە و وەک ئەوەی سەر بکاتە سەرم وتی:

- مەزەندەی ئەوە دەکات کە بوونەوەرە ئەقڵانییەکانی ئەستێرەکانی تری گەردوون دەبێت کەمێک لە ئێمە بچن، ئەم زۆر سەرقاڵی ئەو فیکرەیەیە.

یەکسەر وتم:

- کەواتە پێم وابێت بەهەڵەدا چووە.

بەڵام ئەو هەروا بەئاسانی خۆی نەدا بەدەستەوە و وتی:

- دەبێت ئەو بوونەوەرانە کۆئەندامێکی دەمارییان هەبێت و هەروەها بێگومان دەبێت خاوەنی ئۆرگانێکی بیرکردنەوەش بن. ئەمەش مەحاڵە پێی گەیشتبن ئەگەر دوو پەلی سەربەستیان نەبووبێت.

پرسیارم لێ کرد و وتم:

- بۆ دوو؟

لەویادا دڵنیا بووم کە قسەکانی من بەهێزترێک بوون، بەڵام ئەو بەردەوام بوو و وتی:

- چونکە دووان بەسە!

پاش ئەو قسەیەی بۆ یەکەمین جار هەستم کرد من دۆڕاوم. یان دەتوانم بڵێم بەلایەنی کەمەوە خاڵێکی وروژاند کە شڵەژاندمی. دوو دەست و دوو قاچ بەس بوون. بەڵێ بەس بوون، هەرچەندە زانستی تەجریبی بەو شێوەیە بیر ناکەنەوە کە لە ڕێگەی لۆجیکەوە بگەنە دەرئەنجامێک. باشە پێنج سەد ساڵێک لەمەوبەر نەبوو کە فەلسەفە بیرۆکەکەی ئەریستۆتالیسی ڕەت کردەوە کە ناوی نابوو (زانستی هۆی مەبەست؟)

خۆسێ بەردەوامی بە قسەکانی دا:

– لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتێکی زۆریشدا هێشتنەوەی پەلی زیاد لە پێویست هیچ سوودێکی نییە، بەتایبەتیش لە پاش تێپەڕبوونی چەندەها ملیۆن ساڵ.

لەپڕێکدا بۆقێکی کێوی بە بازبازۆکێ هاتە ناو بەر هەیوانەکەوە، وابزانم یەکێک بوو لەوانەی کە مەلەیان دەکرد. ئاماژەم بۆ کرد و بە کەمێک شانازییەوە وتم:

– ئێمە بۆیە دوو دەست و دوو قاچمان هەیە، چونکە زۆر بە ساکاری بە ڕەچەڵەک لەو بوونەوەرە چوارپەلانەوە هاتووین. هەروەها دەبێت سوپاسیشیان بکەین، لەبەرئەوەی خودی پێکهاتەی کۆئەندامی دەمارییمان لە مانەوە هاتووە. ئەم نموونەیە پێی دەگوترێت (بوفۆ)، وردتریش بیلێم ناوی (بوفۆ مارینوس)ە.

بۆقە کێوییەکەم بەرز کردەوە و ئاماژەم بۆ چاوەکانی و کونی لوتی و دەمی و زمانی و قورقوڕاگە و پەردەی گوێکانی کرد. باسێکی کەمی دڵ و سی و شادەمارەکانی و گەدە و زراو و پەنکریاس و جگەر و گورچیلە و هێلکەی گون و بۆری میزیم کرد. دواجاریش چەند تێبینییەکم دەربارەی پێکهاتەی پەیکەری ئێسکی و بڕبڕەی پشت و قەفەزەی سنگ و پێیەکانی وت. لەو کاتەشدا کە بۆقە کێوییەکەم بەردا، شتێکم دەربارەی گەشەکردن باس کرد هەر لە گیانەوەرە وشکاوەکییەکانەوە تا خشۆکەکان و دواتریش لە گیانەوەرە خشۆکەکانەوە تا باڵندە و گیانەوەرە شیردەرەکان.

بەڵام من خۆسێم بە کەم زانیبوو، چونکە دوای قسەکانم وتی:

– کەواتە گیانەوەرە وشکاوەکییەکان کۆمەڵێک وەرەقەی جوانیان لەدەستدا بووە. ویستویانە هەموو دەستە یارییەکان ببەنەوە. ئەوەش تەنها شەنس نەبووە. لەچاو هەموو ڕەگەزەکانی تری ئاژەڵدا پێشەوا بوون. هەموو ئەو مەرجانەیان تێدا بووە کە پێویست بوون بۆ خەلقکردنی مرۆڤ.

منیش وتم:

– چەند ئاسانە لەدوای ڕووداوەکان زیرەکانە بیر بکەینەوە.

لەسەر قسەکەی سوور بوو و وتی:
- درەنگیش بەوە بگەین باشترە لەوەی کە هەرگیز پێی نەگەین. بەهۆی دوو شتەوە ئێمە دوو دەست و دوو قاچمان هەیە. یەکەمیان لەبەرئەوەیە کە ئێمە بەرەچەڵەک لەو بوونەوەرە چوارپەلانەوە هاتووین. دووهەمیشیان لەبەرئەوەیە کە شتێکی گونجاو و لەبارە.
- ئەی چی ڕوویدەدا ئەگەر گیانەوەرە وشکاوەکییەکان شەش پەلیان هەبووایە؟
- ئەو کاتە یان لێرەدا دانەدەنیشتین و ئاوها بەشێوەیەکی ئەقڵانی لەگەڵ یەکتردا قسە بکەین، یاخود دووپەل لەو شەش پەلەی وشک دەبوو. کاتی خۆی ئێمە کلکمان هەبووە، کە بێگومان سوودی خۆی هەیە لە کۆمەڵێک چالاکیی گیانەوەرییدا، بەڵام دەبووە ڕێگرێک بۆ ئێمە کاتێک لەبەردەم کۆمپیوتەرێکدا یان لە کەشتییەکی ئاسمانیدا دادەنیشین.
هێندەی بیرم بێت، وابزانم کەمێک پاڵم دایەوە. خۆسێ تەنها باسی ئەو شتانەی دەکرد کە من بەردەوام لەو ماوەیەی دوادواییەدا بیرم لێ دەکردنەوە. ڤیرا، هەر بەشێوەیەکی گشتی چەند مانگێک لەدوای ئەو ڕووداوەی کە لەناکاوێدا تووشمان بوو، زۆر زۆر بیرم دەکردەوە. بۆچی دەبووایە سۆنیامان لەدەست بدایە؟ نازانم چەند کەڕەت ئەو پرسیارەم ڕووبەڕووی خۆم کردەوە. بۆچی نەمانتوانی سۆنیا بهێڵینەوە؟ ئەگەر یەکێک لە قوتابییەکانم لە وەڵامی تاقیکردنەوەیەکدا پرسیارێکی ئاوهای بوروژاندایە، ئەو کاتە ناچار دەبووم بیر لەوە بکەمەوە کە بیخەم، بەڵام ئێمە مرۆڤین و مرۆڤیش حەز لەوە دەکات بەدوای مانادا بگەڕێت، تەنانەت لەو شتانەشدا کە مانایان تێدا نییە.
وتم:
- بەلایەنی کەمەوە لەوەیاندا ڕاست دەکەیت کە لە دواجاردا گیانەوەرێکی جومگەدار ئاسمانی نەپشکنی. هەروەها گیانەوەرێکی سەر بە پۆلی نەرمۆڵەکانیش بەو کارە هەڵنەستا.
وەڵامی دامەوە و وتی:
- ئەوانەش کە ڕۆژێک لە ڕۆژان لە سیستەمێکی خۆری ترەوە ناسنامە پڕ نهێنییەکانی خۆیان لە ڕێگەی شەپۆلی ڕادیۆییەوە ڕەوانەی ئێمە دەکەن، بەهیچ جۆرێک ئەناتۆمییەکیان نییە کە لە هی ئەختەبووتێک یان هەزارپێیەک بچێت.
ئانا پێکەنی و وتی:

- بزانە، من چیم وت؟
ئانا و خۆسێ -پاشانیش ماریۆ- کۆمەڵێک پرسیاریان دەربارەی زانستی سروشت لێ کردم. وابزانم کاریگەریی ئەو شەوە گەرمە لێی دابووم و چێژم لەوە دەبینی کە لەبەرچاودا بم، هەربۆیە چەند گوتارێکی کورتم بۆ باس کردن کە دەربارەی هەندێک لە کێشە هەنووکەییەکانی بواری پالیۆنتۆلۆجی و بواری گەشەسەندنی بایۆلۆجی بوون، بەڵام هاوکاتیش بەرەبەرە زیاترێک شارەزای فیکری بەرامبەرەکەم بووم. خۆسێ چەند جارێک پرسیاری خۆشخۆشی لێ دەکردم و تا ئەندازەیەکی زۆر وەک پیشەکەم تووشی جۆرە شەرمەزارییەکی دەکردم. نامەوێت بڵێم ڕاست و دروست لە کاتی گفتوگۆکەماندا فێری شتێکی نوێ بووم، بەڵام وابزانم قووڵترێک لە هەموو ئەو گومانانە تێگەیشتم کە لە بواری زانستی سروشتیدا هەیە.
خۆسێ نەک هەر پێی وابوو ژیانی سەر ئەم زەوییە پرۆسێسێکی ڕاستەقینە بێت، بەڵکو پێشی وابوو بەردەوام پرۆسەیەکی پڕ ماناش بێت. ئاماژەی بۆ ئاگایی مرۆڤ کرد و وتی:
- خاسیەتێکی گرنگی ئاوها ناکرێت یەکێک بێت لەو خاسیەتە هەڕەمەکیانەی کە لە ڕێگەی ململانێی مانەوەی ژیانەوە سەری هەڵدابێت، بەڵکو دەبێت خودی مەبەستی گەشەکردن بێت. تا ئەندازەیەک دەتوانین بڵێین یاسایەکی سروشتی بووە کە ئەستێرەیەکی گەڕۆک ئۆرگانێکی هەستی هێندە تایبەتمەندی گەشە پێ داوە.
چەند نموونەیەکی نایابیشی دەربارەی ئەو پرۆسێسە هێنایەوە: هەروەک چۆن ژیانی سەر ئەم زەوییە چەندەها جار -وە بەبێ ئەوەی پەیوەندییەکی ناوەکی جینی هەبێت- گەشەی بە چاو و بینین داوە، وە هەروەک چۆن سروشت زیاد لە کەڕەتێک بەرز بۆتەوە بۆ ئاسمان، یاخود گەشەی بە توانای ڕۆیشتن داوە بە پێوە، بەهەمان شێوەش سروشت مەیلێکی شاراوەی تێدا بووە کە بەرەو ڕەهەندێکی ئەقڵانی بڕوات.
ئەو شتەی کە کەمێک نارەحەتی کردم، ئەوەبوو کە منیش لە کاتی گەنجیمدا لەو جۆرە وێنانەم لە خەیاڵدا بوو، ڕێک لەو کاتەدا بوو کە لەژێر کاریگەریی (پیرێ تایلهارد دی چاردن)دا بووم. بێگومان دواتریش کە دەستم دایە خوێندنی بایۆلۆجی، هەموو ئەو مەزەندانەم وەلاوە نا کە باس لە جۆرە پێشکەوتنێک دەکەن کە بەرەو مەبەستێکی دیاریکراو دەڕوات. هەر لەبەر خاتری زانست، هەستم کرد ئەرکی سەر شانمە کە کەمێک بەرەنگاری بۆچوونەکانی ببمەوە. ئاخر من نوێنەری دەزگایەکی

گەورە بووم، ڕەنگە هەر زۆر گەورە و ئالۆزیش.
من تەبا بووم لەگەڵیدا کە توانای بینین و فڕین و مەلەکردن و ڕۆیشتن بە پێوە، چەندەها جار لە مێژووی ژیاندا گەشەیان سەندووە. هەر بۆ نموونە چاو (٤٠ تا ٥٠) کەرەتێک داهێنراوە، وە مێرووەکانیش پتر لە سەد ملیۆن ساڵ لەپێش خشۆکەکانەوە گەشەیان بە باڵ داوە. یەکەمین گیانەوەری بڕبڕەداریش کە فڕی، مارمێلکە باڵدارەکان بوون. نزیکەی دوو سەد ملیۆن ساڵێک لەمەوبەر سەریان هەڵدا و لەگەڵ دایناسۆرەکاندا قڕیان تێکەوت. زیاترێکم ڕوون کردەوە و وتم: «مارمێلکە باڵدارەکان تاڕادەیەک هەروەک شەمشەمەکوێرە گەورەکان فڕیون. پەڕیان نەبووە و ڕێی تێناچێت ڕەچەڵەکی ئەو باڵدارانە بن کە ئەمڕۆکە بوونیان هەیە. بەتەمەنترین باڵندە -ئارکایۆپتیریێکس[٣٧]-ە کە نزیکەی (١٥٠) ملیۆن ساڵێک لەمەوبەر ژیاوە و لە ڕاستیدا دایناسۆرێکی بچکۆلە بووە. واتە پەرەسەندنی باڵ و پەڕ بەشێوەیەکی سەربەخۆ ڕوویداوە و بەتەواوەتی دوور بووە لە مارمێلکە باڵدارەکانەوە.
لەویادا خۆسێ قسەکانی پێ بڕیم و وتی:
- تۆ دەڵێیت پەڕوباڵ! ئایا ئەو شتانە لە ماوەی شەو و ڕۆژێکدا سەریان هەڵداوە؟ یان سروشت (دەزانێت) بەرەو کوێ دەڕوات؟
بە قسەکەی پێکەنیم. دیسانەوە دەستی خستەوە سەر کرۆکی ناتەباییەکە، پەنجەی خستە سەر خاڵێک کە یەکلاکەرەوە بوو، هەرچەندە ئەمجارەیان پێم وابوو پرسیارەکەی بەشێوەیەک کرد کە چاوەڕوانی وەڵامەکەی نەبوو.
وتم:
- نەخێر، لێرەدا باس لە زنجیرەیەکی دووروودرێژی گۆڕانکاری کتوپڕیی بایۆلۆجی دەکەین کە لە ماوەی هەزارەها نەوەدا ڕوویانداوە. وە تەنها یەک یاساش دەخوات: ئەو تاکە بوونەوەرەی لە ململانێی مانەوەی ژیاندا سیفەتێکی بچکۆلەی باشی هەیە، شەنسێکی زیاتری هەیە کە بتوانێت جینەکانی بگەیێنێتە نەوەکەی دواتری.
ئەو وتی:
- چ لایەنێکی باشی تێدایە ئەگەر تاکە بوونەوەرێک بنەمایەکی ناقۆڵای باڵ پەرە پێ بدات، ئەمەش لە کاتێکدا کە چەندەها وە چەندەها نەوەی دواتر دەردەکەوێت کە باڵەکان سوودێکی وایان هەیە یان نا؟ ئایا جۆرە باڵێکی گەشەنەسەندووی ئاوها ڕێگری نابێت؟ لێرەشەوە ئەو بوونەوەرە کەمترێک دەتوانێت هەم هێرش بکات و هەم بەرگریش لە خۆی بکات.

هەوڵم دا وێنەی خشۆکێک بکێشم کە بەسەر درەختێکدا سەردەکەوێت تا ڕاوی مێش و مەگەز بکات. تەنانەت بچووکترین بنەمای سەرهەڵدانی پەڕ -لە بنەڕەتدا لە پوولەکەوە هاتووە و شێوەکەی شێواوە- یەکسەر سوود بە بوونەوەرەکە دەگەێنێت کاتێک کە دەیەوێت لەسەر قەدی درەختەکەوە خۆی هەڵبدات یان بێتە خوارەوە. وە هەتاوەکو ژمارەی ئەو پوولەکانەش کە شێوەکانیان تێکچووە زیاترێک بێت، زیاترێک دەتوانێت خۆی هەڵبدات، باڵەفرکێ بکات یان لە شەقەی باڵ بدات، بەو شێوەیەش نەوەکانی دوای ئەو شەنسێکی زیاتریان هەیە کە گەورە ببن. تەنانەت سەرهەڵدانی یەکەمین بنەمای سەرەتایی قاچێک کە بۆ مەلە بشێت[٣٨]، ڕەنگە سوودێکی گرنگ بەو گیانەوەرە بگەێنێت کە هەموو ژیانی یان بەشێک لە ژیانی لەناو ئاودا بەسەر دەبات. گەڕامەوە سەر گەشەسەندنی پەڕ و ئاماژەم بۆ ئەوە کرد کە لە دواجاردا پەڕەکان ڕۆڵێکی گرنگ دەبینن لە جێگیرکردنی پلەی گەرمای لەشی باڵندەکەدا، هەرچەندە لە بنەڕەتدا مەبەستی سەرهەڵدانیان ئەوە نەبووە. لەوانەیە سوودمەندیی سەرەتایی سەرهەڵدانی پەڕ پەیوەندی بە جووڵەی گیانەوەرەکەوە هەبووبێت، بەڵام ڕیزبەندی پێچەوانەی ڕووداوەکانی تریش ڕێی تێدەچێت. بۆ نموونە ڕەنگە لە سەرەتادا سەرهەڵدانی پەڕەکان سوودی خۆیان هەبووبێت لە ڕاگرتن و ڕێکخستنی پلەی گەرمای لەشی باڵندەکان و دواتر ڕۆڵی گەورەی لە جووڵەی گیانەوەرەکەدا بینیبێت. بێگومان دۆزینەوەی پاشماوەی دایناسۆری پەڕدار لەم دوادواییەدا، بەڵگەیەکە کە بەو ئاراستەیەماندا دەبات.

لەویادا خۆسێ وتی:

– ئینجا شەمشەمەکوێرەکان هاتن، ئەوانیش جۆرە گیاندارێکی شیردەر بوون کە لە دواجاردا فێری فڕین بوون.

وتم بواری ئاسمانی ئەو کاتە بەهۆی باڵندەوە هێندە گیرا بوو کە شەمشەمەکوێرەکان ناچار بوون لە شەودا ڕاو بکەن، چونکە شەمشەمەکوێرەکان تەنها پەرەیان بە گەشەسەندنی باڵ نەداوە، بەڵکو گەشەیان بە توانایەکی تریش داوە کە ئێمە پێی دەڵێین (دەستنیشانکردنی شوێنێک بەهۆی زایەڵەوە).

خۆسێ وەڵامی قسەکەی دامەوە و وتی:

– کەواتە وەک مەسەلەی مریشک و هێلکەکەی لێهات، کامیان لەپێش کامیانەوە هاتوون: دەستنیشانکردنی شوێنێک بەهۆی زایەڵەوە یان خودی توانای فڕین؟

فریانەکەوتم وەڵامی بدەمەوە، چونکە لەو کاتەدا (لاورا) هاتە سەر مێزەکەمان و

لەلامان دانیشت. تا ئەو کاتەی کە دواهەمین جار لە یارییەکەدا (دەستەکەی من کەشف بوو)، لاورا نەیتوانی خۆی لە دەستی بیلّ ڕزگار بکات، بەڵام نیگایەکی تێگرتم و وا تێگەیشتم کە لە تەنگانەدایە، زیاترێک لەوە دەچوو داوای لێبوردن بکات، چونکە بەشێوەیەکی ساردوسڕ لە فرۆکەخانەکەدا خۆی نیشانی دام. مەشروبێکی سووری بەدەستەوە بوو و بۆ ماوەی یەک دوو دەقەیەک لەبەردەم مێزی بارەکەدا وەستا، دواتر بەرەوڕوومان کەوتە ڕێ و لەو کاتەدا ڕووم تێ کرد و داوام لێ کرد لەسەر مێزەکەمان دابنیشێت، چونکە من لە شوێنێکی گەرموگوڕدا دانیشتبووم. ماریۆش کورسییەکی لە مێزەکەی تەنیشتمانەوە هێنا.

خۆسێ دیسانەوە دەستی پێ کردەوە و وتی:

– نموونەی ئەستێرەیەکی گەڕۆکی زیندووم نیشان بدە...

لاورا قسەکەی پێ بڕی و وتی:

– ئەمەتا!

لاورا بە کەیفخۆشییەوە ئاماژەی بۆ ناو داری گوێزە هیندییەکان کرد، هەرچەندە دونیا هێندە تاریک بوو کە نەمانتوانی هیچ شتێک ببینین. لەویادا نیشانەی (ڕێکخراوی جیهانی پاراستنی ژینگە)کەیم بیر کەوتەوە کە لەسەر کۆڵەپشتەکەی بوو.

خۆسێ پێکەنی و وتی:

– ڕاستە، بەڵام نموونەی ئەستێرەیەکی گەڕۆکی زیندووی ترم بدەرێ. من بەتەواوەتی دڵنیام لەوەی کە ئەمڕۆ بێت یان سبەی ئەو شتە ئافەریدە دەکات کە ئێمە پێی دەڵێین (ئاگایی).

لاورا شانێکی بۆ هەڵتەکاند و خۆسێش بەردەوامی بە قسەکانی دا:

– بۆ ئەوەی پێچەوانەی ئەو بڕوایەم بسەلمێنین، ناچارین جۆرە ئەستێرەیەکی گەڕۆک بدۆزینەوە کە جمەی بێت لە ژیان بە هەموو شێوە و جۆرەکانییەوە، بەڵام هەرگیز کۆئەندامێکی دەماری ئاوها ئاڵۆزی تێدا گەشە نەکردبێت کە بەیانییەک لە بەیانییەکان یەک دووانێکیان خەبەریان ببێتەوە و بۆ نموونە توانای بیرکردنەوەیان هەبێت و بڵێن (پرسیارەکە لەوەدایە کە هەبین یان نەبین) یان بڵێن (من بیردەکەمەوە، کەواتە من هەم).

ئینجا لاورا پرسی:

– پێت وانییە ئەم وێناکردنەت شتێک بێت کە تەنها لەناو بازنەی مرۆڤدا بخولێتەوە؟ ئێ خۆ سروشت تەنها لەبەرخاتری ئێمە بوونی نییە.

لەو کاتەدا خۆسێ هەڵچووبوو و وتی:
- هەر ئەستێرەیەکی گەڕۆکی زیندووم بدەرێ تا بەوپەڕی خۆشحاڵییەوە کۆمەڵێک چاوی زیندووی یەکجار زۆرت نیشان بدەم. کەمێک چاوەڕوان بە و بەرلەوەی هیچ شتێک دەربارەیان بزانین، بۆمان دەردەکەوێت کە چاومان بڕیوەتە ڕۆحێکی زیندوو کە دەتوانێت خۆیمان پێ بناسێنێت.
دیسانەوە ئانا بەهانایەوە هات و وتی:
- مەبەستی لەوەیە هەموو ئەو ئەستێرە گەڕۆکانەی کە ئەو هەلومەرجە تایبەتیانەیان تێدایە، درەنگ یان زوو دەگەنە جۆرێک لە جۆرەکانی ئاگایی. ڕەنگە ئەو ڕێگایەی کە لە خانەیەکی زیندووەوە دەگاتە ئۆرگانێکی ئاڵۆزی وەک ئێمە زۆر زۆر جیاواز بێت، بەڵام مەبەستی کۆتایی هەر هەمان شتە. گەردوون دەیەوێت لە خۆی تێبگات و ئەو چاوەی کە دەڕوانێتە گەردوون، چاوی خودی گەردوون خۆیەتی.
لاورا وتی: «ڕاست دەکەیت» و سەرلەنوێ قسەکەی ئانای دووبارە کردەوە:
- ئەو چاوەی کە دەڕوانێتە گەردوون، چاوی خودی گەردوون خۆیەتی.
بەدرێژایی ئێوارەکە من هەر بیرم لەوە دەکردەوە لە چ شوێنێک لەوەوبەر ئانام بینیوە، بەڵام هیچ شتێکم لەو بارەیەوە بە خەیاڵدا نەهات. لەبەرئەوە ناچاربووم هەوڵ بدەم زیاترێک بیناسم.
پرسیم:
- ئەی تۆ خۆت لەو بارەیەوە چی دەڵێیت؟ خۆ دەبێت خۆشت بڕوات بە شتێک هەبێت.
بۆ ماوەیەکی باش بیری لە پرسیارەکەم کردەوە و زۆر بە ڕوونی وەڵامەکەیم لە یادە کە وتی:
- ئێمە لەتوانامان‌دا نییە کە بزانین خۆمان چین. ئێمە ئەو مەتەڵەین کە کەس ناتوانێت‌هەڵیبهێنێت.
- ئەو مەتەڵەین کە کەس ناتوانێت هەڵیبهێنێت؟
دیسانەوە بۆ ماوەیەکی دووروودرێژ بیری کردەوە و پاشان وتی:
- ئەوە تەنها ڕای تایبەتی خۆمە.
بۆ ساتێکی زۆر کەم تەماشای چاوی کردم و وتی:
- من بوونەوەرێکی خوایانەم.
وابزانم بەدەر لە خۆسێ، تەنها من تێبینیی ئەوەم کرد کە قسەکەی بە خەندەیەکی

پڕ نهێنییەوە وت. پێی ناچێت ماریۆ هەستی بەوە کردبێت، چونکە چاوی داپچڕی و پرسی:

- کەواتە تۆ خودایت؟

ئانا زۆر بەدڵنیاییەوە سەری لەقاند و وتی:

- بەڵێ گەورەم. من ئەوەم.

هەر زۆر بە دڵنیاییەوە وەڵامی دایەوە، بەڕاستی وەک ئەوە بوو پرسیاری لێ کرابێت کە خەڵکی ئیسپانیایە یان نا. جا بۆچی دوودڵ بێت؟ ئانا جۆرە ئافرەتێک بوو کە شانازی بە خۆیەوە دەکرد و هیچ هەوڵی نەدا ڕەچەڵەکە ئۆروستۆکراتییەکەی خۆی پەردەپۆش بکات.

ماریۆ ڕازی بوو بە قسەکانی و وتی:

- شتێکی خراپ نییە. پیرۆزە.

دوای ئەو وشانەی هەستایە سەر پێ و بەرەو لای بارەکە ڕۆیشت. وابزانم تا ئەو کاتەش هەر بیری لە یاری وەرەقەکە دەکردەوە. بەلایەنی کەمەوە پێم وابێت هۆی دۆڕاندنی هەموو یارییەکانی بۆ ڕوون بووەوە.

لەویادا ئانا لەپڕێکدا دایە قاقای پێکەنین. نەمزانی بۆچی پێدەکەنێت، بەڵام پێکەنینەکەی ئێمەشی گرتەوە و پاش نەختێک هەموومان پێکەنین.

ئینجا (جۆن) بە خۆی و پەرداخێک بیرەوە بەرەو لامان هات. ئاگام لێبوو پێشتر کەمێک لەگەڵ کوڕ و کچە ئەمریکییە گەنجەکاندا قسەی کرد، بەڵام هاوکات بەردەوام بە دەوری ئێمەوە بوو و دڵنیاشم بەشێکی زۆری قسەکانمانی گوێ لێ بووبوو.

کورسیی زیاترمان هێنایە سەر مێزەکە و پاش کەمێک ژمارەمان بوو بە شەش کەس، چونکە هێندەی پێ نەچوو کە ماریۆ بە خۆی و پەرداخێک براندییەوە گەڕایەوە سەر مێزەکە، بەدەم خۆیەوە یەکێک لە ئاوازەکانی (پوتشینی ئاریا)ی دەگوت، وابزانم ئۆپێرای (خانمی پەپوولە) بوو. پاش گەڕانەوەی ئینجا خۆی بە لاورا ناساند و دوای ئەوەش لاورا خۆی بە ئانا و خۆسێ ناساند.

جۆن وتی:

- بەبێ ویستی خۆم گوێم لێبوو باسی (مانا) یان (ئامانج)ی شتەکانتان دەکرد. تا بڵێیت باسێکی نایابە، بەڵام بە بڕوای من بەشێوەیەکی گشتی گرنگە لە ڕەهەندەکانی ڕابردووەوە ئەم جۆرە پرسیارانە هەڵبسەنگێنین.

هیچ یەکێکمان لە مەبەستەکەی تێنەگەیشتین، ئەویش هەر زۆر بەلایەوە ئاسایی بوو

و درێژەی بە قسەکانی دا و وتی:
– زۆرجار مانای ڕووداوێکی دیاریکراو پاش ماوەیەکی زۆر بەسەر ڕوودانیدا دەردەکەوێت. واتە ماوەیەکی زۆر تێدەپەڕێت و ئینجا هۆی ڕوودانی شتێکی دیاریکراو دەردەکەوێت. هۆکەشی هەر زۆر بە ساکاری بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە هەموو پرۆسێسێک تەوەرەیەکی زەمەنی هەیە.
تا ئەو کاتەش قسەکانی سەرنجی هیچمانی ڕانەکێشا، تەنانەت کەسمان سەرێکیشمان بۆ نەلەقاند. بەڕاست، کەسیش بە ئەدەبەوە هانی نەدا کە قسەکانی زیاترێک ڕوون بکاتەوە، بەڵام ئەو بێباکانە درێژەی بە قسەکانی دا و وتی:
– تەنها مەزەنەی ئەوە بکەن کە ئێمە شاهیدی ئەو شتانە بووینایە کە بۆ نموونە سێ سەد ملیۆن ساڵ لەمەوبەر لەسەر ئەم زەوییەدا ڕوویانداوە. دڵنیام فرانک دەتوانێت وێنەیەکی ئەو کاتەمان بداتێ.
منیش یەکسەر تەحەداکەیم قبووڵ کرد و وتم: «ئەو کاتە لە کۆتایی سەردەمی (خەڵوزی)[39]دا بووین»، ئینجا کەمێکم دەربارەی ژیانی ڕووەک و یەکەمین مێش و مەگەزی باڵدار باس کرد، هەروەها بەتایبەتیش باسێکی بچکۆلەی هەرە هەرە سەرەتاییترین خشۆکم کرد کە هێدی هێدی گەشەیان بە خۆیان داوە، ڕێک لەو کاتەدا کە ژینگەی زەوی لەچاو سەردەمی دێڤۆن و سەردەمی سەرەتایی خەڵوزیدا وردەوردە زیاترێک وشک دەبووەوە. بەدەر لەوانەش وتم: «لەو کاتەدا وە لەناو گیانەوەرە بڕبڕەدارەکانی سەر زەویدا گیانەوەرە وشکاوەکییەکان زاڵترێک بوون».
لەویادا جۆن قسەکەی پێ بڕیم و وتی:
– کەواتە لەو کاتەدا گیانەوەری گەورە گەورەی وشکاوەکی هاوشێوەی مارمێلکەی ئاوی لەنێو داری سەرخەس[40] و ڕووەکە لاولاوەکاندا بە خشەخش ڕێیان کردووە، بەڵام هاوکاتیش تاکوتەرای کۆمەڵێک خشۆکی تریشیان لەگەڵدا بووە، لەنێوانیاندا ئەوانەی کە دواتر بوونەتە سەرچاوەی ڕەچەڵەکی ئێمە. ئەگەر ئێمە لەو کاتەدا لەو ژینگەیەدا بووینایە، ئەوا بەدڵنیاییەوە هەموو ئەو شتانەی کە دەمانبینی پڕاوپڕ بە شتێکی بێ مانامان دادەنان. تەنها لەم سەردەمەی ئێستاماندایە کە مانای هەموو ئەو شتانە دەردەکەوێت کە لەو کاتەدا ڕوویانداوە.
ماریۆ پرسی:
– مەبەستت لەوەیە ئەگەر کاتی خۆی ئەو ڕووداوە ڕووینەدایە، ئێستاکە ئێمە لێرەدا دانەدەنیشتین؟

جۆن سەرێکی بۆ لەقاند و ئینجا من وتم:
- بەڵام خۆ ناتەوێت بڵێیت ئێمە هۆکاری ئەو ڕووداوەین کە سێ سەد ملیۆن ساڵ لەمەوبەر ڕوویداوە؟
بەئاشکرا دیاربوو خۆسێ قسەکانی جۆنی بەرز دەنرخاند، ئیشارەتی بۆ کرد کە بەردەوامی بە قسەکانی بدات و جۆن وتی:
- تەنها شتێک کە من مەبەستمە بیڵێم ئەوەیە کە سێ سەد ملیۆن ساڵێک لەمەوبەر هەر زۆر زۆر زوو بوو بۆ ئەوەی دەرئەنجامێکی وا دەربهێنین و بڵێین ژیانی سەر ئەم زەوییە بێمانایە، یاخود هیچ مەبەستێکی نییە. ئەو کاتە هەر ئەوەندە بووە کە ئامانجی ژیان هێندە پێنەگەیی بوو.
منیش پرسیم:
- ئەی ئامانجەکە چی بوو؟
وەڵامی دامەوە و وتی:
- سەردەمی دێڤۆن نموونەی حاڵەتی کۆرپەڵەی ئەقڵ بوو. بە بڕوای من دەبێت بواری ئەوەمان پێ بدرێت کە باسی ئامانجی کۆرپەڵەیەک بکەین، چونکە من هەروا بەئاسانی بڕوا بەوە ناکەم کە چەند حەفتەی یەکەمی دووگیانی خۆی لە خۆیدا هیچ ئامانجێکی هەبێت، بەلایەنی کەمەوە بەنیسبەت کۆرپەڵەکەوە هیچ ئامانجێکی نییە. بەهەمان شێوەش هەر زۆر زووە بۆ ئەوەی بڕوا بە وەڵامێکی پڕاوپڕ بهێنین کە مانای ژیانی ئێستای خۆمانمان بۆ ڕوون بکاتەوە.
لاورا پرسیارێکی کرد و وتی:
- واتە تۆ لەو بڕوایەدایت کە هێشتا بەڕێوە بین؟
دیسانەوە سەری لەقاندەوە و وتی:
- ئەمڕۆکە ئێمە لە بەرەی پێشەوەداین، بەڵام هێشتا نەگەیشتووینەتە ئامانجی کۆتایی. پاش سەد یان هەزار یان ملیارد ساڵی تر دەردەکەوێت بەرەو کوێ دەڕۆین. بەهەمان شێوەش ئەو شتەی کە لە داهاتوویەکی زۆر دووردا دەردەکەوێت، بەشێوەیەک لە شێوەکان هۆکاری ئەو شتەیە کە لە کاتی ئێستا و ئێرەدا ڕوودەدات.
پاشان زیاترێک تیشکی خستە سەر (حاڵەتی کۆرپەڵەی ئەقڵ) و لەو بارەیەوە قووڵترێک مەبەستی خۆی ڕوون کردەوە، وابزانم بەلای زۆرینەی ئەوانەی لەسەر مێزەکە بوون، قسەکانی وەک یاری فەنتازیای نووسەرێک دەبینرا کە بە دیدەکانی دەیکات:

- بەڵام بەیارمەتیتان با زیاترێک بگەڕێینەوە بۆ دواوە. گریمان شاهیدی خودی سەرهەڵدان و دروستبوونی ئەم سیستەمی خۆرەی خۆمان بووینایە. بڵێیت ئەو کاتە بەشێوەیەک لە شێوەکان ناڕەحەت نەبووینایە کە بە ناچاری ئەو نمایشە لەڕادەبەدەر ناشیرین و بێ مانا و کوێرانەیەی هێزی سروشت ببینین؟ ڕەنگە زۆربەی هەرەزۆری خەڵکی سوێندیان بخواردایە کە شاهیدی شتێکی هەتا بڵێیت بێ مانا بوون. من ئەوە وەک بەرپەرچدانەوەیەکی هەر زۆر بەپەلە دەبینم.
ئانا و خۆسێ هەردووکیان سەریان بۆ لەقاند و ئەویش بەردەوامی بە قسەکانی دا:
- یاخود دەتوانین هەنگاوێکی تریش بگەڕێینەوە دواوە. مەزەندەی ئەوە بکەن کە خودی تەقینەوە گەورەکەمان ببینیبایە، هەڵبەتە مەبەستم لە سەرەتای سەرهەڵدان و دروستبوونی گەردوونە، ئەو کاتەی کە کات و شوێن خەڵق کران. ئەگەر من بە چاوی خۆم ئەوەم ببینیبایە، ئەو کاتە پێم وایە تا ڕادەی ڕشانەوە قێزم دەکردەوە، چونکە دەمپرسی: بڵێیت ئەم زیادەڕۆییە لە تەقاندنی فیشەکەشێتەدا هیچ ئامانج و سوودێکی هەبێت؟ ئەمڕۆکەش دەڵێم هۆی ئەو تەقینەوە گەورەیە ئەوەیە کە ئێمە دەتوانین لەسەر ئەم مێزە دابنیشین و بیری لێ بکەینەوە.
لەویادا لاورا بە دەنگی بەرز وتی:
- ئێمە! بۆچی هەمیشە دەڵێیت ئێمە؟ بۆچی ناڵێیت بۆقێک یان ورچێکی پاندا؟
جۆن تەماشایەکی کرد و وەک ئەوەی پوختەیەکی قسەکانی بڵێت وتی:
- ئەوانەی کە دەڵێن هیچ مانایەک لە پشت هەبوونی گەردوونەوە نییە، ڕەنگە بەهەڵەدا چووبن. من بۆ خۆم زۆر بەڕوونی وایدەبینم کە مەبەستێک یان ئامانجێک لە پشت تەقینەوە گەورەکەوە هەبووە، هەرچەندە بەلایەنی کەمەوە مەبەستەکە بەلای ئێمەوە شاراوە بووە.
ناڕەزایی خۆمم بەرامبەر قسەکانی دەربڕی و وتم:
- وابزانم تۆ شتەکان هەڵدەگێڕیتەوە. هەمیشە کە باس لە (هۆ) دەکەین، مەبەستمان لە شتێکە کە لە ڕابردوودا ڕوویداوە. واتە بەهیچ شێوەیەک (هۆ) شتێک نییە کە سەر بە داهاتوو بێت.
بە لاچاوێک سەیرێکی کردم و وتی:
- بە بڕوای من لەو خاڵەدا بەهەڵەدا دەچین، بەڵام با ڕوانگەکان هەڵبگێڕینەوە: ئەگەر ژیانی سەر ئەم زەوییە لە گیانەوەرە وشکاوەکییە سەرەتاییەکانەوە گەشەی نەکردایە، ئەو کاتە دەمانتوانی بڵێین ژیانی سەر ئەم زەوییە هیچ و بێ مانایە،

بەڵام ئەو کاتە کێ ئەو ئەرکەی دەخستە سەر شانی خۆی و وەک بۆقێک هاوشانی کەسێکی وەک جان پۆڵ سارتەر دەوەستایەوە؟

دیاربوو لاورا کاتی ئەوەی نەبوو کە ئەو بیرۆکانە هەڵبسەنگێنێت. زۆر بە توندی تەماشای جۆنی کرد و وتی:

- ئەو کاتە بۆقەکان هەر بۆق دەبوون. هەروەک چۆن ئێستاکە مرۆڤ مرۆڤە، ئەو کاتەش هەروا دەبوو. من وای نابینم هیچ مانایەکی کەمتری هەبووایە.

وەک ئەوەی جۆن لەگەڵیدا تەبا بێت، سەرێکی بۆ لەقاند و وتی:

- ڕاست دەکەیت، ئەو کاتە بۆقەکان بۆق دەبوون و هەر ئەو شتانەشیان دەکرد کە بۆقەکانی ئێستاکە دەیکەن، بەڵام ئێمە مرۆڤین و ئەو شتانە دەکەین کە ئێستاکە مرۆڤ دەیانکات. ئێمە پرسیار دەکەین و دەڵێین ئایا مانایەک یاخود مەبەستێک لە پشت شتەکانەوە هەیە یان نا. کە من دەڵێم ژیانی سەردەمی دێڤۆن لە ڕاستیدا پڕ بووە لە مانا، مەبەستم لە مانایە بەلای ئێمەوە نەک بەلای بۆقەکانەوە.

دیاربوو قسەکانی جۆن لاورای سەرسام نەکرد، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا وتی:

- من بەشێوەیەکی تەواو جیاواز دەیبینم. هەموو ژیانی سەر زەوی وەک یەک پڕ مانایە.

لەویادا نەمزانی تا چ ڕادەیەک جۆن بە جیددی قسە دەکات. ئینجا وتی:

- بێگومان هەر بە ڕێکەوتێک بواری ئەوەش هەبووە کە هیچ جۆرە ژیانێک بە هیچ شێوەیەک لەسەر ئەم زەوییە سەری هەڵنەدایە. ئەو کاتە هەر زۆر بەئاسانی دەمانتوانی بڵێین ئەم زەوییە بەدەر لە هەبوونی خودی خۆی زیاتر، هیچ جۆرە مەبەستێکی قووڵی تری نەبووە، بەڵام ئەو کاتە کێ ئەوەی بگوتایە؟

هیچ وەڵامێکی قسەکانی نەدرایەوە و وەک دەرئەنجامێک وتی:

- ئەگەر تەقینەوە گەورەکە نەبووایە، ئەو کاتە هەموو شتێک بەتەواوەتی بەتاڵ و بێ مانا دەبوو. ئەو کاتە هەموو شتێک هەر بەتاڵیی دەبوو و هیچی تر، لە ڕاستیدا بەتاڵییش کەمترێک هەست بە بێ مانایی دەکات وەک لە بۆق و مارمێلکەی ئاوی.

سەرنجم دا ئانا و خۆسێ بەردەوام نیگایان دەگرتە یەکتری و لەژێرەوە بەستمەوە بەو حیکمەتە سەیروسەمەرانەوە کە لەسەر دوورگەکە بە زمانی ئیسپانی دەیاندا بە گوێی یەکتریدا. لە دڵی خۆمدا وتم: «بڵێیت هیچ پەیوەندییەک لەنێوان ئەو دوو لایەنەدا هەبێت؟ بڵێیت پێش وەخت ئەم یارییە ڕێک نەخرابێت؟ خۆ ڕەنگە جۆن ئەو حیکمەتە سەرسوڕهێنەرانەی هۆنیبێتەوە، کێ دەزانێت؟ باشە شتێکی هەر زۆر

سەیر نییە کە نزیکەی هەموو میوانەکانی ماراڤیو باسی هەمان بابەت دەکەن؟»
بۆ ئەوەی یەکترناسینەکە پڕاوپڕتر بێت، ئانا پرسیاری لە لاورا کرد و ویستی بزانێت خەڵکی چ وڵاتێکە. ئەویش لە وەڵامدا وتی:
- لە بنەڕەتدا خەڵکی (سان فرانسیسکۆ)م و وەک خوێندنیش مێژووی هونەرم تەواو کردووە.
هەروەها وتی:
- بۆ ماوەیەک وەک ڕۆژنامەنووسێک لە (ئادیلایدی) ئیشم کردووە، بەڵام لەم دوادواییەدا وەک بەخشیشێک کارێکم لە دەزگایەکی ژینگەپارێزی ئەمریکی وەرگرتووە. زیاترێکیش وتی:
- بەکورتی ئیشەکەی من ئەوەیە کە نەخشەیەکی هەموو ئەو هێزانە بکێشم کە دژی خەباتی ئەو کەسانەن کە نایانەوێت ژینگە کاول ببێت. وردترێکیش ناونووسێکی ساڵانەی ئەو تاکە کەس و دامودەزگا و کۆمپانیا گەورانە دەکەم کە لەپێناوی قازانجی تایبەتی خۆیاندا دەچنە ناو خەڵکی و بەئاشکرا پڕوپاگەندەی ئەوە دەکەن کە هیچ مەترسییەک لەسەر ژیانی زیندووی ژینگە نییە.
ماریۆ دەیویست گرنگی ئەو نەخشەکێشانە بزانێت، لاوراش بە هەلی زانی و لە دیدەی خۆیەوە وەسفێکی زۆر گشتی حاڵی زەوی خستە ڕوو. ئەو پێی وابوو کە ژیانی سەر ئەم زەوییە لە مەترسیدا بێت و ئەو پارچە زەوییانەی کە شیاوی کشتوکاڵن ڕوو لە کەمبوونەوە بکەن، هەروەها لەو بڕوایەدابوو کە دارستانە پڕ بارانەکان لە داهاتوودا بسوتێن و فرە ڕەگەزی گیانەوەرەکانی سەر ئەم زەوییە لە مەترسیدا بن. بەدەر لەوەش جەختی لەوە کردەوە کە ئەو پرۆسێسە بەردەوام بەو ئاراستەیەدا دەڕوات و بەپێچەوانەوە نابێت.
ماریۆ لەگەڵ قسەکانیدا تەبا بوو و وتی:
- زۆر باشە، بەڵام کۆکردنەوەی ناوی نموونەی ئەو تاوانبارانە لە کتێبێکدا چ سوودێکی هەیە؟
ئەویش وەڵامی دایەوە:
- دەبێت ڕووبەڕووی بەرپرسیارێتیی خۆیان بکرێنەوە. هەتا ئەمڕۆکە بەردەوام ئەرکی سەلماندنی ئەو بورهانانە لەسەر شانی بزووتنەوەی ژینگە بووە. ئێمەش دەمانەوێت لە بنەڕەتەوە ئەوە بگۆڕین، دەخوازین شتەکان بەڕوونی بخرێنەڕوو.
- ئەی دوایی؟

لاورا دەستی بەملاولادا ڕاوەشاند و وتی:
- ڕەنگە ڕۆژێک لە ڕۆژان دادگایی بکرێن. ئێ خۆ دەبێت کەسێک نوێنەرایەتی بۆقەکان بکات.
- بەڵام تۆ بەڕاستی لەو بڕوایەدایت کە ڕاپۆرتەکەت بەس بێت بۆ ئەوەی تاوانبارانی ژینگە بوەستێنێت؟
لاورا سەرێکی بۆ لەقاند و وتی:
- زۆربەی ئەو پیاوانەی کە خۆیان بە شت دەزانن، زمانیان لاڵ دەبێت کاتێک کە مەبەستی چاوپێکەوتنەکەمیان بۆ دەردەکەوێت. هەر ئەوەندەی دەزانن مەبەستی چاوپێکەوتنەکەم دانپیانانی ئەوانە، خێرا قسەکانیان هەڵدەگێڕنەوە. خۆ ڕەنگە منداڵی منداڵەکانیان ڕۆژێک لە ڕۆژان ئەوە ببینن کە چۆن باپیرە گەورەکانیان هەروا بەئاسانی لەسەر لەمپەڕێک دانیشتوون و کێشە گەورەکانی پیسکردنی ژینگە پشتگوێ دەخەن.
ماریۆ دواجار لە مەبەستەکەی تێگەیشت و وتی:
- کەواتە دەتەوێت خودی خۆیان بەرپرسیار بکەیت؟
وابزانم لەویادا لەبەرخۆمەوە خەندە گرتمی، چونکە کەمێک لایەنی چاوقایمی لاورام بەدڵ بوو. وتم:
- بەلای منەوە ئەوە بیرۆکەیەکی هەزەلییە.
ئاوڕێکی لێ دامەوە و نیگایەکی وردی تێگرتم. منیش تەماشای چاوە سەوز و چاوە قاوەییەکەیم کرد. لاورا هەروەک زۆرینەی کەسە ئایدیالیستەکان کەسێکی وریا بوو. وتم:
- ڕەنگە وا باش بێت لەبەرچاوی ڕای گشتیدا گاڵتەجاڕییان پێ بکەین.
جۆن سەری بۆ لەقاندم و ڕەزامەندیی خۆی بۆ قسەکانم دەرخست، هێندە بەگوڕ سەری لەقاند، دیسانەوە سەرنجی هەموومانی بەلای خۆیدا ڕاکێشایەوە و وتی:
- پێدەچێت مرۆڤ تەنها بوونەوەری زیندوو بێت لە هەموو گەردووندا کە ئاگاییەکی گەردوونی هەبێت. بەو شێوەیەش پاراستنی ژیانی ژینگەی زیندووی سەر ئەم زەوییە تەنها لە ئەستۆی ئەم جیهانەدا نییە، بەڵکو بەرپرسیارێتییەکی گەردوونییە. خۆ ڕەنگە کەڕەتێکی تریش تاریکی باڵی خۆی بەسەر هەموو شتێکدا بکێشێتەوە و ئەو کاتە ڕۆحی خودا چیتر بەسەر ئاوەکاندا ناخولێتەوە.
هیچ کەسێک لە دژی ئەو دەرئەنجامە قسەی نەکرد. بەپێچەوانەوە وای لە هەموومان

کرد بێدەنگ دابنیشین و بە قووڵی ڕابمێنین.
لەویادا بیڵ بە خۆی و سێ بتڵ شەرابی سوور و پێکێک ویسکییەوە بەرەو مێزەکەمان هات، دیاربوو دەیویست جۆرە هاوسەنگییەک لە بتڵەکانی دەستیدا ڕابگرێت. لە پشتیشیەوە، ئەو بۆیەی کە گوڵێکی خستبووە پشت گوێچکەی چەپیەوە، بە خۆی و شەش پەرداخی دەستیەوە بەرەو ڕوومان ڕێی دەکرد. بیڵ بتڵەکانی خستە سەر مێزەکە و کورسییەکیشی لە مێزەکەی تەنیشتمانەوە بۆ خۆی هێنا و لە تەنیشت لاوراوە دانیشت.
بیڵ پەرداخەکانی بەسەر مێزەکەدا دابەش کرد، ئاماژەی بۆ بتڵەکان کرد و وتی:
- لەسەر حسابی منە!
دیسانەوە بەوردی بینیم لاورا ڕوویەکی ساردی نیشانی بیڵ دایەوە، خۆم بە خۆمم وت: «لەوەدەچێت لە کار و سەرقاڵی ژینگەکەیدا کەمێک لە مرۆڤ بێزار بێت».
ڕاستە لاورا کچێکی جوان و سەرنجڕاکێش بوو، بەڵام زۆر کراوە نەبوو لەگەڵ خەڵکانی تردا، هەر بۆ نموونە تەنانەت چاوی لەسەر کتێبی (ئەستێرەی گەڕۆکی تاقانە)کەی هەڵنەبڕی کاتێک لە فرۆکەخانەیەکی لابەلادا بەوپەڕی ڕێزەوە قسەی لەگەڵدا کرا.
قسەوباسی سەر مێزەکەمان بەردەوام هەر لەسەر کێشەی ژینگە بوو و منیش لەسەر داواکاری ئانا و خۆسێ باسێکی کورتی ئەرکە زانستییەکەی خۆمم بۆ کردن. ئەو جارەیان لاورا هەستی خۆی نەشاردەوە و هێندەی نیشان دام کە سەرسامی قسەکانمە، بەو جۆرەش لە دواجاردا هەستم کرد کەمێک ڕێزم دەگرێت. پێم وابێت تا ئەو کاتەش زۆر بەئاسانی وای مەزەنە دەکرد کە خۆی تەنها کەسی سەر ئەم زەوییەیە، یان بەلایەنی کەمەوە تەنها کەسی سەر ئەو دوورگەیەیە، کە گرنگی بە کێشەکانی ژینگە دەدات.
بیڵ، هەروەک لەوەوپێش مەزەندەم کرد، سەر بەو گروپە زۆرەی خەڵکی ئەمریکایە کە خانەنشین کراون و پڕن لە ژیان. کاتی خۆی کاری بۆ کۆمپانیایەکی مەزنی نەوت کردووە و یەکێک بووە لە پسپۆڕە هەرە شارەزاکان لە بواری کۆنترۆڵکردنی ئەو چاڵە نەوتانەدا کە بەشێوەیەکی هەڕەمەکی دەتەقنەوە. زۆر بە شانازیشەوە باسی ئەوەی کرد کە بۆ ماوەیەک لەگەڵ (ڕێد ئادیار)ی هەرە بەناوبانگدا کاری کردووە. بەدەر لەوانەش چەند ئەرکێکی بۆ (ناسا) جێبەجێ کردووە و زۆر بێفیزانە وتی:
- یەکێک بووم لەوانەی بەشدار بووم لە وەستاندنی (ئەپۆلۆی ١٣)دا و توانیمان

خوولانەوەی بە دەوری مانگدا بوەستێنین.
من بۆیە ناوی ئەم شتانە دەهێنم، چونکە ئەم ڕووداوەی خوارەوە ڕوویدا:
کەمێکی تر باسی کێشەی ژینگەمان کرد، بەڵام هێدی هێدی ناوەڕۆکی باسەکەمان گۆڕا و زیاترێک باسی شتی خۆشمان دەکرد. هەموومان (بیڵ)مان هاندا کە باسی هەندێک لە کارەکانی خۆیمان بۆ بگێڕێتەوە. پیاوێکی هەزەلی بوو و لە ڕاستیشدا ئەو شەرابەی دەمانخواردەوە ئەو کڕیبووی، بەڵام کاتێک کە باسی ڕووداوێکی دڵتەزێنی گێڕایەوە، لاورا لە ڕادەبەدەر تووڕە بوو، ئینجا پەلاماری (بیڵ)ی دا و بە چەپ و ڕاستدا پیایدا کێشا، بە دەنگی بەرزیش هاواری بەسەردا کرد و وتی:
– دەبێت ئەم تەقینەوە هەڕەمەکییەش بخۆیت هەی بەراز!
بەلای منەوە قسەکانی لاورا بەهیچ شێوەیەک لە جێی خۆیدا نەبوو، چونکە هەر کەمێک لەوەوبەر ئەو پیاوە باسی ئەوەی گێڕایەوە کە چۆن لەویادا ژیانی خۆی خستۆتە مەترسییەوە تا ڕێگە لە کارەساتێکی گەورەتری چاڵە نەوتەکان بگرێت.
مایەی سەرسوڕمانێکی گەورە نەبوو کە مەزاجی ئەو کچە گەنجە هێندە توند بوو. هەر زۆر بەڕوونییش دیاربوو کە نەیدەتوانی جیاوازیی نێوان پیشە و توندڕەوی بکات، بەڵام ئەو زۆرجار بۆکسی کێشا بە (بیڵ)دا، تا وای لێهات ناچار بوو چەند جارێک شانی کوڕ بکات بۆ ئەوەی خۆی لە دەستی بپارێزێت. هەر لەو زرم و کوت و فەرتەنەیەدا بتڵێک قلْپ بووەوە و ئەو چارەکە شەرابەی کە تێیدا بوو بەسەر قوماشە سپییە دیمەشقییەکەی سەر مێزەکەدا ڕژا.
لەویادا بیڵ شتێکی هەر زۆر سەیری نواند، زۆر بەئاسانی دەستی خستە سەر ملی لاورا و بە دەنگێکی هێمن و میهرەبانەوە وتی:
– هێواش، هێواش.. ئارام بەرەوە.
ڕێک ئەو قسانەی بوو بە وەرچەرخانێکی هەرە بەرچاوی ئێوارەکەمان، چونکە هەروەک چۆن ئەو کچە لەپڕێکدا هەڵچوو و پەلاماری (بیڵ)ی دا، بەهەمان شێوەش لەدوای ئەو قسانەوە یەکڕاست ئارام بووەوە. بیرم دێت لەو کاتەدا خەیاڵم چووە سەر پەیوەندیی نێوان پڵنگێک و ئەو کەسەی کە ڕایدەهێنێت، لە ڕاستیدا ئەوانیش بەشێوەیەک لە شێوەکان بەتەواوەتی پشت بە یەکتری دەبەستن: ئەگەر پڵنگەکە مەزاجێکی توندی نەبێت، ئەوا ئەو کەسەی کە ڕایدەهێنێت هیچ شتێکی لەبەردەستدا نامێنێتەوە کە ماڵیی بکات، وە بەبێ ئەو کەسەش کە ڕایدەهێنێت، پڵنگەکە هیچ شتێکی نییە کە تووڕەی بکات و بیووروژێنێت. بەهەرحاڵ بەڕاستی ئەو شەڕە

سەلماندی کە بیڵ چەندە توانای هەیە لە بنەبڕکردنی تەقینەوەی هەڕەمەکیدا، بەڵام ئەو شتەی کە من کەمێک شارەزاییم هەبوو تیایدا، ئەو هێز و فشارە شاراوەیە بوو کە بووە هۆی تەقینەوەکە.

بەو شێوەیە ئێوارەکەمان بەشێوەیەکی ئاسایی کۆتایی پێ هات. لاورا یەکەم کەس بوو کە مێزەکەی بەجێهێشت، بەڵام بەرلەوەی بەرەو کوخەکەی بڕوات، داوای لێبوردنی لە بیڵ کرد و هەروەها سوپاسیشی کرد بۆ کڕینی شەرابەکان. دڵنیا نیم، بەڵام وابزانم یەک کەڕەت ئاوڕی دایەوە و نیگایەکی تێگرتم، هەروەک ئەوەی من خاوەنی دەرمانێک بم کە ئازاری ڕۆحی چارەسەر بکات.

ماریۆ بەدەم خۆیەوە بە ئیتالی وتی: «خانمەکە ڕۆشت»، دەستی بەملاولادا بادا و ئینجا هەستایە سەر پێ و ئەویش بەرەو خەو ڕێی کرد. زۆربەی زۆری شەرابی سەر مێزەکە ئەو خواردبییەوە.

جۆن، کە پیاوێکی چوارشانە بوو، سەیرێکی ئەملاولای کرد، دواتر سەرێکی لەقاند و بە خۆشییەکەوە وتی:

– بەڕاستی سەرەتایەکی نایابمان دەست پێ کرد، بەڵام ئێوە تاکەی لێرە دەمێننەوە؟

من وتم سێ شەو لەسەر ئەم دوورگەیە دەمێنمەوە، (بیڵ)یش هەر سێ شەو دەمایەوە و دواتر بەپەلە سەفەری بۆ (تۆنگا) و (تاهیتی) دەکرد. (ئانا و خۆسێ)ش وایان دانابوو ڕۆژێک دوای من سەفەر بکەن.

بووک و زاواکەی (سیاتڵ) دەمێک بوو مێزەکەیان جێهێشتبوو و بەرەو کوخەکەی خۆیان ڕۆیشتبوونەوە، بۆیەکانیش سەرقاڵی کوژاندنەوەی مۆمەکان و پاکردنەوەی مێزەکان بوون. جۆن دوا قوومی بیرەکەی هەڵدا و زۆر بەئەدەبەوە داوای ڕووخسەتی لێ کردین. پاش نەختێک (بیڵ)یش سوپاسی ئەو ئێوارە خۆشەی لێ کردین و بەجێی هێشتین. ئیدی هەر من و ئانا و خۆسێ ماینەوە، ئێمەش کەمێک دواتر بەناو دارگوێزە هیندییەکاندا ڕێگەمان گرتەبەر. بۆ ساتێک بێدەنگ وەستاین و تەماشای بۆقە کێوییەکانی ناو مەلەوانگەکەمان کرد کە لەمسەرەوە بۆ ئەوسەر مەلەیان دەکرد، من وتم:

– هەر ڕێک وەک ئێمە سنگەمەلە دەکەن.

(خۆسێ)ش وتی:

– یان بەپێچەوانەوە، ئێمە لەوانەوە فێری ئەو جۆرە مەلەیە بووین.

لەسەرروومانەوە ئەستێرەکان دەدرەوشانەوە، هەر دەتوت نیشانەکانی (مۆرس[٤١])ە و لە ڕابردوویەکی دوورەوە دەنێردرێن. خۆسێ ئاماژەی بۆ قووڵایی شەوەکە کرد و وتی:

- ڕۆژێک لە ڕۆژان ئەم گەلەهەسارەیە دووگیان بووە بەمانە.

دەمودەست لە مەبەستەکەی نەگەیشتم، وابزانم هێشتا خەیاڵێکم هەر لای لاورا و بیلّ بوو. لێم پرسی:

- ئەمانە؟ مەبەستت چییە؟

دیسانەوە ئاماژەی بۆ مەلەوانگەکە کردەوە و وتی:

- بۆقە کێوییەکان، بەڵام پێم وانییە خۆیان ئاگایان لەوە بێت. من وای دادەنێم تا ئێستاش هەر لەو بڕوایەدا بن کە زەوی چەقی گەردوونە.

هەروا وەستابووین و لەو ڕەنگە سوور و سپی و شینانەی ئاسمان ڕامابووین کە دەدرەوشانەوە، خۆسێ پرسی:

- چەندە بواری ئەوە هەیە کە شتێک لە هیچی نەبووەوە بێتە بوون؟ یان بێگومان بەپێچەوانەوە: چەندە ڕێی تێدەچێت شتێک لە ئەزەلەوە هەر بوونی هەبووبێت؟ ئەی ئایا دەکرێت بزانین چەندە بواری ئەوە هەیە کە ماددەیەکی گەردوونی سەرلەبەیانی ڕۆژێک لە ڕۆژان لەپڕێکدا خەبەری ببێتەوە و بەئاگا بێت لە خۆی؟

مەحاڵ بوو کەس بزانێت کە پرسیارەکانی لە من یان لە ئانا یان لە تاریکایی گەردوون کرد، یاخود تەنها پرسیارەکانی لە خۆی کرد. هەر خۆم گوێم لە دەنگی خۆم بوو کە وەڵامێکی بێ مانام دایەوە:

- ئێ هەموومان ئەو جۆرە پرسیارانە دەکەین، بەڵام خۆ هیچ وەڵامێکیان نییە.

دژی قسەکەم وەستایەوە و وتی:

- وا مەڵێ. هەر ئەوەندەی وەڵامی پرسیارێکمان لەبەردەستدا نەبێت، مانای ئەوە نابەخشێت کە بوونی نەبێت.

لەویادا ئانا دەستی بە قسە کرد، دایچڵەکاندم کاتێک لەپڕێکدا بە زمانی ئیسپانی قسەی لەگەڵدا کردم. ڕێک تەماشای ناوچاوی کردم و وتی:

- لە سەرەتادا، ماوەیەکی هەر زۆر زۆر لەمەوبەر، تەقینەوە گەورەکە ڕوویدا. ئەمە تەنها وەبیرخستنەوەی ئەوەیە کە نمایشێکی زیادەی ئێوارەکەمان نیشان دەدرێت. هێشتا بوار ماوە بلیتی ئەو نمایشە پەیدا بکرێت. زۆر بەکورتی مەبەستی ئەم نمایشە زیادەیە ئەوەیە کە جەماوەرەکەی ئافەریدە بکرێن. ئێ لە هەموو بارێکدا

بەبێ تەماشاکەران، بەهیچ شێوەیەک لە شێوەکان بەجێ نییە ئەو ڕووداوە کتوپڕە ناو بنێین نمایش. هێشتا چەند کورسییەکی بەتاڵ ماوە.
چەپڵەم بۆ لێدا و یەکسەر دوای ئەوە بۆم دەرکەوت کە چ هەڵەیەکم کرد. بۆ ئەوەی هەڵەکەم داپۆشم، وتم:
- ئەوە چی بوو کە وتت؟
بە خەندەیەک وەڵامی دامەوە، بەئاستەم لەبەر ڕووناکی مەلەوانگەکەدا سیمایم بینی.
خۆسێ دەستێکی لە ملیەوە ئاڵاند، هەروەک ئەوەی لەو بۆشاییە بەتاڵەدا بیپارێزێت. شەوشادمان لە یەکتری کرد و هەریەکەمان بە ڕێی خۆماندا ڕۆیشتین. بەرلەوەی لە تاریکییەکەدا لەبەرچاوم ون ببن، گوێم لێ بوو خۆسێ وتی:
- ئەگەر خودایەک هەبێت، ئەوا نەک هەر لەوەدا زۆر زیرەکە کە هیچ شوێنەوارێک لەدوای خۆیەوە جێنەهێڵێت، بەڵکو مامۆستایەکی گەورەشە لە هونەری خۆشاردنەوەدا. لە ڕاستیدا جیهانیش هەروا بە ڕاشکاوی خۆی نیشان نادات. گەردوونیش بەردەوام نهێنییەکانی خۆی شاردۆتەوە و نایاندرکێنێت. ئێ خۆ ئەستێرەکانیش هێندە ورتەورت لەگەڵ یەکدیدا ناکەن...
دوای ئەو وشانە (ئانا)ش دەنگی خۆی خستە پاڵ دەنگی ئەو و دوابەشی قسەکانی (خۆسێ)یان وەک کۆرسێک پێکەوە وت، هەر لەوە دەچوو کە تێکستێکی کۆنی پچڕپچڕ پێکەوە بخوێننەوە:
- بەڵام تا ئێستاش هیچ کەسێک ئەو تەقینەوە گەورەیەی لەیاد نەکردووە. هەر لەو کاتەشەوە بەردەوام بێدەنگی زاڵ بووە و هەموو ئەو شتانەش کە بوونیان هەیە هێدی هێدی لە یەک دوور دەکەونەوە. هێشتا بواری ئەوە ماوە کە چاومان بە مانگێک یاخود ئەستێرەیەکی کلکدار بکەوێت، بەڵام چاوەڕوانی ئەوە مەبە کە بەشێوەیەکی میهرەبانانە بانگهێش بکرێیت، چونکە لە ئاسماندا کارتی سەردان و داوەتنامە چاپ ناکرێن.

# (پیاوێکی مێشوولە) و مارمێلکەیەک

لەگەڵ کردنەوەی دەرگای کوخەکەمدا هەستم بە نائارامییەک کرد، هەر ئەوەندەی گڵۆپەکەشم داگیرسان، یەکسەر سەرنجم چووە سەر مارمێلکەیەکی زرت و زیندوو کە لەسەر بتڵی جنەکەم دایکوتابوو. کەواتە ڕێک وەک ئەوە وابوو کە خۆم مەزەندەم دەکرد. خۆ ڕەنگە لەو کاتەدا کە چوومە دەرەوە بۆ نانخواردنی ئێوارە، هەر گوێم لە ترپەی ئەم مارمێلکەیە بووبێت کە بەخێرایی بە ژێر کۆڵەکەی سەقفی خانووەکەدا خل بووەوە. مارمێلکەکە نزیکەی سی سانتیمەترێک درێژ بوو و بەهیچ شێوەیەکیش لەوە نەدەچوو کە ڕۆژێک لە ڕۆژان مێشوولەی نوقسان بووبێت. بۆ ساتێک هەردووکمان داچڵەکین، بەڵام دواتر لە شوێنی خۆیدا چەقی، هەروا بێ جووڵە مایەوە هەتا ئەو کاتەی هەنگاوێک لێی نزیک بوومەوە. زۆر بەخێرایی بە نیوەی بتڵە جنەکەدا سوڕایەوە و منیش نیگەرانی ئەوە بووم بتڵەکە لەسەر مێزی تەنیشت جێگای خەوەکەم بکەوێتە خوارەوە. ئاخر ئەو ئێوارەیە بەشی خۆی مەشروبی تێدا ڕژا.

من خۆم زۆرێکم دەربارەی مارمێلکە دەزانی، زۆر باشیش دەمزانی خەیاڵپڵاوییە گەر وابزانین لەم بەشەی جیهاندا نایەنە ناو ژووری خەوەکانمانەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پێم خۆش نەبوو لەو کاتەدا کە بەرەو جێگای خەو دەچم، ژمارەیەکی زۆری ئەو بوونەوەرە چالاک و بزێوانە ببینم بە ژوورەکەمدا بخولێنەوە، بەتایبەتیش ڕقم لەوە بوو کە بەسەر چەرچەفەکەمدا فرتەفرت بکەن، یاخود بیانبینم کە بە تەختەی جێگاکەوە خۆیان بنووسێنن و بچنە سوڕی سرپبوونەوە.

هەنگاوێکی تریشم بەرەولای مێزی تەنیشت جێگای خەوەکە نا. مارمێلکەکە بەتەواوەتی خۆی مت کردبوو، زۆربەی زۆری لەشیشی کەوتبووە ئەودیوی بتڵەکەوە، بەو شێوەیە بەهۆی ئەو ڕووناکییەی کە لە بتڵەکەی دەدا، دەرفەتێکم بۆ ڕەخسا کە سک و کۆمی بەشێوەیەکی گەورەتر ببینم و لێی ورد ببمەوە. مت بووبوو و تەنانەت یەک ماسوولکەشی نەبزواند، سەر و کلکی لە پشتی بتڵەکەوە هاتبوونە

دەرەوە، مارمێلکە بچکۆلەکە زۆر بەوریاییەوە چاوی تێبڕیبووم و دەیزانی تەنها دوو بواری لەبەردەستدایە: یان ئەوەتا بەتەواوەتی ئارام بێت، هەڵبەتە بەو ئومێدەی کە تێکەڵی چواردەورەکەی ببێت، یاخود ناچارە بەوپەڕی خێرایی بە دیوارەکەدا سەرکەوێت و بۆ نموونە بە سەقفەکەوە بمێنێتەوە یاخود خۆی لە پشتی کۆڵەکەیەک لە کۆڵەکەکانی سەقفەکەوە بشارێتەوە.
پارادۆکسەکە لەوەدا بوو کە لەگەڵ بینینی ئەو نموونە گەورەیەی (هیمیداکتایلوس فریناتوس)[٤٢]ەدا، هێندەی تر پەرۆشی خواردنەوە بووم و دەمویست بەزووترین کات پەرداخێکی گەورەی مەشروبی قورس فڕ بکەم، هاوکات لەوەش دەترسام ئەو مارمێلکەیە ببێتە ڕێگر و نەتوانم پلان و مەبەستەکەم بەجێ بهێنم، نەک هەر ئەو شەوەش، بەڵکو هەموو ئەو شەوانەی تریش کە دامنابوو لەسەر ئەو دوورگەیە بمێنمەوە. ئاخر هیچێکی وام لە بتڵەکەم نەخواردبووەوە و واشم حساب کردبوو بەر لە گەڕانەوەم بەشی ئەو سێ شەوەم بکات. لە بارە بچکۆلەکەی ژوورەکەشدا تەنها بیرە و ئاوی تێدا بوو، من هەر لەگەڵ گەیشتنمدا بۆ ئێرە بەوردی لەو بارەیەوە چاوم گێڕا.
هەنگاوێکی تریش چوومە پێشەوە و هاوکاتیش دامنابوو ئەگەر بتڵەکە بکەوێتە خوارەوە بەدەستی چەپم بیگرمەوە، بەڵام لەوەدەچوو میوانە ڕەزا قورسەکەم بڕیاری دابێت کە بۆی دەرنەفرتێت، وا دیاربوو وەک تاکتیکێک وای بەباش بزانێ کە لە شێوەی تێکەڵەیەکی چاوەڕوانی و دەستگرتن بەسەر شتەکاندا بەرگری لە خۆی بکات. ئەگەر ئەوەندە نیگەرانی مەشروبی ناو بتڵەکە نەبوومایە، ئەو کاتە هەر زۆر بەئاسانی دەڕۆیشتمە حەمامەکەوە و بەو شێوەیەش بوارم بە مارمێلکەکە دەدا بە سەربەرزییەوە بۆی دەربچێت، بەڵام هاوکات زۆر بەباشی لەیادم بوو کە چەندەها جار مارمێلکە شامپۆ و پەرداخی فڵچە و دەرمانی دانی خستۆتە خوارەوە. بەدەر لە هەموو ئەوانەش بینیم سەری بتڵەکە بەباشی دانەخرابوو.
یەک هەنگاوی تر بچوومایەتە پێشەوە، دەمتوانی بتڵەکە بگرم، بەڵام ئیدی دەبووایە مارمێلکەکەشم لەگەڵدا بگرتایە. لێرەدا دەبێت دان بەوەدا بنێم کە من هەمیشە پەیوەندییەکی دووفاقم لەگەڵ خشۆکەکاندا هەبووە: خشۆکەکان لە زۆر لاوە سەرنجڕاکێشەرن، هەر بۆ نموونە چونکە کۆمەڵێک وێنەی گیانەوەرە بەبەردبووەکان دەهێننەوە بەرچاو، بەڵام لەلایەکی تریشەوە قەت حەزم لێ نەبووە بەدەستم بیانگرم و یارییان لەگەڵدا بکەم، یان بیانخەمە سەر سەرم و بەسەر قژمدا بێن و بچن،

بەتایبەتیش لەو کاتانەدا نا کە خەریکە بچمە ناو جێگاوە.
مارمێلکە بەلای زۆربەی خەڵکییەوە وەک شتێکی پڕ نهێنی و هاوکاتیش زۆر سەرنجڕاکێش تەماشا دەکرێت. کتومت وەک ئەو دەستەواژەیەیە کە بە لاتینی پێی دەڵێن (mysterium tremendum et fascinosum[٤٣])، منیش لەو یاسایە بەدەر نەبووم، هەرچەندە خۆم وەک کەسێکی پسپۆڕ دادەنێم لە بواری ئەو گیانەوەرانەدا. ئێ خۆ زۆر ڕێی تێدەچێت کەسێک وەک پیشە گرنگییەکی لەڕادەبەدەر بدات بە بەکتریا و ڤایرۆس، بەبێ ئەوەی ڕاستەوخۆ بەبێ هیچ خۆپاراستنێک لەو جۆرە ئۆرگانیزمانە نزیک ببێتەوە. بەهەمان شێوەش لە دوای (مەدام کۆری)یەوە هەموو ئەو کەسانەی کە خولیای تیشکی سەروو وەنەوشەیین (تیشکی ئێکس)، دەبێت بەرلەوەی ئەو یارییە خۆشە لەگەڵ ئەو تیشکە ئەتۆمیانەدا بکەن، کۆمەڵێک خۆپاراستنی دیاریکراو بەکار بهێنن. لەلایەکی تریشەوە هەر زۆر ئاساییە و هیچ جۆرە دژایەتییەکی تێدا نییە ئەگەر کەسێک بۆ نموونە زۆر لە جاڵجاڵۆکە بترسێت و هاوکاتیش نامەیەکی دکتۆرای نایاب لەسەر مۆرفۆلۆجی ئەو گیانەوەرە جومگەدارە گۆشتخۆرانە بنووسێت.
ئەگەر تەماشایەکی هەندێک گیانەوەری بڕبڕەداری وەک مارمێلکەکان و (ئیگوانا)کان بکەین، ئەوا دەبێت هێندە ببینین کە هەستیاریی ئەمان لەچاو بەکتریا و جاڵجاڵۆکەکاندا، شێوەیەکی تەواو جیاوازتری وەرگرتووە. هەر لەو کاتەوەی لە نەرویج، لە شاری (ڤێستفۆلد)دا، کارمامزە مرداربووەکەم دۆزییەوە، هێندەم بۆ ڕوون بووەوە کە گیانەوەرەکانیش جۆرە کەسایەتییەکی بچکۆلەیان هەیە، ڕێک لەو کاتەشەوە لە توانامدا نەبووە بیر لەوە بکەمەوە کە برادەرایەتییەکی نوێیان لەگەڵدا دروست بکەم. بەهیچ شێوەیەکیش حەزم نەکرد مارمێلکەیەک چاوم تێببڕێت، لایەنی کەم لەم نیوەشەوەدا نا و لەم شوێنەشدا نا کە من بە شوێنێکی زۆر تایبەتی خۆمم دادەنا و بەدەر لەوەش بەڕاستی پارەم پێدابوو. دواجاریش بەئاشکرا هەر لە سەرەتاوە کە هاتم ئاماژەم بەوە دابوو کە دەمەوێت بە تەنیا لە کوخەکەدا بم و نامەوێت هیچ میوانێکی ترم لەگەڵدا بێت، بەڵام مێروو و مێش و مەگەزەکان بەلامەوە شتێکی تر بوون و قەت نیگەرانیان نەکردووم، من هەرگیز لەوەوپێش مێرووییەکم وەک کەسێک دانەناوە. مێش دەموچاوێکی وەهای نییە، شێوە گوزارشتێکی تایبەت بە کەسایەتیی خۆی نییە، بەڵام مارمێلکەکان هەیانە و ئەو دانەیەش کە بە بتڵی جنەکەوە چەقی بوو خاوەنی هەمان شت بوو.

بێگومان ئەگەر یەک دوو پێکی باشم لە جنەکەم بخواردایەتەوە، ئەو کاتە دەمتوانی بەسەر ئەو هەستەمدا زاڵ بم و بەئاسانی لەو خشۆکە لوتبەرزە نزیک بمەوە، بەڵام لە ڕاستیدا من کەوتبوومە حاڵەتێکی دژوارەوە، چونکە زنجیرەی ڕووداوەکان بەو شێوەیە نەبوو کە من دەمویست: بەرلەوەی بموێرایە دەست بدەمە بتڵەکە و بەرزی بکەمەوە، ناچار بووم هەندێک لە مەشروبەکەی ناوی بخۆمەوە. بەو شێوەیە بەمانای وشە کەوتبوومە حاڵەتێکی قوڕەوە و ئەو دراما تۆقێنەرەش زۆر زیاتریکی خایاند وەک لەوەی من مەزەندەم کرد. هیلاک بووم، زۆر هیلاک بووم و نەموێرا هەروا بەبێ خواردنەوەی دەرمانی خەوەکەم، لەسەر جێگاکەم پاڵ کەوم و لە تەنیشت مارمێلکەیەکەوە بخەوم.

ئێ خۆ نەشمدەتوانی هەروا بە پێوە لە ناوەڕاستی ژوورەکەدا بوەستم، قاچەکانم لەدوای ئەو پیاسە دووردرێژەی هێلی (بەرودوا)وە بەتەواوەتی دەئێشان، بەدەر لەوەش مایەی شەرمەزاری بوو کە بەردەوام بەرامبەر ئەو خشۆکە بوەستم و چاوم تێببڕێ، تەنانەت بۆ چرکەیەکیش چییە چاوی لەسەر لانەبردم و دڵنیابووم لە دونیای خۆی ڕادەما. لەبەرئەوە یەکەم شت کە کردم ئەوە بوو کە بەهێواشی لەسەر جێگاکەم دانیشتم، ڕێک لە شوێنێکی واشدا دانیشتم کە ئەگەر بتڵەکە بکەوتایەتە خوارەوە، بمتوانیبایە بیگرمەوە. زۆر ڕێی تێدەچوو بتڵەکە بکەوێتە خوارەوە، چونکە ئەو مارمێلکە بچکۆلە هەڵئاوساوە، کە لە بنەڕەتدا نموونەی ئەو مارملێکانە بوو کە لە نیو پەنجە درێژتر نابن، قەڵەوترین و گەورەترین مارمێلکە بوو کە لە ژیانمدا بینیبووم. من هیچ گومانێکم نەبوو کە کێش و هێزی ئەو مارمێلکەیە لە توانایدا بوو کە بتڵەکە بدات بە ئەرزدا، بەلایەنی کەمەوە لە خراپترین حاڵەتدا ئەوە شیاو بوو و لەو کاتەدا نەمتوانی بیر لە هیچ بوارێکی تر بکەمەوە.

بۆ ماوەیەکی دووردرێژ دانیشتین و چاومان لە یەکتری بڕی، من لەسەر قەراغی جێگاکەمەوە و ئەویش لەسەر تەختی پاشایەتییەکەی خۆی وەک (سفینس[٤٤]) ێک ڕێک لەبەردەم دەرگای دەرمانخانەکەمدا چەقی بوو. خۆ ئەگەر چەپڵەیەکم لێبدایە، ڕەنگە ئەویش جووڵەیەکی بکردایە (یان لەبەرئەوەی بەپەلە بۆی دەربچێت یاخود هەروا بە نیەتێکی خراپ) و دوای چەند بەشێکی بچکۆلەی چرکەیەک بەسەر چەپڵەکەمدا بتڵەکەمی بخستایەتە خوارەوە، ئەو کاتە زۆر بەسەر ئەوەدا تێدەپەڕی کە شیردەرێکی خاووخلیچکی وەک من فریای گرتنەوەی بتڵەکە بکەوێت. ئەو شتەی کە زیاترێک منی سەرسام کردبوو لەو گیانەوەرانەدا، ئەوە بوو کە تاڕادەیەک وەک

(کلاڤۆیانت)ێک جۆرە توانایەکی سەیری بەرپەرچدانەوەیان هەبوو. بەڕاستی ئەو دانەیەشیان نموونەیەکی تایبەتی و دانەیەکی هەرە بەئاگای ڕەگەزەکەی خۆی بوو. ناوم نا (گۆردن)، هەر بەو ناوەوە ناوم نا کە لەسەر بتڵەکە بوو. من پێش ئەوەی لەسەر جێگاکەم دانیشم، هێندەم بۆ ڕوون بووەوە کە مارمێلکەیەکی نێرە. لەوەدەچوو کاکە گۆردن نیوەی ژیانی تێپەڕاندبێت، ئەگەر بە پێوانەی تەمەنی مرۆڤ حیسابی بکەین، ڕەنگە نزیکەی بیست ساڵێک لە من گەورەتر بووبێت. وە هەرچەندە ئەو مارمێلکەیە سەر بە ڕەگەزێک بوو کە مێیەکانی هەر جارەی تەنها دوو هێلکە دەکات، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پێدەچوو چەندەها نەوەی خستبێتەوە. من خۆم زۆر دڵنیا بووم لەوەی کە گۆردن دەمێک بوو ببووە باپیرە و باپیرەگەورە، خۆ پێشی دەچێت باپیرەی خۆی یەکەمین نەوەی ئەو بیانیانە بووبێت کە کاتی خۆی هاتنە سەر دوورگەکانی فیجی، چونکە ئەو مارمێلکەیە سەر بە ڕەگەزێک بوو کە لە ساڵانی حەفتاکانی سەدەی بیستدا هێنابوویانە سەر ئەو دوورگانە.
پاش قەیرێک بیرکردنەوە بۆم دەرکەوت کە ئەو مارمێلکەیە ڕەنگە بەهۆی ئەزموونی ژیانییەوە ئەو بڕیارەی دابێت کە بە بتڵەکەوە بمێنێتەوە، چونکە لەویادا بەتەواوەتی دڵنیا بوو کە هەردووکمان دانیشتبووین و بەوردی چاودێریی یەکتریمان دەکرد. بێگومان لە ماوەی ژیانیدا هێندەشی بۆ دەرکەوتووە کە ئەو گیانەوەرە شیردەرانەی کە بەرگیان لەبەردایە و قژبەسەریانەوەیە هیچ مەترسییەکی وایان لەسەر ژیانی ئەوان نییە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەبووایە هێندەش فێر بووایە کە هەڵهاتن مەترسییەکی گەورەی تێدا نییە. بەهەرحاڵ بوارێکی تریش لەئارادا بوو: خۆ پێی دەچوو کە گۆردن مارمێلکەیەکی فزوڵی بێت، یان لەوەش زیاتر خۆ ڕەنگە هەروەک کەسێکی کراوە حەزی لەوە بووبێت کە لەگەڵ کەسانی تردا بێت.
لەویادا هەر زۆر ئارەزووی خواردنەوەی قومێک جنم کرد، خۆم پێ نەگیرا و تەماشای بیلبیلەی چاوە ئەستونییەکانیم کرد، وەک ئەوەی جەخت لەسەر شتێک بکەمەوە بە چرپەیەک وتم:
– دەی ئیتر بەڕاستی کاتی ئەوە هاتووە دوور بکەویتەوە!
وابزانم کەمێک خێراتر هەناسەی هەڵمژی، ڕەنگە فشاری خوێنیشی تۆزێک بەرز بووبێتەوە، بەڵام بەدەر لەوانە هەروەک خۆی بەئارامی مایەوە. هەر لەو کەسە مانگرتووە تەمەڵانە دەچوو کە پۆلیس ناچار دەکەن هەڵیان بگرن و دووریان بخەنەوە، جا ئیتر دژی لێدانی جادەیەک مانیان گرتبێت یان (هەروەک لەم

حاڵەتەدا) دژی یاسای پێشکەشکردنی مەشروبێک بوەستنەوە کە بەشێوەیەکی لیبراڵ خرابێتە بەردەستی خەڵکی. خۆشی، بەپێچەوانەی منەوە، وەک کەسێکی مانگرتوو تەنانەت چاویشی نەتروکاند، کتومت ئەو ڕاستییەش کە پێڵووی چاوی مارمێلکە ناجووڵێتەوە، لەڕادەبەدەر بێزاری کردم: نەک لەبەرئەوەی کە بەهیچ شێوەیەک بواری نەدەدام تەنانەت بۆ چرکەیەکیش سوود لە بێ ئاگایی ئەو ببینم، بەڵکو هاوکات ئەو بواری ئەوەی هەبوو بۆ چەند ساتێک لە کاتی چاوتروکاندنی مندا لێم ورد ببێتەوە بەبێ ئەوەی من بتوانم تەماشای بکەم. نەک هەر ئەوەش: خۆی چرکەیەک ماوەیەکی زەمەنی زۆر کورتە بۆ مرۆڤێک و ماوەیەکی درێژترە بۆ مارمێلکەیەک، مەبەستم لەوەیە کە ئەو دەیتوانی بۆ ماوەیەکی درێژتر چاوم تێببڕێت و هەستی بەوە کردبوو کە هێدی هێدی خەو دەیبردمەوە.

بە دەنگی بەرز وتم:

– باشە باش، بەڵام ئیتر بەسە!

گۆردن لە شوێنی خۆی نەجووڵایەوە. خۆ هەر ئەوەندە نەبوو کە گیانەوەرێکی پیری نێرینەم لەبەردەستدا بوو و نەمدەزانی چی لێ بکەم، بەڵکو زۆر بە ڕوونی دیاربوو کە بێزار و ماندوو بوو لە ژیان، لەوەدەچوو هیچی تری نەدۆزیبێتەوە چێژی لێ ببینێت جگە لەوەی دەست بەسەر دەرمانی خەوی گیاندارێکی بڕبڕەداری بەرزدا بگرێت. وتم (دەستگرتن بەسەر شتێکدا)، بەڵێ، ئەوە وشە سەرەکییەکەیە، چونکە کەسێکی تریش ناچار بوو دان بەوەدا بنێت کە ئەو ڕۆژە دەستی بەسەر شتێکدا گرتووە. کەسێک، کە بڕواشی بە ژیانی هەتاهەتایی هەبوو و هێندە نابێت تەنیا مابووەوە و ئافرەتێک جێی هێشتبوو، بێگومان هەر بەو هۆیەشەوە ئەو شەوە لە بارێکی دووکەڵاویدا دانیشتبوو و زۆری خواردبووەوە. چ شەوێکیش، ڕێک ڕۆژی دوای ئەوە دەبووایە سواری فڕۆکەیەکی کۆن ببووایە و توانای خۆی لە فڕیندا تاقی بکردایەتەوە، نەک بە تەنهاش، بەڵکو لەگەڵ چوار موسافیری تردا کە پارەیان دابوو بەو سەفەرە. ڕێک لەویادا بوو کە دیسانەوە کاپتنی فڕۆکە شقارتەکەی هێڵی ئاسمانی (سەن فلاوەر)م بیرکەوتەوە. گۆردنی مارمێلکە کتومت هەمان سیمای ئەو کاپتنە پیرەی پێوە بوو، هەمان نیگای تیژ، هەمان ملی چرچولۆچیشی پێوە بوو و چەندەها توێژاڵی پێست لەژێر چەناگەیدا یەک لەسەر یەک شۆڕ بووبوونەوە، دەستەکانیشیمان بیر نەچێت کە هەر لە شێوەی بێڵدا بوون و پێنج پەنجەی کورتیان پێوە بوو. وەک دەزانیت وشەی (هیمیداکتایلوس) واتە (نیو پەنجەیی)،

ئێ خۆ کابرای کاپتنیش نیوەی دوو پەنجەی دەستێکی قرتا بوو. هەستم دەکرد شتەکان هێدی هێدی دەچنە شوێنی خۆیان. لە ماوەی ئەو شەوو ڕۆژەی پێشوودا ئەوە یەکەمین کەڕەت نەبوو کە وەک بارمتەیەک خۆمم لەناو درامایەکی ترسناکدا بینییەوە، وە هەروەها یەکەمجاریش نەبوو کە بەهۆی حاڵەتێکی تۆقێنەرەوە لە ڕادەبەدەر ئارەزووی خواردنەوەی مەشروب بکەم و ڕێک بەهۆی بارودۆخەکەشەوە نەتوانم تینوێتیەکەم بشکێنم.

زۆر توڕە بووم و سەرلەنوێ بواری ئەوەم لێکدایەوە کە هێرشێکی کتوپڕی بکەمە سەر، بەڵام دیسانەوە لە خەیاڵم دەرکردەوە، چونکە من دڵنیا بووم لە هێرشێکی کۆماندۆی کتوپڕدا دەمتوانی خودی بتڵەکە بگرمەوە، بەڵام ترسی ئەوە لەئارادا بوو کە بەشێکی زۆری مەشروبەکە بڕژێت. بەلایەنی کەمەوە ئەگەر گۆردن بەشێوەیەکی قۆڕ بجووڵایەتەوە دەڕژا و ئەوەش تا بڵێیت ڕێی تێدەچوو، ئێ منیش تەنها ئەو بتڵەم هەبوو و نەمدەویست تەنانەت دڵۆپێکیشی لەدەست بدەم.

چاوم بڕییە ناو چاوە تیژەکانی خزمە هەرە دوورەکەم و وتم:

- باش گوێم لێ بگرە.. بەهیچ جۆرێک پێم خۆش نییە بتخنکێنم، گومانم نییە هەر هیچ نەبێت تا ئێستا هێندە تێگەیشتوویت. تەنانەت ناشمەوێت کە ڕابکەیت و ئێرە بەجێ بهێڵیت، بەس تەنها ئەو بتڵەم دەوێت کە تۆ لەسەری دانیشتوویت.

هیچ گومانێکم نەبوو کە لە قسەکانم تێگەیشت، چونکە لەوەدەچوو بەجۆرێک وەڵامم بداتەوە و بڵێت: (ئێ من زۆر باش ئەوە دەزانم و لە ڕاستیشدا چارەکەساعاتێک زیاترە کە ئاگام لەوەیە، بەڵام زۆر پێش ئەوەی تۆ بێیتە ژوورەوە، من بۆ خۆم لەسەر ئەم بتڵە دانیشتبووم و مێشوولەم ئەگرت). کەواتە بەهیچ شێوەیەک مافی ئەوەم نەبوو کە داوای لێ بکەم بڕوات، بەڵکو بەپێچەوانەوە من هاتبوومە ناوچەی ئەوەوە، چونکە وەک وتی:

- ئەمە یەکەمجارە من لێرەدا تۆ دەبینم و ئەگەر یەکسەر نەڕۆیت، یان بەلایەنی کەمەوە ئەگەر وازم لێ نەهێنیت، ئەوا ئەو کاتە ناچارم ئەو بتڵە نەهێڵمەوە کە شەڕی لەسەر دەکەین. هەر بۆ ئاگاداریشت من پشتوێنی قاوەییم لە لێدانی کلکدا هەیە.

منیش وتم:

- نا، نا، من مەبەستم ئەوە نەبوو. ئەگەر هەر ئەوەندە بۆم هەبێت یەک دوو قوم لەو بتڵە بدەم (کە تەنها یەک دوو چرکەی پێدەچێت)، ئەوکاتە بەوپەڕی سنگفراوانییەوە

دەتوانیت دیسانەوە لەسەر بتڵەکە دانیشیتەوە. من خۆم لە ڕاستیدا پشتوێنی ڕەشم لە وردوخاشکردنی خشۆکەکاندا هەیە، بەڵام لە کاتێکدا کە بەتەواوەتی متمانە بە یەکتری ناکەین، پێشنیاری ئەوە دەکەم بۆ ساتێک بێیتە خوارەوە بۆ سەر مێزەکە تا من یەک دوو قوم بخۆمەوە. بەدەر لەوەش ناچارم سەری بتڵەکە دابخەم، ئەگینا ئەو کاتە ڕەنگە هەر بە بۆنەی لە یەکترنەگەیشتنەوە هەردووکمان بۆنی عەرعەرمان لێ بێت.

هیچ نەجووڵایەوە، بەڵام وتی:

- لەوەوپێش ئەوەم بیستووە.

- بەڵێ؟

- هەروا بتڵەکە دەبەیت و دەڕۆیت.

شتێک لە دەمم هاتە دەرەوە و وتم:

- وابزانم تا ئێستا نازانیت چەندە تینوومە؟

وەڵامی دامەوە و وتی:

- منیش برسیمە و تەنها لەم کاتەی ڕۆژەکەشدا نان دەخۆم. تۆ ئەوە نازانیت کە مێشوولەش بتڵی خۆش دەوێت؟ ئەوان دێن بۆ ساتێک لەسەر بتڵەکە دەنیشنەوە، منیش زمانم درێژ دەکەم، ئینجا لوولیان دەکەم و دەیانخۆم.

ڕاستی دەکرد، هەرچەندە پێم خۆش نەبوو هیچ شتێکم دەربارەی ژیانی ئاسایی مارمێلکەکان فێر بکات. خۆ ئەگەر مەشروبی ناو ئەو بتڵە لەئارادا نەبووایە کە سەرەکەشی باش دانەخرابوو، ئەوسا دەمانتوانی ئەو ژووری خەوە بەتەواوەتی دابەش بکەین، دەکرا بیکەینە ژینگەیەک کە بۆ هەردوولامان سوودبەخش بووایە. ئەو کاتە گۆردن دەیتوانی لەسەر بتڵەکە دانیشێت و مێشوولەکانی لوول بکردایە، منیش بۆ خۆم بێ خەیاڵ لێی دەخەوتم و بەیانیش کە لە خەو هەڵدەسام، لەشم نەدەخوراند. کاتی خۆی سەرۆک هۆزەکانی ئەم دوورگانەی فیجی کەسێکیان هەبووە کە ناویان لێ ناوە (پیاوی مێشوولە)، ئیشەکەیان تەنها ئەوە بووە کە بەدرێژایی شەوەکە بەڕووتی لە تەنیشتیانەوە دابنیشن، بۆ ئەوەی مێشوولەکان بەوانەوە بدەن و سەرۆک هۆزەکان بەڕاشکاوی بخەون. هەڵبەتە لەگەڵ بڵاوبوونەوەی مارمێلکەی میشوولەخۆری ناو ماڵان، پیشەی ئەو (پیاوی مێشوولانە) لەسەر دوورگەکان بەرەبەرە ڕووی لە کەمبوونەوە کردووە. ئەمڕۆکەش تاڕادەیەک ئەو مارمێلکانە وەک شتێکی پێویستی ناو ماڵان تەماشا دەکرێن.

لەویادا شتێک بە خەیاڵمدا هات و وتم:
- باشە، بتڵێکی ترت بۆ دەهێنم. بتڵێک بیرەی ساردی ناو یەخچاڵەکەت بۆ دەهێنم. تەڵەیەکی لە ئەندازە بەدەر باشە بۆ مێشوولە.
پێشنیارەکەمی هەڵسەنگاند و وتی:
- لە ڕاستیدا منیش لەم شەڕە بێ مانایە بێزار بووم، لەبەرئەوە ڕازیم بتڵەکان بگۆڕینەوە.
بە دەنگێکی بەرز وتم:
- تۆ ئازیز و خۆشەویستیت.
بۆ چەند ساتێک دڵم خۆش بوو و بیرمە تۆزێک بە شان و باهوی فیکرەکەی خۆمدا هەڵم دا. وتم:
- دە کەواتە خۆت هەڵدە خوارەوە. هەر ئێستا بتڵێکی نوێت بۆ دەهێنم.
گیانەوەرە بچکۆلەکە داچڵەکی و بەتوندی وتی:
- تا بتڵی بیرەکەم بۆ نەهێنیت. خۆم هەڵنادەمە خوارەوە.
سەرم ڕاوەشاند و وتم:
- ئاخر لەوانەیە لەو ماوەیەدا تۆ ئەو بتڵە بخەیتە خوارەوە کە من دەمەوێت بیگۆڕمەوە. خۆ ڕێدەکەوێت جارجارێک کەمێک بێ ئەقڵانە ڕەفتار بکەین، وا نییە؟ بەتایبەتی ئەگەر کەس چاودێرییمان نەکات.
- بتڵەکە تەنها لەو حاڵەتەدا دەکەوێتە خوارەوە ئەگەر تۆ بەپێی ڕێکەوتننامەکەمان هەڵسوکەوت نەکەیت، بەڵام لە هەموو بارێکدا تازە گۆڕینەوەی بتڵەکانە، لەیادی کە.
- بۆچی؟
- چونکە شوێنەکەی خۆم باشە.
هێشتا هەر ئومێدم مابوو بیهێنمە خوارەوە و وتم:
- ئەگەر مێشوولە لەم ژوورەدا مابێت، ئەوا دڵنیام زیاترێک حەزیان لە بتڵی بیرەی ساردە. هەموو مێشوولەیەک حەزی لە هەڵمی چڕبووەوەی سەر بتڵی بیرەی ساردە.
بە نیگایەکی گاڵتەئامێزەوە سەیری کردم و وتی:
- ئەی بە بڕوای تۆ من چیم لێ دێت ئەگەر لەسەر بتڵێکی زۆر زۆر سارد دابنیشم؟ بۆ پیاوێکی هەستیاری وەک من ئەوە کتومت وەک خۆکوژی وایە. وابزانم هەر

لەبەرئەوەش بوو کە ئەو بیرۆکەیەت بە خەیاڵدا هات، وایە؟
بەهیچ شێوەیەک وانەبوو، ئەوەم هەر لە خەیاڵدا نەبوو کە گۆڕدن یەکێکە لەو گیانەوەرانەی کە پلەی گەرمای لەشیان لەگەڵ چواردەورەکەیاندا دەگۆڕێت. ڕاست دەکات، ئەگەر تەنها بۆ ماوەی پێنج دەقەیەکیش لەسەر ڕووبەرێکی سارد بمێنێتەوە کە پلەی گەرماکەی دوو پلە بێت، ئەوا یەکسەر دەبورێتەوە.
– باشە کەواتە بتلێکی بیرەت بۆ گەرم دەکەم، زۆر بە خۆشحاڵییەوە ئەوەشت بۆ دەکەم.
– ئای کە بێ ئەقڵیت!
– بەڵێ؟
– ئێ ئەو کاتە چیتر سارد نابێت، کەواتە هیچ جیاوازییەکی نییە و هەر لەسەر ئەم شوێنەی خۆم بمێنمەوە باشترە.
لەویادا بەڕاستی ڕقم هەڵسا:
– تۆ ئەزانیت دەستم ئەتگاتێ و هەر بەم دەستانەشم دەتوانم بتخنکێنم؟
دڵنیا نیم، بەڵام وابزانم بەئەسپایی گوێم لێ بوو کە پێکەنی و وتی:
– من پێم وانییە بوێریت ئەوە بکەیت، هەروەها پێشم وانییە کە بتوانیت. تۆزێک لەمەوبەر خۆت ستایشی خێرایی بەرپەرچدانەوەی منت نەکرد؟ تۆ خۆت وتت تاڕادەیەک وەک (کلاڤۆیانت)ە.
– من وام نەگوت، بەڵکو ئەوە شتێک بوو من بیرم لێ دەکردەوە. تۆ لە خۆتەوە شتەکان تێکەڵ مەکە.
لەویادا بەڕاستی پێکەنی و وتی:
– کلاڤۆیانت واتە کلاڤۆیانت، بەو شێوەیە گەر گوێم لە دەنگت بێت یان مەزەنەی ئەو شتە بکەم کە بیری لێ دەکەیتەوە، وەک یەکە و هیچ جیاوازییەکی گەورەیان نییە. زۆر پێش ئەوەی دەستی تۆ بگاتە لام، من دەستی تۆ بەشێوەی جووڵەیەکی هێواش دەبینم. لەو نێوانەدا دونیایەک کاتم لەبەردەستدایە تا بە لێدانێکی توندی کلکم خواحافیزیت لێ بکەم و هاوکاتیش بە سەلامەتی خۆم بگەیێنمە ژێر سەقفەکە.
من زۆرباش دەمزانی کە ئەو ڕاست دەکات، بەڵام تاڕادەیەک نەڕاندم بەسەریدا و وتم:
– چیتر ئەمە خۆش نییە. من قەت عادەتم نەبووە لەگەڵ مارمێلکەدا شەڕ بکەم، بەڵام وا خەریکە ئارامی مێشکم لەدەست دەدەم.

لەدوامەوە وتییەوە:

- «لەگەڵ مارمێلکەدا شەڕ بکەم»، باشترە ئەو گاڵتەجاڕییە بۆ خۆت هەڵبگریت. لەسەر جێگاکەم پاڵکەوتم، ئەمجارەیان هێندە دوور بووم ئەگەر هەڕەشەکەی ببردایەتە سەر، ئەوا فریای ئەوە نەدەکەوتم بتلەکە بگرمەوە.

بە زمانێکی لووس وتم:

- مەبەستم لەوە نەبوو. لە ڕاستیدا من ڕێزێکی زۆر لە مەخلوقاتی وەک تۆ دەگرم، زۆر زیاتر وەک لەوەی تۆ مەزەندەی دەکەیت.

لاسایی کردمەوە و وتی:

- مەخلوقاتی وەک تۆ

. زۆرجار بەدکارترین حوکمی پێشوەخت هێندە قووڵ لە ناوەوەماندا خۆی حەشارداوە کە خۆشمان هەستیان پێ ناکەین.

وەک ئەوەی دڵنیای بکەمەوە وتم:

- بەڕاستی من نامەوێت ئاژاوە بنێمەوە، بەڵام لەوەدەچیت تۆ کێشەی خۆبەکەمزانینت هەبێت.

- بەهیچ جۆرێک. کاتی خۆی کە نەوەکانی پێشووت گیانەوەرێکی گچکە بوون و هەر هێندەی (شیرناڵی)یەک گەورە بوون، پورەکان و مامەکانی من دەسەڵاتی تەواویان بەسەر ژیانی وشکاوەکی ئەم زەوییەدا گرتبوو، زۆربەشیان هەروەک پاپۆڕێک بە شانازییەوە بەناو ناوچە سروشتییەکاندا تێدەپەڕین.

وتم:

- باشە، باشە. من هەموو شتێک دەربارەی دایناسۆرەکان دەزانم، وە جیاوازیی نێوان (سیناپسید) و (دیاپسید)[٤٥]ەکان دەکەم. لەیادیشت نەچێت کە من جیاوازیی نێوان (لیپیدۆساوریا) و (ئارکۆساوریا[٤٦])ش دەزانم، لەبەرئەوە زۆر شانازی بە خزمایەتیی خۆتەوە مەکە لەگەڵ دایناسۆرەکاندا، باشترە ئەوەیان جێبهێڵیت بۆ کۆتر و توتییەکانی ناو قووڵایی دوورگەکە.

وامزانی بەناوهێنانی ئەو پۆلێنکردنە فێڵم لێ کرد، چونکە بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ بێدەنگ بوو و هیچی نەگوت، لە دڵی خۆمدا وتم: (خۆ ڕەنگە هیچێکی وا لە زمانی یۆنانی نەزانێت). پاش ماوەیەکی زۆر وتی:

- ئەگەر کەمێک زیاتر بگەڕێینەوە دواوە، هێڵی نەوە کۆنەکانمان بەیەک دەگەن. واتە ئێمە خزمین. تۆ بیرت لەوە کردۆتەوە؟

ئاخۆ من بیرم لەوە کردبێتەوە؟! چ پرسیارێکی بێ مانا بوو، نەمویست ئاستی خۆم هێندە نزم بکەمەوە و وەڵامی بدەمەوە، بەڵام ئەو هەر کۆڵی نەدا و وتی:

- ئەگەر بگەڕێینەوە کۆتایی سەردەمی خەڵوزی، ئەوساکە، بۆمان دەردەکەویت کە من و تۆ هەمان دایک و باوکمان هەبووە. براله، زۆر بەکورتی ئێمە لە بنەڕەتدا براین. تۆ باش لەوە تێدەگەیت، ها؟

پێم وابوو تا دەهات زیاترێک لە یەک نزیک دەبووینەوە و جەوەکەمان خۆشتر دەبوو، بەڵام من بەردەوام خەیاڵی سەرەکیم هەر لەلای بتڵەکەم بوو کە لەدەستی نەدەم. وتم:

- بێگومان لەوە تێدەگەم. وە تۆش تەنها لەبەرئەوە لەوە تێدەگەیت، چونکە من لێی تێدەگەم. یان مەگەر لەم دوورگەیەدا دانیشگایەکی تایبەت بە مارمێلکە هەبێت؟

بریا ئەوەم نەگوتایە، چونکە دوای ئەوە دیاربوو کە دڵی ڕەنجا و هەستی بریندار بوو. وەک سەرەتایەک زۆر زۆر توڕە بوو لێم و دەموچاوی گرژ کرد. لەوەدەچوو تەواوی هەموو ماسوولکەکانی گرژ بکات. دواتریش ئەو شتە ڕوویدا کە من بەردەوام لێی دەترسام. لەناکاوێکدا دوو کەڕەت و نیو بە دەوری بتڵی جنەکەدا خوولایەوە، ئینجا بە چاوی خۆم بینیم بتڵەکە چەند سانتیمەترێک لە شوێنەکەی خۆی دوورکەوتەوە. لە هەموو شتێک خراپتریش ئەوە بوو لەدوای ئەو فەرتەنەیەوە سەری بتڵەکە بەتەواوەتی لێبووەوە، یەکەمجار کەوتە سەر مێزی تەنیشت جێگای خەوەکە و دواتریش بەسەر عەرزەکەدا خل بووەوە. هەستم کرد چاوەکانم پڕ بوون لە فرمێسک، چونکە ئەژدیها هەڵچووەکە دەسەڵاتی خۆی نیشان دەدام و هێندەی نەمابوو هەموو دونیام بەسەریەکدا دابڕمێت، ئاخر ئەوسا ناچار دەبووم بەدرێژایی شەوەکە دانیشم و بیرەی فیجی بخۆمەوە. وابزانم هەر لەو کاتەوە ڕقی لێ هەڵگرتبووم کە لە فڕۆکەکەدا بەسەر (تۆمانیڤی)دا دەفرین و کاتێکی زۆر ناخۆشمان بردەسەر، ڕێک لەو کاتەدا بوو کە بە نیگایەکی پڕ لە ناڕەزاییەوە تەماشام کرد، چونکە زۆر بێ خەیاڵانە نەخشەیەکی کردەوە و فرێدایە باوەشی (لاورا)وە.

سەری بتڵەکەم هەڵگرتەوە و لە ناوەوەمدا دەکوڵام و خەریک بوو لەتاو توڕەیی بتەقمەوە، بەڵام ئەو هەستەی خۆمم پەردەپۆش کرد و وەک ئەوەی بمەوێت لەگەڵیدا ئاشت بمەوە، وتم:

- لەلایەن منەوە کەمێک بێ شەرمی بوو کە ناوی دانیشگای مارمێلکەم هێنا، من خۆم دان بەوەدا دەنێم. لێم دەبوریت؟

لەویادا بە ڕووی بتڵەکەوە بوو و پشتی لە من بوو، لەبەرئەوە تەنها بە یەک چاو دەیتوانی من ببینێت.
بەردەوام بووم لەسەر قسەکانم و وتم:
- بەدەر لەوەش ڕاست دەکەیت سەردەمی هەرە گەشاوەی خشۆکەکان لە هەردوو چاخی (جوراسیک و کریتاسی)[٤٧]دا بوو. ئەو کاتە ئێوە لەچاو گیانەوەرە شیردەرە سەرەتاییەکاندا پێشکەوتووترێک بوون، هەروەها لە کۆتایی سەردەمی کریتاسیشدا پێشکەوتووترێک بوون لە گیاندارە کیسەدارەکان و وێڵداشدارەکانیش. من هیچ گومانێکم لەوەدا نییە. لەبەرئەوە لێدانی ئەو نەیزەکە کوشندەیەی کە سەرەتای چاخی سێهەمی[٤٨] نەخشاند، شتێکی لەڕادەبەدەر ناحەقانە بوو.
- ئەوە چۆن ڕوویدا؟
- ئەو کاتە ئێوە پاشەڕۆژێکی پڕ لە شانازیتان لەبەردەمدا بوو. هەر ئەو کاتە زۆربەتان هەستابوونە سەرپێ و لەسەر دوو قاچ دەڕۆیشتن، هەندێکیشتان هەروەک ئێمە خوێنتان گەرم بوو. لە ڕاستیدا من بەتەواوەتی لەو بڕوایەدام بە ڕێگای ئەوەوە بوون کەلتوورێکی بەرز بنیات بنێن کە دانیشگا و سەنتەری توێژینەوەی تێدا بێت. هەندێک لە ڕەگەزەکانیشتان تەنها چەند ملیۆن ساڵێکی کەمی مابوو بگەنە ئەوە، ئەوەش ماوەیەکی هێندە زۆر نییە، هەڵبەتە ئەگەر ئەو لایەنە ڕەچاو بکەین کە دایناسۆرەکان نزیکەی دوو سەد ملیۆن ساڵێک دەسەڵاتیان بەسەر ژیانی ئەم زەوییەدا هەبووە. هەروا بۆ بەراوردکاری تەنها بیر لە ڕەگەزەکەی من بکەرەوە و بزانە تەنها لە ماوەی دوو ملیۆن ساڵی ڕابردوودا چ پێشکەوتنێکی مەزنی بەدەست هێناوە، بێگومان مەبەستم لە گەشەسەندنی جینییە. هەرچی دەربارەی پێشکەوتنی کەلتووریشە، ئەوا باس لە چەند سەد ساڵێک و چەند دە ساڵێک دەکەین، ئەوەش لە ڕاستیدا شتێکی وا نییە کە شانازی پێوە بکەین.
هەر خۆم گوێم لە دەنگی خۆم بوو و ترسام دیسانەوە کەمێک خەمساردانە بۆچوونەکانم دەربڕیبێت، چونکە لەویادا ڕێک دانیشتبووم و بێ وچان لەسەر حسابی خشۆکەکان شانازیم بە ڕەگەزەکەی خۆمەوە دەکرد، وا نییە؟ هەوڵم دا ئاشتی بکەمەوە و وتم:
- منیش وەک تۆ مەبەستم لەوەیە کە ڕەگەزەکەت لە هەردوو سەردەمی جوراسیک و کریتاسیدا پێشەوا بوون، بەڵام دواتر لەگەڵ بەرکەوتنێکی شێتانەی تەنێکی ئاسمانی تردا هەموو شتێک داڕما. ئەوە شتێکی هەقانی نەبوو. بە مانای وشە شتێکی ناهەق

بوو کە نەک هەر یەکەمین هەوڵ، بەڵکو ڕەنگە تا ئەمڕۆکەش گەورەترین هەوڵی ئەم گۆی زەوییە کە ویستبێتی بە تێگەیشتنێکی عەقلانی بگات، کە ویستبێتی لە مێژووی گەشەسەندنی گەردوون و پاشەڕۆژی گەردوونیش بگات، بەهۆی ئەو نەیزەکەوە دابڕمێت کە لە ڕێڕەوی خۆی دەرچوو و هێزی ڕاکێشانی زەویش بێ ڕەحمانە بۆ لای خۆی ڕایکێشا. بەو شێوەیە چەندەها ملیۆنساڵتان لەدەست دا. تەنانەت بۆ یەک چرکەش نیگام لەسەر گۆردن لانەدا، ئەویش یەک بینە چاوی تێبڕیبووم. بەردەوام هەوڵم دا تا ئەوپەڕی ڕادە بە نەرمی قسەی لەگەڵدا بکەم و وامزانی لایەنی کەم کەمێک هێمنم کردۆتەوە. وتی:

– مەبەستت چییە لەوەی کە چەندەها ملیۆن ساڵمان لەدەست داوە؟

بە دەنگێکی نەرمتر پرسیارەکەی لێ کردم. زیاترێک لە کوڕێکی زوویر دەچوو کە باوکی ڕێگەی پێ نەدابێت دەمودەست شوکلاتەکەی بخوات، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا داوای لێ دەکرد بەردەوام بێت لەسەر گێڕانەوەی چیرۆکەکەی.

– پێشبڕکێی گەیشتن بۆ سەر مانگ: ئێوە لەوەیاندا دۆڕانتان و نەوەکانی دواتری (شیرناڵی)یەکان ئەو پێشبڕکێیەیان بردەوە.

گازم لە لێوی خۆم گرت. دیسانەوە لەڕادەبەدەر بەپەرۆشییەوە قسەم کرد. وتی:

– سوپاس، هێندە بەسە و با هەموو سوکایەتییەکانی ترت وەلاوە بنێین.

هێندە تێگەیشتم کە ئەوە دوا ئاگادارکردنەوەی بوو بۆم، بەرلەوەی کارەساتێک ڕێک لەو شەوەدا ڕووبدات کە هاوشانی کارەساتی کەوتنەخوارەوەی نەیزەکەکە بێت کە لەوەوپێش ناومان هێنا.

وتم:

– دەترسم دیسانەوە بەهەڵە لێم تێگەیشتبیت، بێگومان خەتاکەش تەنها خەتای منە و بەڕاستی لۆمەی خۆم دەکەم، بەڵام ئەوەش بزانە کە من هەمیشە لە کاتی نیوەشەودا ناتوانم بە ڕوونی بیر بکەمەوە، بەتایبەتیش ئەگەر ڕێگەم لێ بگیرێت کە... کە بگەمە.. بەڵێ، بەڵام بەڕاستی هەروەک خۆت ئاماژەت پێ دا ئێمە لە بنەڕەتدا لە ڕێگەی خوێنەوە برای یەکین و یەک زنجیرەی جینی وەک یەکمان هەیە، هەر بۆ نموونە هەردووکمان گیانەوەرێکی چوارپەلی پێنج پەنجەیین، وە ئەگەر لەوە تێبگەین کە ئەم زەوییەی لەسەری دەژین بوارێک یا ژینگەیەکی هاوبەشە بۆ هەمووان، ئەو کاتە من لەو بڕوایەدام بەشێوەیەکی باشتر لە یەکتری تێبگەین. لە ڕاستیدا خودی زەوی، نەک تۆ یان من، چەند ملیۆن ساڵێکی لەدەست دا بەهۆی

پێکدادانی ئەو نەیزەکەوە کە کوێرانە لە ڕێڕەوی خۆی لایدا، یان ڕاستترێک بیڵێم هەردووکمان چەندەها ملیۆن ساڵمان لەدەست دا، چونکە دەبێت هێندە تێبگەین کە تەنانەت خودی ئەستێرەیەکی گەڕۆکیش تەمەنێکی هەتاهەتایی نییە و ڕۆژێک دادێت کە تەمەنی تەواو دەبێت. خۆ ئەگەر ئەو نەیزەکە سەرلێشێواوە نەبووایە، ئەو کاتە تۆ لەسەر قەراغی ئەم جێگایە دادەنیشتیت و چیرۆکت دەگێڕایەوە و منیش بە ژوورەکەدا دەسوڕامەوە و ڕاوی مێشوولەم دەکرد. ئێ خۆ ڕەنگە کەڕەتێکی تریش ئەوە ڕوویداتەوە. بەڵێ، ڕێک دەمویست ئەوە بڵێم: خۆ ڕەنگە کەڕەتێکی تریش هەمان شت ڕوویداتەوە! لێرەدا باس لە هاوسەنگییەکی ناسکی هێز دەکەین لەنێوان ئەقڵ و نائەقڵدا، لەنێوان ئاگایی گەردوونی و نائاگایی گەردوونیدا، مەبەستم لە جۆرە هاوسەنگییەکی تیرۆری گەردوونییە کە دەبێتە هۆی ئەوەی ناتەباییە بچکۆلەکانمان لەیاد بچێتەوە، لەوانەیە لێرەدا لە جێگای خۆیدا بێت بڵێم کە ئەقڵ لەو هاوسەنگییە تیرۆرەدا (دەڤید)[49]ە بە خۆی و دارلاسیکە لاوازەکەیەوە، وە نائەقڵییە مەزنەکەش، (گۆلیادی زەبەلاحە کە جبەخانەیەکی تەواوی نەیزەک و ئەستێرەی کشاوی تورەی لەبەردەستدایە. ئەقڵ جۆرە ڕێکخستنێکی زۆر ناوازەیە، لە کاتێکدا هێندێکی زۆری سەهۆڵ و ئاگر و بەرد بوونیان هەیە، ئەمە بەدەر لە ماددەکانی تر. هەزاران هەسارۆکەی گچکەی سەرلێشێواو بەردەوام لە خولگەیەکی ناجێگیردا لەنێوان (مەریخ) و (مشتەری)دا دەخولێنەوە، تەنها یەک نزیکبوونەوەی بەدبەخت بەسە بۆ ئەوەی کە یەکێکیان لە خولگەکەی خۆی دەربچێت و بەرەو زەوی بکەوێتە ڕێ. کەواتە بوەستە بزانە چی ڕوودەدات، فەڕەی داهاتوو گیانەوەرە شیردەرە سەرەکییەکان تیادەچن، هەر بۆ نموونە ڕەنگە مارمێلکەیەکی ژێر هۆزی مارمێلکەییەکان ببێتە پێشەوای سروشت و هەوڵی تێگەیشتنی کەمێکی زیاتری ئەو گەردوونە بدات کە ئێمە بەشێکین لێی، بەڵام پرسیارەکە لەوەدایە بڵێیت ئەو کاتە درەنگ نەبێت بۆ زەوی؟ چونکە کێ دەزانێت خۆر چەندێکی ماوە تا ببێتە شتێکی زەبەلاحی سوور. بەهەرحاڵ من نامەوێت ئەو حوکمە بدەم، بەڵکو هیوادارم بەخت یاوەرتان بێت. لەوانەیە ڕۆژێک لە ڕۆژان هەنگاوێک بنێن کە بۆ مارمێلکەیەک هەنگاوێکی بچکۆلە بێت، بەڵام پێی دەچێت هەنگاوێکی مەزن بێت بۆ هەموو سروشت. ئەو کاتە دەبێت هێندە بزانن کە ئێمەش لەو سەفەرەدا لەگەڵتاندا بووین.

لەویادا وتی:

- تۆ زۆر قسە دەکەیت.
دانم بە قسەکەیدا نا و وتم:
- هەر زۆر زۆر... ئێ ئەوە پێی دەگوترێت نیگەرانی گەردوونی.
- باشە لە کاتی ئێستادا هەر هیچ شتێک نادۆزیتەوە کە ستایشی خێزانەکەی من بکات، مەبەستم لەوەیە بەو شێوەیەی کە ئێستاکە هەین؟
من زۆر بە باشی لە قسەکەی تێگەیشتم، بۆیە وتم:
- بەڵێ بەڵێ بێگومان، هەر زۆر زۆریش. بۆ نموونە من زۆر سەرسامی ئەوەم کە ئێوە توانیوتانە بەدرێژایی چەندین ملیۆن ساڵ خۆتان لە ماددە بێ هۆشبەرەکان بەدوور بگرن، پێدەچێت کتومت هەر لەبەرئەوەش بێت کە هێندە تەمەندرێژ دەبن. ئاخر دڵنیام کە هەمیشە شتێکی ئاسان نییە کە خشۆکێک بیت، بەلایەنی کەمەوە دەتوانم هێندەت پێ بڵێم کە جارناجارێک سەختە کە مرۆڤ بیت. لەوانەیە ئێمە بەدەست ئەو شتە بچکۆلە نائاسییەوە بناڵێنین کە یەک دوو گرێی زیادەمان لە مێشکماندا هەیە. ئەم قسەیەش بەشێوەیەک ناکەم وەک ئەوەی کە بەزەییم بە خۆماندا بێتەوە، چونکە کێ دەڵێت خشۆکەکانیش بەدرێژایی ژیانیان بەدەست جۆرێک لە جۆرەکانی ناتەواوییەکی ناخۆشەوە ناناڵێنن؟ بەڵام وەک دەزانین ئەلکهول تاڕادەیەک بەشێوەیەکی سەربەست بوونی هەیە، هەر بۆ نموونە لە چەندین جۆری ئەو میوانەدا هەیە کە خۆیان بۆ خۆیان دەکەونە خوارەوە، بەڵام هیچ جۆرە ڕەگەزێکی ئێوە ئالودەی ئەو جۆرە شتانە نەبوون، لێرەدا مەبەستم لە هەموو هۆزەکانتانە، هەر لە هۆزی سەرلمۆزییەکان و هۆزی مارمێلکە پولەکەییەکانەوە تا تیمساحەکان، ئەمە ئەگەر تەنها باسی (دیاپسید)ەکان بکەین. بەداخەوە هێندە زۆر دەربارەی خۆراکی کیسەڵەکان نازانم، بەڵام وای بۆ دەچم هەموو ڕەگەزی کیسەڵەکان بەلایەنی کەمەوە بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ بەبێ ئەلکهول هەڵ بکەن، وەک دەزانیت تەمەنیشیان زۆر درێژ دەبێت، هەندێک ڕەگەزیان هەیە دوو سەد ساڵێک دەژین، بۆ نموونە ئەو کیسەڵە یۆنانییانەی لەسەر وشکانی دەژین. دەڵێن گوایە قەشەی شاری لینینگراد کیسەڵێکی هەبووە (٢٢٠) ساڵ ژیاوە. خۆ لەوانەشە هەندێک زیادەڕۆیی لە چەند سەرچاوەیەکی تردا هەبێت کە باسی کیسەڵێکی گەورە دەکات و گوایە لە ساڵی (١٧٦٦)دا لەسەر دوورگەکانی (سیشیل) بە گەورەیی گیراوە، هەر بە بەندی ماوەتەوە تا دواتر لە ساڵی (١٩١٨)دا بە ڕووداوێک لە (ماوریتیۆس)دا گیانی لەدەست داوە، هەرچەندە لەو کاتەدا بۆ ماوەی (١١٠)

ساڵ کوێر بووە. بەهەرحاڵ وەک دەزانین کیسەڵەکان تەنها ڕەگەز نین کە هێندە تەمەنیان درێژ دەبێت، من زۆرباش دەزانم کە بەشێوەیەکی گشتی خشۆکەکان تەمەنێکی زۆر دەژین، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئێوە کە بەرەو تەمەنی پیربوون دەڕۆن هۆگری ئەلکهول نابن، هەروەک ڕەگەزەکەی من کە بەئاشکرا ئەو حاڵەتەی تێدا دەبینرێت. بەلایەنی کەمەوە لەو کەلتوورانەدا کە تا ئەندازەیەک بەشێوەیەکی یەکلایەنانە ئەو یەک دوو گرێ زیادەیەی مێشک دەپەرستن کە لەوەوپێش باسمان کرد، مەبەستم لەو گرێیانەیە کە تاڕادەیەک زیانیان زیاترە وەک لە سوود، زیاتر دەبنە هۆی سەرهەڵدانی کۆمەڵێک نیگەرانی، نیگەرانی سەبارەت بە گەردوون و بەکورتی ژیانی سەر زەویمان و ئەو ڕەهەندە مەزن و فراوانەی شوێن و کات.

– وەک لەوەوپێش وتم تۆ قسە زۆر دەکەیت.

مەبەستم لە وتارە دووردرێژەکەم ئەوە بوو کە نەرمترێکی بکەم، خۆ ئەگەر بەپێچەوانەشەوە کاریگەری لەسەر جێبهێشتایە، ئەوا گومانم نەبوو بتڵە جنەکەم لەدەست دەدا. هەروا بۆ دڵنیایی بڕیارم دا خۆم بدەم بەدەستەوە و وتم:

– گەورەکەم گۆردن، چیتر نامەوێت باسی ئەو بتڵە بکەم و وا من بڕیارم دا لەو بارەیەوە خۆم بدەم بەدەستەوە.

– بڕیارێکی ئاقڵانەیە.

– کەواتە ئیتر لەسەری ناڕۆین.

– ئێ من وا سەعاتێکی ڕێکە بەدوای ئەوەوەم.

– بەڵام بێگومان ڕێگەم پێ دەدەیت کە سەری بتڵەکە بنێمەوە. ئەوە شتێکی ئاساییە و هەموو کەسێک دەبێت هێندە فێر ببێت کە لە یادی نەکات.

وەڵامی نەدامەوە و وتم:

– ئی خۆ ڕێگە لە ڕاوی تۆ ناگرێت. بگرە بەپێچەوانەوە، من بیستوومە کە مێشوولە حەزی لە بۆنی جن نییە. بەڵێ، بەڕاستی دەڵێن باشترین مەرهەمە بۆ دوورخستنەوەی مێشوولە، هەربۆیە کاتی خۆی داگیرکەرە بەریتانییەکان جنێکی زۆریان دەخواردەوە تا خۆیان لە مەلاریا بپارێزن، دەزانیت؟

بە ئاستەم لە شوێنی خۆی جووڵایەوە، وابزانم تەنها لەبەرئەوە بوو کە بەتەواوەتی بمخاتە بواری بینینی خۆیەوە، بواری بینینی مارمێلکە تەنها نزیکەی (٢٥) پلەیە. دواتر وتی:

– فەرموو هەوڵی خۆت بدە.

دەکرا وەڵامە کورتەکەی بە دوو شێوە لێک بدرێتەوە، لەبەرئەوە پرسیم:
– مانای ئەوەیە ڕازیت؟
– نەخێر، هاوکات مانای ئەوەشە کە دەبێت وریاتریک بیت و بزانیت بە چ شێوەیەک قسەکانت دەردەبڕیت. بێگومان ڕاست دەکەیت کە بتڵێکی سەرکراوە جیاوازە لە بتڵێکی سەرداخراو و دەبێت وریاتریک مامەڵەی لەگەڵدا بکەین.
– باشە تۆ قەت هیلاک نابیت؟
– تۆ خۆت باش دەزانیت کە من مارمێلکەیەکم و بە شەو چالاکم.
چیتر نیگەرانیی شەوانی دواتری (ماراڤیۆ) نەبووم، ئێ خۆ هەر هیچ نەبێت دەمتوانی لە ئوتێلەکەدا یان لە دوکانەکەی (سۆمۆسۆمۆ)دا بتڵێک جن بکڕم، هەرچەندە لە ڕاستیدا نەمدەزانی یاسا و ڕێسای کڕین و فرۆشتنی ئەلکهول لە دوورگەکانی فیجیدا بە چ شێوەیەکە، بەڵام لە یەک شت دڵنیا بووم: بۆ ئەوەی بمتوانیبایە باقی شەوەکە بخەوم، ناچار بووم بە هەر شێوەیەک بێت یەک دوو قومی باشم لە بتڵەکەی گۆردن فڕ کردایە. بەکورتیەکەی لەویادا ئامادە بووم گرەو لەسەر نیوەی بتڵی جنەکە بکەم تا دوو قومی باشم بەدڵنیاییەوە دەست بکەوێت، لەبەرئەوە بەهۆی ئەو بارودۆخە نوێیەوە سەرلەنوێ بیرم لەوە کردەوە کە هێرشێکی کتوپڕی بکەمە سەر، هەرچەندە زۆر پێی دەچوو بەشێکی باشی بڕژێت و بەهەدەر بچێت، بەڵام هاوکات دڵنیا بووم بەشی ئەو شەوەم هەر دەست دەکەوێت. خراپترین حاڵەتیش کە بە مێشکمدا دەهات ئەوە بوو کە بتڵەکە بکەوێتە خوارەوە، هەر تەنها کە بیرم لەوە دەکردەوە چەندە سوک و ڕیسوا دەبم ئەگەر لەبەرچاوی گۆردندا بەسەر عەرزەکەدا بخشێم و بەرلەوەی زۆربەی زۆری جنەکەم لەنێوان درزی دارەکاندا دیار نەمێنێت، بکەومە لێسانەوەی پاشماوەی پیسی دەرمانەکەم، وای لێ کردم پەشیمان ببمەوە و کەرەتێکی تریش هەموو حاڵەتەکە هەڵبسەنگێنمەوە.
جانتا ڕەشەکەم لە ناوەڕاستی ژوورەکەدا بوو، نزیکەی هەنگاو و نیوێک دوور بوو لەو شوێنەی کە منی لێ دانیشتبووم. لەپڕێکدا بیرم کەوتەوە کە پاکەتێک شەربەتی تێدایە و قامیشێکیشی پێوەیە، کاتی خۆی لە یەکێک لە سەفەرەکاندا خانمێکی خزمەتچی لەناو فڕۆکەکەدا بۆی هێنام. لە دڵی خۆمدا وتم ڕەنگە ئەوە دواهەمین شەنسم بێت و ئەو جارەیان بڕیارم دا ئەو شتەی خەیاڵم بەو تیرۆریستە لوتبەرزە نەڵێم، جا ئیتر کلاڤۆیانت بێت یان نا.
دەستی چەپم لە پشتمەوە دانا بەرەورووی مێزی تەنیشت جێگاکە و چاویشم

بەردەوام بڕیبووە بتڵەکە و گۆردن، پڕم کرد بە جانتاکەمدا و چەند چرکەیەک دواتر دیسانەوە لەسەر قەراغی مێزەکەم دانیشتمەوە.
پرسی:
- ئەوە چی دەکەیت؟
درۆیەکم بۆ کرد و وتم:
- دەمەوێت بخەوم، تۆ خۆت دەزانیت من گیانەوەرێکم و بەشێوەیەکی گشتی بە ڕۆژ چالاکم.
- ئەو (شیرناڵی)ییانەی کە تۆ بە ڕەچەڵەک لێوەیان هاتوویت وا نەبوون. کە دونیا تاریک و سارد دەبوو، بەخشکەیی بۆ ڕاو دەچوونە دەرەوە، چونکە لەو کاتانەدا گیانەوەرە خوێنساردەکان ناچار بوون بە ئارامی لە شوێنی خۆیاندا بمێننەوە.
لەو کاتەدا کە جانتاکەم کردەوە وتم:
- خۆشم زۆرباش ئەوە دەزانم. ئێ خۆ من ڕاستەوخۆ وتم ئەگەر (٦٥) ملیۆن ساڵ لەمەوبەر بەهۆی ئەو نەیزەکەوە نەبووایە، ئەوا لەوانە بوو ئێستا تۆ بە ئارامی بچوویتایەتە ناو جێگاوە و منیش بە عەرزەکەدا بخولامایەوە و ڕاوی مێش و مەگەزم بکردایە. بەشێوەیەکی گشتیش تۆ تەنها ئەو شتانە دەزانیت کە من دەیانزانم، نە زیاتر و نە کەمتر.
دوا ڕستەم بۆ ئەوە فڕێدا تا مەزاجی تاقی بکەمەوە، بەڵام هەروەها بۆ ئەوەش بوو کە سەرنجی لەسەر خۆم لابەرم، چونکە دانیشتبووم سەرقاڵی کارتۆنی شەربەتەکە بووم. نەختێک دواتر قامیشەکەم بەدەستەوە بوو.
هێندە بێ ئەقڵ نەبووم پرسیار لە گۆردن بکەم و بزانم ڕێگەم پێ دەدات تۆزێک لە شلەی ناو بتڵەکە بخۆمەوە یان نا، بەڵکو سەرم بەسەر بتڵەکەدا نوشتاندەوە و وتم:
- تۆ خۆت دەزانیت کە من شارەزاییەکی باشم لە گیانەوەرە خشۆکەکاندا هەیە...
- سوپاست دەکەم، بەڕاستی هێندە تێگەیشتم. تۆ شێت و شەیدای ئێمەیت.
- بەڵام وابزانم بەتەواوەتی بۆم ڕوون نەکردیتەوە کە من هەمیشە خۆشەویستییەکی یەکجار تایبەت و زۆرم بەرامبەر مارمێلکەکان هەبووە. وە دیسانەوە بەتایبەتیش دەتوانم پێت بڵێم بەرامبەر ئەو (٣٥) ڕەگەزەی کە پێیان دەگوترێت مارمێلکە نیو پەنجەییەکان...
پاش ئەوە یەکسەر سەرێکی قامیشەکەم خستە ناو دەممەوە و سەرەکەی تریشی

بۆ ناو بتڵەکە بەبێ ئەوەی دەستی لێ بدەم، لە هەموو شتێکیش سەیرتر ئەوە بوو کە گۆردن بە ئارامی مایەوە. خۆم بە خۆمم وت (ڕەنگە نەوێرێت هیچ شتێک بکات یان لەوانەیە بەتەواوەتی سەری لێ شێوابێت).
دڵنیام پێش ئەوەی ناچار بووم کە بوەستم و هەناسەیەکی بۆ هەڵکێشم، قومێکی باش باشم لوش دا، ئێ ئیتر ئەو کاتەش من بە مەرامی خۆم گەیشتبووم. لە ڕێگەی فیڵێکی دەگمەنەوە توانیم لە بتڵەکە بخۆمەوە بەبێ ئەوەی بەرزی بکەمەوە بۆ دەمم. لەدوای ئەوەشەوە تا ئەندازەیەک (هێلکەکەی کۆلۆمبوس)[5] شتێکی وا نەبوو کە شانازی پێوە بکرێت.
- ئای کە خۆشە، ئای کە خۆشە.
هێندەم وت و بە دەنگی بەرز قرقێنەیەکم لێدا.
نە بەهۆی بێ ئەدەبییەوە بوو کە قرقێنەم لێدا و نە بەهۆی خواردنەوەکەشەوە بوو کە زۆرجار جۆرە جورئەتێک دەبەخشێ، بەڵکو هەر بۆ خۆی بە سروشتی لەدەمم هاتە دەرەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەبێت دان بەوەدا بنێم کە یەکسەر هەستم کرد بەشێوەیەک لە شێوەکان شانم سوک بووە و پاش نەختێکیش زیاترێک هەستم بە ئازایەتی کرد. لە ڕاستیدا هەر لە سەرەتاوە گۆردن ناهەقی نەبوو کە نەیدەهێشت دەستم بەو بتڵە بگات.
چرکەی دوای ئەوە (هیمیداکتایلوس فریناتوس) بەخێرایی بە دەوری بتڵەکەدا خوولایەوە، هەرچەندە بە پەنجەیەکم بتڵەکەم گرتبوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا چەند دڵۆپێکی گرانبەهای مەشروبەکەم لە بتڵەکەوە هاتە دەرەوە و بەسەر مێزی تەنیشت جێگای خەوەکەمدا پرژا. بێگومان ئەوە شتێک بوو کە چاوەڕوانم دەکرد، پاش نەختێک دڵنیا بووم ئەگەر فرسەتی بۆ هەڵ بکەوێت پیامدا هەڵدەزنێت، لەبەرئەوە دەستم لە بتڵەکە هەڵگرت، چونکە تەنانەت لەدوای ناسینی گۆردنیشەوە هەستم بەرامبەر مارمێلکە هەروەک جاران بەشێوەیەکی دوولایەن مایەوە.
وتی:
- ئێستا دەمەوێت بەڕاشکاوی قسەی خۆمت پێ بڵێم: وریابە ئەگەر کەڕەتێکی تر هەمان شت بکەیتەوە، ئەوا بەڕاستی پەشیمان دەبیتەوە.
زۆر بە باشی لە ئاگادارکردنەوەکەی تێگەیشتم، چونکە خۆشم دەمزانی ئەگەر تەنها یەک قومی ترم بخواردایەتەوە، ئەو کاتە هێندە جورئەتم دەکرد کە غەدری لێ بکەم.
هەر لە پاش ئەو قومەی کە خواردبوومەوە بەڕاستی سەرم بۆی دەخورا.

وتم:
– تێگەشتم. نەمزانی پێت ناخۆشە کە ئەم قامیشە هەزەلییە تاقی بکەمەوە. بەڕاست، هەر زۆر نزیک کەوتمە لێت، بەڵام مەبەستم نەبوو بتترسێنم.
– کەواتە بەشکم بتوانی کەمتریش قسە بکەیت.
هەرواشم کرد، چونکە ڕێک لەو کاتەدا هیچ شتێکم نەبوو کە لەگەڵ گۆردندا باسی بکەم. هەروەک چۆن بەشێوەیەکی گشتی دەروونناسێکی پۆلیس هیچ شتێکی نییە لەگەڵ ئەو کەسەدا باسی بکات کە خەڵکی تری بە بارمتە گرتووە، بەڵام وا خۆی پیشان دەدات کە شتێکی هەیە و دەیەوێت لەگەڵیدا باسی بکات، لە ڕاستیدا هەموو خاڵە گرنگەکەش لەوەدایە: چونکە پێویستی بە کاتە، لەبەرئەوە درێژە بە گفتوگۆکەیان دەدات. زۆرجاریش ڕێک لەو حاڵەتەدا پەیوەندییەکی هاویەش لەنێوان هەردووکیاندا سەرهەڵدەدات، چونکە کاتێک کە هەموو ڕێگاکان دادەخرێن و ئەو کەسەی کە بارمتەکانی گرتووە دەزانێت کە چواردەوری بە هێزێکی گەورەتر گیراوە، ئەویش هەست دەکات کە پێویستی بە کاتە.
گۆردن وتی:
– یان هەر هیچ نەبێت باسێک دابمەزرێنە کە ئەقڵانی تر بێت.
– ئەوەت دەوێت؟ دەتەوێت باسی شتێکی ئەقڵانی بکەین؟
– هێشتا بەشێکی زۆری شەوەکەمان ماوە و بەهۆی تۆشەوە زۆر ڕێی تێدەچێت کە مێشوولە پەیدا ببن، بەدەر لەوەش وا چاوەڕوانم پێش ئەوەی لوولیان بکەم، زۆر قەڵەوتر و خۆشتر ببن.
پێم خۆش نەبوو بۆ مارمێلکەیەک ببمە (پیاوێکی مێشوولە) و پێشم وابوو لە سنووری بێ ئەقڵی نزیک بووەوە کاتێک درێژەی بە قسەکانی دا و وتی:
– من خۆم ئومێدەوار بووم پاش ئەوەی گڵۆپەکەت داگیرساند، هێندە زوو دەرگاکە دانەخەیت.
لە ڕاستیدا من بەرلەوەی گڵۆپەکە دابگیرسێنم، دەرگاکەم داخست. من نزیکەی دوو مانگێک بوو لەو ناوچە گەرمانەدا بووم، هەرچەندە زۆر هەستیاریش نەبووم بەرامبەر بە مێشوولە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا زۆر وریا بووم کە مێشوولە نەیەتە ژووری خەوەکەمەوە تا بەو شێوەیە هەتا بکرێت کەمترین ژمارەی مارمێلکە لە ژوورەکەمدا هەبێت.
وتم:

- دەتوانین باسی هەر شتێک بکەین کە ئارەزووت لێ بێت. حەزت لە دووگۆڵی هەیە؟
- بە هیچ شێوەیەک.
- ئەی یاری کریکت؟
- نەخێر.
- پولی دەگمەن؟
- بێدەنگ بە!
- کەواتە پێشنیار ئەکەم باسی دونیای ڕاستەقینە بکەین.
- دونیای ڕاستەقینە؟
- بەڵێ، هەر بۆ نموونە. یان بەلاتەوە ئەوەش بابەتێکی هەر زۆر هەڕەمەکییە؟
- فەرموو دەست پێ بکە، خۆ من لە هەموو بارێکدا تا خۆر هەڵنەیەت ناخەوم.
- بەر لە هەموو شتێک هەتا بڵێیت گەورەیە و لەڕادەبەدەریش کۆنە، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا هیچ کەسێک پەی بە سەرچاوەکەی نابات.
- خۆر؟
- نا، دونیای ڕاستەقینە. ئێمە باسی ئەوە دەکەین. وابزانم ناچار دەبین لە یەک کاتدا تەنها سەرنج بدەینە یەک شت. ئەم سیستەمی خۆرەی خۆمان تەنها بەشێکی هەر زۆر زۆر بچکۆلەی ئەو شتەیە کە ئێمە ناوی دەنێین دونیای ڕاستەقینە. بەشێوە گشتییەکەی دونیای ڕاستەقینە لە نزیکەی سەد ملیارد گەلەهەسارە (مەجەڕە) پێکهاتووە. (ڕێگای کاکێشان)یش، مەبەستم لەو لاڕێگا بچکۆلەیەی خۆمانە کە پێچی کردۆتەوە، یەکێکە لەو گەلەهەسارانە. خۆریش لێرەدا تەنها ئەستێرەیەکی ئەو گەلەهەسارەیەیە کە زیاتر لە سەد ملیارد ئەستێرەی لەخۆ گرتووە. هەر کتومت ئەو دانەیەشە کە پاش چەند سەعاتێکی تر هەڵدێت و ڕۆژێکی نوێی سەر ئەم زەوییە دەست پێ دەکات، خۆ ئێمە هەر بە مانای وشە لەسەر هێڵی (بەرودوا)ین و هەموو ڕۆژێکی نوێ لێرەوە دەست پێ دەکات.
گۆردن شتێکی لەسەر قسەکانم وت:
- کەواتە دونیای ڕاستەقینە گەورەیە.
وابزانم لەدوای ئەو قسەیەوە گەمژەترێک هاتە بەرچاوم.
منیش وتم:
- بەڵام ئێمە تەنها بۆ چرکەیەکی کەم لێرەداین و لەناکاوێکدا ون دەبین و دەچینە

ناو پاشماوەی ئەبەدییەتێکەوە کە ماوەیەکی یەکجار زۆری پێ دەچێت. هەر بۆ نموونە من خۆم لە پاش چەند ساڵێکی تر یاخود چەند دە ساڵێکی تر ون دەبم و دوای ئەوە هیچ بوارێکم نییە کە بزانم چی ڕوودەدات. بێگومان پاش سەد ملیۆن ساڵی تریش هەر ونم، ئەو کاتە کتومت سەد ملیۆن ساڵێک بەسەر ونبوونمدا تێپەڕیوە، هەڵبەتە ناقسی چەند حەفتە و مانگێک و باقی ئەم شەوەش کە تیایداین.

– بە بڕوای من پێویست ناکات بەدەست ئەو نیگەرانیانەوە بناڵێنیت.

ئەو قسەیەی بەشێوەیەک دەربڕی هەروەک ئەوەی دڵنەواییم بداتەوە، وەک ئەوەی هەر خۆی هۆکاری بنەڕەتی ماتی و نیگەرانییەکەم نەبووبێت.

درێژەم بە قسەکانم دا و وتم:

– لە بنەڕەتدا وە بە پلەی یەکەم کورتی ئەم ژیانە نیگەرانم ناکات، چونکە لە کاتی ئێستادا پێویستیم بەوەیە کە کەمێک پاڵ بکەوم، سەرخەوێک بشکێنم، بەڕاستی هەر لە ئێستاوە هەست دەکەم کەمێک شەکەت و ماندووم. ئەو شتەی کە من پەست دەکات ئەوەیە کە لە پاش ڕۆیشتنمەوە ئیتر قەت قەت ناتوانم بگەڕێمەوە، مەبەستم لەوەیە قەت ناتوانم بگەڕێمەوە بۆ ناو ئەم حەقیقەتە. خۆ مەرج نییە ڕێک بێمەوە ئەم شوێنە، شەرت نییە بگەڕێمەوە گەلەهەسارەی (کاکێشان)، مەبەستم لەوەیە ئەگەر لێرە کێشەی کەمی شوێن سەرهەڵبدات دەکرێت بچمە شوێنێکی تر. من بەتەواوەتی ڕازیم کە بیر لە گەلەهەسارەیەکی تر بکەمەوە، بەس ئەوەندەی بارێکی تێدا بێت دەمەوێت، هەروەها وا چاوەڕوانم گیانەوەرەکانی دوو ڕەگەزی بن و من وەک ڕەگەزێکیان لەدایک ببمەوە، چونکە قەت حەزم لەو ئەستێرە گەڕۆکە قۆڕانە نەبووە کە گیانەوەرەکانی بێ ڕەگەزن و لە ڕێگەی گۆپکەوە زیاد دەکەن، ئەگەر بەو شێوەیە بێت، ئەوا بوون و نەبوونی وەک یەکە. مەبەستم لەوەیە کە کێشەکە لە ونبوون و ڕۆیشتندا نییە، بەڵکو لەوەدایە کە قەت ڕێگەی گەڕانەوە نییە. بەلای ئێمەشەوە، کە مێشکمان دوو سێ گرێی تاڕادەیەک لەیەک ترازاومان هەیە –ئەو گرێیانەی کە زیادەن، یان دەشتوانین بڵێین یەدەگن– بۆ ئێمە پێی دەچێت ئەو جۆرە وێناکردنانە بۆ ماوەیەکی کەم چێژی ژیانمان بوەستێنێت، مەبەستیشم لە چێژی ژیان تەنها لایەنی سۆزداری نییە، چونکە ئێمە لێرەدا تەنها باسی جۆرە ڕقەهەستانێکی سۆزداری ناکەین، بەڵکو باسی جۆرە ڕقەهەستانێکی خودی ئەقڵیش دەکەین. واتە زۆر بەباشی دەتوانین بڵێین ئەو شتەی کە زەرەرمەندە لەوەدا کە

ئێمە ئەو دوو سێ گرێ مێشکییە زیادەیەمان هەیە، هەر کتومت خودی ئەو دوو سێ گرێ مێشکییە زیادەیەن. بەو شێوەیەش بەردەوام لە بازنەیەکدا دەخولێینەوە و وەک دەڵێین گاز لە کلکی خۆمان دەگرین، نەک بۆ خۆشیش، بەڵکو بەردەوام دەبین تا خوێنی لێ دەچۆڕێت. بەشێوەیەکی تر بیڵێین جۆرە سیفەتێکی وای تێدایە کە خۆی خودی خۆی دەڕوخێنێت و هاوکاتیش بەشێوەیەکی سانا ناتوانین دەستبەرداری ببین. بۆ نموونە ئەگەر هێرش بکرێتە سەر مارمێلکەیەک، بەئاسانی دەتوانێت دەستبەرداری کلکی ببێت، چونکە بەڕاستی لەنێوان هەموو گیاندارە سەرەکییە باڵاکاندا، هیچ گیانەوەرێکمان نییە کە توانایەکی مێشکی سەربەخۆی وەک مارمێلکەی هەبێت. بێگومان دەکرێت ئەو ترپە دەمارییانەی کە هێرشیان کراوەتە سەر بۆ چەند سەعاتیک بەنج بکرێن، بۆ نموونە بە خواردنەوەی یەک دوو پێکی جن، بەڵام وەک دەزانیت ئەوە چارەسەرێکی کاتییە و لە بنەڕەتەوە چارەسەری کێشەکە ناکات.

– باش تێدەگەم.

هەر هێندەی وت و لەویادا بەڕاستی وام بە خەیاڵدا هات کە فشە دەکات و تەنانەت یەک وشەش چییە لە قسەکانم تێنەگەیشتووە. وتم:

– ئەو بەشانەی مێشکمان، مەبەستم لەو بەشانەیە کە زیادەن و بە مانای وشە پێویست نین بۆ ڕاپەڕاندنی کارە سەرەکییەکانی ژیانمان، ڕێک ئەو بەشانە لەلایەکی ترەوە خودی سەرچاوەی ئەو تێگەیشتنە کەمەیە کە تا ئێستاکە پێی گەیشتووین، بۆ نموونە زانیاری دەربارەی گەشەکردنی ژیانی سەر زەوی، یان زانینی چەند یاسایەکی سەرەکیی سروشتی و بەتایبەتیش شارەزایی دەربارەی مێژووی گەردوون هەر لە تەقینەوە گەورەکەوە هەتا ئەمڕۆ. وەک دەبینیت ئێمە شتی بچکۆلە و ترۆهات نائاخنینە مێشکمانەوە.

– سەرسامت کردم!

ئێمە کتومت هێندە تێدەگەین کە بتوانین وێنایەکی ڕوونمان دەربارەی مێژووی دونیای ڕاستەقینە و جوگرافیاکەی و سروشتی ماددەکەشی هەبێت، بەڵام هیچ کەسێک بەهیچ شێوەیەک نازانێت جەوهەری ئەو ماددەیە چییە، بەلایەنی کەمەوە لەم ناوەدا هیچ کەسێک ئەوە نازانێت، ماوەکانی گەردوونیش نەک هەر تەنها گەورەن، بەڵکو بێ وێنە و خەیاڵیشن. لێرەدا پرسیارێکی گرنگ ڕووبەڕوومان دەبێتەوە: ئەگەر مێشکمان بۆ نموونە لە سەدا دە گەورەترێک بووایە، یان لە

سەدا پانزە چالاكترێک بووایە، بڵێیت ئەو کاتە زیاترێک لە جەوهەری قووڵی جیهان تێبگەشتینایە؟ تۆ خۆت چۆنی دەبینیت؟ لەو بڕوایەدایت ئەگەر هەر جۆرە مێشكێكمان هەبووایە یان ئەندازەی مێشكمان هەرچەندێک بووایە، ئەو کاتەش هەر کتومت ئەوەندەمان بزانیبایە کە تا ئێستاکە تێی گەیشتووین؟ چونکە بەڕاستی پێی دەچێت، وەک مەبدەئێک، کە مەحاڵ بێت لەو هێندە زیاترێک بزانین کە تا ئێستاکە دەیزانین. خۆ ئەگەر بەو شێوەیە بێت، ئەوا خۆی لە خۆیدا پەرجوویەکی بچکۆلەیە کە مێشكێكمان هەیە و پڕاوپڕ هێندە گەورەیە کە دەتوانێت بۆ نموونە لە تیۆری ڕێژەیی و یاسای گەردیلەیی فیزیا و پێکهاتەی بۆماوەیی مرۆیی تێبگات. بەڕاستی لەو بوارانەدا شتەکان ڕوونن و هێندە زنجیرەی ونبوومان نییە. من گومانم هەیە کە تەنانەت پێشكەوتووترین شەمپانزی هیچ جۆرە مەزەنەیەکی دەربارەی تەقینەوە گەورەکە هەبێت، یان بزانێت چەندساڵی تیشکی لە نزیکترین گەلەهەسارەوە دوورین، یاخود بۆ نموونە بەئاگا بێت لەوەی کە زەوی خڕە. ئەو لایەنەی لەم بارەیەوە مایەی سەرسوڕمانە، ئەوەیە کە نەدەکرا مێشكی مرۆڤ گەورەترێک بووایە وەک لەوەی کە ئێستاکە هەیە، زۆر بەئاسانی لەبەرئەوەی ئەو کاتە دەبووە ڕێگرێک لەبەردەم سەرەتای هەڵسانە سەرپێی دایكەکاندا. لێرەدا دەبێت بەپەلە ئاماژە بۆ ئەوە بکەم کە مێشكی مرۆڤ بەم ئەندازەیەی ئێستاکە گەشەی نەدەکرد ئەگەر کاتی خۆی مرۆڤ هەڵنەسایەتە سەرپێ و لەسەر دوو قاچ نەڕۆیشتایە. من لێرەدا باسی هاوسەنگییەکی دژوار دەکەم، لەبەرئەوە با بەشێوەیەکی تر قسەکەم دەربڕم: ڕەنگە بڕی تێگەیشتنی ئێمە لەو نهێنییەی کە بەدەوریدا دەخولێینەوە، کەوتبێتە سەر ئەندازەی حەوزی ئافرەت. بە بڕوای من شتێکی لە ڕادەبەدەر سەیروسەمەرەیە کە زیرەکی و تێگەیشتنی ئەم گەردوونە پابەندی سنوورێکی قۆڕی ئەناتۆمی ئاوها ببێت، بەڵام ئایا شتێکی سەیریش نییە کە ئەو هاوکێشە گۆشتنە لەوە دەچێت کە هەڵبهێنرێت؟ لەوەدەچێت بڕی نادیاری (ئێکس) لەو هاوکێشەیەدا ڕاست و دروست ئەو بڕە پێویستە بێت بۆ ئەوەی ئەم گەردوونە لە کاتی ئێستادا بەئاگا بێت لە خۆی. واتە ئەندازەی حەوزی مرۆڤ ڕێک هێندە گەورەیە کە بۆ نموونە بوارمان بدات بزانین ساڵێکی تیشکی چییە یان گەلەهەسارە دوورەکان چەند ساڵی تیشکی لێمانەوە دوورن، یاخود بۆ نموونە هێندە بوارمان بۆ دەڕەخسێنێت کە بزانین گەردیلەکان لە تاقیگەدا بە چ جۆرێک دەجووڵێنەوە، یاخود لە پاش چەند چرکەی یەکەمی دوای تەقینەوە گەورەکەوە

چۆن جوولاونەتەوە.
گۆردن بەرپەرچی قسەکانی دامەوە و وتی:
- بەلام کێ دەڵێت لە شوێنێکی تری ئەم گەردوونەدا جۆرە مێشکێکی مەزنتر بوونی نییە؟
بە مەبەستەوە پێکەنیم و وتم:
- بێگومان ئەوەش ڕێی تێدەچێت. من خۆم زۆر بە ساکاری دەتوانم مەزەنەی مێشکێک بکەم کە بۆ نموونە بتوانێت هەموو لاپەڕەکانی ئینسایکلۆپیدیای (بریتانیکا) لەبەر بکات. نەک هەر ئەوەش، بگرە زۆر بەئاسانی مەزەنەی مێشکێکی دیاریکراو دەکەم کە بتوانێت سەرجەم ئەزموونەکانی هەموو مرۆڤایەتی لە خۆیدا جێ بکاتەوە، بەلام ئێمە ئێستاکە کۆمەڵێک نهێنیی ئەم گەردوونە دەزانین و بەشێوەیەکی مەبدەئی گومانم هەیە ڕۆژێک لە ڕۆژان لەوەندە زیاترێک بزانین. بەو شێوەیە هەموو ئەو پرسیارانەی کە من دەیانوروژێنم لە یەک پرسیاردا کۆدەبنەوە: ئایا خودی ئەم گەردوونە چەند نهێنی ماوە تا بیانخاتەڕوو؟ بۆ نموونە ئەگەر پارچە بەردێکی ئەستێرەیەکی کشاو بدۆزینەوە، دەتوانین بارستایی و کێشی بزانین و لەوەش گرنگتر دەتوانین بزانین لە چ ماددەیەکی کیمیاوی پێکهاتووە، بەلام کاتێک هەموو ئەو شتانە بەوردی زانرا، ئەو کاتە مەحاڵە هیچ نهێنییەکی تر لەو پارچە بەردەدا بدۆزینەوە. ئەو پارچە بەردە هەر ئەوەیە کە هەیە و هەر ئەوەشە کە هەمیشە هەر بووە. دەتوانین وەلای بنێین و ڕەنگە بیخەینە مۆزەخانەیەکەوە تا گەردی لەسەر بنیشێت. ئێ ئیتر لەوەندە زیاترێک ناتوانین بڕۆین، بەلام ئایا بەرد چییە؟
گۆردن هەناسەیەکی هەڵکێشا و لەوەدەچوو ماندوو بێت، بەلام وتی:
- بەڕاستی نازانم لە تەواوی ئەو شتانە تێدەگەم کە باسیان دەکەیت یان نا.
- باشە باش، دەمەوێت بڵێم لەوەدەچێت سەردەمی زانست هێدی هێدی بەرەو کۆتاییەکەی بڕوات. ئێمە هەر لە ئێستاوە گەیشتووینەتە ئامانج، ئامانجەکەش خودی جۆرە ئاگاییەکە دەربارەی ئەو ڕێگا دووردرێژەی کە بەرەو (ئامانج) دەڕوات. ئێمە خۆمان بە گەردوون ناساندووە و گەردوونیش بەشێوەیەکی جوان و سەرنجڕاکێش خۆی پێ ناساندووین. ڕەنگە زانست گەیشتبێتە کۆتایی ڕێگاکەی، لەوانەیە ئێمە سەرتاپای ئەو شتانە بزانین کە شایانی ئەوەن کە بیانزانین. وە کاتێکیش کە دەڵێم (ئێمە)، مەبەستم تەنها لە من و تۆ نییە، بەڵکو مەبەستم

لە هەموو ئەو مێشکانەیە کە شاراوەن و ڕێی تێدەچێت لە تەواوی گەردووندا بوونیان هەبێت. خۆ ئەگەر بەو شێوەیەش بێت، دەبێت بڵێم ئەمە ئەو تیۆرییەیە کە من لە کاتی ئێستادا زیاترێک بڕوام پێیەتی، دیسانەوە ئەگەر بەو شێوەیەش بێت ئەوا دونیای ڕاستەقینە تووشی شتێکی (بێ ناو) بووە و بەهیچ شێوەیەک چاک نابێتەوە. دونیای ڕاستەقینە دەپرسێت: من کێم؟ بەڵام هیچ کەسێک وەڵامی ناداتەوە. هیچ کەسێک نە دەمانبینێت و نە گوێشی لێمانە. تەنها خۆمان خۆمان دەبینین.

- خۆزگە بمتوانیایە کەمێک زیاتر یارمەتیم بدایتایە.

ئەو قسەیەی بە سەرسوڕمانەوە وت و بێگومان دەیتوانی کەمێک یارمەتیم بدات، ئەگەر هەر تەنها هێندە ئەقڵی هەبووایە و لەسەر ئەو بتڵە دوور بکەوتایەتەوە کە پێوەی نووسابوو، ئەوە خۆی لە خۆیدا یارمەتییەکی باش بوو.

وتم:

- بەڵام خۆ تۆ خۆت وتت کە بڕوات بە ژیانی هەتاهەتایی هەیە، کەواتە کاتێک لە فڕۆکەکەدا کەبتاینێکی ترت لەگەڵدا نەبێت، نابێت موسافیری تر لەگەڵ خۆتدا سەربخەیت. بەهەرحاڵ، با واز لەو باسە بهێنین.

لەویادا شتێکم بۆ ڕوون بووەوە و لە خەیاڵی خۆمدا وتم (لەوانەیە قەت بە تەنها بە فڕۆکە سەفەری نەکردبێت، ڕەنگە هەر لەبەرئەوەش بێت کە هیچ وەڵامێکی نەدامەوە). پرسیم:

- ئایا بڕوا بوون بە ژیانێکی هەتاهەتایی شتێکی ئاسایی و باوە لەنێوان ڕەگەزەکەی تۆدا؟

وەڵامی دامەوە و وتی:

- من خۆم تا ئێستاکە هیچ مارمێلکەیەکم نەدیوە کە بەڵگەیەکی یەکلاکەرەوەی پێچەوانەی ئەو بڕوایەی لەلا بێت.

- دەتوانیت کەمێک زیاتر بەوردی مەبەستەکەت دەرببڕیت؟

- هیچ مارمێلکەیەک نییە کە نکوڵی لە بوونی ژیانی هەتاهەتایی بکات. پێم وانییە هەرگیز شتێکی وا بە خەیاڵی خشۆکێکدا هاتبێت کە ژیان ڕۆژێک لە ڕۆژان کۆتایی دێت. زۆر بەئاسانی لەبەرئەوەی ئێمە قەت بیرمان لەو شتە نەکردۆتەوە.

لەسەر قسەکانی بەردەوام بوو و لەوەدەچوو بیەوێت لاسایی دەنگی من بکاتەوە:

- لێرەشەوە مەبەستم لە سەرتاپای ئەو ڕەگەزانەن کە لە خێزان و نەوەی هەر چوار هۆزی گیانەوەرە بڕبڕەدارەکانن کە دەچنە ژێر پۆلی خشۆکەکانەوە. تەنانەت مەزەنەکردنی ئەوەی کە ژیان ڕۆژێک لە ڕۆژان کۆتایی دێت، هەرگیز بە خەیاڵی هیچ یەکێکماندا نەهاتووە.
هێندە تێگەیشتم کە منیش تەنها پێویستم بەوە بوو کە چەند نەوەیەک لە مێژووی مرۆڤایەتیدا بگەڕێمەوە دواوە بۆ ئەوەی هەمان شت دەربارەی شیردەرە سەرەکییەکان بڵێم. مەبەستم لەوەیە کە موچوڕکەی گیانەوەرە گەورەکان دیاردەیەکی هێندە نوێ و سەیر نەبوو. هەر بەڕاستیش کێ دەزانێت، خۆ لەوانەیە نیگەرانی و خەمی مردن لەسەر هیچ ئەستێرەیەکی گەڕۆکی تری گەردووندا بوونی نەبێت.
وتی:
- جیهانێک بوونی هەیە. خۆ ئەگەر وەک (ئەگەرێک) بیری لێ بکەینەوە، زۆر لە سنووری مەحاڵ نزیک دەبێتەوە. بە مانایەکی تر، زۆر زیاتر ڕێی تێدەچوو کە هەر لە بنەڕەتدا بە ڕێکەوت هیچ شتێک بوونی نەبووایە، بەڵام ئەو کاتە هیچ کەسێک بەهیچ شێوەیەک نەیدەپرسی: بۆچی هیچ شتێک بوونی نییە؟
هیچ وەڵامێکم نەدایەوە، لەبەرئەوە پرسی:
- گوێت لێ بوو چیم وت؟
- بەڵێ، بەڵێ گوێم لێ بوو، پێم بڵێ بزانم ئەو جۆرە ڕستانە شتێکە کە لەسەر ئەم دوورگەیە داتانهێناوە یان شتێکە کە لە کتێبێکی حیکمەتدا دۆزیوتانەتەوە؟
وەڵامی نەدامەوە، بەڵام من ویستم بیهێنمە قسە:
- باشە شتێک هەیە کە ماوەیەکی زۆر بێت سەرقاڵی بووبن و بیرتان لێ کردبێتەوە؟ یاخود ئێوە جۆرە شاعیرێکی گەڕۆکن؟
دیاربوو هەڵچوو، چونکە وتی:
- ئێمە ڕۆحێکمان هەڵگرتووە، هەر هەمان ڕۆحیش هەڵی گرتووین و نایناسین. سەرەی ئێمە ئەو کاتە دێت کە نهێنییەکە لەسەر دوو پێ دەوەستێت و هەڵناهێنرێت. کاتێک وێنە خەونییەکان چرنوق لە دەستی خۆیان دەگرن و خەبەریان نابێتەوە، ئەوە ئێمەین، چونکە ئێمە ئەو نهێنییەین کە کەس هەڵیناهێنێت. ئێمە ئەو حەکایەتەین کە لەناو وێنەی خۆیدا دەستی بەسەردا گیراوە. ئێمە ئەو شتەین کە بەردەوام دەڕۆین و دەڕۆین بەبێ ئەوەی بگەینە تێگەیشتنێک و بینینێکی ڕوون.

وتم:

- وابزانم ئێستاکە سەرەی تۆیە کە بێدەنگ ببیت. لە ڕاستیدا خەریکە سەبرم نامێنێت.

بە فیزێکەوە قسەکەی ڕەت کردمەوە و وتی:

- هەر کاتێک دەتەوێت، دەتوانیت بخەویت. من ئاگام لە بتڵەکە دەبێت.

نەڕانم بەسەریدا و وتم:

- قەت قەت.

لەویادا کاتی خۆی هاتبوو کە دەمارەکانی مێشکم بەنج بکەم، بۆیە بەرەوڕووی ئەو و بتڵەکە خۆم هەڵدا.

گۆردن بە توڕەییەوە خۆی هەڵدایە سەر دەستم و لەوێشەوە بەپەلە بازێکی دایە سەر دیوارەکە و بەسەریدا سەرکەوت، لەو کاتەدا بتڵەکە کەوتە سەر عەرزەکە، بەو شێوەیەش دەرمانە هێورکەرەوە هەرە گرنگەکەم ڕژا و یەک و دوو لەنێوان درزە گەورەکانی تەختەی عەردەکەدا دیار نەما. بتڵەکەم بەرز کردەوە و خستمە بەر ڕۆشنایی گڵۆپەکە، هێشتا پێکێک یان پێک و نیوێکی باشی تیا مابوو. سەری بتڵەکەم نا بە دەممەوە و بە یەک فەڕە هەموویم خواردەوە.

لورەیەکی لێوە هات و لەو کاتەدا کە بە دیوارەکەوە بوو وتی:

- تەمبەڵی بێ ئەدەب! یەکتر دەبینینەوە!

دواهەمین شتیش بەر لە خەوتنم کە بیرم بێتەوە ئەوە بوو گۆردن وەک دزێک قسە ئیسپانییەکانی ئانا و خۆسێی گوتەوە کە تیایدا وەسفی دونیای ڕاستەقینەیان کرد:

- ئەگەر خودایەک هەبێت، ئەوا نەک هەر لەوەدا زۆر زیرەکە کە هیچ شوێنەوارێک لەدوای خۆیەوە جێنەهێڵێت، بەڵکو مامۆستایەکی گەورەشە لە هونەری خۆشاردنەوەدا. لە ڕاستیدا جیهانیش هەروا بە ڕاشکاوی خۆی نیشان نادات. گەردوونیش بەردەوام نهێنییەکانی خۆی شاردۆتەوە و نایاندرکێنێت. ئێ خۆ ئەستێرەکانیش هێندە ورتەورت لەگەڵ یەکدیدا ناکەن، بەڵام تا ئێستاش هیچ کەسێک ئەو تەقینەوە گەورەیەی لەیاد نەکردووە. هەر لەو کاتەشەوە بەردەوام بێدەنگی زاڵ بووە و هەموو ئەو شتانەش کە بوونیان هەیە هێدی هێدی لە یەک دوور دەکەونەوە. هێشتا بواری ئەوە ماوە کە چاومان بە مانگێک

یاخود ئەستێرەیەکی کلکدار بکەوێت، بەڵام چاوەڕوانی ئەوە مەبە کە بەشێوەیەکی میهرەبانانە بانگهێش بکرێیت، چونکە لە ئاسماندا کارتی سەردان و داوەتنامە چاپ ناکرێن.

دوای ئەوەش گۆردنی مارمێلکە هەندێک قسەی تری کرد و هەوڵی دا خەوم لێ نەکەوێت، بەڵام تەواوی قسەکانیم بە ناڕوونی و تێکەڵوپێکەڵی لەیادە، پێم وابێت یەک کەڕەت نزیکەی سەعات پێنج بەم حیکمەتەی خوارەوە خەبەری کردمەوە:

– چەند ملیارد ساڵێکی پێ دەچێت تا مرۆڤێک ئافەریدە دەکرێت، کەچی لە ماوەی یەک دوو چرکەدا دەمرێت.

# زڕبرا نازدارەکەی نیاندەرتاڵ

بەو شێوەیە یەکەم ڕۆژ و شەوم لەسەر دوورگەکانی فیجی بردەسەر، لێرە بەدواوە پێویست ناکات هێندە بچمە ناو وردەکاریی هەموو شتێکەوە، بۆیە ئاوها بەوردیش بۆم گێڕایتەوە، تا تێبگەیت و بزانیت بۆچی ئەو کاتەی پێکەوە بووین لە سالامانکا، بەو شێوەیە ڕەفتارم کرد کە کردم.

ڕێک لەو کاتەدا کە ویستم باسی خۆم و خۆت بکەم، لەسەر قەراغی ڕووباری (تۆرمس) چاوم بە ئانا و خۆسێ کەوت. لەپڕێکدا هەستم کرد گەڕاومەتەوە بۆ سەر (قەراغ ئاوی پرێنس چارلس) و لەویادام. بەو شێوەیەش نە هیچ شتێکم دەربارەی خۆم و خۆت وت و نە دەربارەی ئەوەش کە بەسەر سۆنیادا هات، چونکە زۆر بە دەنگی بەرز قاقات لێدا و واتزانی هەروا چیرۆکێکی سەرنجڕاکێشت بۆ دەهۆنمەوە تا لەگەڵ خۆمدا بتهێڵمەوە. ئای چەندە بەلامەوە خۆش بوو کە سەرلەنوێ بتبینم پێدەکەنیت، ئامادەبووم چەندین چیرۆکی سەرنجڕاکێشت بۆ بگێڕمەوە تا بەو شێوەیە گوێم لە دەنگت بێت، بەڵام ئەو دوو کەسەی کە بینیمن بەڕاستی ئانا و خۆسێ بوون، ئەو کاتە من لەوە دڵنیا بووم و پێش نیوەڕۆی ڕۆژی دواتریش بەتەواوەتی ئەو ڕاستییەم بۆ دەرکەوت. هەر پاش حەفتە و نیوێک سەرلەنوێ خۆسێم بینییەوە، ئەو جارەیان لە مەدریددا چاوم پێکەوتەوە و تەواوی چیرۆکی (ئیل پلانیتا) و دوو پۆرترێتەکەی مۆزەخانەی (پرادۆ)ی بۆ گێڕامەوە کە ناچنە ئەقڵەوە، لە پاش ئەوەوە بەتەواوەتی بۆم ڕوون بووەوە کە من و تۆ دەرسێکی گرنگمان پێیە کە فێری یەکتری بکەین، هەروەها ئەوەشم بۆ دەرکەوت کە تەنها بواری بەردەستمان ئەوەیە کە نامەت بۆ بنووسم، تا دەرگایەکی نوێی گفتوگۆ لەنێوان من و تۆدا بکرێتەوە.

ڤیرا... ناچارم داوات لێ بکەم کە چاکەیەکم لەگەڵدا بکەیت، تەنانەت بەوەش ڕازیم ئەگەر ئەوە دواهەمین شت بێت کە بۆ منی بکەیت. پاشنیوەڕۆی پێنج شەممە هەوڵ دەدەم هەموو ئەو شتانەت بۆ ڕەوانە بکەم کە دەیاننووسم و ڕۆژی هەینیش داوات لێ دەکەم لەگەڵمدا بێیت بۆ ئیشبیلییە. هەست دەکەم قەرزارباری ئانا و

خۆسێم کە سەفەرێک بۆ ئیشبیلییە بکەم و تا ئەندازەیەک دڵنیاشم کە تۆش لە پاش خوێندنەوەی چیرۆکی ئانا و وێنە ئەفسووناوییەکە هەمان ئەو هەستەت لەلا دروست دەبێت.

بێگومان ئەو پۆستکارتەت لەیادە کە چەند ساڵێک لەمەوبەر لە بەرشەلۆنەوە بۆت ڕەوانە کردم. لەویادا خۆت نووسیبووت: «شلە ئەفسووناوییەکەت لەیادە؟»، کاتێکیش کە گەڕایتەوە ماڵەوە وتت: «ئەگەر ئەو شلەیە بدۆزمەوە، ئەوا دوودڵ نابم و نیوەیت پێ دەبەخشم». ئەو کاتە تۆ زۆر ئاواتەخواز بوویت لەگەڵ مندا بۆ هەتاهەتایە بژیت. تۆ خۆت وتت: «بەلای منەوە، تەنها یەک پیاو و یەک زەوی بوونی هەیە»، ئەوەت لەیادە؟ دواتریش زیاترێکت دەربڕی و وتت «ئەم هەستە قووڵەشم لەوەوە سەرچاوە دەگرێت کە تەنها یەک کەڕەت دەژیم». ئیدی چارەنووس ژیانمانی گۆڕی و بە ئاراستەیەکی تردا بردی.

بۆ ئێستا تەنها ئەوەندەت لێ داوا دەکەم کە یەک ڕۆژی ژیانت ببەخشیت بە من. ناتوانم بەبێ تۆ سەفەر بۆ ئیشبیلییە بکەم. بەڕاستی ناتوانم.

پاش ئەوەی ئاوها لەسەر شاشەی کۆمپیوتەرەکەمەوە سەرلەنوێ یەکەمین پێگەیشتنی توندم لەگەڵ گۆردندا هاتەوە پێش چاو، چوومە ساڵۆنە خڕەکەی خوارەوە و ڕۆژنامەی (ئیل پایس)م خوێندەوە، کوپێک چام خواردەوە و چەند پسکیتێکی بچکۆلەشم لەگەڵیدا خوارد. زۆرم بەلاوە خۆش بوو کە لەو نووسینە بەگوڕە داببڕێم و گوێ بۆ دەنگی ئامێری (هارپ) ڕادێرم، ئاوازەکە تێکەڵی دەنگی خەواڵووی کۆڕو کۆبوونەوە بچکۆلەکان بووبوو کە لێرەو لەوێی مێزەکانی ژێر قوبەکەوە بەرز دەبووەوە. باش دەزانم کە حسابی ئوتێلەکەم زۆر بەرز دەبێت، بەڵام بڕیارم داوە هەتا هەموو شتێکت پێ نەڵێم، شاری مەدرید جێنەهێڵم. وەک دەزانیت ئەم جارەشیان لە (پالاس) دابەزیووم. هەمووان لێرە دەمناسن و نەختێکیش لە (پرادۆ)وە دوورە، نزیکی (باخی ڕووەک)ە و هەر بە پێ لێرەوە تا (ڕیتیرۆ) و (پیوترا دی سۆل) تەنها پێنج خولەکێک دەبێت.

بەڵام با ئێستا بگەڕێینەوە لای دوورگەکانی فیجی. بۆ ڕۆژی دواتر کە خەبەرم بووەوە، یەکسەر ماتەمینییەکی قورس دایگرتم، هەڵبەتە پەیوەندی بەوەوە بوو شەوی پێشوو بەتەواوەتی خۆم بۆ کەسێک کردەوە کە نەمدەناسی، نەک هەر ئەوەش، بەڵکو نەشم دەویست بیناسم و پەیوەندیم لەگەڵدا هەبێت. ماتەمینییەکی لەو جۆرە هەمیشە دوو فاقە، ڕاستە کەمێک بەڕاشکاوی خۆت دەکەیتەوە و ئارام دەبیت،

بەڵام لەلایەکی تریشەوە زۆرجار لەڕادەبەدەر قورسی وەردەگرین کە تەنها بۆ یەک کەڕەتیش کەمێک دەمشڕ بین و نهێنییەک بدرکێنین. لەناو گێژاوی ماتەمینییەکی ئاوهادا بەتەواوەتی نازانین چیمان گوتووە و چیشمان نەگوتووە. بەو شێوەیەش بەدرێژایی پێشنیوەڕۆی ڕۆژی دواتر هەستێکی نیگەرانی داتدەگرێت وا دەزانیت دوژمنێکت لێ پەیدا بووە کە بەدرێژایی ژیانت لەگەڵتا دەمێنێتەوە، یان لەوەش خراپتر: ڕەنگە هەست بکەیت برادەرێکت پەیدا کردووە، هەڵبەتە لێرەدا مەبەستم لە باشترین برادەرە، برادەرێک کە نهێنییە قووڵەکانی ناوەوەت دەزانێت. من دەمزانی گۆردن لە شوێنێک لە شوێنەکانی ژوورەکەدایە، بەڵام هاوکات وەک شارەزایەکیش لە بواری مارمێلکەدا دەمزانی کە ئەو بەشێوەیەکی گشتی لەو کاتەی ڕۆژدا هێندەی شەو چالاک و زرت نییە.
هێندەی نەبرد و خۆمم لەبەردەم ئاوێنەی حەمامەکەدا بینییەوە، نامەوێت بڵێم من لەو کەسانەم کە زیاترێک ڕۆژەکەیان بەوە دەست پێ دەکەن کە دەموچاویان بەرەورووی خۆیان گرژ دەکەن، بەڵام هەتا بەتەمەنتر بم (وە هەتا زیاترێک نزیک دەبمەوە لە کۆتاییم) ڕوونترێک و ڕوونترێک نیگای گیانەوەرێک دەبینم کە بەیانیان لە ئاوێنەکەوە بەرەورووم دەبێتەوە. سیمای بۆقێک دەبینم کە بەردەوام لە گۆڕاندایە، مارمێلکەیەک دەبینم کە بە پێوە وەستاوە، گیانەوەرێکی ماتی سەر بە شیردەرە باڵاکان دەبینم، بەڵام شتێکی تریش دەبینم و ڕاست و دروست ئەوەیان زۆرترێک بێ تاقەتم دەکات. فریشتەیەک دەبینم کە کاتێکی هەر زۆر کەمی ماوە، ناچارە یەکسەر ڕێگای گەڕانەوە بەرەو ئاسمان بدۆزێتەوە، چونکە سەعاتە بایۆلۆجییەکەی خێراتر و خێراتر لێ دەدات و خەریکە درەنگ دەبێت بۆ گەڕانەوەی بۆ ناو ئەبەدییەت. هۆکەشی دەگەڕێتەوە بۆ تێنەگەیشتنێکی کوشندە کە ماوەیەکی زۆر زۆر لەمەوبەر ڕوویدا، ئەو کاتە بوو کە فریشتە پەشۆکاوەکە هات و جەستەیەکی گۆشت و خوێنی لەبەر کرد، وە ئەگەر دەمودەست ڕزگار نەکرێت، ئەوا دواتر قەت نەجاتی نابێت.
بۆ نانخواردنی بەیانی بەڕێکەوتم و لەناو باخی دارگوێزە هیندییەکاندا (جۆن) م بینی. لەژێر دارگوێزێکی هیندیدا وەستابوو، من لە لافیتەیەک وردبوومەوە کە لێی نووسرابوو: «وریابە، لێرەدا گوێزی هیندی دەکەوێتە خوارەوە». وابزانم جۆن کورتبین بوو، چونکە ڕێک لەژێر قەدی ئەو دارگوێزەدا وەستابوو.
پرسیارێکم لێ کرد و وتم:
- چییە، یاری (ڕۆلێت)ی ڕووسی دەکەیت؟

یەک دوو هەنگاو بەرەوڕووم هات و وتی:
- ببوورە، چیت وت؟
پێویستی نەکرد قسەکەم دووبارە بکەمەوە، چونکە ڕێک لەو کاتەدا گوێزێکی هیندیی گەورە لە دارەکە کەوتە خوارەوە و کتومت بەر ئەو شوێنە کەوت کە چەند چرکەیەک لەوەوبەر ئەوی لێ وەستابوو.
ئاوڕێکی دایەوە و وتی:
- وابزانم ژیانت ڕزگار کردم.
- زۆر ئاساییە.
لەویادا بەڕاستی نەمزانی بە چ شێوەیەک بەردەوامی بە قسەکانم بدەم، بەڵام دەمزانی پێویستیم بە کەسێکە کە قسەی لەگەڵدا بکەم، پێویستیم بە کەسێک بوو کە باسی ئانا و خۆسێی بۆ بکەم. هەر لەو کاتەوەی لەبەردەمی ئاوێنەکەدا وەستام، بڕیارم دا کە ئەو ڕۆژە بەوردی ئەو بابەتە بپشکنم. هەرچەندە شەنسێکی بچکۆلەم هەبوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەدوورم نەدەزانی کە ئەو دوو ئیسپانییە بتوانن یارمەتیی فریشتەیەکی (لەدایکبوو) بدەن کە بەڕاستی لە تەنگانەیەکی مەزندا بوو.
پرسیم:
- نازانیت ئیسپانییەکان لەکوێن؟
سەری ڕاوەشاند و وتی:
- ئێ تۆ خۆت دوێنێ لەسەر هێڵی (بەرودوا) بینیتن، وا نەبوو؟
دیسانەوە لەویاشدا هەستم کرد ئەو نووسەرە بەریتانییە پەیوەندییەکی بە ئانا و خۆسێوە هەیە. ئەو چوزانێت کە ئێمە لەسەر هێڵی (بەرودوا) یەکتریمان بینیبوو؟ کێ ئەوەی بۆ گێڕابووەوە؟ بڵێیت خەڵکی ئێرە پێیان خۆش بێت باسی ئەو جۆرە شتانە بکەن؟
سەرم بۆ لەقاند و وتم:
- دوو کەسی سەرنجڕاکێشەرن. تۆ زمانی ئیسپانی دەزانیت؟
دڵنیا نیم، بەڵام پێم وابێت زەردەخەنەیەکی بچکۆلەم لەسەر لێوانی بینی. بەلایەنی کەمەوە هەستم کرد بەشێوەیەک لە شێوەکان لە مەبەستی بنەڕەتیی پرسیارەکەم تێگەیشت. کەچی سەری ڕاوەشاند و وتی:
- زۆر زۆر کەم ئیسپانی دەزانم، بەڵام خۆ هەردووکیان ئینگلیزییەکی پاراو دەزانن.

- ڕاست دەکەیت، بەڵام ئاخر لەنێوان خۆیاندا بە ئیسپانی قسە دەکەن.
زۆر بە سەرنجەوە گوێی بۆ قسەکانم شل کرد، بەڵێ، لەڕادەبەدەر سەرنجی خستە سەر قسەکانم. لەوەدەچوو گرنگییەکی تایبەتی بە تێبینییەکانی من بدات. لە دڵی خۆمدا وتم:
- بڵێیت بەهەمان شێوەش گرنگی بەو دوو ئیسپانییە بدات؟
- ئەی تۆ لە قسەکانیان تێدەگەیت؟
یەکسەر لەدوای پرسیارەکەیەوە شەرم دایگرتم، ئاخر نەمویست بە جۆن بڵێم کە من بە دوورگەکەدا سوڕاومەتەوە و بەدزییەوە گوێم بۆ قسەکانی ئانا و خۆسێ شل کردووە.
وتم:
- هەر هیچ نەبێت هێندە دەزانم کە باسی فتبۆڵێن و یاری (کریکت) ناکەن، بەڵکو ئەوان باسی شتی زۆر زۆر سەیروسەمەرە دەکەن.
پیاوە باڵابەرزە لاجانگ سپییەکە هەروا وەستا بوو و دیاربوو جەوی قسەکانی هەڵدەسەنگاند، دواتر وتی:
- دەڵێن گوایە ئانا لە شاری ئیشبیلییەدا یەکێکە لە سەماکەرە هەرە بەناوبانگەکانی سەمای (فلامینکۆ).
فلامینکۆ! وشەیەکی گرنگی تر هاتە ناو مێشکمەوە و سەرلەنوێ بوارێکم بۆ ڕەخسا لە یادەوەریمدا بگەڕێم تا سەرەداوێکی ئەو شوێنە بدۆزمەوە کە لەوەوپێش ئانام تێدا بینیبوو. من کاتی خۆی یەک دوو کەڕەت لە مەدریددا سەردانی بارێکی فلامینکۆم کرد، بەڵام ئەوە چەند ساڵێکی بەسەردا تێپەڕیبوو و خۆ ئەگەر ئاناشم لەوێ بینیبێ، ئەوا نەمدەتوانی لەنێوان ئەو هەموو ڕیتمە خێرا و جلوبەرگە ڕازاوە و گۆرانییە سەرنجڕاکێشەدا بیناسمەوە. بەدەرلەوەش هەستم دەکرد ئەو وێنەیەی ئانا کە لە شوێنێکی یادەوەریمدا بوو، ماوەیەکی زۆر دووروودرێژتری دەگرتەوە و لەوە نەدەچوو کە تەنها لە ماوەی یەک نمایشی فلامینکۆدا بینیبێتم. بەهەرحاڵ ئەو فلامینکۆیە زانیارییەکی گرنگ بوو بۆ من. وتم:
- من هەست دەکەم لەوەوپێش ئانام بینیبێت، هەربۆیە گرنگی بەو دوو ئیسپانییە دەدەم.
قسەکەم جۆنی داچڵەکاند و وتی:
- لەکوێ بینیوتە؟

– ئێ کێشەکەی من ڕێک ئەوەیە، بیرم ناکەوێتەوە لە چ شوێنێکدا بینیومە.
وتی:
– سەرنجڕاکێشە، یان بڵێم سەرسوڕهێنەرە! لە ڕاستیدا منیش کتومت هەمان کێشەم هەیە. شتێکی سەیر لەو کچەدایە کە تاڕادەیەک بەئاسانی دەناسرێتەوە... ئەویش، کەواتە بووین بە دوو کەس و لێرەشەوە ئەو خەیاڵەم لە مێشکمدا دەرهێنا کە لەوەوپێش من خەونم پێوە بینیبێت یاخود لە یەکێک لە ژیانەکانی پێشوودا هاوسەرم بووبێت. ئینجا زانیم بۆچی جۆن ویستی بزانێت لەسەر هێڵی (بەرودوا) ئەو ئیسپانییانەم بینیوە یان نا. وتم:
– سیمایەکی وەهای پێوەیە کە بیرت ناچێتەوە.
هەر لەدوای ئەو قسەیەمەوە خۆشم هەستم کرد کە وشەکانم شیاوی ئەوەن بە چەند شێوەیەکی جیاواز لێک بدرێنەوە، بۆ ماوەیەک بە قووڵی بیری کردەوە و دواتر وەڵامی دامەوە:
– ئەوە ڕێی تێدەچێت، بەڵام کەواتە ئەو شتەی کە لە یادەوەریدایە سیمای دەموچاوێک نییە.
بێگومان ڕاستی دەکرد و لەسەر قسەکانی بەردەوام بوو:
– کەواتە تەنها یەک بوار ماوەتەوە..
زۆر پەرۆش بووم و دەمویست بزانم پاش ئەوە چی تر دەڵێت، ئینجا وتی:
– ئێمە هەردووکمان لەوەوپێش ئەو ئافرەتەمان بینیوە. خۆ ڕەنگە جۆرێک لە... جۆرێک لە گۆڕانکاری بەسەر خۆیدا هێنابێت.
من خۆشم بیرم لە شتێکی ئاوها کردبووەوە و هەستم کرد سەرم گێژ دەخوات، لە ڕاستیدا دونیاش گەرم و شێدار بوو. لەویادا قیژەی ئافرەتێک قسەکانی پێ بڕین، دەنگەکە لەلای مەلەوانگەکەوە هات. لاورا بوو، لەناو باخی دارگوێزە هیندییەکاندا هاواری کرد و وتی:
– من هەر ئەوەندە دەڵێم کە پێویست ناکات بەردەوام دەوام بکەویت.
نەختێک دوای ئەوە گوێمان لە شڵپەیەک بوو کە لە مەلەوانگەکەوە بەرز بووەوە، هێندە تێگەیشتم کە لاورا پاڵی بە (بیڵ)ەوە نابوو بۆ ناو ئاوەکە. سەرێکم بۆ جۆن لەقاند و وتم (بەرلەوەی درەنگ ببێت، ناچارم بڕۆم نانی بەیانی بخۆم).
بەلای مەلەوانگەکەدا تێپەڕیم و بە چاوی خۆم پاشماوەی پەرشوبڵاوی دراماکەم بینی. ڕێک لەو کاتەدا بیڵ خەریک بوو لە ئاوەکەوە دەهاتە دەرەوە کە بەزۆر فرێیان

دابووه ناوی، هەرچەندە جلی تەواوی ناو ئاویشی لەبەردا بوو: شۆرتێکی زەرد و فانیلەیەکی شینی کاڵ کە وێنەی یەک دوو دارگوێزی هیندی لەسەر بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بە دەموچاویەوە دیاربوو کە سوکایەتی پێ کرابوو. لاوراش خۆی ئامادە دەکرد تا لەسەر یەکێک لە کورسییە درێژەکانی بەرخۆر پاڵ بکەوێت، خەندەیەکی دڵڕەقانەش بە لێویەوە دیاربوو. کە منی بینی و زانی بەرەو چێشتخانەکە دەڕۆم، خاولییەکەی لە خۆیەوە پێچاو پرسی: «دەڕۆیت نانی بەیانی بخۆیت؟»، منیش سەرێکم بۆ لەقاند و ئینجا وتی:

- دێم کوپێک چات لەگەڵدا دەخۆمەوە.

دیاربوو کتێبی (ئەستێرەی گەڕۆکی تاقانە)کەی تەواو کردبوو.

خاولییەکەی لە خۆی کردەوە و لەسەر کورسییە درێژەکە داینا، جلی مەلەی ڕەشی لەبەردا بوو، ماکسییەکی سووری بەسەردا لەبەر کرد و جوتێ سەرپایشی لەپێ کرد. چاوەڕوانم کرد تا ڕێکەوت و دواتر پێکەوە خۆمان کرد بە چێشتخانەکەدا.

قاوە و چایان بۆ تێکردین و بەپەلە فریای نان و مرەبایەک کەوتم، چونکە خەریک بوون مێزی نانخواردنەکەیان لادەبرد. تەماشای چاوە سەوز و قاوەییەکەیم کرد و پرسیم:

- بێزارت دەکات؟

شانێکی هەڵتەکان:

- ئمممم، نا، یەکجار بەو شێوەیە نا.

- بەڵام تۆ پاڵت پێوەنایە ناو ئاوەکەوە.

وەک داواکارییەک وتی:

- باسی توێژینەوەکانتم بۆ بکە.

منیش هیچ لارییەکم لەوە نەبوو کە بابەتەکە بگۆڕم. بەشێوەیەکی گشتی باسی کارەکانی خۆمم بۆ کرد و پاش نەختێک بۆم دەرکەوت کە لەو بوارەشدا زانیارییەکی باشی هەیە. وەک دەزانیت خۆی خەڵکی ناوچەکە بوو و چەند شتێکی بۆ باس کردم کە من نەمدەزانین، باسی چەند کێشە و گرفتێکی هاوشێوەی کرد کە لەسەر کیشوەری ئوستralیادا هەن.

شەوی پێشوو لاورا باسی دەزگایەکی ژینگەی کرد و وتی مەسرەفی ماددی گرتۆتە ئەستۆ تا ساڵانە بتوانێت ڕاپۆرتەکەی دەربارەی ژینگە بنووسێت، منیش ڕێک پرسیاری ئەو دەزگایەم لێ کرد. لە سەرەتادا کەمێک لە پرسیارەکەم هەڵهات، بەڵام

دواتر وتی پارەی دەزگاکە لە ڕێکخراوێکی خێرخوازییەوە دێت و سەرچاوەکەشی کەسێکی ئەمریکییە.

پرسیم:

- یەکێکە لە ئایدیالیستەکان؟

قسەکەی بۆ ڕاست کردمەوە و وتی:

- پیاوێکی دەوڵەمەندە. شەق لە پارە هەڵئەیات.

پرسیارێکی ترم لێ کرد و ویستم بزانم ڕەشبینە یاخود گەشبینە بەرامبەر پاشەڕۆژی زۆر دواتری زەوی و مرۆڤایەتی، کەچی لە وەڵامدا وتی:

- ڕەشبینم بەرامبەر پاشەڕۆژی مرۆڤایەتی و هەرچی دەربارەی پاشەڕۆژی زەویشە گەشبینم.

هێدی هێدی خەریک بوو لە شێوازی بیرکردنەوەی تێدەگەیشتم و پاش ماوەیەکیش هەموو شتێکی بۆ هەڵڕشتم. لە ڕاستیدا گرنگیپێدانی لاورا بۆ ژینگە، بنەمایەکی ئیدیۆلۆجی قووڵتری هەبوو وەک لەوەی کە من مەزەنەم دەکرد. ئەو پێی وابوو زەوی ئۆرگانیزمێکی زیندووە و لە کاتی ئێستایدا بەدەست (تا)یەکی بەرزەوە دەناڵێنێت، بەڵام هەر ڕێک ئەو (تا)یە بەشێوەیەکی ڕێکوپێک کاری خۆی دەکات و پاش ماوەیەکیش زەوی چاک دەبێتەوە و دێتەوە سەرپێی خۆی.

پرسیم:

- هەر دەڵێیت باسی ئافرەتێکی زیندوو دەکەیت؟

- گایا[٥١]. ئەگەر پەرجوویەک ڕوونەدات، ئەوا لە دواجاردا ئەو میکرۆبانە دەکوژێت کە نەخۆشیان خستووە.

لەدوایەوە وتمەوە:

- گایا؟

- بێگومان ئەوە تەنها ناوێکە و بە (دایە زەوی)مان بەخشیوە، بۆ نموونە زۆر بەئاسانی دەکرا ناومان بنایە (ئێرسا)، بەڵام گرنگە بزانین زەوی کەسێکی زیندووە.

- کە میکرۆبەکانی لەناو دەبات؟

بەم شێوەیە دەستی بە قسەکانی کرد:

- چەندین ملیۆن ساڵ لەمەوبەر دایناسۆرەکان قڕیان تێکەوت. بەدڵنیاییشەوە نازانین کە بەهۆی بەرکەوتنی ئەستێرەی کشاوەوە بووە یان نا. ڕەنگە زەوییان تووشی نەخۆشییەک کردبێت و بەدوایدا خۆیان قڕیان لە خۆیان خستبێت. تیۆرییەکم

بیستووه کە دەڵێت گوایە فەوتانی دایناسۆرەکان بەهۆی جۆرە گازێکەوە بووە کە لە ڕیخۆڵەکانیاندا دروست بووە، بەڵام زەوی دیسانەوە چاک بووەوە، لە ڕاستیدا لەدایکبوونەوەیەکی نوێ بوو. لە کاتی ئێستادا مرۆڤ هەڕەشە لە ژیانی سەر زەوی دەکات. لەگەڵ ئەو هەڕەشەیەشدا ژینگەی ژیانی خۆشمان وێران دەکەین و دواجاریش گایا تورمان دەدات.

– بەو شێوەیەش.. بەڵێ، بەو شێوەیەش دیسانەوە زەوی دەتوانێت چاک بێتەوە؟

ئەو ژنەی کە چاوێکی سەوز بوو و چاوەکەی تریشی قاوەیی، سەرێکی بۆ لەقاندم. سەیری چاوە قاوەییەکەیم کرد و وتم:

– تۆ پێت وانییە کە مرۆڤیش بەهایەکی تایبەت بە خۆی هەبێت؟

هەروا شانێکی بۆ هەڵتەکاندم و تێگەیشتم کە هێندە گرنگی بە نرخی مرۆڤ نادات، بەڵام من، یان بڵێم کێشەی من هەمیشە لەوەدا بووە کە نەمتوانیوە نرخی زەوییەک ببینم کە جگە لە چەند ئۆرگانیزمێکی سادە هیچ ژیانێکی تری بەرهەم نەهێناوە. بەهەرحاڵ من زیاترێک گرنگیم بەو لایەنەی بیرکردنەوەکانی دا کە باسی لە لەدایکبوونێکی نوێی دەکرد، بەڵام هەروەک چۆن شەوی ڕابردوو بە گوێردنم گوت، تازە درەنگە لەسەر زەوی ئەوە ڕووبدات و ناشتوانین دڵنیا بین کە ئەقڵ شەنسێکی نوێی پێ دەبەخشرێت، بەلایەنی کەمەوە نە لەسەر ئەم ئەستێرە گەڕۆکە ئەوە ڕوودەدات و نە لە ماوەیەکی یەکجار دوورودرێژیشدا.

وتم:

– من هەمیشە لەو بڕوایەدا بووم کە هەموو مرۆڤێک نرخ و بەهایەکی لەڕادەبەدەر زۆری هەیە.

– هەموو ورچێکی (پاندا)ش هەمان نرخیان هەیە.

تەماشای چاوە سەوزەکەیم کرد و پرسیم:

– ئەی تۆ خۆت چی؟ لە مردن ناترسیت؟

سەری بۆ ڕاوەشانم:

– تەنها بەم سیمایەی ئێستامەوە دەمرم.

لەیادمە لەو کاتەدا بیرم لەوە کردەوە کە سیمای لە ئەندازە بەدەر جوان بوو.

درێژەی بە قسەکانی دا و وتی:

– بەڵام من هاوکات ئەم زەوییە زیندووەشم. من زیاترێک نیگەرانی ئەوەم کە ئەو

بمرێت، چونکە من خۆم هەبوونێکی قووڵتر و بەردەوامترم لەناو ئەودا هەیە.
لەدوایەوە وتمەوە:
– «هەبوونێکی قووڵتر و بەردەوامتر».
پێکەنی، وەک ئەوەی بەربەرەکانێم بکات وتی:
– بێگومان تۆ وێنەی (گایا)ت بینیوە کە لە ئاسمانەوە گیرابێت؟
– بێگومان بینیومە.
– بەلاتەوە جوان نییە؟
پێم وانەبوو خۆشی لە ناخیدا باوەڕی بە نیوەی قسەکانی خۆی بێت. بەدەر لەوەش قەت باوەڕم بەو جۆرە تێڕوانینە (مۆنیزم)ە بازاڕییە نەبووە کە تێکەڵی نەختێک بەکەمزانینی مرۆڤ بێت و بەو شێوەیە گرنگی بە ژینگە بدات. هەرچەندە تاڕادەیەک بیروڕاکانیم بەدڵ نەبوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەبێت دان بەوەدا بنێم کە وەک کەسێک لاورام بەدڵ بوو، چونکە ئافرەتێکی هەستیار و سەرنجڕاکێش بوو و بەشێوەیەک لە شێوەکانیش کەسێکی برینار بوو.
هەوڵم دا زیاترێک لە مەبەستەکەی تێبگەم. لە دڵی خۆمدا وتم: «باشە، ئێمە ژیانێکی کورت لەسەر ئەم زەوییە بەسەر دەبەین، بەڵام لەگەڵ ڕۆیشتنماندا هەموو شتێک کۆتایی نایەت، چونکە سەرلەنوێ دێینەوە، وەک گوڵە سەوسەن دێینەوە، یان وەک داری گوێزی هیندی و ورچی پاندا و کەرکەدەن دێینەوە و هەموو شتێکیش (گایا)یە کە نموونەی هەبوونی هەرە بنەڕەتی و قووڵمانە».
دانیشتبوو و سەرپاییەکانی پێی ڕادەوەشاند. لە قووماشی ماکسییە سوورەکەیەوە، تۆزێکی جلی مەلە ڕەشەکەیم بینی. پرسیارێکی لێ کردم و وتی:
– بە چ شێوەیەک ژیانی سەر زەوی سەری هەڵداوە؟
بە بڕوای من پرسیارەکەی بەشێوەیەک کرد کە چاوەڕوانی وەڵامدانەوەی نەبوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا وەڵامە کلاسیکییەکەم دایەوە وتم: «ڕەنگە هەموو ژیانی سەر ئەم زەوییە لە تەنها یەک گەردیلەی مەزنەوە هاتبێت، چونکە هیچ گومانێک لەوەدا نییە کە هەموو ماددە جینییەکانی سەر زەوی پەیوەندییەکی نزیکیان بەیەکەوە هەیە».
وەک سەرئەنجامێکی قسەکانم وتی:
– کەواتە زەوی یەک ئۆرگانیزمی زیندووە و ئەوەش تەنها وەسفێک نییە کە بەکاری دەهێنین. من بەڕاستی خزمایەتیم لەگەڵ ئا ئەو تۆڵەکەیەی ئەویادا هەیە.

ئامارەی بۆ ناو باخەکە کرد، چاوم لێ بوو بیڵ ئەو خاولییەی بەدەستەوە بوو کە ئەم لەسەر کورسییەکە بەجێی هێشت، بەڵام نەمویست سەرنجی بخەمە سەر ئەوە.
ئەویش لەسەر قسەکانی بەردەوام بوو:
- لە بنەڕەتدا خزمایەتیی من و ئەو تۆڵەکەیە زۆر زیاترە لە خزمایەتی نێوان دوو دڵۆپە ئاوی ناو دەریایەک، وە ئەگەر بەڕاستی هەموو ژیانی سەر ئەم زەوییە لە یەک گەردیلەی گەورەوە سەری هەڵدابێت...
بۆ ساتێک گومان دایگرت و منیش دیسانەوە تەماشای چاوە سەوزەکەیم کردەوە و وتم:
- ئێ؟
- ئەگەر وابێت کەواتە گەردیلەیەک بووە کە بەهیچ شێوەیەک ناچێتە ئەقڵەوە. من بەبێ هیچ دوودڵییەک ناوی دەنێم گەردیلەیەکی خوایانە. ئەوە تۆوی خودا بووە، هەر لەبەرئەوەشە کە دیسانەوە بەبێ هیچ دوودڵییەک ناوی خواژن لە گایا دەنێم.
- (گایا)ش خودی خۆتە؟
- تۆشیت. هەروەها تۆڵەکەکانیشە.
لەوەوپێش ئەوەم بەرگوێ کەوتبوو و وەک وتم پێم وانەبوو کە خۆی بڕوای بە هەموو ئەو شتانە بێت کە دەیگوتن. دژی قسەکانی وەستامەوە و وتم:
- بەڵام زەویش تەمەنێکی سنووورداری هەیە. زەوی تەنها (ئەستێرەیەکی گەڕۆکی تەنهایە) لەنێوان هیچێکی گەورەدا.
- یان لەنێوان گشتە گەورەکەدا، میستەر!
لەگەڵ ئەو قسەیەدا دەستی گرتم، منیش شڵەژام و نەمزانی چی بکەم. تەنانەت لەوەش دڵنیا نەبووم کە هەر لە بنەڕەتدا بتوانم جیاوازیی لەنێوان (گشت) و (هیچ)دا بکەم. باشە تاڕادەیەک ئەو دوو وشەیە هەمان مانایان نییە؟
دەستی بە توندی گوشیم و وتی:
- ئێمە پێکەوە دەبینە یەک.
بەلای منەوە ئەو جۆرە پێکەوەبوونە وەک شۆکێکی ئەلەکترۆنی وابوو و لەویادا هەستم کرد وشکی کردووم. لەلایەکی تریشەوە لەدوای باسکردنی (گشتی) گەورە و (هیچی) گەورەوە، شتێکی خراپ نەبوو کە دەستێکی گەرم لەناو دەستمدا بێت. خۆ ئەگەر هەموو شتێک یەک نەبووایە، ئەوا بەلایەنی کەمەوە هەستم دەکرد کە ئێمە دووانین. مەبەستم لەوە نییە کە بنەمایەکی ئیدیۆلۆجی خەریک بوو فریوم بدات، نا

بەهیچ جۆرێک، چونکە هاوکات لە دڵی خۆمدا وتم: «هەر ئەوەندەی دونیا بە باشی تاریک ببێت، هەموو شتێک خۆڵەمێشی دێتە بەرچاو وەک یەک دەردەکەون».

هەروا دانیشتبووین و بۆ چەند چرکەیەک دەستمان لەنێو دەستی یەکتردا بوو. لاورا لە یەک کاتدا هەم ئافرەتێکی سەرنجڕاکێش بوو و هەم ئایدیالیستێکی ناسروشتی و نەخۆشیش بوو، هەرچەندە بەشێوەیەک لە شێوەکان ئەو شتەی کە ئەو وتی پێچەوانەکەی نەدەسەلمێنرا، بەڵام خۆ هەروەک فەردانیەتە غەمگینەکەی خۆم وابوو، ئەوەش پێچەوانەکەی نەدەسەلمێنرا. وە پێکەوە دەبووینە یەک.

پرسیم:

– ئەو قسەیەت کابرای ئەندازیاری نەوتیش دەگرێتەوە؟

ڕێک لەدوای ئەو پرسیارەمەوە دەستی ڕاکێشایە دواوە.

بەدەم خەندەیەکی گەرمەوە سەرێکی بۆ ڕاوەشاندم و وتی:

– ئەو لە گەردوونێکی تەواو جیاوازدا دەژی.

لەگەڵ ئەوەشدا پاش نەختێک هەڵسا و بەرەو لای کورسییە درێژەکەی قەراغ مەلەوانگەکە ڕۆشت، وابزانم بۆ ئەوە ڕۆیشت تا لە پیاوە ئەمریکییەکە تورە ببێت، چونکە خاولییەکەی بردبوو.

بڕیارم دا سەیارەیەک بەکرێ بگرم و بەرەو پارکی نەتەوەیی (تاڤۆرۆ) بکەومە ڕێ، ئەو شوێنە کەوتبووە بەشی ڕۆژهەڵاتی دوورگەکەوە. لەلایەکەوە بەو ئومێدەی چاوم بە توتییە بەناوبانگەکانی ئەو ناوچەیە بکەوێت و لەلایەکی تریشەوە بۆ ئەوەی تاڤگە گەورەکانی ئەو ناوە ببینم، بەڵام بەدەرلەوانەش ئیشێکی تریشم هەبوو و دەبووایە بەر لە هەموو شتێکی تر ڕاییپەڕێنم، ئیشێک کە گرنگییەکی زۆری بۆ تەندروستیم هەبوو.

خاوەنی (ماراڤیو پلانتەیشن ڕیسۆرت) پیاوێک بوو کە ناوی (یۆکین کیس) بوو و بە ڕەچەڵەک خەڵکی ئەڵمانیا بوو. لە پەیداکردنی سەیارەکەدا زۆر یارمەتی دام، بەڵام بۆ ئیشەکەی ترم هەروا ئاسان نەهات بەدەستەوە و کێشەی تێکەوت. ئەو شوێنە بارێکی تێدا بوو، بێگومان بە هەموو جۆرە مەشروب و شتێکەوە، بەڵام یاسای ناوچەکەیان ڕێگەی پێ نەدەدا کە بتڵێکی پڕی مەشروبی قورس بە هیچ کەسێک بفرۆشێت. منیش بۆم باس کرد و وتم بەتەواوەتی لەوە تێدەگەم و ئێمەش لە نەرویجدا هەمان یاسامان هەیە، بەڵام وتم خۆ ئەوە لە ڕاستیدا جۆرە فرۆشتنێکی ئاسایی نییە، بەڵکو تاڕادەیەک قەرەبووکردنەوەی ئەو زەرەرەیە کە بەهۆی مارمێلکەیەک لە

مارمێلکە زۆر و زەوەندەکانی ناوچەکەدا ڕوویداوە. هەروەها ئامادەیی خۆشم نیشان دا کە نرخی تەواوەتی بتڵەکەی بدەمێ، واتە هەمان ئەو نرخەی بدەمێ کە لە بارەکەیدا پێک پێک دەیفرۆشێت. دواجار قسەکانی من قەناعەتی پێ نەکرد، بەڵکو زیاترێک بەهۆی مەزاجی باشی خۆیەوە بوو کە بتڵێکی سەر مۆری جنی گۆردنی پێ فرۆشتم، منیش بە فیکەلێدان بە خۆم و بتڵەکەمەوە بەرەو کوخەکەم ڕۆیشتمەوە. لە ڕێگادا چڵێکم لەو تۆڵەکەیە کردەوە کە لاورا ئاماژەی پێ دا و وەک خۆی وتی (خزمایەتی من و ئەو تۆڵەکەیە زیاترێکە لە خزمایەتی نێوان دوو دڵۆپە ئاوی نێو دەریایەک). بێگومان دەربارەی دڵۆپە ئاوەکان ڕاستی دەکرد، چونکە دوو دڵۆپە ئاو هیچ جۆرە خزمایەتییەکیان لەگەڵ یەکدیدا نییە، بەڵکو هەر ئەوەندەیە کە زۆر لە یەک دەچن و هیچی تر.

بتڵە بەتاڵەکەی ماڵەوەم پڕ کرد لە ئاو و چڵە تۆڵەکەکەم خستە ناوی، دواتر بتڵەکەم لەسەر مێزە بچکۆلەکەی بەردەم ئەو پەنجەرەیەدا دانا کە بەسەر باخی دارگوێزە هیندییەکاندا دەیڕوانی. ئینجا سەری بتڵە نوێکەم کردەوە و خستمە سەر لێوم. قومێکی بچکۆلەم لێ دا، تەنهاو تەنها لەبەرئەوەی هەست بکەم کە بتڵەکە هی خۆمە و تازە ناکرێت بیگەڕێننەوە بۆ بارەکە. سەرەکەیم بەتەواوەتی داخستەوە، ئینجا جانتاکەم کردەوە و زۆر بە ورياييەوە بتڵەکەم خستە ناوی.

لەویادا دیسانەوە بینیمەوە، گۆردن لەنێوان چرچی پەردەکەدا لە سوڕی سڕبوونی ڕۆژانەی خۆیدا بوو. وای بۆ چووم خەوتبێت، هەرچەندە سەختە بزانیت ئەو جۆرە خشۆکانە خەوتوون یان نا، چونکە لەبری پێڵوی چاو بە جۆرە چاویلکەیەکەوە لەدایک بوون کە بە چاویانەوە نووساوە. خۆ ڕەنگە منی بینیبێت کە بە خۆم و بتڵە نوێکەوە خۆم کرد بە ژووردا. بەهەرحاڵ من لەویادا ڕێک تەماشای ناوچاویم دەکرد کە لێی پرسیم:

– چییە، سەرت گێژ دەخوات و دەتەوێت خۆت چاک بکەیتەوە؟

– نەفرەت! دیسانەوە دەستی پێ کردەوە.

بەدڵنیاییەوە وتم:

– نا، بەس دەمم تەڕ کرد و بەدەرلەوەش لەم ژوورەی خۆمدا چی دەکەم و چی ناکەم، هیچ پەیوەندییەکی بە تۆوە نییە.

– خۆ مەبەستت لەوە نییە کە لە هەمان ئەو شوێنەوە دەست پێ بکەینەوە کە دوێنێ شەو وازمان لێ هێنا؟

– بەهیچ شێوەیەک. هەر ئەوەندە دەڵێم کە بە هەڵە لە خۆت تێمەگە و بزانە کێیت. تۆ تەنها مارمێلکەیەکیت و تەواو.
– وایە و واش نییە، میستەر!
– مەبەستت چییە؟
– ڕاست کە من ئا ئێستا و لەم شوێنەدا بەم شێوەیە دەردەکەوم، بەڵام لە ڕاستیدا..
خۆم زانیم دەیەوێت چی بڵێت، لەبەرئەوە بەربەرەکانێم کرد و وتم:
– فەرموو بەردەوام بە! من لەو کەسانە نیم کە باوەڕم بە ئازادیی ڕادەربڕین نەبێت.
– لە ڕاستیدا من ڕۆحی جیهانم، ئەو ڕۆحەی لە کاتی ئێستادا خۆی خنیوەتە ناو مارمێلکەیەکەوە. لەبەرئەوە ئەگەر شتێک هەیە و دەتەوێت بیزانیت، فەرموو پرسیار بکە.
وتم:
– بەڕاستی نازانم ئەگەر تاقەتی ئەوەم هەبێت یان نا، چونکە هەر شتێک بڵێیت من دەیزانم.
– گومانم لەوە هەیە، چونکە من ڕۆحی دونیام و هەموو شتێک دەزانم.
– دە کەواتە قسە بکە، بزانم چی دەزانیت؟
– نانی بەیانیت لەگەڵ گیاندارێکی شیردەری مێینەی ئوسترالیدا خوارد.
– باشە، با بڵێین لە تاقیکردنەوەکەدا دەرچوویت. دەتوانیت ئەوەشم پێ بڵێیت کە خۆشم دەوێت یان نا؟
پێکەنی:
– نەخێر، مایەی پێکەنینە ئەگەر پاش ماوەیەکی هێندە کەم شتێکی وا ڕوویدات، تەنانەت بەلای گیانەوەرێکی شیردەرێکی نێرینەی وەک تۆشەوە، بەڵام ئەگەر ناتوانیت غەریزە ئاژەڵییەکانت ڕابهێنیت، ئەوا ڕەنگە ون ببیت.
– ئاخر ئەویش ڕۆحی جیهانە.
– کتومت میستەر، کتومت. من لە هەموو شوێنێکی چواردەورتام. تۆ لە مندا دەژیت و دەجووڵێیتەوە.
تا ئێستاش لێرەو لەوێ کۆمەڵێک خەڵکی دابڕاو هەن کە فریویان نەخواردووە و نایانەوێت ڕۆحیان بەرامبەر بە پارە بفرۆشن. بۆ نموونە دانیشتووانی لادێ بچکۆلەکەی

(بۆئوما)ی ڕۆژهەڵاتی تاڤیونی هەر لە لەدایکبوونیانەوە دەزانن کە چاویان لەسەر یەکێک لە جوانترین دارستانە پڕ بارانەکانی سەر ئەم زەوییەدا هەڵهێناوە، بەدەر لەوەش دەزانن شوێنەکەیان هەم بۆتە مایەی سەرنجی توێژەرە سروشتییەکان و هەم بەرهەمهێنەری فیلمە بەهەشتییەکانی وەک (گەڕانەوە بۆ قەراغ ئاوی شین)یش. کاتی خۆی وەک پێشنیارێک پارەیەکی یەکجار زۆریان خستە بەردەم خەڵکانی ئەو ناوچەیە تا دارستانەکانیان بفرۆشن بۆ پیشەسازیی تەختە و خەڵکەکەش بێگومان کەوتنە تاوتوێکردنی بابەتەکە، چونکە سەرمایەیەکی نەقدیی نەک هەر لە (بۆئوما) دا بەڵکو لە هەموو دوورگەکانی فیجیدا شتێک نەبوو کە زۆریان هەبێت، بەڵام لە دوا ئەنجامدا وتیان (نا) بۆ پیشەسازیی تەختە و (بەڵێ) بۆ بیرۆکەیەکی گونجاو کە بتوانێت ناوچە بەپیتەکەیان بکاتە پارکێکی سروشتی، چونکە پێی دەچوو نەک هەر ببێتە سەرچاوەی داهاتێک بۆ خەڵکە بێ دەرامەتەکەی لادێکە، بەڵکو دەکرا ببێتە سەرچاوەیەکی بەردەوامی داهاتیان و بۆ ماوەیەکی زۆر زیاتر بەردەوام بێت وەک لەو پارەیەی کە ویستیان فریویان بدەن تا دارەکانیان بفرۆشن. ئەمڕۆکە پێنج هەزار هێکتاری ئەو پارکەیان خستۆتە بەردەستی گەشتیارانی ژینگە، هەروەها خەڵکانی ئەوێ لە سەخترین شوێنی ناوچەکەدا ڕێگایان لێداوە و تەوالێت و شوێنی سەیرانیان دروست کردووە. نموونەکەشیان سەرکەوتنی بەدەست هێنا، چونکە ئێستاکە خەریکن چەندین پرۆژەی لەو شێوەیە لەسەر دوورگەکە ئەنجام بدەن.

سەرسام بووم کە بە لادێکەدا تێپەڕیم و ڕووباری (بۆئوما)ی قەشەنگم بڕی، هەربۆیە بە خۆشحاڵییەوە پێنج دۆلاری (فیجی)م دا تا بتوانم بچمە ناو بەهەشتە پارێزراوەکەوە. لە کوخێکی بچکۆلەدا پاکەتێک پسکیت و بتڵێک ئاوم کڕی، دواتر چەند زانیارییەکی بەسوودیان دەربارەی ئەو حەوت کیلۆمەترە دامێ و شوێنی ڕێگاوبانی ئەو ناوەیان نیشان دام. هەروەها دڵنیام کردنەوە کە ئاگر نەکەمەوە و وتم منیش دەزانم کە هەر جۆرە ئاگرکردنەوەیەک ڕەنگە کارەساتێک بەدوای خۆیدا بهێنێت.

بۆ ماوەی نزیکەی کیلۆمەترێک بەدرێژایی ڕووباری (بۆئوما)دا ڕۆیشتم، وە ئەو ڕێگایەش کە بەسەریدا دەڕۆیشتم زیاد لەڕادە قەشەنگ دروست کرابوو، لە ڕاستیدا بەدرێژایی کیلۆمەترێک بەناو داری گوێزی هیندیی و دەوەنی گوڵ و گوڵزاردا تێپەڕیم. ڤیڕا، ئەوەیە کە من پێی دەڵێم دیمەنێکی کەلتووری. خۆزگە لەویادا لەگەڵمابوویتایە!

پاش نەختێک گوێم لە هاژەهاژی یەکەمین تاڤگە بوو. لەوەوپێش دەربارەیم

خوێندبووەوە و دەمزانی کە ئاوەکە لە بەرزایی بیست مەترەوە دێتە خوارەوە، لەو شوێنەشدا کە ئاوەکە بەر زەوی دەکەوێت، عەرزەکەی دڕیوە و جۆرە مەلەوانگەیەکی گەورەی پێک هێناوە و ئاوەکەی خوارەوە بڵقەبڵقی دێت. هەر زووش پێیان وتبووم کە خەڵکانێکی زۆر ڕووناکەنە ئەوێ، بۆیە من جلی مەلەم لەگەڵ خۆمدا نەبردبوو، بەڵام لەلای خۆمەوە وام دانابوو ئەگەر بە تەنها بم، ئەوا بە ڕووتوقووتی خۆم فڕێبدەمە ناو ئەو مەلەوانگە سروشتییەوە، وە ئەگەر تەنهاش نەبووم ئەوا نیو سەعاتێکی تر سەردەکەوم و دەگەمە تاڤگەی دووهەم، لەوێ ئاوەکە لە نزیکەی پەنجا مەترەوە دێتە خوارەوە، کەچی مەلەوانگەکەی خوارەوەی کە ئاوەکە دڕیویەتی هێندە گەورە نییە.

هەرکە چاوم بە تاڤگەکە کەوت (تا ئێستاش گوێم لە هاژەی ئاوەکەیە کە بەنەرمی دەپڕژایە خوارەوە) گوێم لە دەنگی یەک دوو کەسێک بوو کە دەمناسین و پاش نەختێک ئانا و خۆسێم لەناو حەوزەکەدا بینی. نازانم لەویادا نائومێد بووم کە بە تەنها نەبووم، یان بە بینینی ئەوان سەرسام بووم. بەهەرحاڵ شتێکی ناخۆش و چاوەڕواننەکراو بوو: بێگومان خۆش بوو سەرلەنوێ بیانبینمەوە، بەڵام هاوکات سوور دەمزانی کە ئەوانیش هەمان خەیاڵی منیان هەبووە و بەڕووتی مەلە دەکەن. دیسانەوە لەویاشدا ئادەم و حەوایان بە خەیاڵدا هێنامەوە، یەکەمین ژن و پیاو کە خوا ئافەریدەی کردن، هەروەها خەیاڵم چووە سەر شێوازی هەرە سەرەتایی خۆشبەختیش، لایەنی کەم ئەو کاتەم هاتە بەرچاو کە بەرلەوەی بکەونە بەر لێشاوی سۆزی سێوەکەوە و لە باخچەکەدا دەربکرێن، بەڵام دەرکردنەکەیان لە بەشی دواتردا ڕوویدا، چونکە تا ئەو کاتەش هەر بە ڕووتی دەسوڕانەوە. بەرلەوەی پشتیان تێبکەم، نیشانەیەکی زگماگی گەورەم لەسەر سکی ئانادا بینی.

ئەوەی کە لێرەو لەوێ خۆم گێل کردبوو و وام نیشان دەدا لە قسەکانی ئانا و خۆسێ تێناگەم شتێک بوو و ئەوەش کە بەدزییەوە تەماشای جەستەی ڕووتیان بکەم شتێکی تەواو جیاواز بوو. نەمویست ئاستی خۆم هێندە دابەزێنم، بەڵکو ئەو کارەم بۆ خودای گەورە جێهێشت، با خوا هەر خۆی بە تەنها ئەوە بکات، ئێ خۆ ئەو هەر خۆشی نموونەی هەرە ڕەسەنی ئەو بوارەیە و چێژ لەو جۆرە دیمەنانە دەبینێت. کێشەکەی من لەوەدا بوو کە نەمدەتوانی هەروا بەرەو تاڤگەکەی تر بڕۆم بەبێ ئەوەی نەمبینن، چونکە تەنها یەک ڕێگام لەبەردەستدا بوو و ئەو ڕێگایەش ڕێک بەلای حەوزەکەدا دەڕۆیشت. کەواتە ناچار بووم ڕوویان تێبکەمەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا ڕووم تێنەکردنەوە، چونکە گوێم لێ بوو خۆسێ شتێکی بە کچە ڕووتەکەی هاوەڵی وت، هەرچەندە لەویادا هەموو قسەکەیم گوێ لێ نەبوو، بەڵام دواترێک لە بۆنەیەکی تردا تەواوی قسەکانیم بەرگوێ کەوت:

- جۆکەر لە خەوە سوکەکانییەوە خەبەری دەبێتەوە و پێست و ئێسقانی خۆی دەبینێت. بەپەلە تووترکی شەوەکە دەڕنێت، بەرلەوەی ڕۆژ لەڕادەبەدەر پێیان بگەێنێت. یان ئێستا دەبێت ئەوە بکات یان قەت ناتوانێت. ئێستا دەبێت ئەوە بکات و تەواو. جۆکەر دەزانێت کە ناتوانێت دووجار لە هەمان جێگای خەوەوە بێتە دەرەوە.

لە دڵی خۆمدا وتم ئەگەر لەسەر ڕێگاکە بوەستم و نە بۆ دواوە و نە بۆ پێشەوە بڕۆم، ئەوا لەوانەیە لەو پێش نیوەڕۆیەدا بوارم بۆ بڕەخسێت و گوێم لە قسەکانی ناو دڵی ئاناش بێت. ئانا وتی:

- فریشتەکان بیر لە چی دەکەنەوە کاتێک لە نهێنیی خەونەکان بەرەڵا دەکرێن و بەوپەڕی کامڵییەوە دێنە ناو ڕۆژێکی تەواو نوێوە؟ ئامارەکان لەو بارەیەوە چی دەڵێن؟ جۆکەر ئەو پرسیارە دەکات. ئەو هەموو کەڕەتێک سەرسام دەبێت کە پەرجوویەکی ئاوها بچکۆلە ڕوودەدات. ئەو سەرسامی ئەو جادووەیە کە خۆی ئەنجامی داوە. ئەو بەو شێوەیە ئاهەنگی بەیانیی ئافەریدەکردن دەگێڕێت. ئەو ئا بەو شێوەیە سەلام لە بەیانیانی خەلق دەکات.

لەوەوبەر چەندین جار دەربارەی ئەو جۆکەرە پرسیارم لە خۆم دەکرد و دەموت (ئاخۆ ئەو جۆکەرە کێ بێت؟)، کەچی لەویادا جۆرە ڕوونکردنەوەیەکم بەرگوێ کەوت، چونکە خۆسێ وتی:

- جۆکەر لە شێوەی گیانەوەرێکی شیردەری باڵادا بەناو شەکرەپەرییەکاندا دێت و دەڕوات. سەری دادەنەوێنێت و تەماشای دوو دەستی نامۆی خۆی دەکات، دەستێک بە کوڵمێکدا دەهێنێت کە نایناسێت، دەستی دەبات بۆ ناوچەوانی و دەزانێت ئەوێ ماڵی نهێنیی خودە، جێگای پلازمای ڕۆح و دەڵەمەی مەعریفەیە. ناتوانێت لەوەندە زیاتر لە کرۆکی شتەکان نزیک ببێتەوە. بە لێڵی مەزەنەی ئەوە دەکات کە دەشێت خانەخوێیەکی مێشک بێت. لێرەشەوە چیتر خۆی خۆی نییە.

لە دڵی خۆمدا وتم: «ڕەنگە فریشتەیەکی بیۆکیمیاویی بێت و نموونەی ئەبەدییەت بێت، هێندەش بە حەسرەتەوە بووە بزانێت ژیانی ناو مەملەکەتی گۆشت بە چ شێوەیەک جمەی دێ، وە بەهۆی بڕوای لەڕادەبەدەر بە خۆیەوە، بیری چووە

ڕێگایەکی گەڕانەوە بۆ خۆی دابین بکات. هەر تەنها بەلای گیانەوەرێکی شیردەری باڵاوە خەتەرناک نییە کە دوو باڵی لە مۆم دروستکراو بە خۆیەوە بکات و هەروا بەپەلە بڕوا بەوە بکات کە دەتوانێت وەک فریشتەکان بەرەو ئاسمان بفڕێت، بەڵکو پێچەوانەکەشی بەهەمان شێوە شتێکی بێئەقڵییە: دەشێت بەهەمان شێوە شتێکی بێئەقڵی بێت ئەگەر فریشتەیەک پێی وابێت کە بتوانێت بەئاسانی وەک گیانەوەرێکی شیردەری باڵا بژی بەبێ ئەوەی سیفەتی فریشتەیی خۆی لەدەست بدات. فریشتەکە لەچاو گیانەوەرە شیردەرە باڵاکەدا زۆر زیاترێکی دۆڕاندووە، هەرچەندە بەشێوەیەک لە شێوەکان هەردووکیان هەمان شتیان دۆڕاندووە: ئەویش ڕاست و دروست خودی خۆیانە. جیاوازییەکە تەنها لەوەدایە کە فریشتەکە زۆر بەئاسانی وای داناوە کە ژیانە هەتاهەتاییەکەی قەت قەت کۆتایی پێ نایەت.

دڵنیا نیم، بەڵام وابزانم وای بۆ چووم کە بینیبێتیانم، هەربۆیە دیسانەوە لە سەبەتە بچکۆلەکەیانەوە هەندێک ڕستەی فەلسەفییان دەرهێنا. خۆ ئەگەر بەو شێوەیە بووبێت ئەوا بێ ئەقڵی بوو گەر خۆمم لێ بشاردنایەتەوە، بەڵام بەهیچ شێوەیەک دڵنیا نیم کە ئەو جۆرە شتانەم هەڵسەنگاندبێت، چونکە تەنها ئەوەندەم لە یادە کە چوومە سەر ڕێگاکە و دەستێکم بە چاومەوە گرت و خۆم نیشان دان، بێگومان هاوکاتیش وام نیشاندا کە گوێم لە هیچ وشەیەکیان نەبووە.

پرسیارێکم لێ کردن وتم:

– شوێنی کۆچەرێکی تریش دەبێتەوە؟ بەڕاستی منیش پێنج دۆلارم بە فیزەی ئەم بەهەشتە داوە.

پێکەنین و لە حەوزەکە هاتنە دەرەوە، منیش هەروا وەستابووم و بەئاشکرا دەستم هەر بە چاومەوە بوو، بەڵام لە ساتێکدا پەنجەکانم بە ڕێکەوت یەک دوو ملیمەترێک لە یەکتر ترازان، ڕێک لەو کاتەدا بەرلەوەی خۆسێ و ئانا یەک بەدوای یەکدا پانتۆڵێکی کەتانی ڕەش و ماکسییەکی سووری هاوینە لەبەر بکەن، کەمێکی جەستە ڕووتەکەیانم بینی.

هەر ڕێک پاش بینینی ئانا لە بەرگی حەوادا، سروشێکی نوێم بۆ هات: من لەوەوبەر تەنها سەری ئانام بینیبوو و بەرگی حەوام نەدەناسییەوە، هەرچەندە بەتەواوەتی لێی دەهات، هیچ گومانێک لەوەدا نەبوو، بەڵام خۆ مەحاڵە سەرێک لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر بگوێزرێتەوە؟ من خۆم هەرگیز نەمبیستبوو بە نەشتەرگەرییەک سەری کەسێکیان گواستبێتەوە بۆ کەسێکی تر.

کاتێکیش بەتەواوەتی جلەکانیان پۆشی، لە سێبەرەکەدا لەسەر کورسییەک دانیشتین و پسکیتمان خوارد. یەک لە یەک زیاترێک وەسفی جوانی ئەو گەوهەرە سروشتییەمان بۆ یەکتر کرد و بێگومان بەتایبەتیش باسی خەڵکی (بۆئوما)مان کرد، چونکە ئێمە میوانی ئەوان بووین. دیسانەوە ئانا بە خۆی و کامێراکەیەوە بەو ناوەدا سوڕایەوە، چەندین جاریش داوایان لێ کردم ڕەسمی هەردووکیان بگرم.
لەو کاتەدا کە ئانا خەریکی وێنەگرتن بوو، سەرلەنوێ خۆسێ چەندین پرسیاری تایبەتی لێ کردم کە هەموویان لە بازنەی تێزە زانستییەکانی بواری گەشەکردندا بوون، هەرچەندە هەر شەوی ڕابردوو هێندە تێگەیشتم کە ئەو وەک کەسێکی ئاسایی زانیارییەکی باشی لەو بوارەدا پێ بوو. بەبێ هیچ دوودڵی و ترسێک زاراوەی تەکنیکی لەو بوارەدا بەکاردەهێنا، بۆ نموونە هەروەک زاراوەی (گەشەکردنی هێدی هێدی) و (گەشەکردنی پنتی).
دەبووایە چاویان بە شۆفێرێک بکەوتایە کە لە کوخە بچکۆلەکەی خوارەوە چاوەڕوانیان بوو، وە لەسەر ئەوەش ڕێکەوتین کە سەرەی من بوو بەهەشتەکە بۆ خۆم داگیر بکەم. پاش مەلەکردن بەرەو تاڤگەی دووهەم بەڕێکەوتم.
دواتر پاش چەند سەعاتێک دیسانەوە چاوم بە ئانا و خۆسێ کەوتەوە، ئەو جارەیان لەناو دارگوێزە هیندییەکانی ماراڤیودا بینیمنەوە. سەرلەنوێ لەویاشدا ئانا ویستی چەند وێنەیەکی ترمان بگرێت، دەمەوێت بەتایبەتی باسی ئەمە بکەم، چونکە لەوەدەچوو ئەو وێنەگرتنەش جۆرە سروتێک بێت و کەم تا زۆر هەروەک ڕستە نهێنییەکانیان وابوو کە دەسوڕانەوە و دەیاندا بە گوێی یەکتریدا.
لەناو باخەکەدا بە تەنها بووم، بەڵام لەناکاودا گوێم لە چەند دەنگێک بوو کە زۆرباش دەمناسییەوە و هێندەی نەبرد بۆم دەرکەوت لەلای کوخەکەی ئانا و خۆسێدا بووم، ئەوانیش لە بەرهەیوانەکەیاندا دانیشتبوون. نەیانبینیم، یان بەلایەنی کەمەوە مەحاڵ بوو ڕێک لەو شوێنەدا بمبینن کە منی لێ وەستابووم، هەرچەندە کتومت هەر ئەوەندە دوور بووم لێیانەوە وەک ئەو کاتەی کە من لە بەرهەیوانەکەم دانیشتبووم و ئەوان لەناو دارگوێزە هیندییەکاندا بوون. ویستم بەئەدەبەوە جێیان بهێڵم و جەوەکەیان لێ تێک نەدەم، بەڵام ڕێک لەو کاتەدا لێشاوێک لە حیکمەتی سەرنجڕاکێشیان دەربڕی.
یەکەمجار خۆسێ دەستی پێ کرد و وتی:
- ئاخۆ کێ خۆشیی لە نمایشی تەقاندنی فیشەکەشێتەکانی گەردوون بینیبێت؟ لە

کاتێکدا کاتی خۆی سەرجەم کورسییەکانی ئاسمان تەنهاو تەنها جمەیان هاتووە لە سەهۆڵ و ئاگر؟ کێ بە خەیاڵیدا دەهات ڕۆژێک لە ڕۆژان خشۆکە سەرەتاییە ئازاکان هەنگاوێکی بچکۆلە بەرەو کەناری دەریا بنێن، نەک هەر ئەوەش، بەڵکو لەو ڕێگا دوورودرێژەدا هەنگاوێکی گەورەتریش بنێن بەرەو گیانەوەرە شیردەرە باڵاکان، کە ئێستاکە بەوپەڕی شانازییەوە لە سەرەتای ئەو ڕێگایە دەڕوانن؟ پانزە ملیار ساڵ بەسەر تەقینەوە مەزنەکەدا تێپەڕی و ئینجا هاڕەکەی بەرگوێ کەوت.

ئانا لێی پرسی:

- یان با لە پێشدا ئەمەیان بڵێین، تۆ دەڵێیت چی؟

ئینجا هەر خۆی وتی:

- شتێک گوێقووڵاغە و چاوی داپچڕیوە: لە سەرەوە لە کلێپەی ئاگرەکەوە تەماشا دەکات، لە شلە چڕە سەرەتاییەکەوە دەڕوانێت، لە دەرکی ئەشکەوتەکانەوە و لە ئاسۆی دەشتە پڕ گژوگیاکانەوە سەیر دەکات.

- زۆرباشە، بەڵام ڕەنگە باشترێک بێت گەر بڵێین (شلە قورقوشمییە چڕەکە).

- بۆچی؟ ئاخر هیچ شلەیەک نییە کە وەک قورقوشم چڕ بێت.

- مەبەستم لەوەیە وەک وێنەیەکی خەست بیهێنینە بەرچاو، چونکە شەنسێکی یەکجار بچکۆلە لەئارادا بووە کە ڕۆژێک لە ڕۆژان بوونەوەری زیندووی لێ بێتە دەرەوە و پێ بخەنە سەر وشکانی.

- بەو شێوەیە ڕیتمی قسەکە تێک ناچێت؟

- بەپێچەوانەوە: (لە شلە قورقوشمییە چڕەکەوە دەڕوانێت...)

- با بزانین چۆن دەبێت.

ئینجا سەرەی خۆسێ هات. دیاربوو بەرلەوەی قسەکانی بکات، کەمێک بیری کردەوە و ئینجا وتی:

- دیمەنە سەرەکییەکە وەک تەمێکی ئەفسووناوی بەرز دەبێتەوە، بەنێو تەمەکەدا تێدەپەڕێت و دەچێتە سەروو تەمەکەوە. زریرا بەنازەکەی نیاندەرتاڵ دەست دەخاتە سەر ناوچەوانی و دەزانێت لە پشت ئێسقانی ناوچەوانی گیانەوەرە شیردەرە باڵاکانەوە ماددەی نەرمی مێشک مەلە دەکات، دەزانێت هەر ئەو مێشکەش کاپتنی ئۆتۆماتیکیی سەفەری گەشەکردنە، پەی بەوە دەبات کە هەر ئەوە باڵۆنی پارێزەری فیستیڤاڵی پڕۆتینە، ئەو باڵۆنەیە کە شت و بیرکردنەوە لە یەکدی جودا دەکاتەوە.

لەویادا ئانا پێویستی نەبوو بە قووڵی بیر بکاتەوە تا شتێک بڵێ، وەڵامەکەی لەناو

درامای سروتەکەدا دارێژرابوو:
- پێشکەوتنە هەرە گەورەکە لەناو بازنەی سێرکی مێشکی گیانەوەرە چوارپەلەکاندا ڕوودەدات. لەوێوە دەنگوباسی دواهەمین سەرکەوتنی ڕەگەزەکەیان ڕادەگەیەنرێت. لەناوخانە دەمارییە گەرموگوڕەکانی گیانەوەرە برپڕەدارەکاندا، بۆ یەکەم جار تەپەدۆری شەمپانیاکان بە ئاسماندا هەڵدەدرێن. گیانەوەرە شیردەرە پۆستمۆدێرنەکانیش لە دواجاردا دەگەنە تێگەیشتنە مەزنەکە. پێویست بە ترس و نیگەرانیش ناکات، چونکە هەر ئەوەندەیە کە گەردوون لە گۆشەیەکی کراوەوە تەماشای خودی خۆی دەکات.
پشوویەکی بچکۆلەیان دا و وامزانی کۆتاییان بە قسەکانیان هێنا، چونکە لەو ماوەیەدا بتڵێک شەرابیان هەڵپچڕی، کەچی پاش نەختێک خۆسێ وتی:
- گیانەوەرە برپڕەدارەکە لەناکاوێکدا ئاوڕ دەداتەوە و لە ئاوێنەی ڕابردووی ساڵە تیشکییەکانی شەوەوە، دەڕوانێتە کلکی پڕ نهێنیی ڕەگەزەکەی خۆی. ئەو ڕێگا پەنهانە تەنها لە ئێستادا گەیشتۆتە ئامانجەکەی، ئامانجەکەشی ئەوە بوو کە بەئاگا بێت لەو ڕێگا دوورودرێژەی کە بەرەو ئامانجەکە دەڕوات. تەنها هێندەی پێ دەبڕێت کە چەپڵە لێبدات، هەر ئەو پەلانەشە کە وەک بۆماوەیەک بۆ ڕەگەزەکەی جێدەهێڵێت.
ئانا لەدوایەوە وتییەوە:
- (ئاوێنەی ڕابردووی ساڵە تیشکییەکانی شەو)، کەمێک قورس نایەتە بەرگوێ؟
- بەڵێ، بەڵام تەماشاکردنی گەردوون وەک ئەوە وایە تەماشای مێژووی ڕابردووی گەردوون بکەیت.
- دواتر دەگەڕێینەوە سەر ئەوە. ڕەنگە ئێستاکە لە شوێنی خۆیدا بێت کە بڵێین: گیانەوەرە شیردەرە زرنگەکە لە ماسی و خشۆک و (شیرناڵی) بچکۆلەی شیرینەوە، وەک بۆماوەیەک، دوو چاوی قەشەنگ و قووڵبینی بۆ ماوەتەوە. ئێستاکەش نەوە بۆماوە دوورەکانی ماسییە پەڕەکە پەلکدارەکان لە هەڵهاتنی گەلەهەسارەکانی ئاسمان دەڕوانن و دەشزانن کە چەند ملیارد ساڵێکی پێچووە تا بتوانن بەو شێوە قووڵە بڕوانن. هاوێنەکانی چاویان لە گەردیلەی سافکراوی گەورە گەورە پێکهاتووە. بەهۆی پرۆتین و ترشی ئامینی لەڕادەبەدەر کامڵیشەوە، دەتوانن بەو شێوە وردە سەرنج بدەن.
سەرلەنوێ نۆبەی خۆسێ هاتەوە:

- بینینی فرەلایەن و حیکمەت لە گلێنەی چاودا بەیەکدا دەدەن، هەروەها ئەندێشەی قووڵ و مەخلوقیش لەویادا بەگژیەکدا دەچنەوە. بەرهەمی بینین دەرگایەکی ئەفسووناوییە و بە هەردوو دیودا دەکرێتەوە، لەویادا ڕۆحی خالق ڕووبەڕووی خودی خۆی دەبێتەوە کە لەناو مەخلوقەکانیدایە. ئەو چاوەی کە تەماشای قووڵایی ناو گەردوون دەکات، چاوی خودی گەردوونە.

بۆ چەند چرکەیەک بێدەنگ بوون، دواتر خۆسێ وتی:

- سینەک یان دینار؟

- دینار! بێگومان دینار.

دوو پەرداخ شەرابیان تێکرد و منیش کەمێکی تر مامەوە، بەڵام هیچی تریان نەگوت، لەبەرئەوە زۆر بەئەسپایی شوێنەکەم جێهێشت.

قسەکانیان هەژاندمی، بەڵام هاوکات وەڵامی هەندێک پرسیاریشم دەست کەوت، لەویادا زۆر بەڕوونی بۆم دەرکەوت کە ئانا و خۆسێ لەبەر هەیوانەکەیاندا دادەنیشن و حیکمەتە سەیروسەمەرەکانیان دەهۆننەوە. بەدەر لەوەش دیاربوو کە خاوەنی بەهرەی بێ شەرمیش بوون: ئەو گفتوگۆ دوورودرێژەی کەمێک لەوەوبەر بەرگوێم کەوت، شتێک بوو کە هیچ گومانێکی لەلام نەهێشتەوە و بەوپەڕی دڵنیاییەوە دەتوانم ناوی بنێم (دزینی فیکری) بگرە (دزینی ئەقڵی)ش. ئاخر ڕێی تێناچێت هەروا بە ڕێکەوت حیکمەتە فەلسەفییەکانی ئانا و خۆسێ هێدی هێدی لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا زیاتر و زیاتر لە تێڕوانینەکانی من بچێت لە بواری گەشەکردنی بایۆلۆجیدا، بەتایبەتیش لەدوای قسەکانی دوێنێمان و ئەو چاوپێکەوتنە بچکۆلەیەم لەگەڵ خۆسێدا کە چەند سەعاتێک لەوەوبەر ڕوویدا. هەر لە یەکەمین دیدارمانەوە بە مەبەستەوە پرسیاریان لێ دەکردم تا شتم لێ دەربهێنن و تا ئەندازەیەک هەموو تێڕوانینێکیان پێ هەڵڕشتم.

بەهەرحاڵ هێشتا کۆمەڵێک پرسیاری بێ وەڵام مابووەوە: وتی «دینار! بێگومان دینار». بێگومان دینار بوو قیرا، نەک سینەک و قەرە، بەڵام مەبەستیان چی بوو لەوە؟ چ پەیوەندییەکی بە یاریی کاغەزەوە هەبوو؟ ئەی (جۆکەر) و (شەکرەپەرییەکان) کێ بوون؟

جگە لەوەش دڵنیا بووم ئەو کۆبوونەوەیەی پاشنیوەڕۆیەشیان هەروا نمایشێک نەبوو کە بە مەبەستەوە لەبەرخاتری گەشتیارێکی تەنها هەڵیرێژن کە هەر بۆ نموونە بەدزییەوە بەناو دارگوێزە هیندییەکاندا دەسوڕێتەوە. من هیچ بەدووری

نازانم بەرلەوەی بگەمە پشتی بەرهەیوانەکەیان، سوسەیان کردبێتم، کێ دەزانێت؟ ئێ (ئانا)ش با جارێ بۆ خۆی لەولاوە هەر بوەستێت. ئانا... تکایە وەرەوە ناو یادەوەریم.
بڕیارم دا هەروا دەستەوەستان دانەنیشم و شتێک بکەم. سەرەتا گەڕامەوە بۆ کوخەکەم، قەڵەم و کاغەزێکم دەرهێنا و لەسەر قەراغی جێگای خەوەکەم دانیشتم. دەستم کرد بە نووسین: «هەتاوەکو جۆکەر زیاترێک لە عەدەمی هەتاهەتایی نزیک بێتەوە، وە لەگەڵ بەخەبەربوونەوەیدا بۆ هەموو ڕۆژێکی نوێ، ڕوونتر و ڕوونتر سیمای گیانەوەرێک لە ئاوێنەکەیدا دەبینێت. هیچ جۆرە دڵنەوابییەک لە نیگای بێ ئومێدی گیانەوەرە شیردەرە غەمبارەکەدا نابینێت. ماسییەکی جادوولێکراو دەبینێت، بۆقێک دەبینێت کە شێوەکەی لە ساتێکەوە بۆ ساتێکی تر دەگۆڕێت، مارمێلکەیەکی شێواو و نوقسان بەدی دەکات. لە خەیاڵی خۆیدا دەڵێت: «ئەمە کۆتایی دونیایە. لێرەدا کتوپڕ کۆتایی بە سەفەری دوورودرێژی گەشەکردن دێت».
ئەو بڕگەیەم بە دەنگی بەرز خوێندەوە و لە چرچولۆچی ناو پەردەکەوە وەڵامێکم بەرگوێ کەوت:
گۆردن وتی:
– ئەو دەربڕینەتم بەلاوە جوان بوو کە دەڵێیت (مارمێلکەیەکی شێواو و نوقسان).
– بۆچی؟
– چونکە بەشێوەیەک لە شێوەکان جەخت لەوە دەکەیتەوە کە ئێمە ڕەسەنین.
– قسەی قۆڕ! تۆش ماسییەکی جادوولێکراویت.
– بەڵام من نوقسان نیم. تەنانەت یەک گرێی مێشکیی زیادەشم نییە. من خاوەنی جۆرە سیستەمێکی دەماری ئاوهام کە پڕاوپڕ لەگەڵ ئەو چالاکییانەدا دەگونجێت کە هەڵیان دەسوڕێنم، نە زیاتر و نە کەمتر.
– کەواتە دەنووسم: «مارمێلکەیەک کە هەستاوەتە سەر پێ».
– نا، بە بڕوای من باشترە ئەو (شێواو و نوقسان)ە وەک خۆی بهێڵیتەوە، نەک تەنها لەبەرئەوەی کە گرێی مێشکیی زیادەتان هەیە، بەڵکو لەبەرئەوەش کە لەگەڵ ڕیتمی زمانەکەدا ڕێک دەکەوێت، بێگومان ئاماژەیەکیشە بۆ ئەو پەیوەندییە باشەی کە وەک دراوسێیەک هەمانە.

وتم:

- دە گوێ شل بکە بۆ ئەم دانەیەش.

هێندەم وت و لە کاتی نووسیندا بە دەنگی بەرز وشەکانم بۆ خوێندەوە:

- جۆکەر فریشتەیەکە کە لە تەنگانەدایە: بەهۆی تێنەگەیشتنێکی کوشندەوە خۆی خزاندە ناو لەشێکەوە کە لە گۆشت و خوێن پێکهاتبوو. ویستی بۆ چەند ساتێکی کەمی گەردوونی بەشداری ژیانی گیانەوەرە شیردەرە باڵاکان بکات، بەڵام نەیزانی و بەدوای خۆیدا پەیژە ئاسمانییەکەی داگرت. ئەگەر کەسێک لە کاتی ئێستادا نەیگەڕێنێتەوە، ئەوا کاتژمێرە بایۆلۆجییەکەی خێراتر و خێراتر لێدەدات، بەو شێوەیەش درەنگ دادێت و دواتر ناتوانێت بگەڕێتەوە بۆ ناو مەملەکەتی ئاسمان.

سەرم هەڵبڕی و تەماشایەکم کرد.

- ترۆهاتێکی ڕۆمانسیت وت، هەڵبەتە ئەگەر ئەتەوێت ڕای من بزانیت.

- من هیچ پرسیارێکم لێ نەکردیت.

- باشە ئەی ئەگەر ئەبەدییەت بوونی نەبێت؟

- ئێ ڕێک ئەو بیرکردنەوەیەیە کە منی لەڕادەبەدر توڕە کردووە، هەروەها پەست و غەمگینیش. من گیانەوەرێکی شیردەری مات و مەلوولم.

- بەڵام تۆ خۆت وای دادەنێیت کە ئاسمانێک هەیە و فریشتەکان دادەبەزنە سەر زەوی و دەچنە ناو لەشەوە، تەنها بۆ ئەوەی لێرەدا گیر بخۆن و ئەزموونی ئەو گێژاوە سەختەی سەر زەوی بکەن، گێژاوێک کە ناتوانن لەناویدا بێنە دەرەوە و سەرلەنوێ ڕێی ماڵەوەیان بدۆزنەوە.

- ئەوەش بنووسمەوە؟ «... بۆ ئەوەی لێرەدا گیر بخۆن و ئەزموونی ئەو گێژاوە سەختەی سەر زەوی بکەن، گێژاوێک کە ناتوانن لەناویدا بێنە دەرەوە و سەرلەنوێ ڕێی ماڵەوەیان بدۆزنەوە».

- بەهیچ جۆرێک. بەدەر لەم جیهانە، هیچ جۆرە جیهانێکی تر بوونی نییە. ئەم جیهانەش بەشێوەیەکی دراماتیکی لەناو کات و شوێندا ڕوودەدات.

بە دەنگێکی بەرز وتم:

- خۆشم ئەوە دەزانم! هەر ڕێک لەبەرئەوەشە کە تۆ ئەو قسانەم بۆ دەکەیت، بەڵام لەو تەشبیهکردنەدا جۆرە دەربڕینێکی ناڕاستەوخۆشی تێدایە، مەبەستم لە شتێکە کە پێی دەڵێن (وەک ئەوەی)، نازانم تێدەگەیت یان نا؟ من وەک

فریشتەیەکی بێ دەسەڵاتم، وەک ئەوەی فریشتە بوونی هەبێت. هەر ئەوەندە مەزەندەی فریشتەیەکی بێ دەسەڵات بکە کە لە گێژاوی جەستەدا ونبووبێت و لەناکاودا پێی بزانێت کە لەناو کارەساتێکدایە و هیچ چارەیەکی نییە و ڕێگای ئاسمانی بۆ نادۆزرێتەوە. تۆ لەوە تێناگەیت کە ئەو فریشتەیە لە چ کارەساتێکدایە؟ ئەو، بەپێی یاسا و ڕێسای سروشتی خەلق، وای دانابوو کە بوونی هەرگیز کۆتایی نایەت. لەوەوبەر بەردەوام بوونی هەبووە و جۆرە ڕێکەوتنێکیشی لەگەڵ خودادا هەیە کە بوونی هەتاهەتایی بێت. هەڵەکەش ڕاست و دروست لەویادا ڕوودەدات، هەروەک هەڵەی سێوەکە کە لە باخچە کۆنەکەدا ڕوویدا، لەویادا فریشتەکە هێندە تێدەگات کە پلەوپایەی هەر زۆر زۆر دابەزیوە، چونکە لەناکاودا بووە بە فریشتەیەکی بایۆکیمیاوی، مەبەستم لەوەیە بووە بە مرۆڤ و لەوێشەوە بووە بە مەکینەیەکی پرۆتینی کە شیاوی مردنە، هەروەک ماسییەکان و بۆقەکان. لەبەردەم ئاوێنەکەدا دەوەستێت و دەبینیت کە بەهۆی تەنها یەک تێنەگەیشتنی ساکارەوە هیچێکی لە مارمێلکەیەک زیاتر نییە.

– وەک لەوەوبەر وتم ئێمە هیچ گلەییەکمان لە پلەوپایەی ئەنتۆلۆجی خۆمان نییە.

– ئاخر من گلەییم هەیە.

– چونکە تۆ یەک دوو گرێی مێشکیی زیادەت هەیە.

– بەڵێ، بەڵێ، بەڵام فریشتەکە ئەوەی نییە. ڕەنگە ئەویش هەر هێندەی مرۆڤێک تێبگات، واتە هێندە تێبگات کە کۆمەڵێک وێنای دیاریکراوی دەربارەی گەردوون هەبێت، بەڵام هەر ئەوەندەیە کە ئەو بەپێچەوانەی مرۆڤەوە لە ژیانێکی هەتاهەتاییدا خۆی دەبینێتەوە. هەر کتومت جیاوازییە گەورەکەش لەوەدایە. بەشێوەیەکی گشتی فریشتە مەعریفەیەکی گونجاوی هەیە کە هاوشانی پایەی گەردوونییەتی. من خۆم زۆر زۆر شت دەزانم، چونکە تەنها بۆ ماوەیەکی کەم لێرەدام.

– نازانم تۆ بۆچی باسی توانای تێگەیشتنی فریشتە دەکەیت، لە کاتێکدا کەمێک لەمەوبەر خۆت وتت کە بڕوات بە فریشتە نییە.

زۆر بە ساکاری گوێی خۆمم لە قسەکەی کەڕ کرد و لەسەر باسەکەم بەردەوام بووم:

– من لە خێزانی (سەلەماندەر)[٥٢]م و بەرامبەر ئەو کاتە کەمەی کە دەبێت لێرەدا

بم، ئەو یەک دوو گرێ مێشکییە زیادەیەم هەیە. واتە من باسی بابەتێکی ئەقڵانی ناکەم، بەڵکو باسی بابەتێک دەکەم کە پەیوەندی بە سۆزەوە هەیە، یان باشترێک بیڵێم بابەتێکی مۆراڵیی باس دەکەم. بەلای منەوە شتێکی هەم غەمگینە و هەم تورەش دەبم کاتێک ئەو ڕاستییە دەبینم و تێدەگەم ئەم ژیانەم چەندە کورتە، مات و تورە دەبم کە هەر لە ئێستاوە خەریکە ماڵئاوایی لە چەندین شت دەکەم. بەلامەوە ئەوە شتێکی هەقانی نییە.

– کەواتە لەوانەیە باشتر بێت ئەو کاتەی کە بۆت دیاری کراوە بۆ شتێکی تر بەکار بهێنیت و هێندە پەست نەبیت بەوەی کە ژیانت هێندە کورتە.

وتم:

– مەزەندە بکە لە سەفەرێکی دووورودرێژدایت. چاوت بە کۆمەڵێک خەڵکی میهرەبان دەکەوێت و بانگهێشت دەکەن بۆ لای خۆیان، بەڵام تەنها بۆ ماوەیەکی زۆر کورت. جگە لەوەش دەزانیت کە هەرگیزاوهەرگیز ناتوانیت کەڕەتێکی تر پێ بخەیتەوە ناو ئەوماڵە، یان تەنانەت ناتوانیت بچیتەوە بۆ ئەو وڵاتە یاخود جارێکی تر ئەو شارەش ببینیتەوە.

– کەواتە لایەنی کەم دەتوانیت باسێکی خۆشیان لەگەڵدا دامەزرێنیت و چێژی لێ ببینیت.

– بێگومان ئەوە دەکرێت، بەڵام من پێویستم بەوە نییە هەموو شتێک دەربارەی بەڕێوەبردنی ئەو ماڵە بزانم. پێویست ناکات بزانم کەوچکی قووڵ و مەنجەڵی بچکۆلەی دەسکدرێژ و مقەستی پەرژین برین و چەرچەفی ماڵەکە لە چ شوێنێکدایە. پێویست ناکات هەموو شتێک دەربارەی دوو منداڵەکەیان بزانم و بۆم دەرکەوێت لە قوتابخانەدا چۆنی دەگوزەرێنن، یاخود دایکیان یان باوکیان ساڵی ڕابردوو چ جۆرە خواردنێکیان لە یادی زیوینی هاوسەرێتییاندا پێشکەشی میوانەکانیان کردووە. ڕەنگە خۆش بێت گەر کەمێکی ماڵەکەیانم نیشان بدەن، بێگومان من خۆم قەت ئەو جۆرە میوانداریێتییە بە کەم نازانم، بەڵام ئەگەر لە یەک میوانداریی بچکۆلەدا هەموو شتێکم هەر لە ژێرزەمینەکەیانەوە تا هەورەبانەکەیان نیشان بدەن، ئەوا بە بڕوای من زۆرە و لە سنووری خۆی دەردەچێت.

– هەر کتومت وەک گرێ مێشکییە زیادەکان.

ڕێم نەدا قسەکانی سەرم لێ تێک بدات و لەسەر بابەتەکەم بەردەوام بووم:

– خۆ ئەگەر بۆ ماوەی چەند مانگێک لەگەڵیاندا بژیابامایە، ئەوا بەتەواوەتی

شتێکی تر دەبوو، چونکە بێگومان وەک خێزانێکی میهرەبان تەماشام دەکردن و وام دادەنا هێندە بهێنن کە بیانناسم. ئەگەر وا نەبووایە، ئەوا هەر لە سەرەتاوە سەرم نەدەکرد بەماڵەکەیاندا، هەرچەندە نەمدەزانی کە ئەو ماوە کەمەی کە پێکەوە هەمانە بۆ ئەوە بەکار دەهێنن کە بە دوورودرێژی باسی ژیانە خۆش و ڤێلا پڕاوپڕەکەیان بکەن کە هاوتای ژیانە قەشەنگەکەیانە و پێم بڵێن گەرمییان بە ژێر تەختەی عەرزەکەیاندا ڕاکێشاوە و حەمامێکی تازەبابەتی مۆدێرنیان تێدا داناوە بە هەموو جۆرە بڵقی ئاو و فەرتەنەیەکەوە، بەڵام من خۆشم دەبێت فریای فڕۆکەیەک بکەوم، بەرەو بەشی دووهەمی زەوی سەفەر دەکەم. پەرۆش و نیگەرانم، چونکە دەبێت پاش ماوەیەکی کەم هەستم و بڕۆم، هاکا تەکسییەکەم پەیدا بوو و ئیدی کە ڕۆیشتم قەت قەت ناگەڕێمەوە... بەڕاستی تا ئێستاش لە مەبەستم تێناگەیت و نازانیت دەمەوێت ئاماژە بە چی بکەم؟

- لایەنی کەم نەختە نەختە هێندە تێدەگەم کە تۆ زۆر زۆر تێدەگەیت.

- بەڵێ من زۆر تێدەگەم و هەر لە سەرەتاشەوە ئەوەم وت. من نزیکەی لە سەدا (٩٩)ی جینەکانم لەگەڵ مەیموونی شەمپانزیادا هاوبەشە، تەمەنیشمان تاڕادەیەک وەک یەکە، بەڵام پێم وا نییە بەهیچ جۆرێک بزانیت کە من لە چاو ئەودا چەندە زیاترێک تێدەگەم، هەروەها هاوکاتیش دەزانم کە دەبێت هەموو شتێک بەدوای خۆمدا جێبهێڵم. بۆ نموونە من زۆر بە تێروتەسەلی دەزانم کە ئەم گەردوونە چەندە گەورەیە، دەزانم بە چ شێوەیەک لە گەلەهەسارە و کۆمەڵە گەلەهەسارە و تەمی شێوە لوولپێچی گەردوونی و ئەستێرەی تاک و تەرا پێکهاتووە، دەشزانم ئەستێرەی پڕاوپڕ و ئەستێرەی گەورە و سووربووەوە و ئەستێرەی بچکۆلەی سپی و ئەستێرەی نیوترۆن و گەڕۆک و کشاویش بوونیان هەیە. هەموو شتێک دەربارەی خۆر و مانگ و گەشەکردنی ژیانی سەر زەوی دەزانم، دەربارەی فیرعەونەکان و دەسەڵاتە یەک بەدوای یەکەکانی چینیش، دەربارەی وڵاتانی دونیای و خەڵکەکانیان لە کاتی ئێستادا، ئەوە با هەر باسی هەموو ئەو زانیارییانەش نەکەین کە دەربارەی گوڵ و گیانەوەر و کەناڵ و دوورگە و ڕووبار و دۆڵەکان فێر بووم. من زۆر بەئاسانی دەتوانم ناوی سەدان شاری جیهانت بۆ بهێنم، هەروەها تاڕادەیەک ناوی هەموو وڵاتانی جیهان دەزانم و دەشزانم لە هەر دانەیەکیاندا نزیکەی چەند کەسی تێدا دەژی. زانیاریم لەسەر بنەمای مێژوویی کەلتوورە جیاوازەکان هەیە و دەربارەی ئایین و میتۆلۆژیایان شارەزام،

تارادەیەک مێژووی زمانەکانیش، بەتایبەتی زانستی نەژادی وشە و مێژووی داهێنانیان، وە دیسانەوە بەتایبەتیش لە گروپی زمانە هیندۆئەورووپییەکاندا، بەڵام هاوکات دەشتوانم بێ کێشە زنجیرەیەک لە دەربڕینی زمانە سامییەکان بڵێم و هەروەها چەند دەربڕینێکی یابانی و چینیش دەزانم، بەدەر لەوانەش ناوی چەندین شوێن و خەڵکیش دەزانم. هەر لەو بارەیەشەوە سەدان کەس بەتایبەتی دەناسم و تەنها لەو وڵاتە بچکۆلەیەی خۆمدا دەتوانم بەئاسانی ناوی هەزاران کەست پێ بڵێم کە تا ئێستاکە لە ژیاندان و شتێک دەربارەیان دەزانم، وە هەروەها وردەکاریی ژیانی زۆربەشیان دەزانم. نەک هەر تەنها کەسانی نەرویجیش، چونکە هێدی هێدی لە لادێیەکی جیهانی بچکۆلەدا ژیانمان بەسەر دەبەین و هێندەی نەماوە گۆڕەپانەکە سەرتاپای ئەم گەلەهەسارەیە بگرێتەوە. لەلایەکی تریشەوە چەندەها خەڵکی تر هەن کە بەڕاستی بەدڵمن، هەرچەندە وەک دەزانیت ئەو جۆرە سەرقاڵبوونەمان تەنها مرۆڤ ناگرێتەوە، بەڵکو شوێنیش دەگرێتەوە، هەر تەنها بیر لەو هەموو شوێنانەی جیهان بکەرەوە کە کون و کەلەبەریان شارەزام و ئەگەر بەردێک یان دەوەنێکیان لێ لابەرن، یەکسەر هەستی پێ دەکەم. ئینجا کتێبەکانیش دێنە ئاراوە، بەتایبەتیش ئەو کتێبانەی کە گەلێ شتیان لێوە فێر بووم لەبارەی ژینگەی شیاوی ژیان و بەشی خوارووی ئەتمۆسفیری زەوی و گەردوونەوە. هەروەها کتێبە ئەدەبییەکانیش، من زۆر خولیای ناسینی ژیانی مرۆڤە خەیاڵییەکانم و گرنگییەکی لە ئەندازە بەدەریان پێ دەبەخشم. بێگومان ناشتوانم بەبێ مۆسیقا بژیم، تارادەیەک حەزم لە هەموو جۆرە مۆسیقایەکە هەر لە فۆلکلۆر و مۆسیقای ڕێنیسانسەوە تا (شۆپنبێرگ) و (پێندێرێتیسکی)، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەبێت دان بەوەدا بنێم (ئەمەش پەیوەندییەکی بەو باسەوە هەیە کە دەمانەوێت شی بکەینەوە) دەبێت دان بەوەدا بنێم کە من بەتایبەتی خولیای مۆسیقای ڕۆمانسیم. دەبێت ئەوەشمان لەبیر نەچێت کە مۆسیقای ڕۆمانسی لە کارەکانی (باخ) و (گلۆک) و (ئەلبینۆنی)شدا هەیە، چونکە ئەو جۆرە مۆسیقایە هەمیشە بوونی هەبووە و هەر زوو کاتی خۆی (پلاتۆن) دژی ئەو جۆرە مۆسیقایە بوو، چونکە پێی وابوو خەمۆکی خۆی لە خۆیدا وڵات لاواز بکات. کاتێکیش دەگەینە (پوتشینی) و (گۆستاڤ مالێ) بەڕوونی دەبینین کە مۆسیقا ڕاستەوخۆ گوزارشت لەو شتە دەکات کە من دەمەوێت تێتی بگەێنم: گوزارشت لەوە دەکات کە ژیان زۆر زۆر کورتە و مرۆڤ بەجۆرێک ئافەریدە کراوە کە ناچارە بەدوای

خۆیدا ماڵئاوایی لە شتگەلێکی یەکجار زۆر بکات. ئەگەر گوێت لە پارچە مۆسیقای (ماڵئاوایی) گۆستاف مالێ بووبێت کە لە سەمفۆنیای (گۆرانیی زەوی)دایە، ئەوا بێگومان بەتەواوەتی لە مەبەستەکەم دەگەیت. ئومێدەوارم هێندە تێگەیشتبیت کە من باس لە خودی ماڵئاواییەکە دەکەم، باس لە خواحافیزبوون دەکەم، هەمووشی بەشێوەیەکی دراماتیکی کتومت لەو ئۆرگانەدا ڕوودەدات کە من سەرتاپای ئەو شتانەم تێدا پاراستووە کە ماڵئاواییان لێ دەکەم.

ڕۆیشتمە لای جانتاکەمەوە و کردمەوە، بتڵی جنەکەم دەرهێنا و دەمم پێوەنا. ئەوەی نەدەهێنا هیچ شتێک لەو بارەیەوە بگوترێ، چونکە قومێکی زۆر بچکۆلەم خواردەوە و هێندەشی نەمابوو بۆ نانی ئێوارە، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا وتی:

– هەر لە ئێستاوە دەست پێ دەکەیت؟

– دەست پێ دەکەم؟ وابزانم بەو شێوەیە تەنها لایەکی بابەتەکە دەبینیت. من بۆیە قومێک دەخۆمەوە، چونکە تینومە، واتە دەمەوێت تینوێتیم بشکێنم. تۆش باسی دەستپێکردنی شتێکم بۆ دەکەیت.

– تەنها مەبەستم لەوەیە کە ئەو خوی خواردنەوەیەت ڕەنگە لە خراپترین حاڵەتدا هێندەی تر ژیانە کورتەکەت کورتترێک بکاتەوە.

– پێی دەچێت، خۆشم لەو پارادۆکسە تێدەگەم، بەڵام من باسی ئەوە ناکەم کە بەتەمەن ببم، بەڵکو باسی ئەبەدییەت دەکەم و لەو بارەیەشەوە ساڵێک یان دوو ساڵ کەمتر یان زیاتر شتێکی بێ مانایە.

– خۆشبەختانە من بەخشراوم و نیگەرانی ئەبەدییەت نیم.

وتم:

– بەڵام من بەو شێوەیە نیم.

پارچە کاغەزەکەم هەڵگرت کە شتەکانم لەسەر نووسی بوو، بەپەلە لە کوخەکە دەرپەڕیمە دەرەوە و دەرگاکەم بەتوندی بەدوای خۆمدا داخست.

بەبێ هیچ گومان و دوودڵییەک ڕاستەوڕاست بەرەو بەرهەیوانەکەی ئانا و خۆسێ بەگوڕ هەنگاوم نا، بەڵام کە نزیک بوومەوە هەنگاوەکانم هێواش کردەوە تا وای نیشان بدەم بە ڕێکەوت بەلای بەرهەیوانەکەیاندا ڕۆیشتووم. کاغەزەکەشم قەد کرد و خنیمە گیرفانی دواوەم.

ئانا هاواری کرد و وتی:

– پەرداخێک شەرابی سپیمان لەگەڵدا ناخۆیتەوە؟

- بەڵێ، سوپاس.
ئانا چوو لە ژوورەوە کورسییەک و پەرداخێکی هێنا. پاش ئەوەی کە دانیشتین و شەراب تێکرا، من هەر تەماشای ناو دارگوێزە هیندییەکانم دەکرد، وام نیشاندان کە بەقووڵی لە شتێک ڕادەمێنم، لەو کاتەشدا لەبەرخۆمەوە دەستم کرد بە ورتەورت، هەروەک ئەوەی کۆمەڵە ڕستەیەکی کۆنی پەرت پەرت بۆ خۆم بخوێنمەوە، وتم:
- هەتاوەکو جۆکەر زیاترێک لە عەدەمی هەتاهەتایی نزیک ببێتەوە، وە لەگەڵ بەخەبەربوونەوەیدا بۆ هەموو ڕۆژێکی نوێ، ڕوونتر و ڕوونتر سیمای گیانەوەرێک لە ئاوێنەکەیدا دەبینێت. هیچ جۆرە دڵنەواییەک لە نیگای بێ ئومێدی گیانەوەرە شیردەرە غەمبارەکەدا نابینێت. ماسییەکی جادوولێکراو دەبینێت، بۆقێک دەبینێت کە شێوەکەی لە ساتێکەوە بۆ ساتێکی تر دەگۆڕێت، مارمێلکەیەکی شێواو و نوقسان بەدی دەکات. لە خەیاڵی خۆیدا دەڵێت: «ئەمە کۆتایی دونیایە. لێرەدا کتوپڕ کۆتایی بە سەفەری دوورودرێژی گەشەکردن دێت».
بێدەگییەکی سەیر باڵی بەسەر بەرهەیوانەکەدا کێشا، هێندە بێدەگ بوون کە ترساندمی. وابزانم چەند نیگایەکیان گرتە یەکتری، بەڵام ورتە لە دەمیان نەهاتە دەرەوە، تا دواتر ئانا پرسیاری دەربارەی شەرابەکە لێ کردم و ویستی بزانێت بەلامەوە خۆش بوو یان نا.
لەلای خۆمەوە چاوەڕوان بووم لەدوای قسەکەمەوە شتێک بڵێن و وەڵامێکم بدەنەوە، چونکە ئەو قسانەی کە کردمن تەنها یەک لێکدانەوەی هەڵدەگرت: دەرئەنجامێکی هەموو ئەو قسانەی خۆیان بوو کە لە یەک دوو ڕۆژی پێشتردا کردبوویان. کەچی ئاوها بۆ ماوەی چارەکەسەعاتێک دانیشتین و باسی دوورگەکانی فیجی و بابەتی جۆراوجۆری ترمان کرد.
بیرمە لەویادا خەیاڵێکی ترسناک مێشکمی داگرت، لە دڵی خۆمدا وتم: «بڵێیت هەموو ئەو قسانەی ئانا و خۆسێ کە بەرگوێی من کەوتبوون، بەشێوەیەکی تیۆری هاوشێوەی هەمان ئەو گفتوگۆ دوورودرێژەی نێوان خۆم و گۆردن نەبێت؟»
بەڵام ئەو کاتە سەرتاپای کێشەکە سەرەوژوور دەبووەوە: ئاخر نە ئانا و نە خۆسێش هیچ شتێکیان دەربارەی قسەکانم نەگوت کە باسی ماسییە جادوولێکراو و گیاندارە شیردەرە غەمگینەکەم تێدا هۆنیبووەوە، بۆ هیچیان لەو بارەیەوە نەگوت؟ لەناکاوێکدا دەورەکانمان بەتەواوەتی هەڵگەڕابووەوە.
یاخود بڵێیت هەستیان کردبێت کەسێک بەدزییەوە گوێی بۆ قسەکانیان شل

کردبێت؟ چونکە پێیان وانەبوو من هیچ شتێک لەو قسانەیان تێبگەم کە بەردەوام لێرە و لەوێ بۆ یەکتریان هەڵدەڕشت. یان خۆ لەوانەشە قسەی نێوان دوو عاشق کە بەڕووتی لەژێر تاڤگەیەکدا مەلە دەکەن، شتێکی وا نەبێت کە بکەوێتە بەرگوێی خەڵکانی تر، بەلایەنی کەمەوە ئەوەندە نەهێنێت کە وەڵامی بدرێتەوە. بەهەرحاڵ هیچ پێویستی نەدەکرد تووڕە ببم لەوەی کە چواردەورەکەم خۆیان دا بەدەستەوە و کەم تا زۆر بەشێوەیەکی شاعیرانە ئەو بابەتانەیان گۆڕی کە باسمان دەکردن.

ناچار بووم لەو بارەیەوە بەتەواوەتی دڵنیا بم. پاش ئەوەی سوپاسم کردن بۆ شەرابەکەیان، گوێزێکی هیندی لە یەکێک لە درەختەکانەوە کەوتە خوارەوە، لەویادا دیسانەوە بە دەنگی بەرز لەبەرخۆمەوە کەوتمەوە قسە، هێندە بەرز قسەم کرد کە هیچ گومانێکم نییە کە بەتەواوەتی گوێیان لێم بوو:

- جۆکەر فریشتەیەکە کە لە تەنگانەدایە. بەهۆی تێنەگەیشتنێکی کوشندەوە خۆی خزاندە ناو لەشێکەوە کە لە گۆشت و خوێن پێکهاتبوو. ویستی بۆ چەند ساتێکی کەمی گەردوونی بەشداری ژیانی گیانەوەرە شیردەرە باڵاکان بکات، بەڵام نەیزانی و بەدوای خۆیدا پەیژە ئاسمانییەکەی داگرت. ئەگەر کەسێک لە کاتی ئێستادا نەیگەڕێنێتەوە، ئەوا کاتژمێرە بایۆلۆجییەکەی خێراتر و خێراتر لێدەدات، بەو شێوەیەش درەنگ دادێت و دواتر ناتوانێت بگەڕێتەوە بۆ ناو مەملەکەتی ئاسمان.

دیسانەوە بێدەنگی و خامۆشییەکی تەواو ئەو ناوەی تەنییەوە، هەستم کرد بەشێوەیەک لە شێوەکان لە بەرهەیوانەکەدا هەست بە شەرم دەکەن. ڤیرپا، یەک وشە چییە نەیانوت، نەک هەر بە وشەش، بەڵکو تەنانەت هیچ جۆرە بەرپەرچێکیان بۆ قسەکانم نیشان نەدا، نە ڕاستەوخۆ و نە ناڕاستەوخۆش. لێرەدا دەبێت ئەوەشت پێ بڵێم کە لەدوای ئەو پاشنیوەڕۆیەوە ئیتر هەموو شتێک کۆتایی پێ هات. لەدوای ئەوەوە تەنانەت بۆ یەک کەڕەتیش کە منیان لەگەڵدا بووم، ئانا و خۆسێ لەو جۆرە باسانەیان بۆ یەکتر نەگێڕایەوە. ئەوە شتێک بوو مرد و تەواو بوو، لەو بارەیەوە هیچ گۆڕانکارییەک ڕووینەدایەوە، هەر ڕێک وەک ئەو فریشتەیەی لێ هات کە کلیلی ئەبەدییەتی ون کردبوو.

پێکەوە چووینە ناو دارگوێزە هیندییەکانەوە. دیسانەوە ئانا کامێراکەی لەگەڵ خۆیدا هێنا و دەستی کردەوە بە ڕەسمگرتن. لەوێشدا داوایان لێ کردم ڕەسمیان

بگرمەوە، هەر بۆ نموونە وێنەیەکم لەژێر ئەو دارەدا گرتن کە لافیتەکەی پێوە بوو و لێی نووسرابوو (وریابە، لێرەدا گوێزی هیندی دەکەوێتە خوارەوە).
بەدەر لەو فریشتە بێدەسەلاتانەی کە هاتوونەتە خوارەوە، شتێک دەربارەی شێوەی دەموچاو و کەوتنەخوارەوەی گوێزی هیندی، وایان لێ کردم بیر لەوە بکەمەوە کە چەندە بەئاسانی دەکرێت لەژێرەوە و لە ڕێگەی فۆتۆگرافەوە کاریگەری لە خەڵکی بکەیت، بۆ نموونە وێنەی ڕووتی دروستکراوی خەڵکانی بەناوبانگ بخەیتە سەر تۆڕی ئینتەرنێت، بەڵام من وێنەی دەموچاوی ئانام لەوەوپێش لە وێنەیەکدا نەدیبوو. بەتەواوەتی دڵنیا بووم لەوە، هێندە دڵنیا بووم کە ناچار بووم پرسیار لە خۆم بکەم و بڵێم: «چۆنە ئەوەندە دڵنیام لە شتێک کە ناتوانم بیرم بکەوێتەوە؟».

# کۆبوونەوەیەکی باڵا لە ناوچە گەرمەکاندا

بۆ نانخواردنی ئێوارە گەیشتینە چێشتخانەکە، بەڵام تەماشامان کرد هەموو مێزە بچکۆلەکانیان بەیەکەوە نوساندبوو و مێزێکی درێژیان لێ پێک هێنابوو. ئێوارەی پێشوو هەر ئەوەندەی میوانەکان لە نانخواردن بوونەوە، یەک و دوو تێکەڵاوی یەکتری بوون، لەبەرئەوە وای بۆ چووم کە کارمەندانی ئەوێ ویستبێتیان هاریکاریمان بکەن و هەر لە سەرەتاوە کۆمان بکەنەوە. دواترێک بۆم دەرکەوت ئەوە لەسەر پێشنیارێکی میستەر سپۆک بووە کە بەو شێوە نائاساییە مێزەکان برازێننەوە، چونکە هەروەک یۆکین کیس وتی: «ئێمە دەمانەوێت (ماراڤیو پلانتەیشن ڕیسۆرت) پەناگەیەک بێت بۆ فەردانییەت».

من زوو گەیشتبووم و لەگەڵ جۆندا فریای خواردنەوەی بیرەیەک کەوتین لە بارەکەدا. باسی گیانەوەرە خشۆکەکانی بەشی خوارووی ئۆقیانووسی ئاراممان کرد، بەتایبەتیش مارمێلکەی ماڵان، چونکە ژوورەکەی جۆنیش کۆمەڵێک مارمێلکەی تیا بوو بوو. هیچ شتێکم دەربارەی بتڵی جنەکە باس نەکرد، ویستم ئەوەیان وەک نهێنییەک لەنێوان خۆم و خاوەنی ئوتێلەکەدا بمێنێتەوە. باشترە دان بەوەشدا بنێم کە کەمێک باسی ئۆسلۆم بۆ کرد و بێگومان کەمێکیش باسی هەردووکمانم بۆ گێڕایەوە و وتم منداڵێکمان لە ڕووداوی هاتوچۆدا لەدەست داوە.

هەر سەرلەبەیانی ئەو ڕۆژە تەلەفۆنم بۆ (سالامانکا) کرد تا دڵنیا بم کە ناوی منیش لەنێوان بەشداربووانداییە. ئەوەشم بۆ جۆن گێڕایەوە، نەمتوانی باسی ئەوەی بۆ نەکەم کە لەو تەلەفۆنەدا پێیان وتم ناوی تۆش لەنێوان لیستی بەشداربووانداییە، بەڵام نەمزانی کە تۆش بەئاگایت لەوەی کە من دێم بۆ ئەوێ یان لەو لایەنەوە بێئاگایت. جۆنیش لەلای خۆیەوە باسی ئەوەی بۆ گێڕامەوە کە چەند ساڵێک لەمەوبەر هاوسەرەکەی لەدەست داوە، نەخۆش بووە و ماوەیەکی زۆر لە جێگادا کەوتووە. ناوی شیلا بووە و هێندە تێگەیشتم کە زۆر بەقووڵی خۆشی ویستووە. پێکەوە گەیشتینە ئەو دەرئەنجامەی کە ژیان شتێکی ئاسان نییە. جۆن ساڵانێک

بوو لە دونیای نووسین دابڕابوو، وا تازە خەریک بوو تێبینییەکانی کۆدەکردەوە تا ڕۆمانێکی نوێ بنووسێت. لەو بارەیەشەوە بەشێوەیەکی گشتی چەند وشەیەکمان دەربارەی هونەر و کەلتوور بەیەک وت، نهێنییەکیشم بۆ درکاند و وتم لەڕادەبەر سەرسامی ڕەسامە ئیسپانییەکانم، بەتایبەتیش ئەو کارە مەزنانەی کە لە مۆزەخانەی (پرادۆ)دا کۆکراونەتەوە. هەر لەدوای ئەو باسەمەوە یەکسەر چاوی داپچڕی، وەک ئەوەی بەڕاستی ئەوە شتێک بووبێت کە لە خەیاڵیدا بووبێت.
لە کاتی قسەکردنماندا میوانەکان هێدی هێدی پەیدا بوون. لەسەر مێزی نانخواردنەکە دانیشتم، لاورا لەلای ڕاستمەوە بوو و ئێڤیلینیش لەلای چەپمەوە دانیشت. مارک، هەرچەندە تەمەنێکی کەمی هەبوو، بەڵام وەک پارێزەرێک تازە خوێندنی تەواو کردبوو، ئەو لەلای چەپی ئێڤیلینەوە دانیشت، لەلای چەپی مارکیشەوە، لە سەری ئەوسەری مێزەکەوە، بیڵ دانیشت. جۆن ڕێک لە بەرامبەرمدا دانیشت، ماریۆش لەلای چەپی ئەوەوە دانیشت، واتە ڕێک بەرامبەر لاورا. لەلای ڕاستی جۆنیشەوە، ئانا دانیشت و خۆسێش لەلای ڕاستی ئاناوە دانیشت.
هەوڵ دەدەم باسی شتە هەرە گرنگەکانی ئەو ئێوارەیەت بۆ بگێڕمەوە، لەبەرئەوە ڕاستەوخۆ دەچمە ناو بابەتەکەوە. هەر پاش نانخواردن و پێش ئەوەی شیرینی بهێنن، جۆن زرنگەیەکی لە پەرداخەکەی هەستان و بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ یەک دوو تێبینی دەربارەی ئەو شوێنە وت کە تێیدا بووین، باسی جۆرە ئیلهامێکی تایبەتی فیکریی کرد کە زۆرجار لەگەڵ شەوانی ناوچە گەرمەکاندا دەوروژێنرێن، ئێ مرۆڤیش گیانەوەرێکی سەر بە ناوچە گەرمەکانە. هەروەها بەتایبەتی خۆشحاڵی خۆی دەربڕی کە بواری بۆ ڕەخساوە و یەکەیەکە چاوی پێمان کەوتووە، ئیتر چ لە ڕێگای دوورودرێژی ئەوروپاوە هاتبین یان لە ئەمریکا و ئوسترالیاوە، بەلایەوە هیچ ڕۆڵێکی نەبوو. خانەخوێکەشمان لە ماراڤیو، خانم (ئەنجێلا کیس)، لەلای خۆیەوە وتی (لە ماوەی چەندین مانگی پێشوودا، ئەمە یەکەمین جارە تەواوی میوانەکانمان دوو ئێوارە لەسەر یەک لەم چێشتخانەیەدا پێکەوە دابنیشن، چونکە هەمیشە یان میوانێکمان ڕۆیشتووە یان میوانێکی نوێ گەیشتۆتە لامان). بەدەر لەوانەش بە بڕوای جۆن شتێکی هاوبەش لەنێوان هەموو ئەو کەسانەدا هەبوو کە لەسەر ئەو مێزە دانیشتبوون، هەرچەندە هەمووشمان جیاواز بووین، لە ڕاستیدا هەر ئەو خاڵەش بوو کە هانیدابوو جۆرە ئێوارەیەکی ئاوها ڕێک بخات. بەڵێ شتێکی هاوبەش، ئەگەر بە زمانی ماتماتیکی دەربیبڕیایە، دەکرا بڵێت ژمارەیەکی لێکدراوی

هاوبەشی سادە لەنێوانماندا هەبوو. بەکورتی: جۆن لەو ماوە کەمەدا توانیبووی یەکە یەکەمان بە تەنها ببینێت و باسێکی کورتی لەگەڵ هەر یەکێکماندا کردبوو، لێرەوە هێندە تێگەیشتبوو کە هەموومان، هەڵبەتە هەریەکەمان بەپێی شێوازی خۆی، بەتایبەتی شتێکمان بەلاوە گرنگ بووە کە ئەو ناوی نابوو (کۆسپ و کێشەی مرۆڤی مۆدێرن). ئەو هەر ئێوارەی پێشوو تێبینیی ئەوەی کردبوو، هەرچەندە گفتوگۆکانمان پەرشوبڵاوترێک بوون وەک لەوەی ئەو ئومێدی بووبوو، بەڵام دەیویست ئەو ئێوارەیە وانەبێت. ڕاستە بەشێوەیەکی ناڕەسمی کۆبووبووینەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پێی خۆش بوو کەسێک کۆڕەکە بەڕێوە بەرێت. دواتر ناوی هەریەکەمانی هێنا و بەجۆرە سەختییەکەوە ویستی بەو شێوەیە گوزارشت لە کۆبوونەوەکەمان بکات وەک ئەوەی لەژێر ئەستێرەکانی ئاسماندا بەشێوەیەک لە شێوەکان نموونەیەکی گشتیی مرۆڤایەتی بین.

بەو شێوەیە جۆن بەرنامەی دانیشتنەکەمانی بە ناوی (کۆبوونەوەیەکی باڵا لە ناوچە گەرمەکاندا) پێناسە کرد، دیاربوو ماوەیەک بوو لە ژێرەوە بە نهێنی بیری لێ کردبووەوە. وتی:

- کاتێک خەڵکی کۆدەبنەوە، ئیتر چ لە کۆنفرانسێکی پیشەییدا بێت یان لەسەر دوورگەیەکی دەریای ئەم خوارانە بێت، وەک یاسا و ڕێسایەکی باو هەریەکەیان ناوی خۆی و شوێنی نیشتەجێبوونی خۆی بەوانی تر دەڵێت، هەروەها خۆشتریشە گەر لەوە زیاتر بدرکێنن و شتێکیش دەربارەی خۆیان بڵێن، بەتایبەتیش ئەگەر یەکتر ناسینەکەیان چەند ڕۆژێکی پێ بچێت. بۆ نموونە ڕەنگە شتێک دەربارەی ژیانی تایبەتی خۆیان بگێڕنەوە، یاخود کەمێک دەربارەی پیشەی خۆیان و ئەو شار و وڵاتەی کە لێوەی هاتوون بە یەکتر بڵێن. بەو شێوەیە پێدەچێت هەر بە ڕێکەوت جۆرە ئاشناییەکی هاوبەشیان لەگەڵ یەکدا بۆ دەرکەوێت، یاخود ڕەنگە چەند بابەتێکیان بۆ دەرکەوێت کە هەردوولا گرنگی پێ دەدەن، خۆ لەوانەشە دەرکەوێت کە شێوەی ژیانیان زۆر لە یەکەوە نزیک بێت، بۆ نموونە ڕەنگە هەردوولا هاوسەرێکیان هەبێت کە زۆر غیرە بکات، یان جۆرە کەمئەندامییەکی تایبەتییان هەبێت، یان لە شتێکی ناوازە بترسن، یاخود لەوانەشە هەردووکیان لە ماوەی کەمی پێشوودا یەکێک لە دایک و باوکیان لەدەست دابێت.

تەماشایەکی چواردەورەکەم کرد، زۆربەیان هەر لە نیشانەیەکی پرسیاری زیندوو دەچوون. لاورا، بلوسێکی ڕەشی بێ قۆڵ و پانتۆڵێکی کاوبۆی لەبەردا بوو کە

خوارەکەی کرابۆوە و ڕیشاڵ ڕیشاڵ بوو، دەستێکی خستە سەر شانم و بە چرپەیەک وتی:

– ئەمەیە قەشمەری ڕاستەقینە.

جۆن دەستی بە قسەکانی کردەوە و وتی:

– باشە! یەکێک لەو شتانەی کە تاڕادەیەک لەم جۆرە خۆناسینانەدا پێویستە ئەوەیە کە هەر کەسەو باسی باشترین لایەنی خۆی دەکات، ئیتر ڕەنگە ئەوە شتێک بێت کە پەیوەندی بە ڕەگەزییەوە هەبێت، یان بە پلەوپایەی کۆمەڵایەتی و ئاستی دەوڵەمەندی و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانیەوە هەبێت، یاخود توانایەکی زۆر تایبەتی خۆی باس دەکات. هونەرەکە تەنها لەوەدا نییە کە لایەنە هەرە باشەکان بخرێنە ڕوو، بەڵکو لەوەدایە کە تا بکرێت بەشێوەیەکی ڕێکەوت و ئاسایی و بێ مەبەست باس بکرێن. مرۆڤ هەر ئەوەندە نییە کە گیانەوەرێکی کۆمەڵایەتی بێت و تێکەڵبوونی پێ خۆش بێت، بەڵکو بەر لە هەموو شتێک گیانەوەرێکە کە دەیەوێت زۆر خۆی دەربخات، مەبەستم لەوەیە کە لە چاو هەموو گیانەوەرە بڕبڕەدارەکانی تردا زیاترێک حەز بە خۆدەرخستن دەکات. ئێمە دەڵێین: «سەیرکە، بزانە چەندە بەتوانا و زیرەکم. دەبێت ئەوەندە بزانیت کە من هەروا کەسێکی ئاسایی نیم. من دوو کوڕی گەورەم هەیە و هەردووکیان لە دانیشگان، کچێکی هەرزەکاریشم هەیە و دەیەوێت ببێتە ئەکتەر یان وێنەکێش. بەڕاست؟ بەڵێ، لەم دوادواییەدا کچەکەمان شوی بە کوڕی سەرۆکی شارەوانی (لیڤەرپۆڵ) کرد، شێت و شەیدای کچەکەمانە. بەدەرلەوانەش باری ماددییم زۆر باشە. بەڵێ، ناوەکەشمان هەر ئەو ناوەیە کە لەسەر کۆمپانیای پۆلاکەمانە، پێم خۆشە بزانن ئەو ناوەمان لە باپیرەمانەوە بۆ ماوەتەوە. بێگومان (دریدا)م خوێندۆتەوە، لەسەر مێزی تەنیشت جێگای خەوەکەمەوە کتێبێکی (باودریلارد)م داناوە. بێگومان هەروەها هونەریش، تابلۆیەکی (مۆنێت) لە ژووری خەوەکەماندایە و دانەیەکی (میرۆ)ش لە ژووری دانیشتنەکەمان هەڵواسراوە. بەڕاست، ماوەیەک لەمەوبەر ئاوێنەیەکی (بارۆک)یمان لەسەر ئاگردانەکە هەڵواسی....»

لەویادا بێدەنگ بوو، بەڵام پاش کەمێک وتی:

– ئێ! باشە!

کەڕەتێکی تریش سەیرێکی ئەملاولای خۆمم کردەوە، بینیم زۆربەی ئەوانی تریش وەک من تەماشای چواردەوریان دەکەن، لەو کاتەدا هیچ کەسێکمان نەماندەزانی

مەبەستی سەرەکی چییە. بەلایەنی کەمەوە من ئەو هەستەم هەبوو، بەڵام دواتر لە خەیاڵمدا گومانم کرد و وتم: «بڵێیت ئا ئەمە بەشێوەیەک لە شێوەکان دەستی کەسێکی تریشی تێدا نەبێت؟».
بیڵ وەک پێشنیارێک وتی:
- زۆر گەرمە، دەڵێن چی ئەگەر یەک دوو بتڵ شەرابی سپی بانگ بکەین؟ یان شڵپە لە بتڵێک شەمپانیا هەڵسێنم؟
بەڵام جۆن لەسەر قسەکانی بەردەوام بوو:
- بەدەر لە هەموو ئەو شتانە، بەدەر لەو ماکسییە درێژانە و ئاهەنگی خواردنانە و ئەو هەموو سووراوو سپیاوو دەرزی ڕازاوەی سەر بۆینباخەکان و حیسابی بانک و ئاوێنەی (بارۆک)ی، بەکورتی مەبەستم لەو هەموو شتانەیە کە لە کاتی کۆبوونەوە کۆمەڵایەتییەکاندا خۆمانی پێ دەڕازێنینەوە، بەدەر لە هەموو ئەوانەش، ڕەنگە دوو ساڵێک یان دە ساڵێک یان لە باشترین حاڵەتدا چەند دە ساڵێکمان مابێتەوە تا لەسەر ئەم زەوییەدا بەسەری بەرین. لەم ڕوانگەیەشەوە، کۆمەڵێک ئەندێشە و ڕەهەندی وجودی هەیە کە هەمووومان دەگرێتەوە، هەرچەندە زۆر دەگمەن باسی ئەو شتانە دەکەین. لەبەرئەوە من پێشنیار دەکەم ئەم ئێوارەیە دەستبەرداری شتە کاتی و بچکۆلەکانی ژیانمان بین و لەبری ئەوانە سەرنج بخەینە سەر شتێک کە هەموومان دەگرێتەوە و کاریگەری لەسەر هەموومان هەیە.
لەویادا وتم:
- بۆ نموونە گەردوون.
هەر لە خۆیەوە ئەو وشانە لە دەممەوە هاتنە دەرەوە، وابزانم لەبەر ئەوە بوو کە لەویادا شتێکم بیر کەوتەوە کە شەوی پێشووتر لەگەڵ گۆردندا باسم کرد.
من هەر لەبەرخۆمەوە ئەو قسەیەم کرد، کەچی جۆن پرسی:
- ئەو کاکەیە وتی چی؟
- بۆ نموونە گەردوون.
- زۆر نایابە، هەر زۆر بەجێیە. کەواتە پێشنیارێکمان بۆ هات کە ئەم ئێوارەیە هەوڵ بدەین سەرنجمان بخەینە سەر گەردوون. لەبەرئەوە با سیاسەتی حیزبیمان لەگەڵ (لیندا تریپ) و (مۆنیکا لویسکی)دا بخەینە ئەولاوە، هەرچەندە من خۆم تا ئێستا بەتەواوەتی لەوە نەگەیشتووم کە ئابڕووچوونێکی ئاوها گەورە بە چ شێوەیەک لە بنەڕەتەوە لە شتێکی ئیرۆسی وەک سیگارێکی (هاڤانا)وە سەرهەڵدەدات، بەهەرحاڵ

با واز لەوە بهێنین، زۆرمان لەو بارەیەوە بیست. ئێ خۆ ئێمە تەنها بەرهەمێک لە بەرهەمەکانی لایەنی کۆمەڵایەتی مرۆیی نین، ئەمە هەمووومان دەگرێتەوە. بەڵکو لەهەمانکاتدا هەمووومان لەژێر نهێنییەکی قووڵی ئاسماندایین کە پڕە لە ئەستێرە و گەلەهەسارە، وە تەنانەت لە مانگە دەستکردەکانی خۆشمانەوە ناتوانین جیاوازیی نێوان سیگارێکی کوبای قەدەغەکراو و سیگارێکی بەڕازیلی ئاساییدا ببینین.

هەستم کرد لەژێرەوە جەوێکی نائارام باڵی بەسەر مێزەکەدا ڕاکێشاوە. هاوکات ئانا و خۆسێ بەتەواوەتی چووبوونە ناو بابەتەکەوە، هەڵبەتە ئەگەر هەر لە بنەڕەتەوە خۆیان ئەندامی ڕێکخەری ئەو کۆبوونەوەیە نەبووبن. پێم وابێت هەر لەو کاتەشدا لاورا زیاترێک سەرنجی بۆ بابەتەکە ڕاکێشا، هەرچەندە یەک دوو خولەک لەوەوبەر ناوی (قەشمەر)ی لە جۆن نا. لەلایەکی تریشەوە پێم وابوو مارک و ماریۆ بەناچاری لە کۆبوونەوەکەدا دانیشتبوون، ئێڤیلینیش، کە زانستی دەرمانسازی لە (سیاتڵ) تەواو کردبوو، بەڕاشکاوی وتی:

– من هیچ شتێک دەربارەی ئەستێرەناسی نازانم، لەبەرئەوە باشترە خۆم بکێشمەوە. لەوەدەچوو (بیڵ)یش هەر زۆر بێباک بێت، چونکە هەر لەو کاتەدا کە جۆن قسەکانی دەکرد، ئامارەی بۆ ئەو پیاوە کرد کە گوڵێکی لە پشت گوێی چەپیدا دانابوو و داوای مەشروبی کرد. منیش خۆم دابووە دەست دانیشتنەکە و ماراڤیو پلانتەیشن ڕیسۆرت، بەڵام نەک تەنها وەک پەناگەیەک بۆ فەردانییەت، بەڵکو وەک شوێنێکیش بۆ وروژاندنی پرسیارە گەورەکان.

جۆن ویستی دانیشتنەکەمان گەرم بکات و پرسی: «کێ لە ئێوە بڕوای بە هەبوونی ژیان هەیە لەسەر ئەستێرەکانی تری گەردوون؟» ئێڤیلین هیچ وەڵامێکی نەدایەوە، وەڵامەکانی تریش نیواونیو بوو و بەو شێوەیە بەسەر دوو گرووپی وەک یەکدا دابەش بووین، لەویادا بۆ یەکەمین جار جۆن کورتەیەکی دانیشتنەکەمانی خستە ڕوو و وتی:

– سەرسوڕهێنەرە! بەشێوەیەکی گشتی دەبێت بڵێم سەرسامی شێوازی حوکمدانی ئەم کۆبوونەوەیەم. من پرسیارێکی لە ئەندازەبەدەر بنەڕەتیم دەربارەی سروشتی گەردوون کرد و هەر پاش چەند خولەکێکی کەم چوار وەڵامی ڕاستم بەدەست گەشت، بێگومان چوار وەڵامیشیان بەتەواوەتی هەڵەن.

ماریۆ وەڵامی قسەکانی دایەوە و وتی:

– کەواتە ئەنجامەکان لەلای تۆیە، وایە؟

بەڕێوەبەری کۆڕەکە قسەکەی ئەوی پشتگوێ خست و درێژەی بە قسەکانی خۆی دا:

– مەبەستم لەوەیە یان ژیان لە گەردووندا هەیە یان نییە. (tertium non datur!) واتە بواری سێهەم بوونی نییە! بێگومان هەر تەنها بە وێناکردنی ئەوەی ژیان لەوسەرەوە جمەی دێت، ڕەنگە کەمێک سەرمان گێژ بخوات. هاوکات پێشی دەچێت ژیان شتێک بێت کە تەنها لەسەر ئەم ئەستێرە گەڕۆکەی خۆمان بوونی هەبێت، بەڵام ئەم جۆرە هەڵسەنگاندنەشمان بابەتەکەمان بۆ ئاسان ناکات، چونکە بەڕاستی ئەو شێوە بیرکردنەوەیەش پێی دەچێت بمانهەژێنێت و نائارامامان بکات. کەواتە چوار کەس لێرەدا وەڵامی ڕاست و پڕاوپڕی ئەو پرسیارەی داوەتەوە. بەجۆرێکی تر بیڵێم، کەواتە وەڵامدانەوەی پرسیارە گەورەکان مەرج نییە هێندە ئاڵۆز و دژوار بێت.

ماریۆ بەدەم بۆڵەبۆڵێکەوە وتی:

– بەڵام تۆ پێت نەگوتین کاممان وەڵامی ڕاستمان داوەتەوە.

جۆن زیاترێکی ڕوون کردەوە و وتی:

– ئەوە هیچ ڕۆڵێکی نییە. ئەو شتەی کە بەلای منەوە زۆر گرنگترە ئەوەیە کە چوار کەس لەسەر ئەم مێزە دانیشتوون و وەڵامی پڕاوپڕی ئەو پرسیارەیان دایەوە کە دەڵێت: «ئایا ژیانی تر لە گەردووندا بوونی هەیە یان نا؟».

لەویادا بوو کە لە خۆمەوە شتێکی قۆڕ و بێ مانام دەرپەڕاند و وتم:

– بێگومان ژیانی تر لە گەردووندا هەیە. ڕەنگە سەدان ملیارد گەلەهەسارە لە گەردووندا هەبن و لە هەر گەلەهەسارەیەکیشدا سەدان ملیارد ئەستێرە هەیە. خۆ ئەگەر تەنها بین، ئەوا شوێنێکی یەکجار مەزن بەهەدەر چووە.

خۆسێ وەڵامی قسەکەی دامەوە و وتی:

– قسەکەت سەرنجڕاکێشە.

– بەڵێ؟

– دوێنێ ئێوارە هەر ئەوەندەی مابوو سوێند بخۆیت و دەتوت پرۆسە سروشتییەکان هیچ ئامانجێکیان نییە.

بەدڵنیاییەوە وتم:

– ئێستاش هەر لەو بڕوایەدام.

قسەکەمی ڕەت کردەوە و وتی:

- ئەمرۆکەش دەڵێیت ئەگەر تەنها بین، ئەوا شوێنێکی یەکجار مەزن بەهەدەر چووە..
سەرم بۆ لەقاند، تا ئەو کاتەش نەمزانی چەندە کەلەپووت بووم، بەڵام ئیدی کەوتمە داوەکەوە و بەڕاستی گرتمی:
- کەواتە ڕەنگە بتوانیت پێمان بڵێیت ئەو کەسە کێیە کە شوێن بەهەدەر دەدات یان شوێن بەهەدەر نادات؟
هەر ئەوەندەم بۆ مایەوە کە خۆم بدەم بەدەستەوە و دان بەوەدا بنێم کە لەنێو قسە دژبەیەکەکانی خۆمدا گرتمی. هاوکاتیش بۆم دەرکەوت ئەو کەسانەی کە یەکەم جار دەستەواژەی (بەهەدەردانی شوێن)یان وەک بەڵگەیەک بەکارهێنا تا بڵێن ژیان لە گەردووندا جمەی دێت، زۆرجار هەر ئەوانە بوون کە بە هەموو شێوەیەک نکوڵیان لە بوونی ئامانجێکی قووڵتر دەکرد کە لە پشت پرۆسە سروشتییەکانەوەیە، بەڵام ئەگەر سەرهەڵدانی ژیانی سەر زەوی تەنهاو تەنها لە ڕێگەی ڕێکەوتێکی شێتانەوە بووبێت، ئەوا ئەو کاتە ڕێکەوتێکی شێتانەتر و ناهەقانیترە گەر بڕوا بە بوونی پرێنسیپێکی گەردوونی بکەین.
جۆن بەردەوام لە ڕێگەی وروژاندنی هەندێک پرسیارەوە تیشکی زیاتری دەخستە سەر بابەتە گەردوونییەکان، هەمیشەش پرسیارەکانی دەیکردین بە دوو بەشەوە. بۆ نموونە پرسیاری دەربارەی وزەی گەردوونی کرد و وتی: «لەو بڕوایەدان وزەی گەردوونی هەمیشە هەر بوونی هەبووبێت؟ ئەگەر نا، ئایا ئەو وزەیە خۆی لە خۆیەوە سەری هەڵداوە یان بەهۆی هێزێکی خوڵقێنەری ناوەکی یان دەرەکییەوە دروست بووە؟» هەروەها پرسیارێکی تری دەربارەی گەردوون کرد و وتی: «ئایا ئەم گەردوونە بەردەوام دەبێت لەسەر بڵاوبوونەوەی خۆی، یاخود ماددەکانی سەرلەنوێ هێدی هێدی بەرەویەک دەچنەوە و بەو شێوەیەش بێ سنوور کۆمەڵێک تەقینەوەی مەزنی یەک بەدوای یەکدا ڕوودەدەنەوە و دەبنە هۆی سەرهەڵدانی کۆمەڵێک گەردوونی نوێ؟» پاشانیش: «ئایا جۆرە ئاگاییەکی سەروسروشتی[٥٣] بوونی هەیە یان تەنها ئەم گەردوونە فیزیاوییە بوونی هەیە و تەواو؟ بەدەر لەوانەش چەند پرسیارێکی تریشی وروژاند و وتی: «پێتان وایە مرۆڤ ڕۆحێکی هەبێت کە بەشێوەیەک لە شێوەکان لەدوای مردنی مێشکەوە بمێنێتەوە، یاخود لەو بڕوایەدان هەموو شتێکی سروشت کاتی بێت؟ ئایا هیچ جۆرە دیاردەیەک هەیە کە لەسەروو هەستەکانەوە بێت؟ یان سەرتاپای ئەو دیاردانەی کە پێیان دەگوترێت (دیاردەی سەرروو هەستیی)

کتومت شتێکی هەڵبەستراو و خەیاڵین و تایبەتن بە پاشماوەی جۆرە وێناکردنێکی ئەفسانەیی مرۆڤی مۆدێرن، یان پاشماوەی جۆرە مەزەندەکردنێکە کە دەڵێت هیچ شتێک لە سروشتدا بەبێ ڕۆح بوونی نییە؟» جۆن زۆر بەوردی و بەردەوام سەرنجی گروپەکەی دەدا، چونکە بۆچوونەکانمان هەمیشە دەیکردین بە دوو کەرتەوە. هیچ پرسیارێکی نەکرد کە هەموومان کۆک بین لەسەر وەڵامەکەی، لەبەرئەوە تا ئەوپەڕی توانای هەوڵی دەدا بە جوانترین شێوە ئەو ڕاستییەمان بیر بخاتەوە کە هەندێکمان وەڵامی ڕاستیی پرسیارەکانمان داوەتەوە.

جۆن سپۆک فیشکەیەکی کرد و بە تۆنێکی ئینگلیزیی ئۆکسفۆردی زرینگەدار وتی: «یان ئەمیان یان ئەویان!»، دواتریش هاوکێشە ئەنترۆلۆجییەکەی کە دوو نەزانراوی تێدا بوو، بەم ڕستە لاتینییە کۆتایی پێ هێنا: (tertium non datur!)، واتە بواری سێهەم بوونی نییە.

ئەو پیاوەی کە گوڵێکی لە پشت گوێچکەی چەپییەوە دانابوو، دوو بتڵ شەمپانیای لەسەر مێزەکە دانا کە بیڵ بانگی کردبوو، لەوێشەوە گفتوگۆی سەر مێزەکەمان بەتەواوەتی بەرەو ئاراستەیەکی نوێ وەرچەرخا. جۆن داوای لێ کردین کە هەریەکەمان کەمێک دەربارەی شێوەی تێڕوانینمان بۆ ژیان بخەینە ڕوو. لەمەیاندا هەموومان بەشداریمان کرد، تەنانەت ئێڤیلینیش خۆیدا بەدەستەوە.

خۆسێ یەکەم کەس بوو کە دەستی پێ کرد، هەلەکەی قۆستەوە تا پشتگیری لە جۆرە تێڕوانینێک بکات کە من بەبێ هیچ گومانێک ناوی دەنێم (ئەو دونیابینییەی کە مرۆڤ لە چەقدا دادەنێت). ئەو زۆر بە ساکاری پێی وابوو مرۆڤ خەلق نەدەبوو ئەگەر ئەم گەردوونە زۆر بچکۆلەتر بووایە وەک لەوەی کە ئێستاکە هەیە، یان ئەگەر بنچینەی سیستەمەکەی بەشێوەیەکی جیاوازتر بووایە. بەردەوام ئەو دەرئەنجامانەی کە دەریدەخستن زۆر قووڵترێک بوون لەو بەڵگانەی کە بەکاری دەهێنان، بەڵام هاوکات وتیشی: «خۆ ڕەنگە مێشکی مرۆڤ هەرە ئاڵۆزترین ماددەی گەردوون بێت و تێگەیشتن لێی، بە مانا قووڵەکەی، زۆر سەختترێکە لەچاو تێگەیشتن لە ئەستێرەی نیوترۆنی و کونە ڕەشەکانی گەردوون».

هەروەها وتی: «مێشک لە ئەتۆم پێکهاتووە، لەو ئەتۆمانەی کە ماوەیەکی یەکجار زۆر لەمەوبەر لە ئەستێرە گڕگرتووەکاندا کوڵاون، وە ئەگەر ئەم گەردوونە هێندەی ئێستاکەی گەورە نەبووایە، ئەوا ئەو کاتە نەیدەتوانی ئەستێرە و ئەستێرەی گەڕۆک بخوڵقێنێت، بەو شێوەیەش تەنانەت یەک ئۆرگانیزمی زۆر بچووکیش سەری

هەڵنەدەدا. بۆ نموونە تەنانەت ئەستێرەیەکی گەڕۆکی (ناژین)ی وەک (جوپیتەر) بەتەواوەتی پێویست بووە بۆ ئەوەی کە ئێمە ئەمڕۆکە لێرەدا دانیشین و بەشێوەیەکی ئەقڵانی لەگەڵ یەکتریدا قسە بکەین. ئەگەر ئەو بازنە هەرە مەزنەی هێزی ڕاکێشانی ئەو ئەستێرە گەڕۆکە گەورەیە نەبووایە، ئەوا ئێستاکەش زەوی هەر لەبەر شاڵاوی ئەستێرەی کشاو و بەرد و تەنە ئاسمانییەکاندا دەبوو، بەڵام (جوپیتەر) وەک گسکێکی کارەبایی هێزە تێکدەرەکانی هەڵمژیوە کە ئەمەش بۆتە هۆی ئەوەی ئەستێرەی گەڕۆکی (تیلوس[٤٥]) ژینگەیەکی شیاوی ژیان پێک بهێنێت و لە دواجاریشدا ئاگایی مرۆڤ». باسەکەی بەشێوەیەک هەڵڕشت کە یەکسەر سەرۆک هۆزەکانی پێشووی کۆمەڵگای فیجیم بیرکەوتەوە کە کاتی خۆی پیاوێکیان ڕاگرتووە تا مێشوولەیان لێ دەربکات: ئەگەر زەوی سەرۆک هۆزەکە بوو بێت و ئەستێرە کشاوەکانیش لێشاوی مێشوولەکان بووبن، ئەو کاتە جوپیتەر ڕۆڵی (پیاوی مێشوولە)ی بینیوە. بەو شێوەیەش بێگومان لەگەڵ تێپەڕبوونی ساڵەکاندا چەندەها و چەندەها مێشوولەی گەورە پێوەی داوە و بەپێی خۆسێ تەنها یەک دانەیان بەس بووە بۆ ئەوەی نزیکەی سەرتاپای ژیانی سەر زەوی بسڕێتەوە.

بە دەنگی بەرز وتی:

– نموونەی ئەستێرەیەکی زیندووم بۆ بهێنەرەوە! خۆ ڕەنگە زەوی تەنها دانە بێت، هەڵبەتە ئەگەر هێزێک نەبێت کە بڕیاری دابێت شوێن بەهەدەر نەدات، بەڵام لەلایەکی تریشەوە دەشێت ماددەی گەردوون پڕاوپڕ هێندە بێت کە بتوانێت جۆرە ئاگاییەک خەلق بکات تا تیۆرییەکی ئاوهای وەک ئەمە بخاتە ڕوو. بەدەرلەوەش ئافەریدەکردنی شتێکی هێندە ئاڵۆزی وەک مێشکی مرۆڤ کاتێکی زۆری پێویستە، بەلایەنی کەمەوە شتێکی وا لە ماوەی حەوت ڕۆژدا ئەنجام نەدراوە. ئێ خۆ پانزە ملیارد ساڵ بەسەر تەقینەوە گەورەکەدا تێپەڕی و ئینجا هاڕەکەی بەرگوێ کەوت.

بیڵ پێی وابوو زانست لە داهاتوودا بتوانێت هەموو نهێنییەکانی گەردوون و ماددە دەربخات و ئەو بابەتە بەلای ئەوەوە شتێک بوو کە تەنها پەیوەندی بە کاتەوە هەبوو و هیچی تر. مارک ئاماژەی بۆ ئەوە کرد کە لە داهاتوودا لێکۆڵینەوە هەرە بنچینەییەکان لەلایەن کۆمپانیا نێونەتەوەییەکانەوە هاریکاری دارایی دەکرێن. ئێڤێلینیش بەتەواوەتی بڕوای بە مەسیح هەبوو وەک تەنها ڕزگارکەری مرۆڤ و گەردوون.

ئینجا سەرەی لاورا هات. لاورا ئەو ڕاستییەی نەشاردەوە کە فەلسەفە و تێڕوانینی

خۆی بۆ ئەم ژیانە، سروشێکی زۆری لە فەلسەفەی هیندییەوە هێناوە، بەتایبەتیش لە یەکێک لەو شەش قوتابخانە بنەڕەتییەی کە ناوی (ڤیدانتا vedanta) بووە، یان وردتریێک پێی دەڵێن (کیڤال-ئادڤایتا keval-advaita)، ئەو دەربڕینە لە (شانکارا)ی فەیلەسووفەوە هاتووە کە لە سەرەتای سەدەی نۆدا لە هیندستان ژیاوە. هەروەک لاورا ڕوونی کردەوە و وتی (کیڤال-ئادڤایتا) واتە (نادوالیزمی پەتی). بە بڕوای لاورا تەنها یەک حەقیقەت بوونی هەیە و هیندییەکان کاتی خۆی ناویان ناوە (براهمان brahman) یان (ماهاتمان mahatman)، کە مانای (ڕۆحی جیهان) دەگرێتەوە یان ئەگەر ڕاستەوخۆ وەربگێڕدرێت مانای (ڕۆحی گەورە) دەبەخشێت. (براهمان) شتێکی ئەبەدییە، دابەش ناکرێت و ماددیش نییە. بەو شێوەیەش وەڵامی سەرجەم ئەو پرسیارانەی جۆن درایەوە کە ورووژاندنی، تەنها و تەنها یەک وەڵام، چونکە (براهمان) وەڵامی هەموو پرسیارەکانە.
بیڵ سەرسام بوو، هەناسەیەکی هەڵکێشا و وتی: «لاورا، خوا بمانپارێزێت»، هەر خۆی کەمێک لەوەوپێش تاڕادەیەک بەشێوەیەکی ساویلکانە گەشبین بوو و باوەڕی بە زانست بوو.
لاورا هیچ گوێی بە قسەکەی نەدا. کەوتە ڕوونکردنەوە و وتی: «هەموو شتە جۆراوجۆرەکان وەهمن و تەنها ڕواڵەتەکەیان دەبینین، کاتێکیش ڕۆژانە شتی جۆراوجۆر ئەزموون دەکەین، جۆرە وەهم و شتێکی ناڕاستەقینە هەست پێ دەکەین، یان ئەو شتە ئەزموون دەکەین کە هیندییەکان هەزاران ساڵ لەمەوبەر ناویان ناوە (مایا)، چونکە حەقیقەت نە حەقیقەتی ماددییە و نە ئەو شتەشە کە بە ڕواڵەت یان لە دەرەوە دەبینرێت. ئەوە تەنها شتێکی خەیاڵی و وەهمە، تەنها بەلای ئەو کەسانەوە ڕاستن کە بەندییان دەبن، بەڵام بەلای ژیرەکانەوە تەنها (براهمان) یان (ڕۆحی جیهان) شتێکی ڕاستەقینەیە». بەردەوام بوو لەسەر قسەکانی و وتی: «ڕۆحی مرۆڤ هاوتای (براهمان)ە و تەنها ئەو کاتەی کە لەوە تێدەگەین، وەهمی بینینی ڕواڵەت لەبەرچاوماندا ون دەبێت. ئەو کاتە ڕۆح دەبێت بە (براهمان)، خۆی ڕۆح هەمیشە هەر (براهمان) بووە، بەڵام هەر ئەوەندەیە کە پەی پێ نەبردوە».
جۆن وەڵامی قسەکانی دایەوە و وتی:
- کەواتە لێرەدا کارێکی گەورەمان دێتە بەردەم. جیهانی دەرەوە بوونی نییە و بینینی هەموو شتە جیاوازەکانیش تەنها وەهمە و هیچی تر.
لاورا گوێی بە قسەکانی نەدا و پرچە ڕەشەکەی لادا، بە خەندەیەکی مەکراوی

سەرلێوانییەوە لەمسەرەوە بۆ ئەوسەری مێزەکە سەیرێکی کردین و ئینجا زیاترێکی ڕوون کردەوە و وتی:

- کاتێک کە خەو دەبینین، وا دەزانین کۆمەڵێک شتی جۆراوجۆر ئەزموون دەکەین و لەو کاتانەدا لە دەرەوەی حەقیقەتداین، بەڵام هەموو شتێکی نێو دونیای ئەفسووناویی خەون سەرچاوەی لە ڕۆحەوە وەرگرتووە، بەڵێ، تەنها لە ڕۆحەوە و هیچی تر. کێشەکە لەوەدایە تەنها ئەو ساتە دەزانین خەونە کە خەبەرمان دەبێتەوە و خەونەکەمان کۆتایی پێ دێت. بەو شێوەیەش هەموو ماسکە درۆکان لە خۆمان دادەماڵین و ئەو حەقیقەتە دەردەکەوێتەوە کە هەمیشە هەر بووە: واتە دەبینەوە بە خودی ڕاستەقینەی خۆمان.

بەڕێوەبەری کۆڕەکەمان وتی:

- من ئەو تیۆرییەم نەبیستووە، بەڵام لەوەدەچێت قووڵ و جێی متمانە بێت. بەلایەنی کەمەوە هێندە تۆکمەیە کە مەحاڵە پێچەوانەکەی بسەلمێنرێت...

جۆن بۆ ساتێک بیری کردەوە و دواتر وتی:

- بەڕاست.. وتت (مایا)، وا نەبوو؟

جۆن سەیرێکی ئانای کرد کە لە تەنیشتیەوە دانیشتبوو و ئەویش سەری بۆ لەقاند. سەرنجم دا سەری داخست و هاوکاتیش خۆسێ دەستێکی خستە سەر شانی و بەلای خۆیدا ڕایکێشا.

لاورا کەوتە ڕوونکردنەوە و وتی:

- ئێمە لەو بڕوایەداین کە نۆ ڕۆحین و لەسەر ئەم مێزە دانیشتووین، ئەوەش بەهۆی (مایا)وەیە. لە حەقیقەتدا ئێمە هەموومان چەند دیاردەیەکی هەمان ڕۆحین، چەند ڕووکارێکی هەمان ڕۆحین. ئەوە وەهمی (مایا)یە وامان لێ دەکات بڕوا بەوە بکەین کە خەڵکانی تر جیاوازن لە خۆمان. لەبەرئەوە پێویستیش ناکات لە مردن بترسین. هیچ شتێک نامرێت. تەنها شتێک لە کاتی مردنماندا کە ون دەبێت، خودی ئەو وەهمەیە کە وا دەزانین لە جیهان جیا کراوینەتەوە. هەر کتومت وەک ئەوەیە کە لە کاتی خەوندا وا دەزانین خەوەکانمان شتێکی جیاوازن لە ڕۆحمان.

جۆن سوپاسی لاورای کرد کە بەشداری کردین و دوای ئەو نۆبەی ماریۆ هات و وتی:

- من (کاتۆلیک)م.

دەستێکی بەملاولادا بادا و وەک ئەوەی کە بڵێت: «لەوە زیاتر هیچی ترم نییە

بیلێیم»، بەڵام جۆن هەروا بەئاسانی وازی لێ نەهێنا تا دواجار کابتنە تەنهاکە وتی:
– ئێوە دانیشتوون و بە قووڵی باسی هەموو ئەو شتانە دەکەن کە دەیانبینن، بەڵام لە ڕاستیدا چاوتان کوێرە و هیچ نابینن. ئێوە دەڵێن: ئەستێرەکان و گەلەهەسارەکان دەبینین، گەشەکردنی ژیانی سەر زەوی دەبینین، هەروەها دەڵێن گوایە خودی ماددەی بۆماوەش دەبینن. هێندە دەبینن کە سیستەمێکی ڕێکوپێک لە شتێکی نارێک و پێک و شڵەژاوەوە سەرهەڵدەدات، بگرە شانازی بەوەوە دەکەن کە دەتوانن بگەڕێنەوە سەر ساتی خەلق. دواتریش وەک دەرئەنجامێک دەڵێن: «نەبوونی خوامان سەلماند»، ئافەرم!
بۆ ماوەیەک بێدەنگ بوو، بەڵام دیسانەوە جۆن هێنایەوە قسە، پاش نەختێک درێژەی بە قسەکانی دا و وتی:
– وا ئێمە تاڕادەیەک سەرمان بە هەموو شوێنێکدا کردووە، بەڵام لە هیچ شوێنێکدا تەنانەت هێندەی سەرە دەرزییەکیش چییە، شتێکی خوایانەمان نەبینی. هیچ خوایەک لەسەر شاخی (ئێڤەریست) نەبوو. لەسەر مانگیش مێزمان بۆ نەڕازێنرابووەوە. تەنانەت لە ڕێگەی پەیوەندی بێ تەلیشەوە نەمانتوانیوە جۆرە پەیوەندییەک لەگەڵ (ڕۆحی پیرۆز)دا بگرین، بەڵام کاتێک یاری چاوشارکێ بکەین، هەر یاری چاوشارکێ دەبینین و هیچی تر. مەبەستم لەوەیە کێ خاوەنی تێڕوانینێکی ساویلکانەیە بۆ جیهان و گەردوون؟ ئایا کەسە ئایینییەکانن یان ئەوانەن کە تەنها بڕوایان بە شتە بینراو و مەلمووسەکانە؟
ئێڤیلین چەپڵەیەکی بۆ لێدا و پاش ئەوە بەگوڕتر قسەی کرد. ئەو نهێنییەشی درکاند کە کاتی خۆی لە سەردەمی گەنجیدا مامۆستای فیزیا بووە و لەو بوارەشدا تا ئێستا لە ڕێگەی کتێب و گۆڤارە زانستییەکانەوە بەردەوام لەو بارەیەوە دەخوێنێتەوە. دواتریش وتی:
– دەمێکە لەو ژینگەیە تێگەیشتووین کە ژیانی تێدا بەڕێوە دەچێت. هێندەشمان زانی کە هەموو شتێک تەنها گەردیلەی گەورە و پرۆتینە، پاشان دەرکەوت کە تەنانەت ئەوەش نەبوو، بەڵکو ئاشکرا بوو کە هەموو شتێک تێکەڵەیەکی (ترشی ئەمینی)یە و هیچی تر. ئێ دەربارەی ئاسمانیش شتێکی هێندە بەجۆش و خرۆش نییە کە باس بکرێت. هەموو شتێک لە تەقینەوە گەورەکەوە سەری هەڵداوە. هیچ لایەنێکی نادیار و نهێنیش لەوەدا نییە، هیچ نهێنیکارییەک لە دیاردەی (دۆپلەر)[°°] دا نییە، لە تیشکی

گەردوونی دووردا، لە ئاسمانی چەماوەدا، نە لەوانەدا و نە لە هیچ شتێکی تری ئاسماندا هیچ جۆرە نهێنییەک نییە. ئەوە پێی دەگوترێت فیزیا، یان فیزیای تیۆری. کەواتە تەنها ئاگایی ماوەتەوە، ئەوەش هەروەک شتەکانی تری خەلق لە بنەڕەتدا شایانی تێڕامان نییە. ئاگاییش لە تێکەڵەیەکی ئەتۆم و گەردیلە پێکهاتووە. واتە هیچ نەماوەتەوە و فەلسەفە بەئاسانی دەتوانێت پشوویەکی دوورودرێژ وەربگرێت، چونکە بەڕاستی هیچ مەتەڵێک نەماوەتەوە کە هەڵبهێنرێت. یان ڕەنگە کاتی ئەوە هاتبێت کە زانست پێویستی بە پشوویەک بێت؟ خۆ پێدەچێت (زانست) دوا هەناسەی خۆی بدات. تەنها شتێک کە ئێمە نیگەران دەکات خودی جیهانە، هەڵبەتە کاتێک دەڵێم (ئێمە)، مەبەستم لە کۆمەڵێکە کە لە کەمینەیەکی بەرچاو پێکهاتووە. بەهەرحاڵ یەک دوو بەڵگەی ئاڵۆز و پێشکەوتوومان بۆ بهێنەرەوە، تا ئێمەش بیگۆڕین، بەڵام تا ئەو کاتە هەموو شتێک لە شوێنی خۆیدا چەقیووە.

دیسانەوە ئێڤیلین چەپڵەی بۆ لێدایەوە و خۆسێ و بیلێش سەریان بۆ لەقاند.

پاش ماریۆ سەرەی جۆن هات و وتی:

– من هەروەک لەوەوپێش بوارم بۆ ڕەخسا بڕوای خۆم دەربخەم، لەو بڕوایەدام کۆمەڵێک وەڵامی سادەمان بۆ سەرتاپای ئەو پرسیارە گەورانە هەبێت کە دەیانوروژێنین. هەر ئەوەندەیە کە بەئاسانی ناتوانین لەنێوانیاندا دانەیەکیان هەڵبژێرین. بەدەر لەوەش هەوڵم دا ئاماژە بۆ ئەوە بکەم کە پرسیارە گەردوونییەکان ڕەنگە زیاترێک بۆ یارییەکی سەر مێز و کۆڕو کۆبوونەوەکان بشێن، وەک لەوەی بخرێنە ژێر لێکۆڵینەوەی زانستییەوە. زانست، بۆ نموونە تیۆری گەشەکردنی پێشکەش کردووین، تیۆری ڕێژەیی و فیزیای بڕ و بەتایبەتیش تیۆرییەکی سەرنجڕاکێشەری دەربارەی تەقینەوە گەورەکەی خستۆتە بەردەممان. زۆرباشە! ئەوانە هەموویان زۆر زۆر باشن، بەڵام پرسیارە گەورەکە لەوەدایە ئایا زانستی سروشتی خەریکە لە کۆتایی ڕێگاکە نزیک ببێتەوە یان نا؟ ڕاستە وا خەریکە نەخشەی سەرجەم جینەکانی مرۆڤ دادەڕێژین، بەو هەموو سەدان هەزار جینەوەی کە تێیدایە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا زیرەکتر نابین. بێگومان پێی دەچێت ئەو نەخشەیە گوڕێکی باش بە لایەنی تەکنیکیی بایۆلۆجی بدات و ڕەنگە ببێتە هۆی دۆزینەوەی چارەسەری هەندێک نەخۆشیش، بەڵام هیچ تیشکێکی نوێ ناخاتە سەر سروشت و ماهیەتی ئاگایی، وە بەتایبەتیش ناتوانین هەر لە بنەڕەتەوە هۆی هەبوونی ئاگایی پێ لێک بدەینەوە. بەو شێوەیەش دەکرێت بۆ ماوەیەکی زۆر بەردەوام بین. ئەگەر ژیان لەسەر گەلەهەسارەیەک، کە

سەدان ملیۆن ساڵی تیشکی لێمانەوە دوورە، هەبێت و نەبێت، وەڵامەکەیمان دەست ناکەوێت، چونکە ماوەکان یەکجار یەکجار دوورن. لەلایەکی تریشەوە ڕاستە ئێمە بەردەوام زانیاری زیاترمان دەربارەی گەشەکردنی گەردوون دەست دەکەوێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا قەت ناتوانین تەفسیرێکی زانستیانەی ماهیەتی گەردوون بکەین، بەڵام دەمەوێت وێنەیەکی لاورا بە نموونە بهێنمەوە کە جیهانی دەرەوەی بە خەونێک چوواند. بەڕاستی ئەوە سیمبولێکی زۆر نایابی تێدایە. ئەگەر جیهان خەون بێت، کەواتە زانست هەوڵ دەدات ماددەی ئەو خەونە لێک بداتەوە. هەوڵ دەدات ماوەی نێوان ئەمسەر و ئەوسەری خەونەکە بپێوێت، بەڵام هاوکات هەمووان تەبان لەسەر ئەوەی کە کات و شوێن هەم لەو کاتەدا دادەڕمێن کە تەماشای قووڵایی لێواری دەرەوەی گەردوون دەکەین و هەم لەو کاتەشدا کە دەگەڕێینەوە بۆ سەر تەقینەوە گەورەکە، بێگومان لە هەردوو حاڵەتەکەدا باس لە دوو دیوی هەمان دراو دەکەین، چونکە هەتاوەکو دوورترێک لە قووڵایی گەردوون بڕوانین، زیاترێک دەگەڕێینەوە بۆ مێژووی گەردوون. واتە بەوپەڕی توانامانەوە هەوڵ دەدەین زۆرترین زانیاری لە خەونەکانماندا بەدەست بهێنین. زۆرباشە، هەموو ئەوانە زۆر زۆر باشن، بەڵام ناتوانین بێینە دەرەوەی خەونەکە. قەت ناتوانین لە دەرەوەڕا ببینین. سەرمان دەکێشین بەوسەری سنووری خەونەکەدا، هەروەک چۆن کەسێکی دوورەپەرێزی نەخۆش سەری دەکێشێت بە دیوارێکدا.

پەرداخەکەی لاورام پڕکردەوە لە شەمپانیا و لە جۆنم پرسی:

– تۆ بەتەواوەتی ئەو بوارە بەدوور دەزانیت کە ڕۆژێک لە ڕۆژان شتگەلێکی زۆر زیاتر دەربارەی ئەم جیهانە تێبگەین؟

سەری ڕاوەشاند و وتی:

– ڕێک بەپێچەوانەوە. من پڕاوپڕ بڕوام بە خورپەی دڵی مرۆڤ هەیە، بەڵام ئەگەر بمانەوێت مەتەڵی گەردوون هەڵبهێنین، ڕەنگە باشترێک بێت بەشێوەیەکی ئەقڵانی لێی نزیک ببینەوە و بەو شێوەیەش لەوانەیە هەر لە بنەڕەتەوە مەتەڵەکەمان هەڵهێنابێت. من خۆم هیچ بەدووری نازانم کە وەڵامی ئەو مەتەڵە هەر لە کۆنەوە لە تێکستێکی یۆنانی یان لاتینی یاخود هیندیدا داڕێژرابێت. مەرجیش نییە وەڵامەکە زۆر دژوار بێت، دەشێ بە دە بۆ بیست وشەیەک داڕێژرابێت. هەر بەو شێوەیە بەتەواوەتی لەو بڕوایەدام کە تیۆریی (مایا)کەی لاوراش، دەکرێت بە چەند ڕستەیەک دەرببڕدرێت. ئەم ئێوارەیە کۆمەڵێک وەڵامی پڕاوپڕی زنجیرەیەک پرسیارمان دایەوە

که تەنها دوو بواری وەڵامدانەوەیان هەیە. پێشم وا نییە هیچ پێوەرێک و ئامێرێکی زانستیمان هەبێت و پێمان بڵێت کام وەڵامیان ڕاست بوون و کامەشیان بەتەواوەتی هەڵە بوون. یان تۆ دەڵێیت چی ئانا؟

لەویادا سەرەی ئانا بوو. بۆ ساتێک هەروا دانیشتبوو و تەماشای شەوی ئەو ناوچە گەرمەی دەکرد. خۆی ڕاست کردەوە و بەدڵنیاییەوە وتی:

– حەقیقەتێک لە دەرەوەی ئەم حەقیقەتەدا هەیە. من کاتێک کە دەمرم، نامرم. ئەو کاتە هەمووتان وا دەزانن کە من مردووم، بەڵام من نەمردووم. دیسانەوە پاش ماوەیەکی تر لە شوێنێکی تردا یەکتری دەبینینەوە.

لەگەڵ ئەو قسەیەدا یاری کۆبوونەوەکەمان کۆتایی پێ هات، لەپڕێکدا جەوی قسەکانمان بە ئاراستەیەکی تردا ڕۆیشت. جەوێکی ناخۆش سەرتاپای مێزەکەمانی داپۆشی. زۆر دڵنیا نیم، بەڵام وابزانم من تەنها کەس بووم کە فرمێسکێکم بینی لە چاوی خۆسێوە هاتە خوارەوە. ئانا درێژەی بە قسەکانی دا و وتی:

– ئەو کاتە وا هەست دەکەن بۆ پرسەی کەسێک هاتوون، بەڵام لە ڕاستیدا بۆنەی لەدایکبوونی کەسێک کۆیکردونەتەوە.

ئینجا ئانا ڕێک تەماشای منی کرد و دیسانەوە سوور بوو لەسەر قسەکەی و وتی:

– حەقیقەتێک لە دەرەوەی ئەم حەقیقەتەدا هەیە. ئێمە لێرەدا تەنها ڕۆحێکین کە لە سەفەرداین و زوو تێپەڕ دەبین.

لەویادا خۆسێ بە زمانی ئیسپانی بە چرپەچرپێک وتی:

– بەسە، پێویست ناکات هیچی تر بڵێیت.

لە کاتی قسەکانیدا هەمووان چاویان بڕیبووە ئانا. پاش ئەوەش.. ڤیرا، پاش ئەوە کتومت ئەو شتە ڕوویدا کە وای لێ کردم بە پێویستی بزانم هێندە زۆرت دەربارەی ئەو کۆبوونەوەیە باڵایەی ناوچە گەرمەکانت بۆ بنووسم، کە لە ماراڤیو پلانتەیشن ڕیسۆرتدا بەڕێوە چوو.

بەڕێوەبەری کۆڕەکە دیسانەوە قسەکانی ئانای وتەوە:

– ئێمە لێرەدا تەنها ڕۆحێکین کە لە سەفەرداین و زوو تێپەڕ دەبین.

دوای ئەوە پەنجەی دۆشاومژەی خستە سەر ناوچەوانی ئانا و وتی:

– ئەو ڕۆحەش ناوی (مایا)یە.

خۆسێ نائارام بوو، سەرێکی ڕاوەشاند و وەک ئەوەی بیەوێت ئانا بپارێزێت، دەستێکی خستە سەر شانی. بەئاشکرا دیاربوو کە دوا قسەی جۆنی پێ خۆش نەبوو. یان

زۆر بە ساکاری پێی خۆش نەبوو کە جۆن ئاوها پەنجە بخاتە سەر ناوچەوانی ئانا.
بەتەواوەتی نەمزانی بۆچی بەو شێوەیە ڕەفتاری کرد، بەڵام وتی:
- پێم وابێت ئیتر بەسە.
جۆن گازی لە لێوی گرت، هەر دەتوت لەناکاوێکدا هەستی بەوە کردبێت کە شتێکی قۆڕی کردووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نیگایەکی پەلەی گرتە ئانا و وەک ئەوەی لەگەڵ خۆیدا قسە بکات وتی:
- بەدەر لەوەش لێرەدا باس لە هونەرێکی زۆر باڵا دەکەین.
وەک وەڵامێکی قسەکەی، خۆسێ ئانای لەسەر کورسییەکە بەرز کردەوە و وتی:
- سوپاس، هێندە بەسە.
ئینجا بە زمانی ئیسپانی بە ئانای وت:
- با بڕۆین.
پاشان لەنێو باخی دارگوێزە هیندییەکاندا ون بوون و چیتر ئەو ئێوارەیە ئەو دوو ئیسپانیەمان نەدییەوە، بەڵام ئیتر کاتیش درەنگ بووبوو و لە دوانزەی شەو لایدابوو.
هەمووان بێدەنگ بووین و وابزانم بەرلەوەی هیچ قسەیەکی تر بکرێت نزیکەی خولەکێک تێپەڕی. پێم وابێت هەموومان دانیشتبووین و بیرمان لەو شتە دەکردەوە کە لەنێوان خۆسێ و جۆندا ڕوویدا. دواتر بیڵ بێدەنگییەکەی شکاند و بەدەم خەندەیەکی گەورەوە وتی:
- دەزانن من بڕوام بە چییە؟ پێم وابێت نزیکەی شەش ملیارد خەڵکی چەنەباز لەسەر ئەم زەوییە دەژی و لێرەدا لە باشترین حاڵەتدا هەشتا بۆ نەوەد ساڵێک دەژین. بەدەر لەوەش چەندین قسەی خۆش و هەزەلی دەکەین، هەروەها چەندەها قسەی قۆڕ و بێ ماناش.
لاورا بەهێواشی هەستایە سەرپێ و یەک دوو هەنگاو چووە دواوە. ڕۆشتە لای ئەو مێزە بچکۆلەیەوە کە سەرلەئێوارە خواردنەکانیان لەسەر دانابوو، لەویادا سووراحییەک بەفراوی لێ بوو، ڕێک دەستی دایە و گەڕایەوە سەر مێزەکەمان، لە پشتی ئەمریکییەکەوە وەستا و سوک و باریک ئاو و سەهۆڵاوەکەی کرد بە پشتیدا.
لایەنی کەم بیڵ بۆ ماوەی دوو چرکەیەک لە شوێنی خۆیدا چەقی و بەهیچ جۆرێک نەجووڵایەوە، ئینجا بەپەلە لەسەر کورسییەکەی بەرز بووەوە، دەستی چەپی لاورای گرت و بە دەوری خۆیدا خووڵاندییەوە، ئینجا زللەیەکی لێدا.

هەتا ئەو کاتەی لێیدا من پشتگیریم لە بیڵ دەکرد، هەرچەندە زللەیەکی زۆر هێواشی پیاکێشا، بەڵام پێم وابوو لە سنووری خۆی لایدا. بەئاشکراش دیاربوو هەمووان پشتیان لە ڕەفتارەکەی بیڵ کرد، تەنانەت دوو بتڵە شەمپانیاکەشی یارمەتی نەدا کە لە جۆری (ڤیوڤ کلیکۆت) بوو. لاوراش بە بێدەنگی هاتەوە سەر مێزەکە و لە تەنیشتمەوە دانیشتەوە.

جۆن وتی:

– سوپاستان دەکەم کە دیسان وا ئێوارەیەکی خۆشی ترمان بەسەر بردەوە. بۆ بەیانیش، ڕەنگە پێویست نەکات هێندە بە دوورودرێژی لەسەر بابەتەکان بڕۆین.

بیڵ مێزەکەی بەجێهێشت و ڕۆیشت، هەروەها (مارک و ئێڤیلین)یش، وابزانم دوو گەنجە ئەمریکییەکە لەوە دەترسان دیسانەوە ببێتەوە بە شەڕ، بۆیە ئەوانیش بۆی دەرچوون. ماریۆش هەر پێش ئەوەی لاورا بەفراوەکە بکات بە پشتی بیڵدا بەجێی هێشتبووین.

دەستێکم هێنا بە ڕوومەتی چەپی لاورادا و وتم:

– ئێشێت؟

سەرێکی بۆ ڕاوەشاندم.

– خۆش نەبوو، ها؟

وتی:

– فرانک، دەبێت فێری ئەوە ببین کە خۆمان لەدەست بدەین.

– بەڵێ؟

– ئەوەی لەدەستی دەدەین هەر هیچ نییە لەچاو ئەو شتەدا کە دەیبەینەوە.

لەبەر ڕۆشنایی مۆمی سەر مێزەکە، تەماشای چاوە قاوەییەکەیم کرد. لەناو قووڵایی ئەو ماددە ڕەنگ قاوەییەدا، هێڵێکی باریکی سەوز ململانێی لەگەڵ ڕەنگە قاوەییەکەدا دەکرد تا هەمووی هەر قاوەیی نەڕوانێت. وتم:

– باشە ئەی من چی دەبەمەوە؟

– هەموو ئەو شتانە دەبەیتەوە کە بوونیان هەیە.

لەدوایەوە وتمەوە:

– هەموو ئەو شتانەی کە بوونیان هەیە.

سەری بۆ لەقاندم:

– ئەو شتەی لە دەستی دەدەیت، ڕەنگە وا بێتە بەرچاو کە شتێکی گەورە و گرنگ

بێت، بەڵام جگە لە وەهمێکی ناسروشتی زیاتر هیچی تر نییە.
- مەبەستت لە (خود)ە؟ ئەوەیە کە وەهمە؟
- تەنها خودێکی بچکۆلە لەدەست دەدەیت. تەنها ئەو خودە دەدۆڕێنیت کە وەهمە. لە ڕاستیدا هەر خۆی شتێکی دۆڕاوە، بەڵام هاوکات خودێکی گەورەترمان هەیە.
لەویادا گوێم لێ بوو تارماییەک لە تاریکییەکەوە لێمان نزیک دەبووەوە، یەک دوو چرکەیەک دوای ئەوە سووراحییەک ئاومان بەسەردا ڕژا. بەشی هەرە زۆری ئاوەکە بەر من کەوت، پێم وانەبوو ئەوە هەروا ڕێکەوت بووبێت، چونکە لەو کاتەدا زۆر لە تەنیشت یەکەوە دانیشتبووین. بەرلەوەی بێینەوە سەرخۆمان، تارماییەکە لەبەرچاوماندا ون بوو.
لاورا زۆر بە قێزەوە وتی:
- کەلکەپووت!
هەستامە سەرپێ و سەرم ڕاوەشاند. کراسەکەم شەلالی ئاو بوو. هەروەها بلوسەکەی لاوراش تەڕ بوو، بلوسەکەی بە لەشیەوە نوساو و لەگەڵ بینینی ئەو دیمەنەدا کەمێک شەرم دایگرتم. وتم:
- وابزانم ئیتر کاتی ئەوە هاتووە ئێمەش بیکەین بە شەو.
بە چاوە سەوزەکەی سەیرێکی کردم و وتی:
- دڵنیایت؟
وەڵامم دایەوە و وتم:
- هەر زۆر زۆر دڵنیام.
دوای ئەوەی لە یەک جیا بووینەوە ئینجا لەوە تێگەیشتم کە ئەو پرسیارەی تەنها بۆ ئەوە کرد تا لەگەڵیدا بڕۆمەوە.
دەبێت دان بەوەدا بنێم کە ئەو ئێوارەیە کەم تا زۆر بەپەرۆش بووم بڕۆمەوەماڵەوە بۆ لای گۆردن. بەڕاستی برادەرێکی دڵسۆز و باش بوو و وابزانم ڕاستیشی دەکرد کە دەیوت: «بێ مانایە بەر لە خەوتن ئەو هەموو جنە بخۆیتەوە».
لەلای ڕاستی مێزی خەوەکەوە ئاوێنەیەکی گەورەی لێ بوو، خۆی بەوێوە نوساندبوو، بەڵام هەرکە دەرگاکەم بەدوای خۆمدا داخست، گوێم لێ بوو بەهێواشی لەمسەری ئاوێنەکەوە بۆ ئەوسەری ئاوێنەکە خۆی خشاند. بێگومان دڵنیا نەبووم کە گۆردن بێت، چونکە بەدڵنیاییەوە چەندەها مارمێلکەی تریش لە ژوورەکەدا بوون و منیش لە ڕاستیدا زۆرم پێ خۆش نەبوو لە سەرەتای سەرەتاوە دەست پێ بکەمەوە و

خۆم بە مارمێلکەیەکی نامۆ بناسێنم، بەڵام هەرکە گڵۆپەکەم داگیرساند، یەکسەر ناسیمەوە. من هەمیشە توانایەکی تایبەتیم هەبووە و بەئاسانی توانیومە سیمای تایبەتی گیانەوەرێکی بڕبڕەدار بناسمەوە، بێگومان هەر مارمێلکەیەکیش وەک هەر تاکە مرۆڤێک تایبەتمەندیی خۆیان هەیە، لە دڵی خۆمدا وتم: «ئەوانیش وەک هەر تاکێکی ئێمە هەمان پلەی فەردانیەتیان هەیە»، دڵنیاش بووم بەلایەنی کەمەوە نوێنەرانی (ڕێکخراوی جیهانی پاراستنی ژینگە)ی سەر دوورگەکە، پشتگیری لەو بیرۆکەیەم دەکەن. بەدەر لە هەموو ئەوانەش بەڕاستی گۆردن گەورە بوو، بەلایەنی کەمەوە لەوەدەچوو بەهێزترین دانەی پۆلەکەیان بێت. وتم:

- بەڕاستی دەمەوێت بخەوم، لەبەرئەوە تکایە پێتناخۆش نەبێت و بەهیچ جۆرێک خراپ لێکی مەدەرەوە ئەگەر نەمتوانی تا نیوەشەو دانیشم و قسەت لەگەڵدا بکەم.

جانتاکەم کردەوە و بتڵی جنەکەم دەرهێنا، سەرەکەیم کردەوە و قومێکی باش باشم لێدا، هەر بۆ ئەوەی دڵنیا بم خەوم لێدەکەوێت، قومێکی گەورەم خواردەوە.

گۆردن وتی:

- بەڕاستی کەمێک بەلامەوە سەختە بڕوا بەوە بکەم.

- بەڵێ؟

- مەبەستم لەوەیە کە دەڵێیت: «دەچم دەخەوم»، گرەوت لەگەڵدا دەکەم هەر ئەم شەو زیاترێک لەو بتڵە دەخۆیتەوە.

- بەهیچ شێوەیەک ئەوەم لە خەیاڵدا نییە.

- ئێوارەیەکی خۆشت ڕابوارد؟

- نامەوێت باسی ئەوە بکەم، چونکە هەر ئەوەندەی دەست پێ بکەم، ئیتر وەستانم نییە و بەو شێوەیەش وەک دوێنێ شەوی لێدێت، نازانم لێم تێدەگەیت یان نا؟

- من هەر ئەوەندەم لێ پرسیت کە ئێوارەیەکی خۆشت هەبووە یان نا.

وتم:

- لاورا کەسێکی (پانتیست)ە، توندڕەوێکی (مۆنیست)ە، دەتوانم بڵێم (مۆنیست) ێکی ساکارە و بابەتەکەی سەرپێیی وەرگرتووە.

- واتە ئافرەتێکی بەخەبەرە. هەروا بێ هودە وەک چەند کەسانێکی تر کە دەیانناسم، بەشێوەیەکی نیمچە خەواڵوو نایەت و ناڕوات. دڵنیاشم دانەکانی بە جن ناشوات.

- دواتریش شتێکی دەربارەی (مایا) وت. من لەوەوپێش ئەو دەستەواژەیەم بیستووە، لەبەرئەوە سوپاست دەکەم و لەو بارەیەوە پێویستم بە ڕوونکردنەوە نییە.

لەویادا گۆردن وتی:

- (مایا) خودی وەهمی جیهانە. هەر بەهۆی ئەویشەوەیە کە ئەو وەهمە تاڵە سەرهەڵدەدات و وا دەزانیت تەنها (خود)ێکی هەژار و بێچارەیت و لە (خود)ە مەزنەکە جیا کراویتەتەوە، وات لێ دەکات هەست بکەیت کە تەنها چەند مانگێک یان چەند ساڵێکت لەم ژیانەدا ماوە. هەروەها ناوی نەتەوەیەکیشە کە لە ئەمریکای ناوەڕاستدا دەژین، بەڵام ئەوەیان شتێکی تەواو جیاوازە...

- ئێ من وتم لەو بارەیەوە پێویستم بە ڕوونکردنەوە نییە، بەڵام خۆسێ بەشێوەیەکی زۆر سەیر ڕەفتاری کرد، کاتێک کە پیاوە ئینگلیزییەکە پەنجەیەکی خستە سەر ناوچەوانی ئانا و وەک ئەوەی حەقیقەتی ئانا دەربخات وتی: «ئەو ڕۆحەش ناوی (مایا)یە» و دواتریش شتێکی دەربارەی (هونەرێکی باڵا) درکاند. قسەکانی سەیر بوون، زۆر سەیر بوون، بەڵام ئاناش زۆر بەشێوەیەکی سەیر بەرپەرچی دایەوە، لەوەدەچوو بەرگەی ئەوە نەگرێت کە بەو شێوەیە ئاماژەی بۆ بکرێت.

- هەندێک کەس زۆر بەتوندی کەوتوونەتە داوی (مایا)وە و ئەگەر خەبەر بکرێنەوە، ڕەنگە ئازاریان پێ بگات. زیاترێک لەوەدەچێت کە لەدوای مۆتەکەیەک خەبەرت بێتەوە.

- قسەی قۆڕ، تۆ نازانیت من باسی چی دەکەم. ئێ خۆ تۆ لەوێ نەبوویت.
- (فرانکی)، من لە هەموو شوێنێکدام. تەنها یەک (من) بوونی هەیە.
- بەیارمەتیت واز لەو قسە قۆڕانە بهێنە.
- هەر ئەوەندەیە کە من ساکارترین و ڕوونترین قسەی گەردوون دەردەبڕم.
- ئەی قسەکەت چییە؟
- ئەوەیە کە یەک جیهان بوونی هەیە.
- بەڵێ تێگەیشتم. تەنها یەک جیهان بوونی هەیە.
- ئەو جیهانەش تۆیت.
- دە کەواتە بەیارمەتیت بێدەنگ بە.

- میستەر، دەبێت ئەو پەتی ژیانە بپچڕێنیت کە تێت ئاڵاوە. بەلایەنی کەمەوە سەرنجت لەسەر خودی خۆت لابەرە و لەبری ئەوە بەرەو دەرەوە بڕوانە، سەرنج بخەرە سەر سروشتی چواردەورت، سەرنج بخەرە سەر یەک تاقگەی حەقیقەتی ئەفسووناوی ساکار کە بەشێوەیەکی سروشتی پێکەوە گرێ دراوە.
- هەوڵ دەدەم.

- ئەی چی دەبینیت؟
- باخێکی دارگوێزی هیندی دەبینم کە لە نیوەی خوارووی زەویدایە.
- ئەوە تۆیت.
- هەروەها ئانا دەبینم بە ڕووتی لەژێر بڵقی ناو ئاوی تاڤگەکەی (بۆئوما)دا دێتە دەرەوە.
- ئەوە تۆیت.
- دەموچاوی دەناسمەوە، بەڵام لەشی نەء.
- زیاترێک سەرنج بدە.
- ئەستێرەیەکی گەڕۆکی زیندوو دەبینم.
- ئەوە تۆیت.
- گەردوونێکی ترسناک دەبینم کە بە ملیارد گەلەهەسارە و کۆمەڵە گەلەهەسارەی تێدایە.
- هەموو ئەوانە (تۆ)ن.
- بەڵام لەگەڵ تەماشاکردنی گەردووندا، مێژووی ڕابردووەکەشی دەبینم. لە ڕاستیدا لە ڕووداوێک ورد دەبمەوە کە تەمەنی چەندین ملیارد ساڵ دەبێت. زۆربەی ئەو ئەستێرانەی کە ئێستاکە دەیانبینم، دەمێکە بوونەتە (ئەستێرەی زەبەلاحی سوور)[٥٦] یان (سوپەر نۆڤا)[٥٧]. هەندێکیشیان هەر لە ئێستاوە بوونەتە (ئەستێرەی سپیی بچکۆلە[٥٨]) و ئەستێرەی نیوترۆنی وروژاو یان بوونەتە (کونی ڕەش).
- تۆ ڕابردووی خۆت دەبینیت. ئەوەش ئەو شتەیە کە پێی دەگوترێت یادەوەری. تۆ هەوڵ دەدەیت شتێکت بیر بکەوێتەوە کە لەبیرت چۆتەوە، بەڵام هەموو ئەوانە (تۆ)ن.
- ڕژێمێکی شێواو دەبینم کە لە مانگ و ئەستێرەی گەڕۆکی گەورە و بچکۆلە و نەیزەک پێکهاتووە.
- ئێ هەموو ئەوانە (تۆ)ن، چونکە تەنها یەک حەقیقەت بوونی هەیە.
- بەڵێ، وەک لەوەوپێشیش وتم لەوەیاندا هاوبیرتم.
- تەنها یەک ماددەی گەردوونی هەیە، تەنها یەک ماددە.
- ئەو ماددەیەش منم؟
- ئەو ماددەیەش تۆیت.
- کەواتە شتێکی بچکۆلە نیم.

– بەڵام بەمەرجێک ئەگەر بتوانیت لەو حاڵەتە تێبگەیت، ئەگەر بتوانیت خۆت بەدەستەوە بدەیت.

– بەڵێ ڕاستە، بەڵام بۆچی ئەوەیان کارێکی هێندە سەختە؟

– زۆر بەئاسانی تەنها لەبەرئەوەیە کە ناتوانیت دەستبەرداری (خود)ە بچکۆلەکەت ببیت، زۆر بە ساکاری تەنها لەبەرئەوەیە.

– پێی دەچێت تەنانەت چارەسەرە ساکارەکانیش لە کاتی کرداردا شتێکی سەخت بن. بۆ نموونە خۆکوشتن شتێکی هەر زۆر ئاسانە، بەڵام کاتێک بە کردار دەیکەین، هەر زۆر سەختە.

– تۆ کەسێکی ئەوەندە دواکەوتوو و سەرەتایی نیت.

– دواکەوتوو و سەرەتایی؟

– بەدەر لەوەش ئەگەر بتەویت خۆت بکوژیت، دەبێت لە پێشدا خودێکت هەبێت کە بیدۆڕێنیت.

– ڕاستە، پارادۆکسەکە لەوەدایە، ڕەنگە من تەنها لە ترسدا خۆم بکوژم، لە ترسی ئەوەی کە ناچارم و دەبێت ماوەیەکی زۆرتر چاوەڕوان بم تا دەستبەرداری خودی خۆم بم، کەچی دەمەوێت بە دەستی خۆم بیکوژم. هەروەک چۆن منداڵێک هەموو شوکلاتەکەی دەخوات، تەنها لە ترسی ئەوەی کە کەسێکی تر نەیخوات، بەڵام لەوەوبەر باسی ئەوەمان کرد. تۆ ئەگەر هێرش بکرێتە سەر کلکت، زۆر بەئاسانی دەتوانیت دەستبەرداری ببیت، بەڵام من ناتوانم یەک دوو گرێی مێشکم دەربهێنم و دواتر وەک کلکت بۆ نموونە، دروستی بکەمەوە. ناتوانم بچم لە خەستەخانەیەکدا بکەوم و بڵێم وەرن بە نەشتەرگەرییەک ئەم نیگەرانیی و ترسە گەردوونییەم بۆ دەربهێنن.

– ئێ تەنانەت ئەوەش کێشەکەت چارەسەر ناکات. بەو شێوەیە بەتەواوەتی دەگەڕێیتەوە دواوە، واتە قەت شانسی ئەوەت نابێت کە سەرلەنوێ خەبەرت ببێتەوە. وابزانم لەو پرۆسێسەدا پێویستت بە هەموو گرێ مێشکییەکانتە.

– وایە، وایە.. سەیر نییە کە تۆ ئەو قسەیە دەکەیت؟

– بەشێوەیەک لە شێوەکان ناچاریت و دەبێت بمریت. دەبێت بوێریت و ئەو کردارە بکەیت.

– باشە تۆ کەمێک لەوەوبەر نەتوت کە ئەوە چارەسەر نییە؟

– تەنها بەو مانایە دەبێت بمریت کە بە شتێکی تر بگەیت. ئەو شتەی کە ناچارە

بمرێت، تۆ نیت. تەنها وێنەی ئەو (من)ە دەبێت بمرێت کە بە چەندین لادا پەلوپۆی هاویشتووە.

– ئەو شێوەیەی کە تۆ ڕاناوەکانی تێدا بەکاردەهێنیت، کەمێک سەرم دەشێوێنێت.

– زۆر پێی دەچێت کە وابێت. لەوانەیە پێویستمان بە ڕاناوێکی نوێ بێت.

– تۆ خۆت هیچ پێشنیارێکت هەیە؟

– دڵنیام ئەو وشەی (ئێمە)یەت بیستووە کە لە کاتی نیشاندانی شکۆدا بەکار دەهێنرێت.

– بێگومان، بۆ نموونە کاتێک پاشایەک یان قەیسەرێک ستایشی خۆی دەکات و لەبری ئەوەی بڵێت (من) دەڵێت (ئێمە)، پێشی دەگوترێت (کۆی) پاشایەتی.

– مەبەستم لەوەیە کە بەدەر لەوە پێویستیمان بە جۆرە (تاک)ێکی پاشایەتییە.

– جا ئەوە سوودی چییە؟

– کە تۆ دەڵێیت (من)، خۆت بە جۆرە وێناکردنێکی (خود)ەوە دەبەستیتەوە، خۆت بە شتێکەوە پەیوەست دەکەیت کە هەر لە بنەڕەتەوە شتێکی هەڵبەستراو و وەهمە.

– دیسانەوە لە هەمان بازنەدا دەخولێیتەوە.

– بەڵام بیر لە سەرتاپای ئەم ئەستێرە گەڕۆکە بکەرەوە و بیر لە گەردوونیش بکەرەوە، بیر لەوە بکەرەوە کە ئەم ئەستێرە گەڕۆکە بەشێکی ئۆرگانیی گەردوون پێک دەهێنێت.

– هەوڵ دەدەم.

– بیر لە هەموو ئەو شتانە بکەرەوە کە بوونیان هەیە.

– بیر لە هەموو ئەو شتانە دەکەمەوە کە بوونیان هەیە.

– بیر لە هەموو گەلەهەسارەکان بکەرەوە، بیر لە سەرتاپای ئەو شتانە بکەرەوە کە پانزە ملیارد ساڵ لەمەوبەر تەقینەوە.

– بەڵێ، بیر لە سەرتاپای دەکەمەوە.

– دە ئینجا بڵێ (من).

– (من).

– ئەوە سەخت بوو؟

– کەمێک، بەڵام تۆزێک خۆشیش بوو.

- بیر لە هەموو ئەو شتانە بکەرەوە کە بوونیان هەیە و دواتر بە دەنگی بەرز بە خۆت بڵێ: «ئەوە منم»
- «ئەوە منم»...
- هەست ناکەیت ئێستاکە سەربەست بیت؟
- کەمێک.
- ئەوە لەبەرئەوەیە کە تۆ ڕاناوە نوێکەت بەکارهێنا، ڕاناوی (تاکی پاشایەتی).
- بەڕاست؟
- فرانک، وابزانم هێدی هێدی نزیک دەبیتەوە.
- چۆن چۆنی؟ هەر ئەوەندەیە کە من بەڕاستی پێم خۆش بوو کە ئەم دەرسەم وەرگرت.
- پێم وابێت تۆش دەتوانیت وەک منت لێبێت. واتە دەتوانیت وەک من ڕزگارت بێت و سەربەست بیت لە هەموو نیگەرانی و ماتییەکی ئەنتۆلۆجی.
- شەیتانی لەعنەتی. لێرەدا هەڵەیت.
دیسانەوە جانتاکەم کردەوە و قومێکی باش باشم لە مەشروبە قورسەکەم دا. زانیشم یەک و دوو قسەیەکی ناخۆش لەوبارەیەوە دەکات، پاش نەختێک وتی:
- دان بەوەدا بنێ کە خۆت باش ناناسیت.
- پرسیارەکە لەوەدایە کە ڕێک لە کاتی ئێستادا بیر لە چ جۆرە ڕاناوێک دەکەیتەوە.
- تۆ خۆت کەمێک لەمەوبەر زۆر بە جیددی وتت: «دەمەوێت بچمە جێگاوە و بەهیچ جۆرێکیش نامەوێت زیاترێک لەو مەشروبە بخۆمەوە».
- بەڵێ، ئینجا تۆش دەستت کرد بە قسە. خەریک بوو هەڵمبخەڵەتێنیت، خەریک بوو فریوم بدەیت و وام لێ بکەیت ئاواتەخواز بم کە مارمێلکەیەک بم.
- تۆ گوێت لە دەنگی خۆتە، گوێت لێیە چی دەڵێیت؟
- من وتم تۆ دەستت بە قسەکردن کرد.
- مەبەستم لەوەیە گوێت لە دەنگی خۆتە کە چ ڕاناوێک بەکار دەهێنیت؟ باشە لە بنەڕەتدا کێ دەستی بە قسە کرد؟
ئەوەم بەلاوە جوان بوو. دیسانەوە لەویادا هەڵیخەڵەتاندمەوە. لە ڕاستیشدا من خۆم سەرتاپای گفتوگۆکەم دامەزراند. دواتر وتی:
- کەواتە باش خۆت ناناسیت. بەدەر لەوەش کێشەیەکی گەورەت هەیە و خۆشت

بەتەواوەتی نازانیت چیت دەوێت.

دانم بە قسەکەیدا نا و وتم:

- من دان بەوەدا دەنێم لەو لایەنەدا کەمێک لاوازم.

هەستم کرد هیچ کێشەیەک لەو دانپیانانە بچکۆلەیەمدا نەبێت. ئێ لە هەموو بارێکیشدا چ پێویست دەکات شتی وا لە مارمێلکەیەک بشارینەوە.

- بەڵام شتێکی تریش هەیە.

- چی؟

- تۆ لەگەڵ خۆتدا قسە دەکەیت.

- پێویست دەکات ئەوەم بیر بخەیتەوە؟

- فرانک، لە کاتی ئێستادا لە بازنەیەکدا دەخولێیتەوە و هەروەک ئەوەیە کە گاز لە کلکی خۆت بگریت. من وای بە باش دەزانم هەر ئێستا دەستبەرداری کلکت بیت و لێی بکەیتەوە.

- کەواتە ئیتر بێدەنگ بە.

- تۆ لەگەڵ خۆتدا قسە دەکەیت.

- چی؟

- ڕۆحی دونیاش هەر هەمان شت دەکات.

- چی دەکات؟

- ڕۆحی دونیا لەگەڵ خۆیدا قسە دەکات، چونکە تەنها (یەک) ڕۆحی دونیا بوونی هەیە.

- ئەی ناوی ئەو ڕۆحە چییە؟

- خۆتیت.

بیرێکم لە قسەکەی کردەوە و دواتر وتم:

- ڕەنگە لە ژیانی داهاتوومدا ڕێزمان بخوێنم. تۆ دەڵێیت چی ئەگەر ناوی نامەی دکتۆراکەم بەم شێوەیە بێت: (پێناس و پلەی ئەنتۆلۆجی. هەوڵێکی سەرەتایی بۆ ڕاڤەکردنی ڕاناوی هەرە نوێی (تاک)ی پاشایەتی؟)

- بە بڕوای من شتێکی نایابە. تەنها ئەو کاتە زانستی زمانەوانی دەگاتە پلەی پۆزەتیڤی خۆی. لە ڕاستیدا هەموو ڕاناوەکانی تر کتومت (مایا)ن.

- (ئانا)ش مایایە؟

- بەڵێ ئەویش (مایا)یە.

- چونکە ئەویش لەگەڵ خۆیدا قسە دەکات.
- باشە هەر بۆ نموونە ئەی ئەو کەسانە کێ بوون کە لە سەدەی چواری پێش لەدایکبوونی مەسیحدا قسەیان لەگەڵ یەکتردا دەکرد؟

وتم:
- لە پێشدا (سوکرات) و شاگردەکانی بوون، دواتریش (پلاتۆن) و قوتابییەکانی بوون، پاشانیش (ئەریستۆتالیس) و (تیۆفراسد)، کە بە دڵنیاییەوە چەند گفتوگۆیەکی گرنگیان لەگەڵ مارمێلکە نیو پەنجەییەکانی سەر دوورگەی (لیسبۆس) ی یۆنانیدا ساز داوە...
- لەو بڕوایەدایت؟
- ئێ خۆ ناتەوێت مێژووشمان لێ بکەیت بە وەهم، ها؟
- مێژوو ئەو ڕۆحی جیهانەیە کە لەگەڵ خۆیدا قسە دەکات. لە سەردەمی کۆنیشدا (ئەنتیک)[59] هەروا بوو، هەرچەندە لە حاڵەتێکی خەواڵوودا ئەو شتانە ڕوویدەدا. ڕێک لەو کاتەدا بوو کە خەریک بوو مێژوو لە خەو هەڵدەسا.
- ئەوان لە گۆڕەپانەکەی ئەسینادا دەهاتن و دەچوون. سوکرات مرۆڤێک بوو کە لە گۆشت و خوێن پێکهاتبوو، مرۆڤێک کە حوکمی مردنیان بەسەردا دا تەنها لەبەرئەوەی کە بەدوای حەقیقەتدا دەگەڕا. برادەرەکانی لە چواردەوری کۆبوونەوە و دەگریان. ناتوانیت بەشێوەیەک لە شێوەکان ئەوە بهێنیتە بەرچاوت؟
- من نەمگوت کە ڕۆحی جیهان هەمیشە لەگەڵ خۆیدا تەبا بووە. هەروەها نەشمگوت کە بەردەوام ئاسودە بووە.
- چ قسەیەکی قۆڕی باو دەکەیت.
- کەواتە زیاترێک بگەڕێرەوە دواوە. کێ بوون ئەوانەی سەد ملیۆن ساڵ لەمەوبەر لە دەوری گۆڕەپانەکە کۆبوونەوە؟
- خۆشت زۆرباش ئەوە دەزانیت. دایناسۆرەکان بوون.
- دەتوانیت ناوی هەندێکیان بهێنیت؟
- بێگومان. لە ڕاستیدا ناوی زۆربەیان دەزانم.
- دە فەرموو بڵێ.
- مەبەستت لە ناوی ڕەگەزەکانیانە یان ناوی ڕەچەڵەک و خێزانەکانیان؟
- نەء، تۆ شێتیت؟ مەبەستم لە ناوی دایناسۆرەکانە وەک تاکێک.
- نەخێر ئەوەیان ناتوانم. ئەوە لە سەردەمی پێش مێژوودا ڕوویداوە.

- بەڕاست، ئەوە شتێکی وەها گرنگیش نییە، چونکە دایناسۆرەکانیش تەنها قۆناغێک بوون لە قۆناغەکانی پێشکەوتنی ڕۆحی جیهان. ئەو کاتە هێشتا (مایا) بەتەواوەتی کاریگەر نەبوو، هێشتا ئەو دوو سێ گرێی مێشکییە زیادەیە سەریان هەڵنەدابوو، مەبەستم لەو کاتەیە کە هێشتا وەهمی ئەقڵی مرۆڤ شتێکی دانەهێنابوو بە ناوی (من) و (تۆ)ەوە. ئەو کاتە ڕۆحی جیهان شتێکی گشتگیر بوو و دابەش نەبووبوو، ئەو کاتە هەموو شتێک (براهمان) بوو.

- واتە دایناسۆرەکان (براهمان) بوون و (مایا) کوێری نەکردبوون؟

- پڕاوپڕ وابوون.

- ئەمڕۆکە دایناسۆرەکان کۆمپانیای (شێڵ) و (تێکساکۆ)ن. چوارپەلە بێ ناوەکان خزاونەتە ناو دەورەی ژیانەوە و ئێستاکە خوێنی ڕەشی ڕۆحی جیهانن. تۆ قەت بیرت لەوە کردۆتەوە؟ بیرت لەوە کردۆتەوە کە سەیارەکانی ئێستاکە بە خوێنی گیانەوەرانی چاخی (کریتاسی) دەڕۆن بەڕێوە؟

- تۆ بەردەوام شتەکان بچکۆلە دەکەیتەوە و هەرواش دەبیت، بەڵام لەم خاڵەیاندا ڕاست دەکەیت.

- بەڕاشکاوی قسەی خۆت بکە. منیش دەمەوێت بگەمە ڕەچەڵەکی ئەم بابەتە.

- ئەگەر تۆ سەد ملیۆن ساڵ لەمەوبەر لەسەر ئەم ئەستێرە گەڕۆکە بوویتایە، ئەو کاتە (هەر بەهۆی ئەو گرێ زیادانەی مێشکتەوە) وەهمێکی درۆت لەلا دروست دەبوو و واتدەزانی هەموو گیانەوەرە خشۆکەکانی سەر ئەم زەوییە کۆمەڵەیەک تاکی تایبەتین. هەڵبەتە گەورەترینیشیانت وەک چوارپەلێکی زەبەلاحی دەبەنگ سەیر دەکرد.

- لەوەیاندا ڕاست دەکەیت کە من چاوێکی تیژم هەیە و گرنگییەکی زۆر بە فەردانییەت دەدەم، بەڵام هەرچی دەربارەی چوارپەلەکانە، ئەوەیان ڕای خۆتە.

- بەڵام ئێستاکە ئەو گیانەوەرانە تواونەتەوە و بوونەتە دەریاچەیەکی نەوتی مەزن. ئێستاکەش بوونەتە کۆمپانیای وەک (شێڵ) و (تێکساکۆ). هەر لیترەی بە هەشت کرۆنە بەڕێزم.

- ئێ منیش هەر وام گوت.

- تۆش هەر کتومت هەمان چارەنووس چاوەڕوانتە. لیترێکت بە هەشت کرۆنە.

- تێگەیشتم. مەگەر خەبەرم ببێتەوە و شتێکی تر ببینم.

- وایە ڕاستە.

– وە دواتریش لە کاتێکی خراپدا خۆم دەبینمەوە. ئەمە شوێنی تەواوەتیی من نییە. من فریشتەیەکی لەدایکبووم و بەئاشکرا دیارە کە لە تەنگانەدام.
لەو کاتەدا دیسانەوە بەرەولای جانتاکەم و ڕۆیشتمەوە و وتم:
– بەڵام خۆشبەختانە بەیانی ڕۆژێکی نوێ دێت.
بتڵەکەم نا بە دەممەوە و یەک دوو قومم فڕکرد. ئەو جارەیان، بەپێچەوانەی کەرەتی پێشووەوە، زۆر بە دڵی خۆم خواردمەوە و ویژدانیشم ئازاری نەدام. ئاخر لەگەڵ ئەو باسانەی گۆردن هەڵیڕشتن، بەدەر لە خواردنەوە هیچ چارێکی ترم لەبەردەستدا نەبوو. جگە لەوەش لە دڵی خۆمدا وتم ئاخۆ کەمێک سەرئێشە و وڕی ڕۆژی دواتر چی بێت بە بەراوردکردنی لەگەڵ باس و خواسی چەندین ملیۆن و ملیارد ساڵدا؟ لەویادا خەوتن تەنها ڕێگای ڕاستەقینەی بەردەستم بوو تا لە گێژاوی باسەکانی ئەو شەوە خۆم قورتار بکەم. خۆ ڕۆژێکی نوێ هەر دێت، ئیتر بە سەرئێشە و وڕییەوە بێت یان نا.
خۆم ئامادە کردبوو کە گۆردن سەرزەنشتێکی باشم بکات، کەچی زۆر بە ساکاری وتی:
– فرانک، نائومێدت کردم. مەبەستم لەوەیە کە تۆ نائومێدیت. بەرامبەر بە خۆت نائومێدیت.
– کەواتە دەبێت کەمێک نائومێد بین و لەمەیاندا هەردووکیشمان وەک یەک بەرپرسیارین.
– تۆ وتت (دەچم دەخەوم و نامەوێت زیاترێک بخۆمەوە).
– بەڵێ، بەڵێ ڕاستە وابوو، بەڵام دواتر تۆ وتت (بەڕاستی بڕوات پێ ناکەم).
– لەگەڵ ئەوەشدا هەر نائومێدم.
– بۆ تۆ ئاسانە وا بڵێیت. چەندە ئاسانە کە زاهیدێک بین ئەگەر کەیف و هەوای ژیان فریومان نەدات، نەک هەر ئەوەش، بگرە ئەگەر دەستمان بەو کەیف و سەفایەش نەگات، ئەوا هێندەی تر ئاسانە وەک زاهیدێک بژین. تۆ لە ڕۆژی ناولێنانتا وەک دیارییەک تەقینەوە گەورەکەت پێ نەبەخشرا. تۆ ناچار نیت لەڕێی تۆپەڵێک خانەی دەمارییەوە کە زیاد لە ڕادە گەشەیان سەندووە، ماوەی ساڵە تیشکییەکانی گەردوون بپێویت. تۆ هەست بە ماوە گەردوونییەکان ناکەیت کە بە چ شێوەیەک فشار دەخەنە سەر مێشک، هەستێکە کە تاڕادەیەک مەحاڵە مەزەندەی بکەیت.
کراسەکەم داکەند و چوومە ناو جێگاوە، ئینجا وتم:

- ئەگەر هەموو گەلەهەسارەکان بفرۆشم و داهاتەکەی بەسەر هەژاراندا دابەش بکەم، ئەو کاتە لەو بڕوایەدایت لە ئاسماندا سامانێک وەربگرم؟
وەڵامی دامەوە و وتی:
- نازانم، بەڵام ڕەنگە ماڵئاوایی لەم جیهانە بەلای گیانەوەرێکی شیردەری پۆست مۆدێرنەوە ئاسان نەبێت و سەختتریک بێت وەک لەو کاتەی کە (حاخام)ێکی جوولەکە ڕۆحی ئەو گیانەوەرەی پاک دەکردەوە.
- باشە، باشە.. قسەی بێ مانا و بێ مانا... بەڕاستی ئێستاکە پاڵ دەکەوم و دەخەوم.
- بەڵام تۆ قەت بەتەواوەتی ناخەویت.
- من خۆم لەو بڕوایەدام باش بخەوم. بەشێوەیەکی گشتی پەیمانم بە خۆم داوە کە یەک دوو پێک زیاتر نەخۆمەوە، بەڵام ئەم شەو بەدڵنیاییەوە دوو ئەوەندەم خواردەوە. ئەوەندەش بەسە.
- مەبەستم لەوەیە ئەگەر تۆ بشخەویت من هەر بەخەبەر دەبم.
- ماڵ ماڵی خۆتە.
- ئاخر ئەو کاتە تەواوی تۆ ناخەوێت.
- ئۆهۆوو!
- خۆت دەزانیت شتێک نییە کە ناوی (من) و (تۆ) بێت. تەنها (یەک) ئێمە بوونی هەیە.
- بەیارمەتی خۆت بۆ نانی بەیانی خەبەرم بکەرەوە.
- زۆرباشە، بەڕێز، بەڵام لە ڕاستیدا تۆ خۆت خەبەرت دەبێتەوە.
لەگەڵ ئەو قسانەدا بە ئاوێنەکەدا هەڵگەڕا، چووە سەر دیوارەکە و لەوێشەوە تا سەقفەکە نەوەستایەوە، ڕێک لەسەر سەرینەکەمەوە گیرسایەوە.
پرسیم و وتم:
- ئەوە چی دەکەیت؟
- ئێ تۆ خۆت نەتگوت بۆ نانی بەیانی خەبەرت بکەمەوە؟
سەرم بە لاکەی تردا وەرچەرخاند و بیرم لەوە کردەوە کە چ ڕۆژێکی دووروودرێژم ڕابوارد، بەڵام پێم خۆش نەبوو بیر لەو حاڵەتە بکەمەوە کە ڕۆحی جیهان لە سەرەوە گووم پیادا بکات.

# کۆترە ڕەنگ پرتەقاڵییەکە

دەبێت دان بەوەدا بێنم کە تا ئێستاش کاریگەریی ئەو مشتومڕە توندانەم لەسەرە کە لەنێوان من و (گۆردن)ی مارمێلکەدا ڕوویاندا، دەبێت بڵێم بەشێوەیەک لە شێوەکان تا ئێستاش پەیوەندیم بە تەواوەتی لەگەڵیدا نەپچڕاوە، چونکە لێرەشدا لە مەدرید، لە ماوەی چەند ئێوارەیەکی درەنگدا، کۆمەڵێک گفتوگۆی دوورودرێژم لەگەڵیدا دامەزراند و هەستێکی تێکەڵ لە خۆشی و ناخۆشی پێ بەخشیم. زۆرجار ئەو کەسانەی ڕۆژێک لە ڕۆژان شتێکی جیددی ناوەوەمانیان وروژاندووە، دواترێک دێنەوە ناو یادەوەریمان. پێی دەچێت ئەو جۆرە ناسیاوانە بگەڕێنەوە لامان، تەنانەت ئەگەر بۆ ماوەی چەندین ساڵیش پەیوەندی ڕاستەوخۆمان لەگەڵیاندا نەبووبێت و چاویشمان پێیان نەکەوتبێت.

بەدرێژایی شەوەکە دانیشتبووم و دەمنووسی. پاش یەک دوو سەعات خەویش، بەپەلە پیاسەیەکم بە لای (ڕیتن)دا کرد و تا پارکی (ڕیتیرۆ) ڕۆیشتم، دواتریش لە (ڕۆتوندە)دا نانی بەیانیم خوارد. وای لێهاتووە هەرکە دەچمە ئەو چێشتخانەیە و لەبەردەم ئەو دەرگایەدا دەوەستم کە لە پشتیەوە هێلکەوڕۆنی لێ دروست دەکەن، یەک دوو خولەک دواتر دوو هێلکەی سوورەوەکراوم بۆ دەهێنن کە هەردوو دیویان سوور کردۆتەوە و دوو پارچە گۆشتی تەنکی بەرازیشی دەخەنە سەر، لەگەڵ قاپێک فاسۆلیا و تەماتەدا بۆم دادەنێن.

لە دواهەمین ڕۆژمدا لە (تاڤیونی)، بۆ ماوەیەک چاوم بە خەڵکە بەتەمەنەکانی لادێی (سۆمۆسۆمۆ) کەوت و کاتێکی خۆشم لەگەڵیاندا بردە سەر. من بەتەواوەتی دەستم لە لێکۆڵینەوەکانم هەڵنەگرتبوو و دەمویست دوا نوێکاری بزانم، دەمویست بزانم لە ساڵانی پێشوودا بە چ جۆرە پلانێک توانیویانە ژینگە کۆنەکەیان بپارێزن، بێگومان بەو شێوەیەش ژیانی کۆمەڵێک ڕووەک و ڕەگەزی گیانەوەرانی تایبەتیان لە ژیاندا هێشتبووەوە. هەر لەو چاوپێکەوتنەدا هێندەم بۆ ڕوون بووەوە کە یەکەمین سەرۆک

هەرێمی ئینگلیزی سەر دوورگەکانی فیجی میستەر (ئارتەر گۆردن)ی بەناوبانگ بووە، کە لە ساڵی (١٨٧٥)ەوە تا ساڵی (١٨٨٠) فەرمانڕەوایی لەدەستدا بووە. وابزانم لەوەوپێش لە بۆنەیەکدا ئەو ناوەم بەرگوێ کەوتبوو، بەڵام پێم خۆش نەبوو ئەو ناوەم بەبیر بهێنرێتەوە، چونکە بەو شێوەیە هێدی هێدی دوورگەی (گاردن) لەبەرگوێمدا دەبووە دوورگەی (گۆردن). هەروەک خۆشت دەزانیت خۆشەویستیی من بۆ جنی (گۆردن)ی لەندەنی بۆ ماوەیەکی زۆر لەوەوپێشتر دەگەڕێتەوە. ڤیرا، من خۆم باش ئەوە دەزانم و دەشزانم کە تۆ بڕوام پێ ناکەیت، بەڵام تاڕادەیەک تەنها لە سەفەردا ئاوهام. ئاخر من لەو کاتانەدا کە تەنها دەبم، زۆرباشی ناگوزەرێنم. بەدەر لەوەش کاتی خۆی تۆ خۆت کەمێک لە خەتاکەت خستە سەر ئەستۆی (گۆردن). لەویادا لەوەدەچوو گوێم لە دەنگی تۆ بێت.

کەمێک سەرم گێژی خوارد و بەپەلە خۆم کرد بە دوکانی لادێکەدا، ویستم بزانم هیچ جۆرە ڤیتامینێک دەفرۆشن یان نا؟! خەڵکێکی زۆری لادێکە لەو دوکانە بچکۆلەیەدا بوون، بەڵام خەریک بوو لە هۆش خۆم بچم کە ئانا و خۆسێم لەویادا بینی. دواتر هەرسێکمان پێکەوە لە دوکانەکەدا هاتینە دەرەوە، لە دڵی خۆمدا وتم: «ڕەنگە ئەمە دواجارمان بێت کە بە تەنها پێکەوە بین»، لەبەرئەوە جورئەتم دایە بەرخۆم و هەوڵم دا بۆ دواجار ڕووبەڕوویان ببمەوە. ئەو پاشنیوەڕۆیە زۆر سارد و بێ تاقەت دیار بوون، بێگومان پەیوەندییەکی بەو هەڵسوکەوتە سەیروسەمەرەیەی دوێنێ ئێوارەی جۆنەوە هەبوو، بەڵام من هیچ بوارێکی ترم لەبەردەستدا نەبوو. پێشنیوەڕۆی ڕۆژی دواتر سەفەرم دەکرد و پێدەچوو قەت قەت ئانا و خۆسێ نەبینمەوە.

لە دەرەوەی دوکانەکەدا خۆسێ جگەرەیەکی داگیرساند، ئاناش سەری بتڵێکی پلاستیکی ئاوی کانزایی کردەوە. وا لە ڕەفتارەکەیان تێگەیشتم کە بەرلەوەی لە یەکتر جیا ببینەوە، بیانەوێت کەمێک پێکەوە قسە بکەین. منیش ڕاستەوخۆ چوومە ناو بابەتەکەوە. ڕێک تەماشای ناو چاوە ڕەشەکانی ئانام کرد و ڕاستەوڕاست وتم:

– هەرچەندە لەوانەیە کەمێک سەیر بێت بەلاتەوە، بەڵام بەڕاستی وا هەست دەکەم لەوەوپێش تۆم بینیبێت.

هەر دوابەدوای قسەکەم یەکسەر خۆسێ ئانای بەلای خۆیدا ڕاکێشا، هەر کتومت بەهەمان شێوەی ئێوارەی پێشوو بەلای خۆیدا ڕایکێشا کاتێک کە لەسەر مێزەکە دانیشتبووین. ئانا تەماشایەکی خۆسێی کرد، لەوەدەچوو داوای ڕەزامەندی لێ بکات تا وەڵامم بداتەوە. ئینجا پرسی:

- بیرت ناکەوێتەوە لەکوێ منت بینیوە؟
- من ماوەیەکی زۆر لە ئیسپانیادا ژیاوم.
- ئاخر ئیسپانیا (٥٢) پارێزگای هەیە.
وەڵامم دایەوە و وتم:
- هەر رێک هێندەی ژمارەی ناوچە هەرێمییەکانی دوورگەکانی فیجی کە دەنگ بۆ پەرلەمانەکەیان دەدەن.
هەروا بۆ خۆشییەک وتی:
- تۆ سەردانی دوورگەکانی (کەناری) ناکەیت؟
سەرم بۆ راوەشاند:
- زیاترێک لە مەدریددا بووم. بڵێیت لەوێ تۆم دیبێت؟
لەوە دەچوو خۆسێ وای هەست کردبێت کە قسە کورتەکانی نێوانمان هێدی هێدی دەگۆرێت و وەک جۆرە لێپرسینەوەیەکی لێ دێت، چونکە لەویادا وتی:
- ئافرەتی قژرەش لە ئیسپانیادا زۆرن. ئەوە راستییەکە و خۆشت باش ئەوە دەزانیت فرانک. لە مەدریدیشدا هەر وایە.
بەردەوام هەر تەماشای ناو چاوی ئانام دەکرد. دڵنیا نیم، بەڵام وابزانم بە چاوی جۆرە وەڵامێکی دامەوە، جۆرە گەشانەوەیەکی بچکۆلەم لە گلێنەی چاویدا بینی و هێندەی تر وای لێ کردم کە گومان لە یادەوەرییەکەم نەکەم. پرسیارێکی ترم لێ کرد وتم:
- باشە خەڵکانی تریش هەمان شتت پێ ناڵێن؟
دیسانەوە کەرەتێکی تریش سەیری خۆسێی کردەوە. لەوەدەچوو داوای ئەوەی لێ بکات کە رێگای پێ بدات نهێنییەکم بۆ بدرکێنێت، ئەویش وا خۆی نیشاندا کە داواکەی رەت بکاتەوە و بەهیچ جۆرێک جووڵەی بۆ نەکرد، بەڵام ئانا خەندەیەکی میهرەبانی خستە سەر لێوانی و لە وەڵامدا وتی:
- لەوانەیە لە مەدرید منت بینیبێت، بەڵام بەداخەوە من تۆم بیر نایەتەوە.
وا تێگەیشتم هەموو شتێکی نەدرکاند، بەڵام هاوکات وشەکانیم وەک وەڵامێکی دبلۆماسیانە لێکدایەوە. ئەو خۆی زۆرباش دەیزانی بۆچی من ئەو پرسیارەم لێ کرد.
ئەوان سەیارەیان پێ بوو و دەیانویست تا سەر (ڤونا پۆینت) برۆن، کە دەکەوێتە ئەوسەری بەشی خوارووی رۆژئاوای دوورگەکەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پێشنیاریان

کرد لە پێشدا تا تاڤیونیم بەرنەوە، منیش سوپاسم کردن و وتم (پێم خۆشە ئەو چوار کیلۆمەترە بە پێ برۆم).
پاش ئەوەی بەلای لادێی (نیئوساوا)دا تێپەڕیم، کچێکی پرچ ڕەشم بینی لە پێشمەوە دەڕۆیشت، جلوبەرگی وەرزشی لەبەردا بوو و کۆڵەپشتێکی قوماشی بە پشتەوە بوو. لاورا بوو، پانتۆڵێکی فشی خاکی و بلوسێکی تەسکی قۆڵدرێژی لەبەردا بوو، جۆرە کڵاوێکی شێوە خوودەشی لەسەردا بوو. جلوبەرگەکەی پیس بوو و شەلالی ئارەق بوو، تا سەر لوتکەی (داس ڤۆیوکس پییک) ڕۆشتبوو کە دووهەمین چیای بەرزی دوورگەی تاڤیونییە، ئەو لوتکەیە نزیکەی (١٢٠٠) مەترێک لەسەرووی ئاستی دەریاوەیە. بەئاشکرا دیاربوو کە هیلاک بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا خەندەیەکی گەورەی خستە سەر لێوانی و لەو کاتەدا کە گەیشتمە لای یەکسەر وتی:
- بینیم.
هەروەک منداڵێک خۆی دەلەراندەوە و دەموچاوی وەک کەسێک گەشایەوە کە تازە ڕووی لە ئایینێکی نوێ کردبێت. خۆم لە خۆمم پرسی و وتم: «بڵێیت خودی حەقیقەتی بینیبێت؟ یان بڵێیت دەوەنێکی سوتاوی بینیبێت؟»
ئینجا وتی:
- بەڕاستی وەسف ناکرێت. هەر ڕێک لەدوای ئەوەی کە خۆر هەڵهات لەسەر شاخەکە بینیم.
تا ئەو کاتەش نەمدەزانی لە چ شوێنێک بووە، بەڵام وتی:
- کۆترە ڕەنگ پرتەقاڵییەکەم بینی.
- دڵنیایت؟
- هەر زۆر دڵنیام.
- لەسەر شاخی (داس ڤۆیوکس پییک)؟
سەری لەقاند و بەدەم هەناسەبڕکێوە وتی:
- دواتریش... ڕەسمم گرت... لە زومی کامێراکەمەوە وێنەم گرت.
ئینجا تێگەیشتم و خۆم بە خۆمم وت ئەگەر بەڕاستی وابووبێت، ئەوا شتێکی یەکجار گەورەی ئەزموون کردووە، چونکە ئەو کۆترە ڕەنگ پرتەقاڵییەی چەندین جار باس کراوە، نەک هەر زۆر دەگمەنە، بەڵکو لە شوێنێکدا خوێندبوومەوە کە تا ئێستا هیچ وێنەیەکیشی نەگیراوە.
وتم:

- کەواتە زۆر پێی دەچێت تۆ یەکەمین کەس بێت کە وێنەت گرتبێت.
- دەزانم.
- لەوانەیە دواهەمین کەسیش بێت.
- دەزانم.

وەک ئەوەی ئیرەیی پێ بەرم وتم:

- بەلایەنی کەمەوە پێم خۆشە وێنەیەکیم بۆ بنێریت.

دەستی بۆ ڕاکێشام تا تەوقەی لەگەڵدا بکەم و منیش سەلامەکەیم وەک پەیمانێک لێک دایەوە کە وێنەیەکم بۆ بنێرێت. هاوکاتیش مانای ئەوە بوو کە ناچار بووم دواتر ئەدرێسەکەمی بدەمێ، ئەوەش شتێکە کە من لە کاتی سەفەردا زۆر زۆر ئاگاداری دەبم.

پێکەوە کەوتینەوە ڕێ. لێم پرسی:

- باشە نەدەکرا بە منیشت بوتایە تا لەگەڵت بێم؟

پێکەنی و وتی:

- فریای ئەوە نەکەوتم، میستەر! تۆ دوێنێ شەو هەر زۆر بەپەلە مێزەکەت جێهێشت و ویستت بخەویت.

لاورا هێندەی پێ وتم کە بەرەبەیانی زوو کە دونیا هێشتا تاریک بووە هەڵساوە. هەر ڕۆژی پێشتریش سەیارەیەکی داوا کردووە تا لادێی (وایریکی) ببات، بە خۆی و چەقۆیەکی تایبەتی ناو دارستان و لایتێکی ناوچەوانییەوە شەش کیلۆمەترێک بە چیاکەدا هەڵزناوە، دواتریش پاش سەعاتێک ئینجا خۆر هەڵهاتووە. هەروەها وتی هەر لە بنەڕەتدا بۆ بینینی ئەو کۆترە ڕەنگ پرتەقاڵییە هاتۆتە سەر دوورگەکە و ئاواتەکەشی هاتۆتە دی و تەواو.

لەسەر لوتکەی (داس ڤۆیوکس پییک)ەوە تەماشای دەریاچەی (گایمۆئوشیا)ی خوارەوەی کردووە کە دەکەوێتە ناوەڕاستی ناوچە بورکانییە خامۆشەکەی دوورگەکەوە. نزیکەی سەرتاپای ئاوی ئەو دەریاچەیە بە ڕووەک داپۆشراوە و تەنها شوێنیشە کە گوڵی تایبەت بە دوورگەکانی فیجی لێ بڕوێت، ئەمان وەک گوڵی نەتەوەیی خۆیان تەماشای دەکەن و پێی دەڵێن (تاجیموشیا)، یان (میدینیللا وتەرهاوسی)، گوڵێکی سوورە و پەڕەکەکانی سپییە. بەسەر ڕێگا تەپوتۆزاوییەکەی لادێکەدا دەڕۆیشتین و بەردەوام ناچار بووین بەملاولادا خۆمان لابدەین تا پێ بە بۆقە گەورەکاندا نەنێین کە لەسەر سەرڕێگاکە پان بووبوونەوە، لەو کاتەدا لاورا

پرسی:

- تۆ دەزانی گوڵی (تاجیموشیا) چۆن دروست بووە؟

سەرم بۆ ڕاوەشاند و ئەویش بەم شێوەیە باسی ئەفسانەی (تاجیموشیا)ی بۆ گێڕامەوە و وتی: «کاتی خۆی، چەندین ساڵ لەمەوبەر، شازادەیەک لە (تاڤیونی)دا ژیاوە. باوکی، کە سەرۆکی خێڵەکە بووە، پیاوێکی بۆ دەستنیشان کردووە کە شووی پێ بکات، بەڵام شازادەکە پیاوێکی تری خۆش ویستووە، بڕیارەکەی باوکی نائومێدی کردووە، لەبەرئەوە لادێکەی جێهێشتووە و بەرەو شاخەکان هەڵهاتووە. دواتریش هیلاک و ماندوو بووە و لە قەراغ ئاوی ئەو دەریاچەیەدا خەوی لێ کەوتووە. بەدەم خەوەوە زۆر بەکوڵ گریاوە، فرمێسکەکانی لە کوڵمییەوە خزاونەتە خوارەوە و بوونەتە گوڵی سووری جوان جوان. بەو شێوەیەش یەکەمین گوڵی (تاجیموشیا) سەریهەڵداوە، (تاجیموشیا) واتە (گریان بەدەم خەوەوە)».

من قسەکانیم وەک چیرۆکێکی خۆش لێکدایەوە، کەچی دوای ئەوە وتی:

- من خۆشم کتومت ئەوەم بەسەرهاتووە.

- بەدەم خەوەوە گریاویت؟

سەری ڕاوەشاند و وتی:

- مەبەستم لە شووکردنە بە بێ ویستی خۆت..

- لەوەوپێش هاوسەرت هەبووە؟

کەمێک سەری بۆ لەقاندم و وتی:

- بەڵام ئەفسانەیەکی تریش دەربارەی (تاجیموشیا) هەیە.

دیسانەوە دەستی کردەوە بە گێڕانەوە: «چەندین چەندین ساڵ لەمەوبەر کچێک لە (تاڤیونی)دا ژیاوە، کاتی خۆی ئەو کچە بە قسەی دایکی نەکردووە. بەردەوام لەبری ئەوەی ئیش بکات، یاری کردووە. ڕۆژێکیان دایکی حەوسەڵەی نامێنێت، سەفتەیەک گەڵای دارگوێزی هیندی دەکێشێت بە کچەکەیدا و پێی دەڵێت (بڕۆ دەرەوە و چیتر نامەوێت بتبینمەوە). کچە دڵشکاوەکەش بەدەم گریانەوە هەڵدێت، هەتا دەتوانێت لە ماڵەکەیان دووردەکەوێتەوە. لەناو قووڵایی دارستانەکەدا دەگاتە لای داری لاولاوێک کە خۆی لە دارمێوێکەوە ئاڵاندووە. بە قەدی دارمێوەکەدا هەڵدەزنێ، بەڵام دواتر بەتەواوەتی لە قەدەکان دەئاڵێت و ناتوانێت بێتەوە خوارەوە. هەر دەگری و دەگری، فرمێسکەکانیشی بە دەموچاویدا دێنە خوارەوە، دەگۆڕێن و دەبنە خوێن، کاتێکیش بەر قەدی دارمێوەکە دەکەون دەبنە جوانترین گوڵ. دواجاریش دەتوانێت خۆی

ڕزگار بکات و بە ڕاکردن دەگەڕێتەوە ماڵەوە. ئەو کاتە دایکیشی ئارام بۆتەوە و بەو شێوەیە چیرۆکەکە بەشێوەیەکی خۆش کۆتایی دێت، بەڵام خەڵکی (تاڤیونی) لەو بڕوایەدان کە ئەو گوڵە دەگمەنە لە فرمێسکەکانی ئەو کچە گەنجەوە سەریان هەڵدابێت».

هەروا بۆ خۆشی لێم پرسی:

- ئەی تۆش هەمان شتت بەسەردا هات؟

زۆر بە جیددی سەری بۆ لەقاندم، بەهیچ شێوەیەک دیار نەبوو کە بەتەوسەوە سەر بلەقێنێت.

- تۆش لەناو قەدی دارمێوێکدا گیرت خوارد؟

دیسانەوە سەری بۆ ڕاوەشاندمەوە و وتی:

- منیش دایکم پشتی لێ هەڵکردم.

پاش ئەوە لە شوێنی خۆیدا وەستا، ڕووی تێکردم و وتی:

- فرانک، دەمەوێت نهێنییەکت بۆ بدرکێنم.

- بەڵێ؟

- من منداڵێکی چارەنەویست بووم.

لە دڵی خۆمدا وتم: «مەگەر بەلایەنی کەمەوە نیوەی منداڵانی سەر ئەم زەوییە بەو شێوەیە نەبن؟»

بەئاشکرا فرمێسکێکی بچکۆلەم لەناو چاوە سەوزەکەیدا بینی، لەبەرئەوە باوەشێکم پێدا کرد و سەریم نوساند بە سنگمەوە. بۆ ماوەیەک بەو شێوەیەماینەوە، دواتریش سەری بەرز کردەوە و ڕێک تەماشای ناو چاوی کردم. منیش پەنجەیەکم بە لێویدا خشاند و لەو کاتەشدا کە زمانێکی بە پەنجەمدا هێنا، بەسەریدا چەمامەوە و ماچێکم کرد. توند بە خۆمەوە نوساندم و بەرم نەدا تا لە ڕێگەی غەریزەمەوە شەرمم کرد و ناچار بووم وازی لێ بهێنم.

دیسانەوە بە ڕێگاکەدا کەوتینەوە ڕێ، ئینجا من کەوتمە گێڕانەوەی ئەو ئەفسانانەی کە لەسەر دوورگەکانی خوارووی ئۆقیانووسی ئارامدا بیستبووومن. هەر بۆ نموونە بە چەندین شێوە لەو ناوەدا ئەو چیرۆکەم بەرگوێ کەوت کە باسی ئەوە دەکات ئافرەت نابێت زۆر نزیک ببێتەوە لە مارمێلکە، ئەگینا پێی دەچێت مارمێلکەی ببێت. هەروەها باسی ئەفسانەی فرە دڵتەنگی (ڤیرانا)شم بۆ گێڕایەوە.

ڤیرانا کچێکی قەشەنگ بووە و هێندە داواکاری زۆر بووە کە نەیزانیوە کامیان

هەڵبژێرێت. بەردەوام گلەیی کردووە و وتویەتی (پێویستیم بە کاتی زیاترە تا بڕیار بدەم). ڕۆژێکیان کابرایەکی جادووگەر خواردنەوەیەکی ئەفسووناوی دەداتێ و پێی دەڵێت (ئەگەر نیوەی ئەم شلە ئەفسووناوییە بخۆیتەوە، ئەوا بۆ هەتاهەتایە دەژیت. بەو شێوەیەش کاتێکی باشت لەبەردەستدا دەبێت تا ئەو پیاوە گونجاوە بدۆزێتەوە کە دەتەوێت. ئەو کاتەش دەتوانیت نیوەکەی تری بدەیت بەو پیاوە تا ئەویش بۆ هەتاهەتایە لەگەڵتا بژی). ڤیرانا بەپەلە شلە ئەفسووناوییەکەی دەخواتەوە و پاشان چەندین ساڵ ژیانی بەسەر دەبات بەبێ ئەوەی بتوانێت پەنجە بخاتە سەر پیاوێکی دیاریکراو. سەد ساڵ تێدەپەڕێ و ڤیرانا هەروەک جاری جارانی جوان و گەنج دەمێنێتەوە، بەڵام لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا بەردەوام هەڵبژاردنی پیاوێکی دیاریکراو بەلایەوە سەختتر و سەختتر دەبێت. دواتر تێدەگات کە شلە ئەفسووناوییەکە هێندەی تر کارەکەی سەخت کردووە و وای لێ کردووە کە هەروا بەئاسانی نەتوانێت بڕیارێک بدات و کەسێک هەڵبژێرێت، نەک تەنها لەبەرئەوەی کە پیاوانی زۆرتری لەبەردەستدا بووە تا یەکێکیان هەڵبژێرێت، بەڵکو بەدەر لەوەش کاتێکی یەکجار یەکجار زۆری لەبەردەستدا بووە تا بڕیارێک بدات. هەروەها ئەو کەسەی کە دەبووایە هەڵیبژێرێت تەنها هێندەی تەمەنی کەسێکی ئاسایی لەگەڵیدا نەدەمایەوە، بەڵکو دەبووایە تا هەتاهەتایە لەگەڵیدا بژی، ئەمەش خۆی لە خۆیدا هێندەی تر بڕیارەکەی سەختترێک کردووە. پاش دوو سەد ساڵ هێندە داواکاری زۆری هەبووە، کە چیتر لە توانایدا نەبوو هیچ پیاوێکی خۆش بوێت. نەگبەتییەکەشی لەوەدا بووە کە حوکم دراوە بەسەریدا کە تا هەتاهەتایە لەسەر ئەم زەوییە بژی، تەنانەت ئەمڕۆکەش هەر بەسەر ئەم زەوییەدا دەخولێتەوە. لەبەرئەوە کاتێک پیاوێک دەکەوێتە داوی عەشقی کچێکەوە کە ناتوانێت بڕیار بدات، دەبێت وریا بێت، چونکە لەوانەیە ئەو کچەی کە عاشقی بووە هەر هەمان ئەو ڤیرانا ڕاڕا و هەست سارده بێت. بەو شێوەیەش چەندین پیاو دڵ و گەنجێتیی خۆیان بە ڤیرانا دۆڕاندووە، هیچ کەسێکیشیان قەت قەت نەیتوانیووە دڵی بەلای خۆیدا ڕابکێشێت.

لەویادا هەروا وتی:

- ئاه.. شەیتانی نەحلەتی.

منیش لەدوایەوە وتمەوە:

- بەڵێ.. ئاه، شەیتانی نەحلەتی.

کە گەیشتینە قەراغ ئاوی پرێنس (چارلس) پێڵاوەکانمان داکەند، کەوتینە

کۆکردنەوەی سەدەف و دەماندا بە یەکتری، هەروەها ئەستێرەیەکی دەریای شینی تۆخمان بینی و لە نزیکەوە لێی ورد بووینەوە. لاورا پێی وابوو ناوی پۆلی گیانەوەرە ئەستێرەییەکان (ئەسترۆیدیا) لەو ڕەگەزەوە هاتبێت، یان لە ماسیی ئەستێرەییەوە هاتبێت، چونکە بەڕاستی هەر لە ئەستێرە دەچوو. لاورا وتی: «خۆ ڕەنگە ئەفسانەیەک هەبێت لەو بارەیەوە و باس لە ئەستێرەیەکی ئاسمان بکات کە کاتی خۆی کەوتبێتە خوارەوە و بووبێت بە ئەستێرەیەکی دەریا، ئەگەر شتێکی واش نەبێت، ئەوا دەتوانین خۆمان ئەفسانەیەکی لەو جۆرە بهۆنینەوە، بەڕاستی هێشتا سەردەمی هۆنینەوەی ئەفسانە بەسەر نەچووە».

ئەو ڕۆژە هەستمان بە مایا یاخود وەهمی جیهانی نەکرد. لە دڵی خۆمدا وتم: «مێشکی لاورا هەروەک ڕەنگی چاوەکانی ڕێک بووە بە دوو بەشەوە»، واشی بۆ چووم کە چاوە سەوزەکەی کۆترە سنگ پرتەقاڵییەکەی بینیبێت و چاوە قاوەییەکەشی فەلسەفەی هیندی خوێندبێت. بەلایەنی کەمەوە وام دانا چاوە سەوزەکەی ئەستێرەی دەریاییە شینەکەی بینیبێت، چاوە قاوەییەکەشی توانای نەبوو بەهای فەردانییەتی مرۆڤ ببینێت.

بەسەر گردەکەدا سەرکەوتین و بەرەو ناو باخی دارگوێزە هیندییەکان ڕۆیشتین، لەو کاتەدا لاورا پێی ڕاگەیاندم کە ئەو ئێوارەیە ئاهەنگێکی گەورە لە (ماراڤیو) ساز دەکرێت، هەروەها وتی پتر لە سەد کەسی دانیشتووانی دوورگەکەش بەشداری تێدا دەکەن. ئەوان ناوی ئەو ئاهەنگەیان نابوو (گوونوسید)، ئەوەش جۆرە کۆبوونەوەیەکە کە هەر کەسەو بەجۆرێک شتێک پێشکەش دەکات و تەواوی قازانجە ماددییەکەش بۆ مەبەستێکی کۆمەڵایەتی بەکار دەهێنن، ئەو جارەیان پارەکەیان بۆ منداڵانی هەژاری لادێکە کۆدەکردەوە تا بتوانن مەسرەفی قوتابخانەی پێ دابین بکەن. بێگومان میوانەکانی (ماراڤیو)شیان بانگهێش کردبوو. لاورا وتی:

- دەبێت لە تەنیشت خۆمەوە دابنیشیت.

پاش چەند سەعاتێک لەسەر مێزێکی نانخواردنندا خۆمم لەگەڵ لاورا و جۆن و ماریۆدا بینییەوە. هەموو مێزە بچکۆلەکانیان ڕازاندبووەوە و هێشتا بۆ ئێوارەکەی چاوەڕوانی میوانی تریشیان دەکرد.

بیڵ خۆی کرد بە ژووردا و ڕێک لەو کاتەدا لاورا بەپەلە دواهەمین جێگای بەتاڵی سەر مێزەکەی دا بە کابتنە ئیتاڵییەکە، بەو شێوەیەش ئەمریکییە بەزەوقەکە نەک هەر ئەوەندەی بۆ دەرکەوت کە لەسەر مێزەکە شوێنی بەتاڵ نەماوە، بەڵکو

ناچاریش بوو لەگەڵ چەند کەسێکدا دابنیشێت کە هەر نەیدەناسین.
بەڵام هەر زوو شکستەکەی بە سەرکەوتن کۆتایی هات، چونکە دەرکەوت لەگەڵ (کاپینا)ی بەناوبانگ و (ڕۆبێرتا)ی هاوسەریدا دانیشتووە، کاپینا خۆی لە بنەڕەتدا خەڵکی (هاوای)ە و بەدەر لەوانیش کوڕێکی خۆش مەعشەریش لەسەر مێزەکەیان بوو، ئەو ناوی خۆی بە (هارڤی ستۆلز) ناساند. کاپینا کەسێکی زۆر دیاری ئەو ئێوارەیە بوو، پیاوێکی چوارشانەی بەقووەت، خۆر ڕەنگی دەموچاوی قاوەیی کردبوو، ڕوومەتەکانی هەڵتۆقیبوون و دانەکانیشی سپی و گەورە بوون. ئەو پیاوە ماسیگرێکی بەناوبانگی دەریا قووڵەکان بووە، کاتی خۆی هەر لە تەمەنی (٢٣) ساڵیدا خەڵاتی یەکەمی پێشبڕکێی (لاهاینا)ی بردۆتەوە، ئەو کاتە توانیویەتی ماسییەکی (مارلین)ی گەورە ڕابکێشێتە ناو بەلەمەکەیەوە کە کێشەکەی (١٢٠٢) پاوەن بووە. ئێستاکەش تەمەنی لە ناوەڕاستی چلەکاندایە، وازی لە ماسیگرتنی ناو دەریا قووڵەکان هێناوە و گواستوێتیەوە بۆ تاڤیونی، لێرەدا بەلەمێکی مۆدێرنی هەیە کە ناوی ناوە (ماکایرا) و گەشتیاران بە مەبەستی ماسیگرتن دەباتە تەنگەبەری (سۆمۆسۆمۆ). هەر ئەو پێشنیوەڕۆیە هەموو ئەو ماسییانەی کە لە ئاهەنگی ئەو ئێوارەیەدا دەخرانە سەر مێزەکان و دەخوران ئەو گرتبوونی، ئەو بەو شێوەیە بەشی خۆی لە ئاهەنگی (گوونوسید)ی ئەو ئێوارەیەدا بەخشی. ئەو پێشنیوەڕۆیە بەدەر لە (هارڤی) کە سەرپەرشتیاری بەلەمەکەیە، (کای)شی لەگەڵ خۆیدا بردبوو کە چێشتلێنەری (ماراڤیو)وە و هەر ئەویش بە جوانترین شێوە ماسییەکانی ئامادە کردبوو. لە کاتی نانخواردندا (بیڵ) ئێمەی بە (کاپینا) و (ڕۆبێرتا) و (هارڤی) ناساند، بەو شێوەیەش بەبێ ویستی خۆمان کەوتینە ناو ئەو بابەتە تەکنیکیانەوە کە دەکرێت لەنێوان ئەندازیارێکی نەوت و ماسیگرێکی قووڵایی دەریادا سەرهەڵبدات.
ئانا و خۆسێ لەسەری ئەوسەری چێشتخانەکەدا لەگەڵ (مارک) و (ئێڤیلین)دا دانیشتبوون. ئەو کاتەی ئێمە لەسەر مێزەکەمان دانیشتین، لەوەدەچوو ئەو دوو ئیسپانیایە بیانەوێت لەسەر مێزی دوو ئەمریکییە گەنجەکە دابنیشن. وابزانم ئەوان بەو شێوەیە دەیانویست خۆیانمان لێ بکێشنەوە.
هەر پاش نانخواردن، کۆرسێکی بچکۆلە و ئۆرکێسترایەک هاتن. هەر هەموویان لە تێکەڵەیەکی موزیکژەنەکانی لادێکە و فەرمانبەرانی (ماراڤیو) پێکهاتبوون هەروەک (سیپۆ) و (سای) و (ستینی) باخەوان و هەروەها (ئێنیسی) بارمان و (کای) و (ڤیرە)ی خزمەتگوزاری ژوورەکان. گیتاری گەورە و بچووکیان دەژەنی و بە دەنگێکی

زوڵاڵەوە گۆرانیان بەسەر (گایمۆئوشیا) و (ماراڤیو) و هەموو ئەوانەدا هەڵدەدا کە بەسەر هەورەکاندا سەفەریان کردووە و لە هەموو سوچ و قوژبنێکی دونیاوە خۆیان گەیاندۆتە سەر دوورگەکە. بەدەر لەوانەش چەند هەڵپەڕکێیەکی (میکە)یان پێشکەش کردین کە جۆرە هەڵپەڕکێیەکی فۆلکلۆری تایبەت بە ناوچەکەیە، لەو هەڵپەڕکێیانەدا لە ڕێگەی تێکەڵەیەکی گۆرانی و دەربڕینی دەموچاو و جووڵەی لە ڕادەبەدەری دەستەوە، ئەفسانە کۆنەکانی (فیجی)یان نمایش کرد.

پاش هەڵپەڕکێ فۆلکلۆرییەکە، (یۆکین کیس) هاتە لای مێزەکەمانەوە و بانگهێشی کردین تا بەشداری سروتی (کاڤا) بکەین، کاڤا یان (یاگۆنا) جۆرە مەشروبێکی قورسە و لە ڕەگی ڕووەکێکی بیبەر دروستی دەکەن کە کەمێک ماددەی بێهۆشکەری تێدایە و پێی دەڵێن (پیپەر میتهیوستیکوم). مەشروبەکەیان لە قاپێکی گەورەی تەختەدا دانابوو و بە لەتی گوێزێکی هیندی خواردمانەوە. جۆن لەوەوپێش کاڤای خواردبۆوە و دەعوەتەکەی ڕەت کردەوە، بەڵام لاورا لە کتێبی (ئەستێرەی گەڕۆکی تاقانە)دا خوێندبوویەوە کە ڕەتکردنەوەی سروتی کاڤا بە کارێکی زۆر بێ ئەدەبی دادەنرێت. لەبەرئەوە پاش نەختێک من و لاورا و ماریۆ لەسەر عەرزەکەدا لەبەردەم قاپی (کاڤا)کەدا دانیشتین. هەموو جارێکیش کە لەناو نیوەی گوێزێکی هیندیدا ئەو مەشروبەیان پێشکەش دەکردین، چەپڵەیان لێدەدا و هاواریان دەکرد (بولا).

تامی (کاڤا)کە خۆش نەبوو. ڕەنگەکەی هەر لە ئاوی ئاوەڕۆ دەچوو و تا ئەندازەیەکیش هەر هەمان تامی هەبوو. پاش دوو پێک هەستم کرد لێوەکانم کەمێک سڕ بوون، پاش سێهەمین پێکیش لە چاو پێشوودا زۆر هێمنتر و ئارامتر بوومەوە، بەڵام هاوکات زۆر خەواڵووشی کردم. بیرمە بیل بەبێ ئەوەی گوێ بداتە هیچ شتێک بە دەوری ئێمە و ئەو کەسانەدا دەخوولایەوە کە لە چواردەوری (کاڤا)کەدا دانیشتبووین و کەڕەتێکیشیان بە لاورای وت: «کاڤا جگە لە گزی و فزی و ساختەکاری زیاتر هیچی تر نییە و بەدەر لەوەش کچە جوان و ئاقڵەکان توخنی ناکەون».

لاورا بە قووڵی تەماشای چاوی کردم، وابزانم بە چاوە قاوەییەکەی سەیری کردم و پرسی:

- تامی چی دەدات؟

خەریک بوو بڵێم تامی پێنج ملیگرام ڤالیۆم دەدا، نە زیاتر و نە کەمتر، بەڵام ئەو پێشم کەوت و وتی:

- هەست ناکەیت وەهمەکە دادەڕمێت؟

هەر بە خۆشییەکەوە وتم:

- پێم وابێت کەمێک.. تەنها یەک جیهان بوونی هەیە.

- تەنها یەک ئاگایی بوونی هەیە، (پوروشا purusha...)

لەویادا وتم:

- ئەمە (بیۆکیمیا)یە.. (ئایینێکی یەکسەری)یە.

تەواو دڵنیا نەبووم و نەمزانی لە مانای قسەکانم گەیشت یان نا، بەڵام دواتر وتی:

- ئاگایی ڕۆژانەش هەروایە، تەنها (بیۆکیمیا)یە و هیچی تر. هەر ئەوەش وامان لێ دەکات کە باوەڕ بە وەهمی ماددە بکەین، باوەڕ بە (پڕاکریتی prakriti) بکەین.

- وشەیەکی خۆشە.

- تاڕادەیەک هەمان مانای (مایا) دەبەخشێت. خۆشبەختانە هەندێک ماددەی کیمیاویی هەن و لەتوانایاندایە ئەو بەشەی مێشک بێ هۆش بکەن کە وامان لێ دەکات باوەڕ بە وەهمی جیهان بکەین.

لە خەیاڵی خۆمدا وتم: «کەواتە لێرەدا مەبەستمان لەو یەک دوو گرێ زیادەیەی مێشکمانە»، بەڵام وابزانم بە دەنگی بەرز ئەو وشانەم نەگوت.

لاورا زۆر زیاترێکی وت، بەڵام وشە بە وشەی قسەکانیم لەیاد نییە. لەبەرامبەردا بیرمە نهێنییەکی بۆ درکاندم و وتی: «لەدوای (ڤیدانتا vedanta)وە حەزم لە فەلسەفەی (سامکیا samkhya)یە».

هەستم کرد کاڤا بەدەر لە کاریگەرییەکانی تری، هەروەک دەرمانێکی میزکردنیش وایە و کاریگەری بۆ هەردوو ڕەگەزەکەش وەک یەک وابوو، چونکە یەکەم جار لاورا پێی وتم کە دەبێت بەپەلە خۆی بگەیێنێتە تەوالێت. هەردووکمان پێکەنینمان بەوە دەهات کە ڕۆحی جیهان هەر ڕێک پاش ئەوەی ڕێگای ناو خودی خۆی دۆزییەوە، ناچار بوو میز بکات.

نەختێک پاش ئەوە خۆمان لەبەردەم مێزەکەی جۆندا بینییەوە، ئەو بەدیار بیرەیەکەوە دانیشتبوو. جۆن پێی وابوو شتێکی خۆش بێت ئەگەر چەند میوانێکی ماراڤیوش بەشێوەیەک لە شێوەکان بەشداری ئاهەنگەکە بکەن و وتی:

- لە ڕاستیدا ئانا سەماکەرێکی بەناوبانگی سەمای فلامینکۆیە. لە ئینتەرنێتدا بینیم و هەرچەندە زمانی ئیسپانییەکەم هێندە بەقوەت نییە، بەڵام زۆر خێرا ئەوەم بۆ دەرکەوت کە ئەو ئەستێرەیەکی بەناوبانگ و گەورەی شاری ئیشبیلییەیە، پێی دەڵێن (لا ئیسترێللە دی سیڤیللا)، واتە ئەستێرەی ئیشبیلییە.

نازانم خەتای کاڤاکە بوو کە هەستپێکردنی زەمەنی لەلای من شێواندبوو یان چی؟!
بەڵام هەستم کرد نیو چرکە تێپەڕی و پاش ئەوە لەبەردەم مێزی ئیسپانییەکاندا خۆمان بینییەوە. لاورا خواستەکەی ئێمەی خستە ڕوو وتی:
- ئانا، پێت خۆشە وەک بەشدارییەکی ئاهەنگەکە سەمایەکی بچکۆلەی فلامینکۆمان پێشکەش بکەیت؟ بەو شێوەیە نەک هەر ئێمە شتێکی نایاب ئەزموون دەکەین، بەڵکو وەک سوپاسێکیش دەبێت بۆ سەماکەرانی دوورگەی فیجی.
خۆسێ وتی:
- وەڵامەکەتان نەخێرە.
جۆن هەوڵی خۆی دا و وتی:
- (لا ئیسترێللە دی سیڤیللا)...
زمانە ئیسپانییەکەی جۆن هیچ کاریگەرییەکی لە خۆسێ نەکرد و تاڕادەیەک نەڕاندی و وتی:
- من وتم وەڵامی پرسیارەکەتان (نا)یە و تەواو.
بەئاشکرا بە سیمای (ئاناوە دیاربوو کە ئازاری دەچەشت و هەستی بریندار کرابوو، بەڵام بۆ؟ بۆچی ئانا بەو شێوەیە ناڕەحەت بوو؟ خۆ ئێمە بەشێوەیەکی زۆر جوان پێشنیاری ئەوەمان کرد کە سەمایەکی فلامینکۆمان بۆ بکات و تەواو. پێشی دەچوو خۆسێ هەستی بریندار کردبێت، چونکە ئەو راستەوڕاست لەبری ئانا داواکەمانی ڕەت کردەوە؟ چەند مانگێک تێپەڕی و ئینجا وەڵامی ئەو پرسیارانەم دەست کەوت.
یەک دوو وشەمان بە کەیفخۆشییەوە بۆ دەربڕین و بەرەو لای مێزەکەی خۆمان گەڕاینەوە.
هێندەی نەبرد و سەمای کەپڵەکان دەستی پێ کرد. هەر زۆر لە سەمای ناو ئوتێلەکانی ناوچە بچکۆلەکانی نەرویج دەچوو کە گۆرانیبێژێکی تەنیا بەناوبانگترین گۆرانیی جیهانی دەڵێتەوە، لە بنەڕەتیشدا تەنها شێوازێکی (کارائۆگا)ی ڕۆژئاوایی بوو.
خەڵکانێکی زۆری لادێکە سەمایان دەکرد و بەئاسانی دەبینرا کە (گوونوسید)ی ئێوارەکە سەرکەوتنێکی گەورەی بەدەست هێنابوو. کاتێکیش کە چەند شەڕەدەستێک و وردە شەڕێک لەنێوان پیاوەکاندا دەستی پێ کرد، هەر دەتگوت لە ئێوارەیەکی خۆشی هاویندا لە (تیوسینبێرگ)ی نەرویجدا دانیشتووم. تەنها جیاوازی لەوەدا بوو کە لەوێ بەدرێژایی شەوەکە دونیا ڕووناکە، بەڵام لە تاڤیونیدا بەتەواوەتی تاریک

بوو.
من و جۆن و ماریۆ و لاورا لەسەر مێزەکە دانیشتبووین. دواتریش مارک و ئێڤیلین بە خۆیان و کورسییەکانیانەوە هاتنە سەر مێزەکەمان، چونکە مێزەکەی ئەوانیان لابردبوو تا بوار بە سەماکەران بدەن. ئانا و خۆسێش لەسەر عەرزەکەدا لەبەردەم قاپی کاڤاکەدا دانیشتبوون. پاش قەیرێکیش بیڵ بە خۆی و بتڵە شەرابەکانییەوە هاتە لامان و وتی:
- سەرەی منە مەشروب دانێم.
کاتژمێر لە دوانزەی شەو نزیک بووەوە و لاورا بەرەو ڕووی من ئاوڕی دایەوە و وتی:
- ئێمە دەڕۆین.
من خۆم پێشنیارەکەیم بەدڵ بوو. لەدوای خواردنەوەی ئەو قوڕاوە بێ هۆشکەرەشەوە هێشتا سەرم هەر قورس بوو، جگە لەوەش ئەو ڕۆژە زۆر ڕۆیشتبووم، بۆ پێشنیوەڕۆی ڕۆژی دواتریش دەبووایە سەفەرم بکردایەتەوە بۆ ئەوسەری دونیا. بەدەر لە هەموو ئەوانەش هیچ بە پێویستم نەزانی کاتێکی زیاتر لەنێوان ئەو قەرەباڵغی و غەڵبەغەڵبەدا بەسەر بەرم. سوپاسی ئەو ئێوارە خۆشەمان کردن و هەستاین.
بیڵ پرسی:
- دەڕۆن؟
لاورا وەڵامی دایەوە:
- بەڵێ دەڕۆین.
- بۆ کوێ؟
پرسیارەکەیم بەلاوە سەیر بوو. جگە لەوەش هیچ وەڵامێکی نەبوو، ئاخر هەمیشە کە شوێنێک بەجێدێڵیت، نازانیت بەرەو کوێ دەڕۆیت. پیاسەیەک بەناو دارگوێزە هیندییەکاندا دەکەین؟ یان دەچینە سەر قەراغ ئاوی پرێنس چارلس و مەلە دەکەین؟ یاخود دەڕۆین و هەروا پێکێک لەلای لاورا یان لەلای من دەخۆینەوە؟ بەهەرحاڵ لە هەموو بارێکدا هیچ پەیوەندییەکی بەو پیاوە بەتەمەنەوە نەبوو. هەڵبەتە لە میهرەبانی خۆیدا بوو کە بەردەوام شەرابی دەخستە سەر مێزەکەمان، هەرچەندە ئەگەر کەسێک لەگەڵ (ڕێد ئادیار)دا کاری کردبێت و ئەپۆلۆی (١٣)ی لە تەقینەوە ڕزگار کردبێت، بێگومان توانای کڕینی چەند بتڵە شەرابێکی دەبێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بە بڕوای من دەبووایە وا هەست نەکات کە بتوانێت برادەر

بکرێت، بەتایبەتیش لاورا.
لاورا وتی:
- ئەچین تەماشای گژوگیا وشکبووەکانی فرانک دەکەین.
بیل وەڵامی دایەوە و وتی:
- بە بڕوای من نەچیت باشترە.
لاوراش وتی:
- بە بڕوای منیش ئەوە هیچ پەیوەندییەکی بە تۆوە نییە.
قسەکەی زۆر بێ ئەدەبانە نەگوت، بگرە تا ئەندازەیەک دەتگوت گاڵتەی لەگەڵدا دەکات و دەیەوێت سەر بکاتە سەری.
بیل سوور بوو لەسەر قسەکانی و وتی:
- ئێ خۆ دەتوانن هەر لێرەدا دانیشن و درێژە بە قسەکانتان بدەن.
لاوراش هەروەک ئەو، سوور بوو لەسەر قسەکەی خۆی و وتی:
- ئێمە چ شوێنێکمان پێ خۆش بێت، لەویادا دادەنیشین و قسە دەکەین.
لەویادا وا هاتە بەرچاوم کە پاش نەختێکی تر لاورا بە چاوقایمی ناوازەی ئەو پیاوە پێبکەنێت.
ئەمریکییەکە بەردەوام بوو و وتی:
- ئاخر شەرابەکە لێرەدایە. بەڕاست.. شەرابی (ڕیبۆژا)شە و زۆر خۆشە.
- تەنها یەک بتڵمان پێویستە.
لاورا هەر هێندەی وت، ئینجا دەستی دایە بتڵێک و بەرەو دارگوێزە هیندییەکانی خوارەوە ڕۆیشت.
منیش وتم:
- لەسەر حسابی من بینووسە.
ئینجا بەپەلە بەدوای لاورادا ڕۆیشتم.
پاش نەختێک لەبەردەم هەیوانی کوخەکەی خۆمدا دانیشتین، (بیل)یش ڕاستی کرد کە وتی شەرابی (ڕیبۆژا) خۆشە. هەوای قوس و گەرمی ئەو ناوچە گەرمەش هەروەک قوماشێکی تەنک لێمانەوە ئاڵابوو.
من دەستم بە قسە کرد و وتم:
- بەڕاستی پیاوێکی تایبەتییە.
لاورا سەری ڕاوەشاند:

- نا، کەسێکی ئاساییە، هەر زۆر ئاساییە.
- ئێوە لە فرۆکەخانەکەی (نادی) یەکتریتان بینی؟
- فرانک، با کاتی خۆمان بە باسکردنی ئەو پیاوەوە نەکوژین. کەسێکی هێندە سەرنجڕاکێش نییە.
- بەلایەنی کەمەوە هەتا بڵێیت کەسێکی چاوقایمە.
بۆ ساتێک بیری کردەوە و دواتر وتی:
- بیڵ باوکمە.
پێکەکەم دانا، فیکەیەکی بەرزم لێدا و وتم:
- بێگومان باوکتە و منیش کەسێکی بێئەقڵم.
وەڵامی نەدامەوە، بەڵام بەپەلە ڕووی بەرەو ڕووی من وەرچەرخاند، لەویادا تەماشای چاوە سەوزەکەیم کرد. هەر لە خۆیەوە هەستم کرد ئەو هەر کە لەدایک بووە هەردوو چاوی سەوز بووە و هێدی هێدی یەکێکیان لەگەڵ گەورەبوونیدا ڕەنگی قاوەیی وەرگرتووە. خۆ ڕەنگە چاوەکەی تریشی هەروای لێ بێت.
پێم ناخۆش بوو کە تا ئەو کاتە درکم بەوە نەکردبوو کە کچ و باوکن و زۆر بە ساکاری بە مەبەستی پشوودان هاتوونەتە ئەم ناوچە گەرمانەی خواروو. ئەوە بۆیە ئاوها دانیشتبوو و بەگوڕ کتێبی (ئەستێرەی گەڕۆکی تاقانە)ی دەخوێندەوە، هەر لەبەر ئەوەش بوو کە ئەو پیاوە یەکەمین ئێوارە لەسەر مێزەکەی ئەو دانیشتبوو، ئێستا دەزانم بۆ ئەو پیاوە ئەو هەموو شەرابەی دەکڕی و دەیبەخشی. باوکی بوو، بۆیە هەرکە دەستی خستە سەر ملی یەکسەر ئارام بووەوە، هەربۆیە ئەمیش پاڵی پێ وەنا و خستیە ناو ئاوی مەلەوانگەکەوە، بۆیە ئەویش لەسەر کورسییەکەی ئەم دانیشت و بە خاولییەکەی لاورا خۆی وشک کردەوە. باوکی بوو، بۆیە لاورا سووراحییەک بەفراوی کرد بە پشتیدا، کاتێک کە نەیویست سەرلەنوێ گوێ لە باسی مایا و وەهمی جیهانییەکەی لاورا بگرێت. بەدەر لەوانەش هەر لەبەر ئەوە بوو کە نەیویست لاورا (کاڤا)کە بخواتەوە، بێگومان هەر لەبەرئەوەش بوو کە ویستی ڕێی لێ بگرێت و لەگەڵ مندا نەیەت. لە لاورام پرسی:
- ئەو بە شووی دایت؟
- ئەو خۆی هەموو شتێکی ڕێکخست. هەموو ژیانمی ڕێکخست، هەر لەو کاتەوەی کە هێشتا کچێکی بچکۆلە بووم. پیاوێکی دەوڵەمەندی خاوەن کۆمپانیایەکی بۆ دۆزیمەوە، لە ڕاستیدا هاوەڵی خۆی بوو و ئەویش لە بواری نەوتدا کاری دەکرد.

ئەو پیاوەی بۆ من دۆزییەوە. بۆ من، تێدەگەیت؟ منیش کچێکی ئاقڵ بووم و لە کاتی ئاهەنگەکەمدا (٢٦٠) میوان بانگ کرابوون، زۆربەی هەرە زۆریشیان سەر بە کۆمپانیاکەی خۆی بوو.

- وام دەزانی ئەو شتانە بەسەرچوون و باویان نەماوە.

- وەک وتم کچێکی ئاقڵ بووم و نەمویست باوکم نائومێد بکەم.

- لەگەڵ ئەوەشدا کە منداڵێکی نەخوازراویش بوویت؟

- من قەت دایکم نەبووە، تەنها باوکم هەبووە.

- تۆ خۆت نەتگوت دایکت هەر کتومت وەک (تاجیموشیا) پشتی لێ هەڵماڵیویت؟

- هەر ڕێک لەبەرئەوەشە کە دەڵێم قەت دایکم نەبووە.

- بەڵام خۆ هێشتا لە ژیاندایە؟

سەری بۆ لەقاندم.

- لەگەڵ باوکتدا دەژی؟

دیسانەوە سەری بۆ لەقاندمەوە.

- ئەی تۆ چەندێکە جیابوویتەتەوە؟

- دوو حەفتەیە.

- دوو حەفتەیە جیابوویتەتەوە؟

- دوو حەفتە لەمەوبەر وازم لێ هێنا، گواستمەوە بۆ ئوستراليا. ئینجا باوکیشم هات بۆ (ئادیلایدی). ئەو پێی وابوو پێکەوە سەفەرێک بکەین.

- دەیەوێت بتگەڕێنێتەوە بۆ لای مێردەکەت؟

- بێگومان ئەوەی دەوێت. ئێ خۆ ئەو، منی بە ئەو پیاوە فرۆشتووە.

- هەر ئەویشە کە یارمەتیی دارایی پرۆژەکەت دەدات؟ ئەو دامەزرێنەری ئەو پرۆژەیەیە، وا نییە؟

سەری بۆ لەقاندم.

- خۆشت دەوێت؟

پەرداخی شەرابەکەی بەرز کردەوە و قومێکی لێ دا. ئینجا بەدڵنیاییەوە وتی:

- زۆریش.

قومێکی تری لە شەرابەکەی خواردەوە، شتێکی تریشی وت و خەندەیەکی بچکۆلەی خستە سەر لێوانی، ئینجا تێگەیشتم چەندە باوکی خۆش دەوێت، وتی:

- بەڵام پیاوێکی زۆر کەلەپووتە. گەمژەیە گەمژە.
لەویادا بەتەواوەتی بۆم ڕوون بووەوە کە حاڵەتەکەی لاورا و باوکی تێکەڵەیەک بوو لە شێوە پاراستنێکی لەڕادەبەدەر و هۆگربوونێکی زۆر بە باوکەوە و گرێیەکی دەروونی ئاشکرای (ئێلێکترا). بەو شێوەیە وەک لەوەوپێش بۆی چووم و وتم پەیوەندییەکەیان لە پەیوەندیی نێوان پڵنگێک و ڕاهێنەرێک دەچێت، هێندە دوور نەبوو لە ڕاستییەوە.
لەگەڵ خواردنەوەی شەرابی (ڕیبۆژا)کەدا، باسی ڕۆحی جیهانمان کرد. ئەو بەردەوام بە چاوە قاوەییەکەی تەماشای دەکردم. گومانم نەبوو گرنگیدانی بە بابەتی ژینگە و تێگەیشتنی لە فەلسەفەی گشتگیری هێندە کامڵ نەبوو، بەڵام ئیتر خۆ بە یەک چاویش دەیڕوانی. جۆرە تاکڕەوییەکی فەلسەفیشی هەر بە یەک چاو دەبینی. وەک لایەنی هەستیش تاکڕەو دەیڕوانی، کچێکی دڵشاد بوو بە ژیان و خاوەنی هەستێکی تایبەتی بوو بۆ بینینی تەیری دەگمەن و ئەفسانەی کۆن و ئەستێرەی ئاویی شین. هەردوو چاوە قاوەیی و سەوزەکەی هەریەکەیان بەشێوەیەک بەربەرەکانێیان دەکردم، چاوەکانی چەندین ئەندێشەی منی وروژاند.
کە بتڵەکەمان فڕێ کرد، چووینە ژوورەوە. بەڵێ.. ئەو شەوە لاورا لەلای من مایەوە.
هەر لەوەوپێش کە من چوومە ژوورەوە تا دوو پەرداخ بهێنم، گۆردنم بە دیوارەکەوە بینی. لاورا چوو ئاوێک بکات بە خۆیدا و لەو کاتەدا چوومە لای گۆردنەوە، ڕاستەوڕاست سەیری ناوچاویم کرد و وتم:
- تۆ ئەم شەو دەمت دادەخەیت؟ تێدەگەیت؟ نامەوێت ئەم شەو بتبینم.
دەستم بۆ بتڵی جنەکە نەبرد، ئەوەش تەنها لەبەرئەوە نەبوو کە نەمویست گۆردن تووڕە بکەم.
لێرەدا لەوانەیە بەلاتەوە سەیر بێت کە من ئەو هەموو شتەت دەربارەی لاورا بۆ دەگێڕمەوە، بەڵام لەیادت نەچێت تۆ بوویت کە سوور بوویت لەسەر ئەوەی چیتر هیچ پەیوەندییەکمان بە یەکەوە نەمێنێت، منیش بووم کە دەمگوت با هەر هیچ نەبێت ساڵی جیابوونەوەکەمان تێپەڕێت و ئەوجا بیر لە پەیوەندیی نوێ بکەینەوە.
هەر بەپێی ئەو هەموو ئاسۆ فیکرییە قووڵانەی کە گۆردن چەند جارێک وەبیری هێنامەوە، زۆر زۆر خۆش بوو بەلامەوە کە خۆمدایە دەستی مرۆڤێکی تر. ئاخر نەمتوانی شەوێکی تر لەگەڵ گۆردندا ببەمە سەر. بەڕاست.. لە (سالامانکا) ویستم

شتێکت لەو بارەیەوە بۆ باس بکەم، بەڵام تۆ لەپڕێکدا داتە قاقای پێکەنین، چونکە ئاماژەم بۆ ئانا و خۆسێ کرد و وتم لەسەر دوورگەکانی فیجی بەیەکەوە بووین.

بۆ بەیانی دواتر کە خەبەرم بووەوە، لاورای لێ نەمابوو. لە کاتی نانخواردنی بەیانیدا بیستم کە سەرلەبەیانی زوو لەگەڵ (بیل)دا سەفەریان کردووە بۆ (تۆنگا)، بەڵام من لەوەوبەر ناونیشان و (ئی-مەیل)ی خۆمم پێدابوو، چەند ڕۆژێکیش بەرلەوەی سەفەر بکەم بۆ (سالامانکا)، وێنەیەکی هەر زۆر ڕوونی ئەو کۆترە دەگمەنەم بەدەست گەیشت کە ڕەنگی سەر سنگی پرتەقاڵییە. لێت ناشارمەوە کە ئەو وێنەیەم لەسەر مێزی نووسینەکەم داناوە، تەنانەت لەم ئوتێلی (پالاس)ەشدا هەر پێمە. دوابەدوای ئەوە نامەیەکی ترم بەدەست گەیشت و تیایدا نووسرا بوو کە لاورا گەڕاوەتەوە لای مێردە دەوڵەمەندەکەی، تەنها لەبەرئەوەی بووە بە مرۆڤێکی نوێ، نەک هەر ئەوەش، بگرە دەستی کردووە بە خوێندنی (بهاگڤاداگیتا).
من خۆشم دەبووایە سەعات دوو بە فڕۆکە لە (ماتای)ەوە بەرەو (نادی) بفڕیمایە و سەعات دەی ئێوارەش لەوێوە بەهۆی فڕۆکەیەکی هێڵی ئاسمانی نیوزلەنداوە بەرەو (لۆس ئەنجلس) بفڕیمایە. پێش نانخواردنی بەیانی جانتاکەم کۆکردەوە، بێگومان گۆردنیش سەرلەنوێ هاتەوە بەردەمم، وابزانم لەبەرئەوە بوو کە قومێکی بچکۆلەم لە جنەکەم خواردەوە، وەک لەوەوپێش وتم شەوی پێشوو دەمم بۆ نەبرد. دوێنێ شەو بەرلەوەی بچینە جێگاوە، گۆردنم بە دیوارەکەوە بینی، ئەو بەیانییەش کتومت لەو شوێنەدا بوو. دەستی بە قسە کرد و وتی:
- نەمگوت وایە.
ڕێک زانیم بیر لە چی دەکاتەوە، پێی دەچوو بەدرێژایی شەوەکە تەماشای کردبین، من بەهیچ جۆرێک پێم خۆش نەبوو بیر لەوە بکەمەوە. هەر ئەوەندە نییە کە ئەو بە شەو بەباشی دەبینێت، بەڵکو هەر بەشێوەیەکی سروشتی قەت ناتوانێت چاوی دابخات. لەگەڵ ئەوەشدا وتم:
- دەتوانیت تۆزێک وردتر مەبەستەکەتم بۆ ڕوون بکەیتەوە؟
- ئێوە کتومت وەک ئێمەن.
- ئێ منیش هەر وام گوتووە. بەردەوام بەئاشکرا و بێ پێچ و پەنا ئەوەم دووپات کردۆتەوە کە من جگە لە گیاندارێکی بڕبڕەدار زیاتر، هیچی تر نیم. لەو خاڵەدا بەتەواوەتی ڕوون بووم. من گیاندارێکی سەرەکیی شیردەری بەتەمەنم.

- مەبەستم لەوەیە تا چەندێک ئەو کچە دەناسیت؟
- ناسیم و تەواو.
- ئێ شووی نەکردووە؟
- با، بەڵام بەشێوەیەکی دڵتەزێن.
وتی:
- چەند زیرەکن لە پاساوهێنانەوەدا.
- قسەی قۆڕ.
- بەشێوەیەکی گشتی ئێوە زۆر زیرەکانە کردەوەکانتان پەردەپۆش دەکەن.
- پێم وابێت ڕاستەوڕاست باسی پێچەوانەکەی دەکەین.
- وابزانم زۆر باش لە مەبەستم تێدەگەیت.
- لە تەواوی قسەکانت تێدەگەم.
- ئەو شتەی کە زیاتر ئێوە لە ئێمە جیا دەکاتەوە، ئەوەیە کە ئێوە تاڕادەیەک هەموو هەڵسوکەوتەکانتان بەشێوەیەک لە شێوەکان پەردەپۆش دەکەن.
- ئەگەر ئەتەوێت گفتوگۆیەکی ڕێکوپێک بەیەکەوە بکەین، ئەوا پێشنیار دەکەم بەشێوەیەکی ڕوونتر قسە بکەیت.
- بەڵام ئەو پەردەپۆشە دەرەکییەتان تەنها هەوڵدانێکە بۆ شاردنەوەی سروشتتان و هیچی تر. ئاخر ئێوەش ڕاستەوڕاست وەک ئێمە بە ڕووتی دێنە دونیاوە و لەچاو ئێمەشدا زۆر زیاترێک لێرەدا نامێننەوە. دواتریش بەرەبەرە ون دەبنەوە.
- پێویست ناکات هێندە ڕوونیش قسە بکەیت.
- تێکەڵی ڕەحمی (گایا) دەبن و دەبنە خۆراکی کرم و قالۆنچەکان.
- پێم وابێت من دواهەمین کەسم کە پێویستی بەوە بێت شتێکی ئاوهای بیر بخرێتەوە.
- ئاخر ئێوە ڕێک خۆتان لەو باسە لادەدەن، تاڕادەیەک باسی هەموو شتێک دەکەن ئەوە نەبێت.
- ئەوەیان من ناگرێتەوە.
- بەلاتەوە گەمژەیی نییە کە ئێوە ناوی خۆتان ناوە (مەیموونی ڕووت)؟
- با.
- مەبەستم لەوەیە کە ئێوە داپۆشراوترین گیانەوەری سەر ئەم زەوییەن، ئێوە خاوەنی هەموو شتێکن لەو بارەیەوە، هەر لە کراسی تایبەتی ئاهەنگەکان و قاتی سپییەوە

هەتاوەکو ناو و لەقەبی هەزەلی و ئاوێنەی جوان و قەشەنگی سەر ئاگردانەکان.
ئەوە با هەر باسی شەهادە و نیشانەی ڕێزلێنان و ئەخلاق و ئەتەکییەت و سروت و دابونەریتیش هەر نەکەین. مەبەستم لە هەموو ئەو ڕووکارانەیە کە بۆ جوانکاری بەکاری دەهێنن، باسی ئەو توێژە فرە ئەستوورە هەڵخەڵەتێنەرەی کەلتوور و (شارستانی)یە دەکەم کە ناسروشتییە.
- بەڵێ، لەو خاڵەیاندا ڕاست دەکەیت.
- بەڕاست.. تۆ چیرۆکی (بەرگە نوێکەی پاشا)ت بیستووە؟
- دەزانی زۆر هەزەلیت!
- تەنانەت مارمێلکەیەکیش ئەوە دەبینیت کە سەرتاپای شتەکان گزی و هەڵخەڵەتاندنە. ئێمە دەڵێین: ئێ خۆ ئەوان هیچ جلێکیان لەبەردا نییە! هەر ڕێک وەک ئێمە ڕووت و قووتن، بەڵام میستەر، ئێوە قسە دەکەن و بەشێوەیەکی تایبەتی دەستتان بادەدەن، لە کاتێکدا کە کاتژمێرە بایۆلۆجییەکە لەژێر ئەو پەردە جوانەدا بێبەزەییانە هەر لێدەدات و لێدەدات تا لەناکاوێکدا هەموو جیهان دەوەستێت.
- دەزانیت تۆش باش دەتوانیت گوزارشت لە خۆت بکەیت؟
- ئێوە دەڵێن: «لەم بارودۆخەی ئێستادا»، شتێکی زیادەشی دەخەنە سەر و دەڵێن: «بەلایەنی کەمەوە لە کاتی ئێستادا». ئێ ئێمەش بەردەوام ڕێک ئەو خاڵەمان بەلاوە گرنگ بووە کە دووپاتی بکەینەوە، هەرچەندە زۆرێک لە هێڵە هونەرییەکانی سەردەمی گەنجی (پیکاسۆ) لە کارە هونەرییەکانی تەمەنی پیریشیدا دەبینرێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لەویادا وە بەشێوەیەکی گشتی زۆر شتمان هەیە کە (شۆینبێرگ)مان دەهێنێتەوە یاد، لەلایەکی تریشەوە جێگای داخە کە (پوتشینی) نەیتوانی ئۆپێرای (توراندۆت)ەکەی تەواو بکات، چونکە بەڕاستی ئەوە باشترین ئۆپێرایەتی، بەڕاست.. ئەی تۆ دەزانی کە (ڤێردی) تەنها بە دوو حەفتە (لا تراڤیاتا)ی نووسیەوە، بەلای منەوە بە بەراوردکردنی لەگەڵ (پوتشینی)دا هەر لە ئاوازێکی سادە دەچێت..
توانی تورەم بکات، قسەکەم پێ بڕی و وتم:
- ئێمە لە کەلتوورێکدا لەدایک دەبین و دواتریش لێی دەردەچین. بەشێوەیەکی گشتی ئێمە تەنها لەسەر ئەم زەوییە میوان نین، بەڵکو میوانی ئەو ژوورانەشین کە پێیان دەگوترێت (باخ) و (مۆزارت) و (شکسپیر) و (دۆستۆفیسکی) و (دانتی) و (شانکارا). دەڕۆینە ژوورەوە و لە سەدەکانی کۆن و ناوەڕاستەوە دێینە دەرەوە،

له (ڕێنیسانس) و (ڕۆکۆکۆ rococo) و (ڕۆمانتیک)و (مۆدێرنیزم)ەوە دێینە دەرەوە. بەو شێوەیەش زۆر بەڕوونی شتێکی جیاوازین و بەهیچ شێوەیەک لە مارمێلکەکان ناچین، دەزانم تا ئێستاش دانیشگایەکی مارمێلکە دانەمەزرێنراوە، بەلایەنی کەمەوە دەزانم تا ئێستا کۆلێجێکی تایبەتی مارمێلکە بوونی نییە.

– پێویست ناکات بەدکار بیت.

– کاتێک کە ئێمە دەمرین، تەنها سەرتاپای گەردوون لەدەست نادەین، هەرچەندە ئەوەش خۆی لە خۆیدا دەکرێت زەرەرێکی بە سوێ و ئازار بێت، بەڵکو هاوکات ماڵئاوایی لە چەندین هەزار ڕۆحی مرۆڤیش دەکەین کە لە ژیانماندا ناسیومانن. خۆ ئەگەر هێندە هەزار ڕۆحی تایبەتی هەبێت، ئەوا پێدەچێت هەمووومان چەند شێواز و ڕووی جیاوازی تەنها یەک ڕۆحی جیهانی بین...

– سوپاس، هیوادارم تۆش هەروا بەشێوەیەکی سەرپێیی نەبووبیت بە (مۆنیست). خۆ ئەوە شتێکی ساری نییە؟ مەبەستم لەوەیە ئایا لە ڕێگەی سێکسەوە دەگوێزرێتەوە بۆ کەسێکی تر؟ من تەنها دەمەوێت بڵێم کە ئێمە لەچاو ئێوەدا، لە هاوئاهەنگییەکی زیاترێکداین لەگەڵ چواردەورەکەماندا، مەبەستم لەوەیە کە ئێمە بەو شێوەیە ڕازین کە هەین، واتە سروشتین.. پڕاوپڕ سروشتین. ئێمە مێشوولە دەخۆین، پیسایی دەکەین و زاوزێ دەکەین. هەموو ئەوانەش بەوپەڕی خۆشحاڵییەوە ئەنجام دەدەین. ئێمە خشڵی نارەسەن و فڕوفێڵی ڕۆحانی فریومان نادات. ئێمە نایەین وتار دەربارەی نرخی بەرزی هونەر و هاوئاهەنگی مۆسیقی بخوێنینەوە، تەنها لەبەرئەوەی لە تەمەنی خانەنشینی نزیک بووینەتەوە و منداڵی منداڵمان نییە.

– وەک وتم تۆ باش گوزارشت لە خۆت دەکەیت، بەڵێ، هەندێک جار شاعیرانەش قسە دەکەیت.

– میستەر، هەموو ئەو شتانەی کە دەربارەی من دەیڵێیت، دەگەڕێتەوە بۆ خۆت.

– بیر لەوە دەکەمەوە ئایا شاعیرەکان بۆیە دەخۆنەوە، چونکە شاعیرن، یان دەخۆنەوە بۆیە دەبنە شاعیر؟

– پێم وابێت بەر لە هەموو شتێک زۆر بیر دەکەنەوە. ئەرێ ناکرێت بیرکردنەوە بوەستێنرێت؟ مەبەستم لەوەیە ئایا ناکرێت بیکوژێنیتەوە؟

– نەخێر، ئەوە کارێکی هەروا ئاسان نییە. مرۆڤ بەدرێژایی ژیانی ناچارە بیر

له شتێک له شته‌کان بکاته‌وه. ڕه‌نگه بتوانین تا ئه‌ندازه‌یه‌ک ده‌ست به‌سه‌ر بیرکردنه‌وه‌کانماندا بگرین، به‌ڵام ناتوانین خودی پرۆسه‌ی بیرکردنه‌وه دابخه‌ین، ڕه‌نگه ته‌نها له ڕێگه‌ی خولێکی خه‌ڵوه‌ته‌وه بتوانین ئه‌وه بکه‌ین، به‌ڵام ئیتر ئه‌وه‌ش کۆمه‌ڵێک میتۆدی قوڕ و ناڕاسته‌قینه‌ی دینی له‌خۆ گرتووه. ئێمه ته‌نانه‌ت له شه‌ویشدا ئارامیمان نییه، چونکه له‌ویادا ته‌سلیمی هه‌موو ئه‌و شتانه ده‌بین که له ڕێگه‌ی خه‌ونه‌کانمانه‌وه بۆمان دێن. ئێمه ته‌نها له کۆمه‌ڵگه‌یه‌کی پڕ هه‌راوهوریادا ناژین که به‌دوی چێژه‌وه‌یه، به‌ڵکو سروشتیش له کاتی خه‌وتنماندا ده‌مانکاته گۆڕه‌پانێکی درامای ده‌روونی.

- دواجار تۆ خه‌وت لێکه‌وت، به‌ڵام شیرده‌ره مێینه‌که نه‌خه‌وت. ببووره که وا ڕاسته‌وخۆ ده‌یگێڕمه‌وه، به‌ڵام هه‌رکه تۆ خه‌وت لێکه‌وت، ئه‌و به‌جێی هێشتیت.
- من هیچ لۆمه‌یه‌کی ناکه‌م.
- بیرته دوێنێ شه‌و خه‌وت به چییه‌وه بینی؟
- به‌ڵێ به‌ڕاستی بیرمه. له خه‌وما نه‌مده‌زانی ته‌مه‌نم (١٦) ساڵه یان (٢٤)، خه‌فه‌تم به‌وه ده‌خوارد که ته‌مه‌نی خۆمم بیر نه‌ده‌که‌وته‌وه. دواجاریش گه‌یشتمه ئه‌و ئه‌نجامه‌ی که (١٦) ساڵ بم یان (٢٤) هیچ گرنگییه‌کی وای نییه، چونکه له هه‌موو بارێکدا هێشتا ته‌واوی ژیانێکم له‌به‌رده‌مدایه. دواتریش له‌ناکاودا خه‌به‌رم بووه‌وه و زانیم وا ده‌بمه (٤٠) ساڵ.
- به‌و شێوه‌یه‌ش وا هاته به‌رچاوت که (١٦) ساڵ یان (٢٤) ساڵی ژیانت له‌ده‌ست دابێت؟ مه‌به‌ستت له‌وه‌یه؟

به‌کورتی وه‌ڵامم دایه‌وه و وتم:

- به‌سه ئیتر.

په‌شیمانی دایگرتم، چونکه که‌ڕه‌تێکی تریش که‌وتمه داویه‌وه. له‌دوای ئه‌و شه‌وه‌ی که له‌گه‌ڵ لاورادا بردمه سه‌ر، ده‌بووایه خۆم دوور بگرتایه و نه‌مهێشتایه بکه‌ومه به‌ر فریوی ئه‌و جۆره بیرکردنه‌وه مارمێلکانه‌ییه‌وه. خۆ ده‌متوانی واز له‌و مه‌شروبه بهێنم.

وتم:

- له‌و بڕوایه‌دا نیت جۆره ڕه‌هه‌ندێکی ئاشتبوونه‌وه له‌ناو پێکگه‌یشتنی عاشقاندا بوونی هه‌بێت؟
- له چییدا؟

- ڕوونکردنەوەی ئەوە کەمێک سەختە. پێم وا نییە مارمێلکەکان ژیانێکی ڕاستەقینەی عەشقیان هەبێت. ڕەنگە ئەوە شتێکی تایبەت بە مرۆڤ بێت، یان بەلایەنی کەمەوە تایبەت بێت بە شیردەرە سەرەکییە باڵاکان.
- نازانم ئەو شتەی دوێنێ شەو بینیم شایانی ئەوە بێت کە پێی بگوترێت (باڵا) یان نا، بەڵام بەهەرحاڵ با وابێت.
- مەبەستم لەوەیە کە تەنها عەشق دەتوانێت بەسەر ئەو یەک دوو گرێ مێشکییە زیادەیەدا زاڵ ببێت کە ئێمە هەمانە و بەو شێوەیەش دەتوانێت (بیرکردنەوەی مردن) بچەپێنێت. پێدەچێت وەک جن و (کاڤا) هەمان کاریگەریی دڵفڕێنی هەبێت، تەنها ئەوەندەیە کە عەشق زۆر بەگوڕترە و زیاتریش دەمێنێتەوە.
- وابزانم لەوەیاندا ڕاست دەکەیت. عەشق ئەفیونی خەڵکە.
- دەمەوێت تەنها ئەوە بڵێم کاتێک کە دوو کەسمان پێکەوە دەبین زۆر جیاوازە لەوەی کە بە تەنها دەبین.
- هیچ شتێکی نوێت نەگوت. چییە، ئەمەیان جۆرە حسابێکی ورد و نوێی ماتماتیکە یان چی؟
- نەخێر.
- جگە لەوەش وتمان شووی کردووە، واتە باس لە سێ کەس دەکەین.
- لاورا لە مێردەکەی جیابۆتەوە.
- ئەی تۆش لە ژنەکەت جیا نەبوویتەتەوە؟
- بەڵێ.
- کەواتە گەیشتینە چوار. کەسی تر هەیە کە لەم دووانەییەدا بەشدار بێت؟
- ئاخر من و ڤیرا چیتر پێکەوە ناژین.
- کەواتە لە دواجاردا هیچ پەیوەندییەکت بەوەوە نەماوە؟ تۆ گوتت لەدوای ئەو سەفەرە دوورودرێژەی ئۆقیانووسی ئارام کە گەڕایتەوەماڵەوە، ئینجا بەتەواوەتی وازی لێ دەهێنیت. خۆ ئەو پەیمانەت لەیاد نەکردووە کە خۆت بە خۆتت دا؟
- نەخێر لەیادم نەکردووە.
- کەواتە پەیوەندیت لەگەڵ ڤیرادا کۆتایی پێ هات.
- من وام نەگوت.
- وات نەگوت؟ تۆ کەمێک لەمەوبەر نەتگوت لە ئێستا بەدواوە تەنها یەک (مۆنیست)ی سەرپێی هەیە کە هۆگری باوکیەتی، پرچی ڕەشە و چاوێکی سەوزە

و ئەوی تری قاوەیی؟
- نەخێر وام نەگوت.
- لەگەڵ ئەوەشدا هەر ڕاست دەکەم.
- لە چییدا؟
- ئێوەش وەک ئێمە فرەژن و فرەپیاون.
- قسەی قۆڕ و بێ مانا. تۆ هەر زۆر بەپەلە حوکم دەدەیت.
- بەڵام خۆ دەبێت خۆت هێندە بزانیت کە دەتەوێت بگەڕێیتەوە لای ڤیرا یان نا.
- هێندە ئاسان نییە. ئاخر هەستی مرۆڤ کەمێک ئاڵۆزترە لە غەریزەی مارمێلکەکان. لۆجیکی دوولایەنی ناتوانێت بەسەر هەستی ئێمەدا زاڵ بێت.
- کەواتە با یارمەتیت بدەم. خۆشە لەگەڵ یەکێکدا قسە بکەیت، تۆ دەڵێیت چی؟
- وای بە باش دەزانم وەڵامی ئەو پرسیارە نەدەمەوە.
- باشە ئەگەر لەنێوان ڤیرا و لاورادا هەڵبژاردنێکت لەبەردەستدا بووایە، ئەو کاتە کامیانت هەڵدەبژارد؟
- مەبەستت لەوەیە تا کۆتایی ژیانم؟
- بەڵێ، تا کۆتایی ژیانت. چییە، مەرجە نموونەییەکانت خەریکە بەرەبەرە لەناودەچن یان چی؟
- ڤیرا یان لاورا؟
- بەڵێ گەورەم فەرموو، هەڵبژاردنەکە لە دەست خۆتدایە.
- لاورا جۆرە خۆشەویستێکە کە لە پشووەکاندا دەبینرێت.
- ئەی ڤیرا؟
- پاش ماوەیەکی کەم ڤیرا لە کۆنفرانسی (سالامانکا)دا دەبینم.
- ڕەنگە ئەویش ببێتە خۆشەویستێک کە لە کۆنفرانسەکاندا ببینرێت. کامیانت بەلاوە گرنگترە؟
لەو کاتەدا کە قسەم لەگەڵ گۆردندا دەکرد، بە ژوورەکەدا دەخوولامەوە و شتەکانم کۆدەکردەوە، جانتاکەم داخست و بۆکسێکم پیا کێشا. ڕقم لە خۆم بوو کە ئەو قومە جنەم خواردەوە. خۆم باشم دەزانی ئەوە بەرەو چ شوێنێکم دەبات. وتم:
- بەسە ئیتر. دەڕۆم نانی بەیانی دەخۆم.
- منیش لێرەدا چاوەڕوان دەبم، کاتێکی باشم لەبەردەستدایە.

- بەڵام من پاش یەک دوو سەعات سەفەر دەکەم.
- ئێیی... چییە، پیاوەکە دەیەوێت لەدەست خۆی هەڵبێت؟
- بەهەرحاڵ دەمەوێت سەفەر بکەم بۆماڵەوە.
- ئێ منیش لەگەڵ شتەکانتا دێم. نازانم فریا کەوتم خۆمت پێ بناسێنم یان نا؟ بەڕاستی ئەوەم لەیاد نییە. تۆ خاوەنی هەستێکیت کە لە ڕێگەیەوە ڕەفتاری باشە دەکەیت، پێم وتیت من برای دووانەی ئەو هەستەتم؟
- دڵنیام شتی وات نەگوتووە.
- بەڕێزم، ئەو جۆرە هەستە هەتا بڵێیت شتێکی نەسرەوتە. هەمیشە لە جووڵەدایە و هەروەک سێبەری ئەو کەسە وایە کە دەیەوێت لەدەست خۆی ڕابکات.

لەسەر مێزی نانخواردنی ئەو بەیانییە، چاوم بە جۆن و ئانا و خۆسێ کەوت. جۆن هێندەی پێ ڕاگەیاندم کە لاورا و بیڵ سەفەریان کردووە و منیش زۆر بە ساکاری پێم گوت کە خۆشم ئەوە دەزانم. جۆن دەیزانی ئەوان باوک و کچن، هەر لە ڕێگەی هەڵسوکەوتی (بیڵ)ەوە ئەوەی بۆ ڕوون بووبووەوە، زیاترێکیش پاش ئەوەی کە من و لاورا مێزەکەمان جێهێشت، بەڵام کەسمان باسی ئەوەمان نەکرد و خۆشبەختانە جۆن لەو کەسە بەریتانییە ئاساییانە نەبوو کە باسی خواردن و خواردنەوەی باش و خراپ بکات و ئاماژەی بۆ بتڵی شەرابی (ڕییۆژا)کە نەکرد کە من و لاورا لەبەردەم هەیوانی کوخەکەمدا خواردمانەوە.

مەزاجی (ئانا و خۆسێ)ش لەچاو ڕۆژی پێشووتردا هەر زۆر باشترێک بوو، وابزانم پەیوەندی بەوەوە هەبوو کە من سەفەرم دەکرد. قسەی خۆشیان دەکرد و پێدەکەنین، باسی چەند ڕووداوێکی خۆشی ئاهەنگەکەشیان گێڕایەوە، ئەوان تا سەعات دووی شەو مابوونەوە. بڕیارم دا بەر لە سەفەرەکەم بۆ دواجار بەشێوەیەکی جیددی قسەیان لەگەڵدا بکەم، وام دانابوو ئەو جارەیان بە زمانی ئیسپانی بیاندوێنم، ئیتر چی دەبوو با ببووایە.

بەڵام ئەوەیان ڕووینەدا: خۆسێ بۆ ساتێک سەرنجی خستبووە سەر شوێنێکی تر، ڕێک لەو کاتەدا (ئانا)م بینی کتوپڕ دەموچاوی زەرد هەڵگەڕا. فنجانی هێلکە کوڵاوەکەی دەستی خستە سەر قاپەکەی بەردەمی، ڕەنگی پێستی تێکەڵێکی ڕەنگی زەرد و خۆڵەمێشی گرت و ڕێک پاش ئەوە، ئەو سەماکەری فلامینکۆیە بەسەر مێزەکەدا کەوت و کوپێک قاوەی ڕشت.

خۆسێ بەپەلە هەستایە سەرپێ و هاواری کرد:

- ئانا!
هاوارەکەی زۆر دڵتەزێن بوو، هەر بە هاوارەکەی (ڕۆدۆلفۆ) دەچوو کە لە دوا بەشی ئۆپێرای (لا بۆهێمە)دا هاوار بۆ (میمی) دەکات.
لەسەر کورسییەکەی بەرزی کردەوە و یەکەم جار زللەیەکی بەهێواشی کێشا بە ڕوومەتیدا، ئینجا جارێکی تریش پیاکێشایەوە.
- ئانا! ئانا!
یەک دوو چرکە دوای ئەوە ڕەنگی دەموچاوی هاتەوە سەرخۆی و ئینجا دەستی کرد بە گریان. خۆی بەسەر خۆسێدا چەماندەوە، بە پاڵپشتی ئەو و بە لارەلار بەناو دارگوێزە هیندییەکاندا ڕۆیشتن. پاشانیش بە لەرزەلەرز و بەهێواشی بەناو درەختەکاندا بەرەو کوخەکەیان بەڕێکەوتن، هەر لەوە دەچوو وێنەی فیلمێک ببینی کە بە خاوی لێدەدرێت.
ئەوە دواهەمین جار بوو کە من لەسەر دوورگەکانی فیجیدا بینیمن. دوای چەند سەعاتێک خۆم کرد بە ژووری پێشوازی ئوتێلەکەدا تا پارەی مانەوەی ئەوێم بدەم، (جۆن)م بینی لەسەر مێزێک دانیشتبوو و خەریکی نووسین بوو. هەواڵی نوێی ئیسپانییەکانم لێ پرسی و وتی دکتۆرێکیان بانگ کردووە و لەوە دەچێت ئانا زۆر باشترێک بووبێت.
وەک لێکدانەوەیەکی حاڵەتەکەی ئانا وتم:
- بڵێیت (کاڤا)ی زۆری نەخواردبێتەوە؟
زۆر بە ساکاری وەڵامی دایەوە و وتی:
- پێی دەچێت.
کارمەندی ئوتێلەکە پێی ڕاگەیاندم کە سەیارەکەم ئامادەیە.
جۆن پرسیارێکی لێ کردم و وتی:
- بۆ کوێ دەڕۆیت؟
- دەچمەوەماڵەوە.
ئینجا وردەکاریی سەفەرەکەم لە (نادی)یەوە تا (ئۆسلۆ) پێ گوت.
- پاش چەند مانگێکیش سەفەر دەکەیت بۆ کۆنفرانسەکەی (سالامانکا)، وا نییە؟
- بەڵێ، بۆ؟
نەمزانی بۆچی ئەو پرسیارەی لێ کردم.

- ئەی ڤیرا؟
شانم بۆ هەڵتەکاند و وتی:
- بێگومان بە مەدریددا تێدەپەڕیت، وانییە؟
- بێگومان. بێگومان.
لەپڕێکدا هەستم کرد زیاد لە ڕادە پێ لەسەر قسەکانی دادەگرێت:
- لە مەدریدیشدا پیاسەیەک بە مۆزەخانەی (پرادۆ)دا ناکەیت؟
دواهەمین پرسیاریم بەلاوە سەیر بوو، بەڵام هەر زوو بیرم کەوتەوە کە من لەوەوپێش پێم گوت کە من خولیای هونەرم و لە مەدریدیشدا گەورەترین کارە هونەرییەکانی جیهانی تێدا کۆکراوەتەوە، هەروەها باسی ئەوەشم بۆ کرد کە من بەتایبەتی خولیای (پرادۆ)م. وتم:
- لەوانەیە.
پێی لەسەر قسەکەی داگرت و وتی:
- هەر دەبێت سەردانی ئەوێ بکەیت. ئاخر ناکرێت بچیتە مەدرید و سەردانی مۆزەخانەی (پرادۆ) نەکەیت.
دوابەدوای قسەکانی وتم:
- نەمزانیبوو کە هەردووکمان هەمان خولیا و پەرۆشیمان هەیە. بۆچی لەوەوپێش هیچ شتێکت لەو بارەیەوە باس نەکرد؟
- پێم بڵێ بزانم زیاترێک حەزت لە کامیانە: (ئیل گریکۆ)، (بووس)، (ڤیلاسکیوز) یان (گۆیا)؟
حەزم لەو گفتوگۆ بەگوڕ و تاڕادەیەک شێتانەیە نەبوو لە دوا ساتەکانی پێکەوەبوونمان، بەتایبەتیش ڕێک پێش ئەوەی جیا ببینەوە و پێشدەچوو قەت یەکتری نەبینینەوە، هەروەها سەفەرێکی دوورودرێژم لەبەردەمدا بوو و دەبووایە دوو کیشوەرم ببڕیایە، ڕێک لەو کاتەدا شۆفێرەکە هات و جانتاکەمی برد. بیرم لەو گفتوگۆ کورتە کردەوە کە ئەو بەیانییە لەگەڵ گۆردندا کردم. بیرم لە بەرگە نوێکەی پاشا کردەوە. هەروەها بیرم لە (ئانا) کردەوە کە لە هۆش خۆی چوو و لەو شێوازە توندەی (خۆسێ)ش کە فریای کەوت.
وتم:
- حەزم لە هەموویانە.
- کەواتە بە بڕوای من دەبێت کاتێکی باش بە خۆت ببەخشیت و بەوردی تەماشای

سەرتاپایان بکەیت.
شۆفێرەکە ئاماژەی بۆ سەعاتەکەی کرد. تەنها نیو سەعاتی مابوو فڕۆکەکە هەڵبسێت.
پرسیارێکم لێ کرد و وتم:
- پەیمانم دەدەیتێ سەلام لە ئانا و خۆسێ بکەیت؟
- بەوپەڕی خۆشحاڵییەوە بەڕێزم. خۆ ئەگەر هاتیشیت بۆ لەندەن...
- هەروەها تۆش. ئەگەر هاتیت بۆ ئەوێ، دەتوانیت ناوم لە دەفتەری تەلەفۆندا بدۆزیتەوە، بەڵام تکایە سەلامێکی گەرموگوڕی منیان پێ بگەیێنە و پێیان بڵێ هیوادارم ئانا زوو چاک بێتەوە.
شۆفێرەکە هۆڕنێکی لێدا و پاش چەند سەعاتێک لە قاتی یەکەمی فڕۆکەیەکی (جامبۆ)دا دانیشتبووم کە بەرەو (هۆنۆلولو) و (لۆس ئەنجلس) دەفڕی.

# تۆ وات هەڵبژارد کە خەمەکە بکەیت بە دوو بەشەوە

هەرکە گەیشتمەوە ئۆسلۆ، یەکسەر کەوتمە ئامادەکردنی ڕاپۆرتەکەم و دواتریش سەفەرم کرد بۆ سالامانکا. ئێستاکە وا زیاتر لە چواردە ڕۆژ بەسەر سەفەرەکەمدا تێپەڕیوە. بەڕاستی نەمدەزانی کە تۆش دێیت یان نا، من لە دڵەوە چاوەڕوان بووم ئەوەم بۆ ڕوون بێتەوە، بەڵام لەوەش زیاتر پەرۆشی شتێکی تریش بووم: دەمویست بزانم ئایا تۆش دەزانیت کە منیش بەشداری لەو کۆنفرانسەدا دەکەم یان نا. تا ئێستاش نازانم کاممان لە پێشدا ناوی خۆمان لەو کۆنفرانسەدا نووسی بوو، بەهەرحاڵ من بەر لە سەفەرەکەم بەرەو ئۆقیانووسی ئارام، داواکاری خۆمم بۆ ڕەوانە کردن، بەڵام بەتەواوەتی یەکلام نەکردبۆوە، کاتێکیش لە (تاڤیونی)یەوە تەلەفۆنم بۆ کردن و پێم وتن بە دڵنیاییەوە دێم، ناوی تۆ لە لیستی بەشداربوواندا بوو. تەنها ئەو کاتەش کە گەڕامەوە بۆ ئۆسلۆ داوایان لێ کردم کە باسەکەم دەربارەی کۆچکردنی ڕەگەزەکان بێت بۆ دەرەوە و ناوەوە و باسی هەمەڕەنگی بایۆلۆجی بێت.

بڵێیت تۆ ناوی خۆت لەو کۆنفرانسەدا لەبەرئەوە نووسیبێت تا لەو ڕێگەیەوە بتوانین یەکتری ببینین؟ یاخود تەنها و تەنها لەبەر پیشەکەت بڕیارت دابوو کە ئامادە بیت، هەرچەندە ئەوەشت لە خەیاڵدا بووە کە ڕەنگە من ببینیت؟ خۆ ئەگەر بەهیچ شێوەیەک نەتویستایە من ببینیت، ئەوا دەتتوانی پەشیمان ببیتەوە و بەشداری نەکەیت.

بەڵام هاتیت و تا پرۆگرامە تەواوەکەشت نەبینی، نەتدەزانی لێرەدا چاوت بە من دەکەوێت. ئینجا دەرکەوت کە تۆش کتومت هەروەک من بیرت کردبووەوە. تەنانەت ئەگەر نەشتوانین چیتر پێکەوە بژین، ئەوا خۆ بەلایەنی کەمەوە غەمێکی قووڵ من و تۆ کۆدەکاتەوە و بۆ هەتاهەتایە حوکم دراوە بەسەرماندا کە هەردووکمان بەشدار بین تیایدا. تۆ گوتت حوکم دراوە بەسەرماندا، بەڵام دەبێت بیکەین بە دوو بەشەوە.

هەشت مانگ بەسەر مەرگی سۆنیادا تێپەڕیبوو و شەش مانگیش لەمەوبەر شتەکانت لە (سۆگنسڤای) کۆکردەوە و گەڕایتەوە بۆ بەرشەلۆنە بۆ لای کەسوکارەکەت.

هەروەها دەبێت بیرت لەوەش کردبێتەوە کە من و تۆ دیسانەوە لە کۆنفرانسێکی زانستیدا چاومان بە یەک کەوتەوە. لێرەشەوە بازنەکە کۆتایی پێ هات. نزیکەی نۆ ساڵ لەمەوبەر بۆ یەکەم جار لە کۆنگرە گەورەکەی مەدریددا یەکترمان بینی و هەر پاش چەند مانگێکیش دوابەدوای ئەوە پێکەوە گواستمانەوە بۆ ئۆسلۆ.

کاتێکیش لە هۆڵە گشتییەکەی ئوتێلی (گران)دا بینیمیتەوە، لەو بڕوایەدا بووم لە هەموو کاتێک زیاتر بە شەوق بیت. بەلایەنی کەمەوە وەک کەسێکی تەواو جیاواز هاتیتە بەرچاوم و لەو کەسە نەدەچوویت کە لەوەوپێش لە دواهەمین حەفتە تاریک و ناخۆشەکانی ئۆسلۆدا بینیبووم. لە سەرەتادا هەروا وەستاین و تەماشای یەکتریمان کرد، دواتریش وەک هەمیشە ئاماژەت بەوە دا کە ڕیشم باش نەتاشیوە. ئینجا منت ڕاکێشایە سوچێکەوە و لەویادا دەستمان کردە ملی یەکتری و گریاین، بەڵام من پێم وانییە ئەو فرمێسکانەمان تەنها بۆ سۆنیا هەڵڕشتبێت.

پێتگوتم یارمەتییەکی داراییان پێ بەخشیویت تا توێژینەوەکەت ئەنجام بدەیت، خۆ ڕەنگە هەر بەهۆی ئەو یارمەتییەشەوە بووبێت کەوا دەدرەوشایتەوە، بەڵام من وام لێکدایەوە پیاوێکی تر هاتبێتە ژیانتەوە. بەدەر لەوەش هەر لە یەکەمین ساتی یەکتربینینماندا شتێکت گوت و مەبەستت بوو هەر لە سەرەتای سەرەتاوە بەڕوونی لێی تێبگەم. تۆ گوتت: «پێم خۆشە دیسان دەتبینمەوە، بەڵام پێویست ناکات پرسی ئاشتبوونەوەمان بکەینە بابەتی هەرە سەرەکیمان»، تۆ بەتەواوەتی دڵنیا بوویت لەوەی کە ناتوانین کەڕەتێکی تر وەک هاوسەر پێکەوە بژین. بیرمە منیش هەروا بێ چەندوچوون خۆمدا بەدەست بڕواکەی تۆوە. منیش شتێکم لەو بارەیەوە دەربڕی و وتم: «منیش گەیشتوومەتە ئەوەی کە تازە ڕێی گەڕانەوەمان نییە بۆ لای یەکتری»، لەویادا درۆم لەگەڵدا کردیت.

بەڕاستی نازانم گەر وەسفی حاڵەتەکەمان بەو شێوەیە بکەم و بڵێم گەیشتووینەتە ڕێگایەکی داخراو یان نا، مەگەر ڕێگای داخراویش شتێک نەبێت کە دوو کەس بەتەواوەتی تەبان لەسەر ئەوەی پیایدا نەڕۆن؟ ڕەنگە خاڵە هەرە سەرەکییەکە لەوەدا بووبێت کە تا چەندێک ئێمە ڕاستگۆ بووین لەگەڵ پەیمانەکانماندا. بڵێیت وەزعەکەمان ئاقارێکی تری بگرتایە ئەگەر یەکێکمان جورئەتی بکردایە و شتێکی جیاوازی دەربڕیبایە؟ ئەگەر سیفەتێک هەبێت کە من و تۆ هەردووکمان هاوبەش

بین تیایدا، ئەوا دەبێت سیفەتی شانازیکردن بێت بە خۆمانەوە. هەردووکمان ئەو سیفەتەمان هەیە.
بە پێویستی نازانم بە دوورودرێژی باسی کۆنفرانسەکە بگێڕمەوە، بەڵام هەست دەکەم بەشێوەیەکی گونجاو سوپاسی پشتگیریەکەتم نەکرد، کاتێک کە ئەمریکییە لیبراڵەکەی بواری بایۆلۆجی بەڵگەی دەهێنایەوە و دەیویست بیسەلمێنێت کە چیتر ڕێگرتن لە گواستنەوە و کۆچپێکردنی ڕووەک و ڕەگەزەکان هیچ سوودێکی نییە. لەو بارەیەوە وتی: «ڕێگە بدەن با سروشت خۆی ئەوە بکات. هەمیشە سروشت کاری خۆی بەڕێوە بردووە». ئینجا تۆ هاتیتە ناو باسەکەوە و وتت: «ئاخر مرۆڤیش بەشێکە لە سروشت. دیارە دکتۆر (گیبۆنس) لە کرۆکی باسەکەی فڕانک تێنەگەیشتووە» و زیاترێکیش وتت: «پێشنیار دەکەم دکتۆر سەرلەنوێ بەسەر وانە تایبەتییەکانی ژینگەدا بچێتەوە کە لە قۆناغی دواناوەندیی خۆیدا خوێندوونی».
تۆ ئاماژەت بەوە دا کە مرۆڤ جێگەی هەڵبژاردنی سروشتی گرتۆتەوە و سەرنجی ئامادەبووانت بۆ ئەوە ڕاکێشا کە لە چاخی (جورا و کریتاسی)دا سەفەری ئاسمانی لەنێوان کیشوەرەکاندا بوونی نەبووە، تەنانەت لە ڕێگەی بەلەم و پاپۆڕیشەوە هاتوچۆ لەنێوان (گۆندوانا) و (لاوراسیا)دا نەبووە. لەیادتە لەویادا بە چ شێوەیەک وەڵامی دایتەوە؟... وتی: «وازیان لێ بهێنە، چی دەکەن با بیکەن».
زۆرێک لە ئامادەبووانی کۆنفرانسەکە دەیانزانی کە من و تۆ پێشتر ژن و مێرد بووین و دەشیانزانی لەسەر چی جیابووینەتەوە. هەر پاش چەند مانگێک لەدوای جیابوونەوەمان، وابزانم هەردووکمان ئەو ویستەمان لا دروست بوو کە هێندە زۆر بەیەکەوە دەرنەکەوین، چونکە پێی دەچوو ببینە بنێشتەخۆشەی سەر دەمی ئەم و ئەو و ئێمەش دەمانویست خۆمان لەوە بپارێزین. هەتا زیاترێک پێکەوە خۆمان نیشان بدایە، زیاترێک باس دەکراین و بەو شێوەیەش زیاترێک هەوڵی خەملاندنی بارودۆخی ڕووداوەکەیان دەدا. من پێم وایە زیرەکیمان کرد کە لە کاتی کۆنفرانسەکەدا دوور بووین لە یەکترییەوە، بەڵام دەمەوێت لە دیدەی خۆمەوە شتێک دەربارەی دواهەمین پاشنیوەڕۆ و ئێوارەی مانەوەمان لەوێ بنووسم.
من لەوەوبەر یەک دوو کەڕەت لە (سالامانکا)دا مابوومەوە، بەڵام تۆ یەکەم جارت بوو بیبینیت. بەر لە نیوەڕۆی ئەو ڕۆژە تۆ پێت لەسەر ئەوە داگرت کە ناوچەی دێرینی شاری زانکۆت نیشان بدەم. دواتر تۆ ڕۆیشتیت و من لەویادا مامەوە، لێت ناشارمەوە کە پاشنیوەڕۆی ڕۆژی دواتر بە هەمان ئەو شوێنەدا پیاسەم کردەوە کە

من و تۆ پیایدا ڕۆیشتین. ئێمە لە (پلازا مایۆر)ەوە دەستمان بە پیاسەکەمان کرد و تۆ وتت: «دەبێت ئەمە قەشەنگترین و دێرینترین (پلازا مایۆر)ی ئیسپانیا بێت»، دواتر بەردەوام بووین و بەرەو (پالاسیۆ مۆنتێرری) بەڕێکەوتین، کە ئێستاکە میری (ئالبا) خاوەنیەتی. هەر لەو گۆڕەپانە بچکۆلەیەی نێوان کۆشکی (ڕێنیسانس) و (ئیگلیسیا دی لا پوریسیما)دا کەوتینە باسکردنی چەند ڕووداوێکی بچکۆلەی ژیانی سۆنیا. هێندە باسی بینا کۆنەکانمان نەکرد کە بە بەردی شاخاوی دەوڵەمەند بە ماددەی ئاسن دروست کراون و لەو کاتەشدا لەبەر ڕۆشنایی ئاڵتونیی ئەو پاشنیوەڕۆیەدا ڕەنگێکی سووری ناسک دایپۆشیبوون. ئەو کۆشکە کەلتوورییە دێرینانە لەو پاشنیوەڕۆیەدا تەنها وەک پاشینەی گفتوگۆیەک دەردەکەوتن کە دەربارەی کچێک بوو کە چیتر لەم جیهانەدا نەمابوو.

بیرم دێت لەویادا لە خەیاڵی خۆمدا وتم: «ئەگەر ئەو ڕووداوە ڕووینەدایە، ئەوا ڕەنگە ئێستاکە من و تۆ لە سالامانکادا پیاسەمان بکردایە و کچێکی تەمەن پێنج ساڵانەش لەنێوانماندا بووایە. بێگومان ئەو کاتەش کۆنفرانسەکە سەرنجی هەر ڕادەکێشاین، هەرچەندە ئەگەر منداڵێکیشمان لەگەڵدا بووایە بە هەموو پێداویستییەکانییەوە، بەڵام لە هەموو بارێکدا دەمانتوانی سۆنیا لەگەڵ خۆماندا بەرین، بۆ نا؟»

ئەگەر وا بووایە، ئەو کاتە لە گۆڕەپانەکەی نێوان کڵێسەکە و کۆشکی (ڕێنیسانس)ەوە بەرەو (کاسا دی لاسکۆنشاس) دەڕۆیشتین، کە چوارسەد لەتە سەدەفی گەورەی ڕەنگ قاوەیی بە دیوی دەرەوەی دیوارە مەزنەکەوەیەتی. ئەوسا بێگومان سۆنیا ڕایدەکردە حەوشە گەورە دڵفرێنەکەوە و بە چاڵەکەدا هەڵدەزنا، من و تۆش تەماشایەکی کتێبخانە و هۆڵی خوێندنەوەکەمان دەکرد. خۆ ڕەنگە هەر دوای ئەوێ ڕاییبکردایەتە سەر جادەکە و بە پلیکانەکاندا بەرەو کڵێسەی کاتۆلیکی (کلیریسیا) سەرکەوتایە، پێی دەچوو لەو کاتەدا کە بەلای (پلازا دی سانئیسیدۆرۆ)دا تێدەپەڕین، ئاوڕێکی بدایاتەوە و ئاماژەی بۆ قەڵا بەرزەکان بکردایە، ئێمەش دەوەستاین و هەوڵمان دەدا ڕازی بکەین تا بە کۆڵانە تەسک و باریکەکەی (کالا دی لۆس لیبیرۆس)دا لەگەڵماندا بێت تا بەرەو زانکۆ دێرینەکە بەڕێ بکەوین. گومانم نییە حەزی لە حەوشەی (لاس ئیسکولاس) دەکرد، پێی دەچوو پرسیاری دەربارەی پەیکەری ناو گۆڕەپانەکەش بکردایە و بیویستایە بزانێت هی کێیە. ئەو کاتە تۆش پێت دەگوت: «ئەوە پەیکەری (فرای لویس دی لیۆن)ە و ماوەیەکی زۆر زۆر لەمەوبەر مامۆستای زانکۆ بووە، بەڵام کاتی خۆی گرتوویانە و پێنج ساڵ

له زینداندا توندیان کردووه، چونکه بڕوای بەو شتانە نەبووە کە کڵێسە بڕوای پێ بووە. کاتێکیش لە زیندان بەریان دا و دەستی کردەوە بە وانەگوتنەوە، بەم وشانە دەستی پێ کردەوە: «هەروەک چۆن دوێنێ گوتمان...»، ئینجا کاتێک کە سۆنیا گوێی لەو وشانە دەبێت لە دڵەوە پێدەکەنێت، چونکە ئەو پێنج ساڵ لەمەوبەر وانەی بە قوتابییەکانی گوتۆتەوە، نەک دوێنێ، ئاخر پێنج ساڵ هێندەی تەمەنی سۆنیایە، ئەوەش ماوەیەکی زۆر زۆرە، نزیکەی هێندەی ئەبەدیەتە، بەڵام بەڕاستی ئەو پیاوە هێندە ساڵ لە زینداندا ماوەتەوە. تۆش ڤیرا، ئینجا ڕەنگە ئەو کاتە تۆش بە پرسیارێکی نوێ وەڵامت بدایەتەوە، هەروەک چۆن لەوەوپێش زۆرجار کە سۆنیا لە شتێک تێنەدەگەیشت، تۆ پرسیارێکی نوێت لێ دەکرد. کێ دەزانێت؟ لەوانەیە ئەو کاتە لێت بپرسیایە: «باشە بە بڕوای تۆ بۆچی دوای پێنج ساڵ زیندانی بەو شێوەیە دەستی بە قسەکانی کرد و وتی: «هەروەک چۆن دوێنێ وتمان؟»» ئەو کاتەش ڕەنگە سۆنیا لە وەڵامدا بیگوتایە «ئاخر بۆیە وای گوتووە، چونکە ویستوویەتی ئەو هەموو ساڵە ناخۆشەی زیندان لەیاد بکات»، یاخود لەوانەیە پرسیارێکی نوێی بکردایە، پێشی دەچوو ئاماژەی بۆ پەیکەرە شێوە هێلکەییەکان و قەڵغان و پەیکەری ئاژەڵە جۆراوجۆرەکانی سەر دیوی دیوارە مەزنەکەی دانیشگاکە بکردایە. هەر زۆر پێش من و تۆش چاوی دەچووە سەر پەیکەری کەللەسەر و بۆقەکە، بێگومان تۆش پێت نەدەگوت کە ئەو نەخشە سیمبولێکە و پەیوەندیی نێوان مردن و هەوەسی سێکسی دەردەبڕێت، ئەوەشت بۆ ڕوون نەدەکردەوە کە کاتی خۆی لە ڕێگەی ئەو شکڵەوە هۆشیارییان داوە بە گەنجەکان تا زیادەڕۆیی لە سێکسدا نەکەن. دیارە پێش ئەوەی من و تۆ لە تەماشاکردنی ڕووکاری ئەو دیوارە تێر ببین، سۆنیا ڕایدەکردە ناو حەوشەی (لاس ئیسکیولاس مینۆریس)وە کە شێوەیەکی بینای باوی سەدەی پانزەهەمە. پێی دەچوو من و تۆش هەر بەدەم ڕێگاوە قسەمان بکردایە، ئینجا ئەویش هەر خۆی بە تەنها خۆی دەکرد بە مۆزەخانەی دانیشگاکەدا و زۆر بە سەرنجەوە سەیری سەقفە شینە تۆخەکەی دەکرد و دەیڕوانییە وێنەی ئەستێرەکان. پێم وابێت هەردووکمانی ڕادەکێشایە ناو هەردوو کاتیدرائییەکەوە، ئینجا داوای لێ دەکردین دۆدرمەیەکی بۆ بکڕین، پاشان ئێمەش ناچار دەبووین تا ڕۆژی دواتر بوەستین ئینجا سەردانی دێری (سان ئیستیبان) بکەین کە سەری سەرەوەی دیوارەکەی پڕە لە هێلانەی گەورە گەورەی باڵندە، هەروەها دێری (دویناس)یش کە بەناوبانگە بە حەوشە قەشەنگ و کۆشکی (فۆنسیکا)ی سەردەمی ڕێنیسانس کە

ڕێک کەوتۆتە تەنیشت ئەو گۆڕەپانەوەی کە کاتی خۆی بۆ زۆرانبازیی گا بەکاریان هێناوە، بیناسازیی ئەو گۆڕەپانەش بەشێوەیەکی تایبەت و نایاب داڕێژراوە.
باسکردنی سۆنیا بەشێوەیەکی قووڵ و جوان سوودی بۆ هەردووکمان هەبوو، من و تۆ هەردووکمان لەسەر ئەوە تەبا بووین. لەویادا چواردەورمان بە ژیانی چەند سەدەیەک گیرا بوو و پێم وابێت هەر لەبەرئەوە بوو کەوا توانیمان ئاوها بەڕاشکاوی قسە لەو بارەیەوە بکەین، وە بەبێ ئەوەی بەهیچ شێوەیەک زۆر لە خۆمان بکەین.
تۆ سوور بوویت لەسەر ئەوەی ناوچەی دانیشگا دێرینەکەت نیشان بدەم، هەرچەندە تەنها باسی سۆنیاشمان دەکرد. بەو شێوەیەش بەجۆرێک لە جۆرەکان لە سالامانکادا سۆنیامان لەگەڵدا بوو. نا.. سۆنیا چیتر لە ژیاندا نییە، ڤیرا، من مەبەستم لەوە نەبوو، تەنانەت ناشمەوێت بڵێم دەبێت درەنگ یان زوو قبوڵی مردنەکەی بکەین، بەڵام ئەگەر هەموو یادەوەرییەکانی کچە بچکۆلەکەمان بوارێکی زیندووی هەبێت کە گەشەی تێدا بکات، جەوێکی هەبێت کە تیایدا بلەرێتەوە، بنچینەیەکی هەبێت کە بیپارێزێت، ئەوا تەنها من و تۆ دەتوانین شتێکی لەو بابەتەی بۆ بخوڵقێنین.
تۆ کۆمەڵێک چیرۆکی بچکۆلەت دەربارەی کچە بچکۆلەکەم گێڕایەوە، کە من قەت لەوەوپێش نەمبیستبوون، ئەوە زۆر ئازاری دام، پێم ناخۆش بوو و پەشیمان بووم کە هەموو چرکەیەکی ژیانی سەر ئەم زەوییەی لەگەڵیدا نەبووم، بەڵام هاوکات ئەوەشم بۆ ڕوون بووەوە کە هێشتا بوارم هەیە کە باشترێک بیناسم. تۆ زۆرجار ڕووت وەرچەرخاند و چاوت سڕی. ڤیرا، من ئەوەم بینی. ڕێک پاش ئەوەی تۆش ئاماژەت بۆ کەللەسەر و بۆقەکە کرد، وابزانم لەویادا تۆش لەوە تێگەیشتیت کە بۆ ئەوە ڕووم وەرنەچەرخاند تا بەوردی تەماشای زەخرەفەی سەر دیواری دانیشگا کۆنەکە بکەم. بەهەرحاڵ زۆرجار لە کاتی ئەو پیاسە دوورودرێژەدا ئەو ڕاستییە وروژاندمی کە تۆ هێشتا هەر دایکی سۆنیایت. ڕەنگە ئەم وەبیرهێنانەوەیە ئازارت بدات، بەڵام بەڕاستی ئەو کەسەی کە من لەو پاشنیوەڕۆیەدا پیاسەم لەگەڵدا دەکرد، دایکی کچێکی بچکۆلە بوو. کچەکە خۆی هەرگیز تەمەنی لە چوار ساڵ و نیو تێنەپەڕی، تەنها دایک و باوکیەتی کە بەشێوەیەکی بێ ڕەحمانە تەمەنیان دەگاتە (٤٠ و ٥٠ و ٦٠)، بەڵام ئێمە بەدرێژایی ژیانمان دەبێت لەگەڵ سۆنیای تەمەن چوار ساڵ و نیودا بژین. ڤیرا، تۆ هێشتا هەر دایکی ئەویت و منیش هێشتا هەر باوکی کچەکەتم.
پاش نانخواردنی ڕەسمیی دوا ئێوارەی کۆنفرانسەکە، خۆمان لە ئاهەنگەکە کێشایەوە

و دیسانەوە لەوێشدا تۆ داوات کردەوە کە پیاسەیەک پێکەوە بکەین، تۆ ویستت ڕووبارەکەم نیشان بدەیت، لەیادتە؟ وتت پاشنیوەڕۆی ئەو ڕۆژە خۆت بە تەنها بەلای کەنار دەریای (تۆرمس)دا ڕۆیشتوویت، هەروەها وتت لەسەر پردە دێرینە ڕۆمانییەکە وەستاویت و تەماشای باڵندەکانت کردووە، سەیری قاز و قووەکانت کردووە. ئەوەشت بۆ گێڕامەوە کە لەویادا توشی حاڵەتی (ستیندالْ[٦٠]) بوویت، چونکە گوێت لە نەغمەی بولبولی (هوزار) بووە و هاوکاتیش خۆر ئاوا بووە و سالامانکا لە پشتەوەتدا وەک جەوهەرێکی سووربلو دەرکەوتووە.
ئەو کاتەی لە ئوتێلەکەدا هاتینە دەرەوە و بەرەو ڕووبارەکە ڕۆیشتین، دونیا تاریک بووبوو، لەویادا چیتر باسی سۆنیامان نەکرد. لە سەرەتادا قسەکانمان هێندە گوڕ و تینی پێوە دیار نەبوو، بەڵام دواتر پرسیارم دەربارەی تۆ و شێوەی ژیانی تۆ کرد و تۆش هەروەها پرسیارت دەربارەی من و شێوەی ژیانی من کرد. دەربارەی مانەوە دوورودرێژەکەم لە ناوچەی خوارووی ئۆقیانووسی ئارامدا، کۆمەڵێک پرسیاری زۆرت لێ کردم. وابزانم فریاکەوتم شتێکیشت دەربارەی تاڤیونی بۆ بگێڕمەوە، بەلایەنی کەمەوە پێم وابێت چیرۆکی مارمێلکەکەم بۆ گێڕایتەوە کە بە بتڵی جنەکەمەوە خۆی مەڵاس دابوو و نەموێرا دەری بکەم، چونکە لەوە ترسام بتڵەکەم بڕژێت، لەگەڵ گێڕانەوەی ئەو چیرۆکەدا کەمێک گاڵتەشم بە خۆم کرد. دەربارەی پرۆژەی توێژینەوە نوێکەت پرسیارم لێ کردیت و بیرمە وەک دەرئەنجامێک وتم: «پێدەچێت لە هەموو ئیسپانیادا تۆ زیرەکترین پسپۆڕی بواری ئەنترۆپۆلۆجیای پالیۆنتۆلۆجی بیت، بەلایەنی کەمەوە لە بواری کۆچکردنی ڕەگەزەکاندا لە ماوەی پێش مێژوودا. ئینجا تۆش خەندە گرتیتی و هیچ لارییەکت لە قسەکەم نەبوو. زۆر شانازیت بەوەوە دەکرد کە یارمەتی داراییان پێ بەخشیویت.
گەیشتینە لای ڕووبارەکە و چووینە سەر پردە دێرینەکە، ئەو پردەی کە تەمەنی دوو هەزار ساڵ دەبێت. وابزانم قووەکان وایان لێ کردیت کە سەرلەنوێ بیر لە سۆنیا بکەیتەوە. بەهەرحاڵ کەوتیتە گێڕانەوەی بەسەرهاتەکانی ژیانمان لە ئۆسلۆ، کە ئێستاکە تاڕادەیەک لە ئەفسانە دەچن. باسی هەموو ئەو سەفەرانەت گێڕایەوە کە کاتی خۆی پێکەوە بۆ (سۆگنسڤان) و (ئوللەڤۆلستەر) کردمان، باسی قەراغ ئاوەکەی (هوک)یشت گێڕایەوە کە بۆ یەکەمین جار تەپەدۆری ژێربالْمان بۆ سۆنیا بردبوو تا مەلە بکات، بەسەرهاتی ئەو جارەشت گێڕایەوە کە سۆنیا بۆ ماوەی نزیکەی سەعاتێک لەناو پەرژینە پڕ پێچ و پەناکانی پارکی (فرۆگنەر)دا خوولایەوە.

دواتریش کە هاتە دەرەوە داوای خەڵاتی لێ کردین و ئینجا دۆدرمەیەکی گەورەمان لە چێشتخانەی (هێرەگۆرد) بۆ کڕی.
وازم لێ هێنایت بە ئارەزووی خۆت قسە بکەیت و خۆشم لەژێرەوە بیرم لەو پەیمانە دەکردەوە کە دابوومان بە یەکتری و وتمان باسی ئاشتبوونەوەی ئەو دوو کەسە ناکەین کە لە خێزانە سێ کەسییەکەماندا ماونەتەوە. ڕاستە لەوە تێدەگەیشتم کە گەڕانەوەمان بۆ لای یەکتری شتێکی سەخت بوو و ڕێگایەکی وامان شک نەدەبرد، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بە بڕوای من هەردووکمان دوو کەسی ترسنۆک بووین ئەگەر لایەنی کەم هەوڵمان نەدایە ڕێگایەکی نوێ بدۆزینەوە. لەو کاتەدا کە باسی سۆنیات گێڕایەوە و وتت لەناو پەرژینە پڕ پێچ و پەناکەدا هاتە دەرەوە، من بیرم لەوە دەکردەوە کە دەبێت هەوڵێک بدەین و قەناعەت بە یەکتری بکەین.
بێگومان تۆش هەستت بە بێدەنگیم کرد و لەناکاوێکدا پرسیارت لێ کردم و ویستت بزانیت بیر لە چی دەکەمەوە. تۆ خۆت من باش دەناسی و دەزانی کاتێک کە لە کاتی گفتوگۆیەکدا بێدەنگ دەبم، ئەوا بیر لە شتێکی غەمگین دەکەمەوە. منیش لە وەڵامدا وتم: (بیر لە هەردووکمان دەکەمەوە)، تۆش وات بە باش زانی کە بیر لەوە نەکەمەوە و جەختت لەسەر ئەوە کردەوە کە تەنها و تەنها بەهۆی سۆنیاوە لە سالامانکادا پێکەوە کۆبووینەتەوە. منیش وتم» «ئاخر هەر بەهۆی سۆنیاوەیە کە بیر لە هەردووکمان دەکەمەوە»، بەڵام تۆ یەک و دوو چوویتەوە ناو قووڵایی چیرۆکە کۆنەکە و باسی ئەوەت بۆ گێڕامەوە کە چۆن کاتی خۆی کە لە خەستەخانە هاتنە دەرەوە خەریک بوو هەڵەیەک ڕووبدات و سۆنیا لەگەڵ منداڵێکی تردا بگۆڕنەوە. لە کۆتایی قسەکانیشتا وتت: «خۆ ئەگەر ئەوە ڕوویبدایە، ئەوا ئەو منداڵەی کە مرد منداڵی من نەدەبوو، بەڵکو یەکێکی تر دەبوو. ئەو کاتەش سۆنیا هێشتا هەر لە ژیاندا دەبوو».
لەو کاتەدا بیرم لەوە دەکردەوە کە تۆ هەمیشە بە چ شێوەیەک ئەو ڕووداوەی (سۆگنسڤای) جار لەدوای جار دەگێڕیتەوە و هەموو جارێکیش لەسەرخۆ و بە دوورودرێژی باسی دەکەیت، هەرچەندە لە ڕاستیدا خۆی بۆ خۆی هەر زۆر بەخێرایی ڕوویدا. پاشانیش ناچار بوویت دوو سێ جار لەو بارەیەوە ڕوونکردنەوە بە پۆلیس بدەیت و لەو کاتەشەوە خودی ئەو ڕووداوە بووە تابۆیەک، بوو بە (شتەکە) یان (ئەو شتەی کە ڕوویدا)، وابزانم هەردووکمان لە سالامانکادا لەوە دەترساین کە بگەڕێینەوە سەر ئەو دیمەنە دڵتەزێنە. ئەو کاتە هەر لەوە دەچوو کە قەتماغەی برینێکی کۆن

هەڵبدەینەوە، لێرەدا تەنها مەبەستم لەو برینە نییە کە لەدوای لەدەستدانی سۆنیاوە توشمان بوو، بەڵکو مەبەستم لەو برینەشە کە توشی یەکتریمان کرد.
(ئەو شتەی کە ڕوویدا) شتێکی هەر زۆر ساکار بوو، شتێک بوو کە ڕۆژانە ڕوودەدات، بەڵام هەر ئەو ساکارییەش سەرتاپای ڕووداوەکەی هێندەی تر ناخۆش کرد: تۆ (سۆنیا)ت لە باخچەی ساوایان هێنایەوە، لە سەیارەکەدا داتنابوو، سلفێکت لێدابوو و سەیارەکەت خستبووە ئیش، ئینجا لەویادا بیرت کەوتبووەوە کە پێڵاوی ماڵەوەی (سۆنیا)ت لەناو دۆڵابەکەیدا بیر چووە. سەیارەکەت کوژاندبووەوە و سویچەکەت لە سلفەکەدا دەرهێنابوو، بەڵام بیرت چووبوو کە ئیستۆپی دەستییەکە ڕابکێشیت و سەیارەکەش لەسەر بۆش بووە. زۆر بەخێرایی پاش نەختێک بە خۆت و پێڵاوەکانی سۆنیاوە گەڕابوویتەوە لای سەیارەکە، ڕێک لەو کاتەدا سەیارەکە خل بووبووەوە، چونکە قەدەر، هەروەک چۆن خۆت هەموو جارێک ئاماژەت پێ دەدا، دەیەوێت بە چاوی خۆت هەموو ڕووداوەکە ببینیت، تەنها لەبەرئەوەی تێبگەیت کە ناتوانیت هیچ شتێک بکەیت. هەربۆیە دەزانین لە دووری (٣٠٠) مەترێکەوە لە پێچەکەی خوارەوەدا چی ڕوویدا. دەزانین پاش سێ ڕۆژ بەسەر ئەو ڕووداوەدا چی ڕوویدا، ئەوەش دەزانین کە لە هەموو بارێکدا و هەرچییەک بەسەر چارەنووسی من و تۆدا بێت، ئەو ڕووداوە دەبێتە شتێک کە من و تۆ هەرگیزاو هەرگیز باسی ناکەینەوە.
من لەوەوپێش چەندەها جار ئەم قسەیەم کردووە و وا ناچارم کەڕەتێکی تریش بیڵێمەوە، ئەم جارەیان بۆت دەنووسمەوە تا بۆ هەتاهەتایە لەبەردەستتدا بێت: چیتر ئەم بابەتە پەیوەندی بە لێبوردنەوە نییە، چونکە تۆ لەوەوبەر چەندین جار بووراویت. دەمێکە، زۆر دەمێکە تۆ بەخشراویت. هەموو ئەو شتانە کۆتاییان پێ هاتووە، تەواو بوون تەواو. من دان بەوەدا دەنێم کە کاتی خۆی لە بێ ئومێدی خۆمدا لێت تورە بووم و یەک کەڕەتیشیان داوام لێ کردیت بڕۆیت و لەبەرچاومدا نەمێنیت، لەهەمانکاتیشدا دامە قووڵپەی گریان. هەروەها داوای لێبوردنیشم لێ کردیت، داوام لێ کردیت غەم و پەژارە ڕووخێنەرەکەم ببەخشیت. دواجاریش تۆ بڕیاری خۆتت دا و ئەوەت هەڵبژارد کە بەجێم بهێڵیت. من خۆم چەندین جار هەر هەمان ئەو پرسیارانەم ورووژاندەوە، کە پۆلیسیش لێی کردیت: بۆچی (سۆنیا)ت بە تەنها بەجێهێشت؟ بۆچی ئیستۆپی دەستییەکەت ڕانەکێشا؟ بۆچی بەلایەنی کەمەوە سەیارەکەت لەسەر گێڕ دانەنا؟ جووتێ پێڵاوی ماڵەوە دەبێت چی

بێت؟ چ پێویستییەکت بەو جووتە پێڵاوە هەبوو؟ بەڕاست، ئەو جووتە پێڵاوە نەحلەتییەت بۆچی بوو؟

هەر ئەوەش نەبوو، بەڵکو شتێکی تریش لەئارادا بوو. ئەو ڕۆژە تۆ ڕاستەوخۆ لەدوای ئاهەنگی کۆتایی ساڵی خوێندنی پەیمانگاکەتەوە بەرەو ئەوێ ڕۆشتبوویت، سێ چوار پەرداخ شەمپانیات خواردبۆوە و دەرکەوت لەو کاتەدا کە سواری سەیارەکەت بووبوویت چڕی ئەلکهولی ناو خوێنت (٠،٥٢) بووە. پۆلیسیش وای بە باش زانی بەوەیان تۆمەتبارت نەکەن، چونکە بە بڕوای ئەوان سزایەکی هەر زۆر توندت چێشتبوو. کتومت وایان گوت: «سزایەکی هەر زۆر توندی چێشتووە»، پۆلیسەکان، بە بەراوردکردنیان لەگەڵ نزیکترین کەستدا، زۆر مرۆڤانەتر مامەڵەیان لەگەڵدا کردیت.

ئەگەر تا ئێستاش لەو بارەیەوە هەر لۆمەی خۆت دەکەیت، مەبەستم لەوەیە کە لە یەک دوو چرکەدا خەیاڵت ڕۆیشت و ئیستۆپی دەستییەکەت ڕانەکێشا، ئەوا دەبێت بزانیت کە هەقی خۆتە زیاترێک لۆمەی من بکەیت، چونکە من بەردەوام خوێم دەکرد بە برینەکەتەوە، بە برینە تازەکەتەوە. وەک دەزانیت من بە دەستی ئەنقەست ئەوەم دەکرد، هەندێکجاریش بە مەبەست و پلانەوە ئازارم دەدایت.

مەبەستم ئەوەیە بڵێم دواجار بەشێوەیەک لە شێوەکان کۆتاییمان بەوە هێنا، دواجار ئاشت بووینەوە. تۆ گواستتەوە بۆ بەرشەلۆنە، بەڵام نەک لەبەرئەوەی کە من نەمبەخشیت. بگرە ئەوەشم پێ گوتیت کە دەکرا من بوومایە لەجیاتی تۆ، پێی دەچوو من هێندە بێ پەروا بم، من پێم وایە تا ئەندازەیەک هەموو کەسێک بۆ ماوەی چەند چرکەیەک لە کاتی سەرلێشێواندا شیاوی ئەوە بن شتێکیان لەبیر بچێت. بەو شێوەیە و تەواو، هەروەک چۆن هەورەبروسکەیەک کوێرانە دەیدات لە شوێنێک، ئاوهاش جارجارێک خێزانێکی بچکۆلە کوێرانە دووچاری ڕووداوێکی دڵتەزێن دەبنەوە.

بەتەواوەتی ئاشتبووینەوە ڤیرا، کاتێکیش دواجار شتەکانت کۆکردەوە و سەفەرت کرد، لەبەرئەوە نەبوو کە نەبەخشرابوویت. تۆ لەتاو غەم و پەژارەی من کۆچت کرد، نەتتوانی لەگەڵ ئەو غەمەی مندا هەڵبکەیت، ئاخر تۆ بە هەزار حاڵ لەگەڵ خەم و خەفەتی خۆتدا ژیانت دەبردەسەر. لە تواناتدا نەبوو غەمی من و لۆمەکردنەکانی پێشووترم لە یەکتری جودا بکەیتەوە، بەڵام منیش لەو چەند حەفتەیەدا کەسێکی میهرەبانی وا نەبووم کە لەگەڵمدا هەڵبکەیت، خۆ ئەگەر خێزانێکم لە وڵاتێکی تر شک ببردایە، ڕەنگە سەفەرم بکردایە بۆ لایان. لەبەرئەوە زۆر لە شوێنی خۆیدا بوو

که پاش ماوەیەکی کەم دەبووایە سەفەرێکی دوورودرێژ بۆ دوورگەکانی خوارووی ئۆقیانووسی ئارام بکەم. ماڵەکەمان ماتەمینی تەنیبووی، غەم و پەژارەیەکی یەکجار زۆر لەژێر تەنها یەک سەقفدا کۆبووبووەوە و تۆ وات هەڵبژارد کە غەمەکە بکەیت بە دوو بەشەوە.

لەسەر پردە دێرینەکە وەستابووین و چاومان بڕیبووە ئاوە خوڕەکەی خوارەوە، بەسەرهاتێکی تری (سۆنیا)ت گێڕایەوە و باسی ئەو کەڕەتەت کرد کە هاتەوە ماڵەوە و سەد کرۆنییەکی کاغەزی پێ بوو، هەڵبەتە وەک خۆی وتی، لە گیرفانی چاکەتی یەکێک لە دایەنەکانی باخچەی ساوایاندا دۆزیبوویەوە، هەر ڕێک کە باسەکەت تەواو بوو، خەریک بوو پەیمانە ڕەسمییەکەمان بشکێنم کە لە ئوتێلەکەدا بە یەکتریمان دا. ویستم بڵێم: «پێویست ناکات ئێستاکە باسی ئەوە بکەین، بەڵام ڕۆژێک دادێت کە ناچار بین پرسیار لە خۆمان بکەین و بڵێین باشە هەر هیچ نەبێت هەوڵێک نەدەین تا بگەڕێینەوە لای یەکتری، تەنانەت ئەگەر لە ڕێگەیەکی تەواو نوێشەوە بێت؟»

ئێمە هەردووکمان لەدوای مردنی سۆنیاوە وەک شتێکی حەتمی تەماشای ئەو ڕووداوەمان کرد کە بەسەر من و تۆدا هات، بەڵام ئایا هەموو مانا و ئامانجەکان تەنها ئاماژە بۆ یەک ئاراستە دەکەن؟ بڵێیت هیچ شتێک لەو شتانەی کە لە ئێستا و ئێرەدا ڕوودەدەن، نەتوانێت ئاماژە بۆ ڕابردوو بکات و مانایەکی تەواو نوێ ببەخشێت بە شتێک کە لەمەوبەر ڕوویداوە؟ دەزانم پرسیارەکانم جورئەتیان پێوە دیارە، بەڵام ئایا ناکرێت پێکەوە هەوڵێک بدەین و شتێک بکەین کە مانایەک بە مردنەکەی سۆنیا ببەخشێت؟

تەنها فریای ئەوە کەوتم لێت بپرسم برادەرت پەیدا کردووە یان نا؟ تۆش تەنانەت فریای وەڵامدانەوەشم نەکەوتیت، چونکە ڕێک لەو کاتەدا بوو کە دوو تارماییەکەم لە قەراغ ئاوەکەی خوارەوەدا بینی. باوەشیان بە یەکدا کردبوو، هەر لە دووانەیەک دەچوون کە لەناو یەکتریدا توابنەوە، زۆر بەڕوونی بینیمن، چونکە بۆ ماوەی یەک دوو چرکە بە بەردەم ئەو گڵۆپە گەورانەدا تێپەڕین کە پردەکە ڕووناک دەکەنەوە، هەربۆیە سێبەرێکی گەورەشیان بەسەر ئێمەدا هێنا. ژنێکم بینی جلی سووری لەبەردا بوو و پیاوێکیش بەرگی ڕەشی پۆشیبوو، من لەسەدا سەد دڵنیا بووم کە ئەو دووانە ئانا و خۆسێ بوون. هەر دەتگوت گەڕاومەتەوە ناو باخی دارگوێزە هیندییەکانی ماراقیو.

دەستێکم خستە سەر شانت و بەرەوڕوویان ئاماژەم کرد، سەرسام بووم و بە

چرپەیەک وتم:
- ئەو دووانە (ئانا و خۆسێ)ن.
تۆ سەیرێکت کردم و خەندەیەکی مەکراوییت خستە سەر لێوانت. دواتر بەناچاری خۆم لە خۆمم پرسی: «بڵێیت ئەو خەندە گەرم و مەکراوییەی سەر لێوانت بەهۆی ئەوە بوویێت کە لەپڕێکدا ناوی یەک دوو کەسم هێنا کە قەت لەوەوپێش بەرگوێت نەکەوتبوون؟ یاخود وەڵامێکی ئەو پرسیارە بوو کە کەمێک لەمەوبەر لێم کردیت؟»
من ئەو ئێوارەیە هێندە قسەم نەکرد، بەڵام لەوە بەدواوە سەرەی من بوو، هەر زۆر بەپەلە باسی ئەو دوو کەسە سەیرەم بۆ گێڕایتەوە کە لە تاڤیونی بینیبوومن. هەتا زیاترێکیشم بۆ دەگێڕایتەوە، خەندەکەی سەر لێوانت گەورەتر و گەورەتر دەبوو، بەڵێ، زیاتر و زیاتر پێدەکەنیت.
چەند خۆش بوو بەلامەوە کە دیسانەوە بینیمیت پێدەکەنیتەوە، بیرمە دواجار کە بینیمیت پێبکەنیت سەرلەبەیانی دواهەمین ڕۆژی پەیمانگاکەت بوو، دڵت زۆر خۆش بوو، چونکە بەشداری نمایشی ئاهەنگی کۆتایی پەیمانگاکەت دەکرد. ئەو ڕستە پڕ حیکمەتانەم بۆ گێڕایتەوە کە ئەو دووانە لەسەر دوورگەکە دەیاندا بە گوێی یەکتریدا، باسی ئەوەشم بۆ کردیت کە بەدزییەوە سەیرم کردن کاتێک بە ڕووتی لە ڕووباری (بۆئوما)دا مەلەیان دەکرد، وتیشم ئانا سەماکەرێکی بەناوبانگی فلامینکۆیە و کەرەتێکیان لەپڕێکدا بورایەوە، وابزانم زۆر زۆر شتم لەبارەیانەوە گێڕایەوە، بەڵام دڵنیام ئەوەم پێ نەگوتیت کە ئانا و خۆسێ جۆرە توانایەکی (کلاڤۆیانت)یان هەبوو، هەر بۆیە سەرجەم یاریی کاغەزەکانیان دەبردەوە. بەدەر لە هەموو ئەوانەش شتێکی تریشم بۆ گێڕایتەوە کە هەرە گرنگترینیان بوو، وتم هەر زۆر زۆر دڵنیا بووم لەوەوپێش (ئانا)م بینیبوو، هەڵبەتە پێش ئەوەی لە تاڤیونیدا بیبینم، بەڵام هەر ئەوەندە بوو کە بیرم نەدەکەوتەوە یەکەم جار لە چ شوێنێکدا بینیبووم.
تۆش هەر پێدەکەنیت و پێدەکەنیت، لەوەدەچوو ماوەیەکی یەکجار زۆر بێت ڕێگەت لە پێکەنینەکانت گرتبێت وا دواجار لەویادا بەریان بدەیت. تۆ بەتەواوەتی لەو قەناعەتەدا بوویت کە گاڵتەت لەگەڵدا دەکەم، یەکەم جار وتت: «بۆیە ئامارە بۆ ئەو دوو کەسە دەکەیت، چونکە پەشیمانیت لە پرسیارەکەت و ناوێریت چاوەڕوانی وەڵامەکەی بکەیت». دواتریش وتت: «ئەو چیرۆکە سەرنجڕاکێشەم تەنها بۆ ئەوە بۆ دەهۆنیتەوە تا زیاترێک لەلای ڕووبارەکە لەگەڵ خۆتدا بمهێڵیتەوە». لە سێهەمین

تیۆریشتدا وتت: «تۆ زیرەکانە وەک دەستپێشکەرییەک لەپڕێکدا ئاماژەت بۆ ئەو دوو دەستگیرانە کرد، تا پەیمانەکەمان بشکێنیت»، بەڵام لێکدانەوەیەکی چوارهەمیشت هەبوو و لەنێوان هەموویاندا ئەو دانەیەیانت زۆر بەدڵ بوو، بگرە هەتا ئەو کاتەش کە چووین بخەوین هەر قەناعەتت بەوەیان بوو. تۆ گوتت: «هێدی هێدی جۆرە چیرۆکێک دەهۆنیتەوە کە ڕێی تێناچێت، هەموو ئەوەش تەنها لەبەرئەوە دەکەیت کە من بخەیتە پێکەنین». نامەوێت هێندە زیاتر دەربارەی پێکەنینەکەت بڵێم، بەڵام لە دواجاردا پێکەنینەکەی خۆت لەڕادەبەدەر دڵخۆشی کردیت. خۆشبەختیت لێ دەدرەوشایەوە کە توانیت گەوهەرێک بدۆزیتەوە کە لەوەوپێش واتدەزانی بۆ هەتاهەتایە ونت کردووە. مایەی سەرنجیشە کە هەموو لێکدانەوەکانت خاڵێکی هاوبەشیان لەنێواندا بوو: هەر هەموویان وەک یەک جۆرە نازێکی ژنانەیان تێدا بەدی دەکرا.

لەیادمە لەویادا بیرم لەوە کردەوە بەدوای ئانا و خۆسێدا ڕابکەم، چونکە خەریک بوو قەراغ ئاوەکەیان بەجێ دەهێشت و بەرەو ناو شار دەڕۆیشتن، بەڵام من لەگەڵ تۆدا بووم و لە خاڵێکیشدا ڕاستت دەکرد، من دەمویست هەتا بکرێت زیاترێک لەگەڵ خۆمدا بتهێڵمەوە، بەتایبەتیش لەژێر ئەو ئاسمانە جوانەی ئەو شەوەدا کە بەسەر ڕووباری (تۆرمس)ەوە بوو. ئاخر ئەوە دواهەمین ئێوارەمان بوو پێکەوە و لەویادا خەریک بوو یەکێک لە گرنگترین گفتوگۆکانی ژیانم دابمەزرێنم، بەدەر لەوەش خەریک بوو پەیمانێک بشکێنم. لە ڕاستیدا شتێکی تریش ڕێگرم بوو و وای لێ کردم لە شوێنی خۆمدا بمێنمەوە: کە لەویادا بینیمنەوە، نەمویست کەڕەتێکی تریش خۆم لەو پەیوەندییە مەحکەمەی نێوانیاندا هەڵقورتێنمەوە. جگە لەوانەش ئەگەر لەویادا لەناکاودا ڕامبکردایە بەدوایاندا، ئەوا بەلایەنی کەمەوە بە چوار جۆری جیاواز لێکت دەدایەوە و پێشی دەچوو دیسانەوە شاڵاوێکی تری پێکەنین بتگرێتەوە.

ئای کە پێکەنیت ڤیرا. دڵنیام من لەویادا زۆر شڵەژابووم و ڕەنگە هەر لە قەشمەرێک چووبم، بەڵام ئای کە تۆ پێکەنیت!

وابزانم تەنها یەک کەڕەت توانیم شەپۆلی پێکەنینەکەت بپچڕێنم. لەو کاتەدا کە ئانا و خۆسێ لەبەرچاوماندا ون بوون، زۆر بە جیددی دیسانەوە وتمەوە کە دەیانناسم، بەڵام تۆ گوتت:

– فرانک، ئەوانە دوو قەرەج بوون، قەرەج.

بەرەو ئوتێلەکە بەڕێکەوتین و لەوەبەدواوە دوو بابەتمان هەبوو کە باسکردنیان

قەدەغە بوو. یەکەمیان ئانا و خۆسێ و دووهەمیشیان فرانک و ڤیرا بوو.
ئەو ئێوارەیە تا لای دەرگای ژوورەکەت لەگەڵتا هاتم، دواهەمین ئێوارەمان بوو ئیتر. هەمووی چەند مانگێکی کەم بەسەر دواجارماندا تێپەڕیبوو کە پێکەوە خەوتین، هەستم کرد شتێکی بێ مانا و ناخۆش بوو کە چیتر لە یەک ژووردا ناخەوین.
بۆ بەیانی ڕۆژی دواتر سواری شەمەندەفەر بوویت و گەڕایتەوە بۆ مەدرید و لەوێشەوە بۆ بەرشەلۆنە، پێشم گوتبیت لەوانەیە شەوێکی تریش لە (سالامانکا)دا بمێنمەوە. تۆ هەر بڕوات بەوە نەکرد کە من (ئانا و خۆسێ)م دەناسی و بێگومان هەڵسەنگاندنی خۆشت هەبوو بۆ ئەوەی کە من بڕیارم دا زیاترێک بمێنمەوە وەک لەوەی لەوەوپێش پێم گوتبوویت.
ئەو ڕۆژە تا پێشنیوەڕۆیەکی درەنگ بۆی خەوتم. ئینجا چوومە ناو شار و بەدوای (ئانا و خۆسێ)دا گەڕام. لە سەرەتادا بەشێوەیەکی هەڕەمەکی بە جادەکاندا سوڕامەوە، لە یەک دوو شوێنیشدا سۆراخم کردن و ویستم بزانم هیچ کەسێک نییە شتێک دەربارەی ئانا و خۆسێ بزانێت، پرسیارم کرد و وتم یەکەمیان سەماکەرێکی بەناوبانگی سەمای فلامینکۆیە و دووهەمیشیان پەیامنێری تەلەفیزیۆنە، بەڵام بێگومان هیچ وەڵامێکم دەست نەکەوت.
هێشتا نانی بەیانیم نەخواردبوو، خۆم کرد بە قاوەخانە قەرەباڵغەکەی (پلازا مایۆر) دا، هەر ئەو قاوەخانەیەی کە من و تۆ نانی نیوەڕۆمان تیایدا خوارد، ئەو ڕۆژە بوو کە تۆ وەڵامی ڕەخنەکانی (گیبۆنس)ت دایەوە کە لەسەر وتارەکەی من گرتنی. هێلکەوڕۆنێک و بیرەیەکم داوا کرد. ئەو ڕۆژە هەر زۆر بەختەوەر بووم، چونکە هەر پاش نەختێک ئانام بینی بەپەلە خۆی کرد بە قاوەخانەکەدا. ئەو منی نەبینی، ئاوڕێکم دایەوە و چاوم بە خۆسێ کەوت، لەوسەری قاوەخانەکەدا لە پشت پایەکەوە دانیشتبوو و چاوەڕێی ئانا بوو. وابزانم ئەویش منی نەدیبوو.
گوێم هەڵخست و گوێم لێ بوو بەگوڕ چرپەچرپیان بوو، بەڵام بەهۆی ماوەی زۆری نێوانمانەوە نەمتوانی لە قسەکانیان بگەم. ویستم هێلکەوڕۆنەکەم بخۆم، ئینجا بڕۆم سەلامێکیان لێ بکەم، خۆ هەر هیچ نەبێت ڕێکەوتێکی سەیر بوو کە جارێکی تر هێندە دوور لە (ماراڤیو)وەوە یەکتری ببیننەوە، بەڵام پاش نەختێک بە دەنگێکی بەرز مۆسیقایەکی فلامینکۆ لە بڵندگۆکانەوە بەرز بووەوە، لە دڵی خۆمدا وتم ڕەنگە وەک ڕێزلێنانێک بێت بۆ ئەو سەماکەرە. بەهەرحاڵ بە دەنگێکی گڕ گۆرانیان بەسەر خۆشەویستی و هەڵخەڵەتاندن و مردن و ژیاندا هەڵدەدا، منیش ئاوڕێکم دایەوە

و تەماشایەکی ئەوسەری هۆڵەکەم کرد. وا هاتە بەرچاوم کە لەشی ئانا لەگەڵ مۆسیقاکەدا بجووڵێتەوە، لە خەیاڵی خۆمدا وتم: «ڕەنگە بیەوێت خۆی بگرێت، نەبا هەڵسێت و بکەوێتە سەماکردن».
ئینجا هەستایە سەرپێ، بەڵام نەک بۆ ئەوەی کە سەما بکات. هەر چۆن بە پڕتاوێک هاتە ژوورەوە، ئاوهاش بە پڕتاوێک بەرەو دەرەوەی هۆڵەکە دەرپەڕی، یەک کەڕەتیش ئاوڕی لە خۆسێ دایەوە و بە تووڕەییەوە هاواری بەسەردا کرد و وتی:
– ئەمەوێت بگەڕێمەوە بۆ ماڵەوە، گوێت لێیە؟ ئەمەوێت بڕۆمەوە بۆ ئیشبیلییە!
لە خەیاڵی خۆمدا وتم هەموو خێزانێک بەشی خۆی هەڵچوونی هەستەکانی تێدایە، بەڵام فریا نەکەوتم هێندە زۆر بیر لەوە بکەمەوە، چونکە لەویادا خۆسێ بەپەلە بە قاوەخانەکەدا تێپەڕی. منیش چوومە سەر ڕێگاکەی و وتم:
– خۆسێ؟
سەرسام بوو و بە دەنگێکی بەرز وتی:
– فرانک!
هەر زۆر بەخێرایی سەیرێکی کردم و دەستی بەملاولادا بادا، هەروەک ئەوەی بیەوێت بڵێت: «خوایە یارمەتییەکم بدە!» یان شتێک لەو بابەتە. هاوکاتیش پەلەی بوو، بەدەم ڕاکردنەوە وتی:
– فرانک، دەبێت لەگەڵ یەکتردا قسە بکەین. تۆ قەت ناچیت بۆ مۆزەخانەی پرادۆ؟
ئیتر تەواو ڤیرا، ئەوە هەمووی بوو. باقی ڕۆژەکە بە سالامانکادا خوولامەوە، بەڵام سەرلەنوێ ئانا و خۆسێم نەدییەوە.
«فرانک، دەبێت لەگەڵ یەکتردا قسە بکەین، تۆ قەت ناچیت بۆ مۆزەخانەی پرادۆ؟»
مەبەستی چی بوو؟ ئەی مۆزەخانەی پرادۆ چی بوو؟ هەستم کرد لەوەوپێشیش شتێکم لەو بارەیەوە بەرگوێ کەوتبوو و دواتر بیرم کەوتەوە لەو کاتەدا بوو کە لە (ماراڤیو پلانتەیشن ریسۆرت)دا خواحافیزیم لە جۆن کرد. ئەویش هەر لە کاتی خواحافیزیدا داوای لێ کردم سەردانی ئەو مۆزەخانەیە بکەم، بەڵام من پێویستم بە هیچ جۆرە هاندانێک نەبوو تا سەردانی ئەوێ بکەم، ئێ من خۆم بەو نووسەرە ئینگلیزەم وت کە لەڕادەبەدەر سەرسامی ئەو کارە مەزنانەم کە لەو مۆزەخانەیەدا کۆکراونەتەوە.

بەهەرحاڵ مەزەندەی شتێکی دیاریکراوم کرد: پاش ئەوەی ئانا لەپڕێکدا بورایەوە و منیش (ماراڤیو)م جێهێشت، جۆن پەیمانی دامێ کە سەلامی من بگەیێنێتە ئانا و خۆسێ، بێگومان ئەوەشی پێ گوتون کە من سەرسامی هونەری ئیسپانیم، چونکە وەک کەسێکی ئیسپانی خۆشە شتێکت لەو بارەیەوە بەرگوێ بکەوێت، بەڵام بۆچی ڕێک مۆزەخانەی پرادۆ؟ ئەی بۆچی مۆزەخانەی (تایسین) یان (ڕینا سۆفیا) نەبێت؟ ئەی بۆ جۆن پرسیاری دەربارەی (ئێل گریکۆ)، (بووس)، (ڤیلاسکیوز) و (گۆیا) لێ کردم و وتی زیاترێک حەزت لە کامیانە؟ دواتریش وتی: «کەواتە بە بڕوای من دەبێت کاتێکی باش بە خۆت ببەخشیت و بەوردی تەماشای سەرتاپایان بکەیت».

سەرلەبەیانی ڕۆژی دواتر سواری شەمەندەفەر بووم و بەرەو مەدرید بەڕێکەوتم. لەو کاتەدا شەمەندەفەرەکە بە گردە بەرزەکاندا سەرکەوت، تەماشای شوورا بەردینەکانم کرد. ئەو دیمەنە، بەشێوەیەک لە شێوەکان لەوەڕگا هاوینەییەکانی قەدپاڵی شاخە بەرزەکانی نەرویجی بەبیر هێنامەوە.

کاتێکیش چاوم بە شورا ئەفسانەییەکەی چواردەوری (ئاڤیلا) کەوت، خەیاڵم چووە سەر (تێریسا)ی پیرۆز. پاش ئەوەش ئەندێشەکانم ڕۆشتنەوە سەر (لاورا)ی ماراڤیو پلانتەیشن ریسۆرت، بێگومان هاتنی یەک بەدوای یەکی ئەم ئەندێشانەم پەیوەندی بە تەسەوفی دینییەوە هەبوو، واتە پەیوەندییەکی بە چاوە قاوەییەکەی لاوراوە هەبوو، هەرچەندە ناتوانم نکوڵی لەوەش بکەم کە چاوە سەوزەکەی و ئەو میهرەبانییەی کە نیشانی دام، زیاترێک لە جەستەمدا مانەوە.

هەرکە گەیشتمە وێستگەی (شامارتین)، سواری شەمەندەفەرێکی تر بووم بەرەو (ئاتۆشا) ڕۆیشتم. دواتریش بە پێ بەرەو ئوتێلی (پالاس) ڕۆیشتم و بۆ ماوەیەکی دیارینەکراو ژوورێکم گرت. هەستم کرد تا خۆم بەتەواوەتی کۆنەکەمەوە، ناتوانم هەروا سەفەر بۆ نەرویج بکەمەوە. جگە لەوەش ئاسان نەبوو هەروا ئیسپانیا بەجێبهێڵم، چونکە دەمزانی تۆ لە بەرشەلۆنەدایت. لە ماڵی خۆمان لە نەرویج، تەنها خۆمم شک دەبرد کە بیری لێ بکەمەوە.. بە مانایەکی تر، هیچم نەبوو بیری لێ بکەمەوە، هیچ.

# بیلیس پێرینیس
# (گوڵی هەمیشە بەهار)

بەدەر لەوە من هەر خۆشم بۆ خۆم کابرایەکی سەیر و پڕ نهێنیم، چونکە دواتر پاش دوو حەفتە ئینجا سەردانی مۆزەخانەی (پرادۆ)م کرد. ئاخر هەر ئەوەندەی وتم (بەشێوەیەکی گشتی کاتێک کە دەچمە مەدرید، سەردانی گەلەرییە گەورە و قەشەنگەکانی پرادۆ دەکەم)، ئیتر چەند کەسێک بە چەندین شێوە ئەو قسەیەی منیان لێک دایەوە. منیش پێم خۆش نەبوو ڕاستەوخۆ شتم پێ بگوترێت، چ جای ئەوەی کە هەڵیشم بخەڵەتێنن. بەهەرحاڵ لە ماوەی ئەو دوو حەفتەیەدا سەردانی مۆزەخانەی (تایسین) و (ڕینا سۆفیا)م کرد. چەندین ساڵ بوو ئەو شوێنانەم نەدیبوو.

من بۆ وانەی کۆنفرانسەکەی سالامانکا کۆمەڵێک بابەتم لەگەڵ خۆمدا هێنابوو و ئیشێکی زیاترم لەسەر ئەو ڕاپۆرتە کرد، ئەو کاتە ماوەی چەند مانگێک بوو بە چڕی ئیشم لەسەر ئەو بابەتە دەکرد. هەروەها ئەو فرسەتەم قۆستەوە و سەردانی کۆمەڵێک برادەری خۆمم کرد لە دانیشگای (کۆمپلوتێنس)، جگە لەوەش یەک دوو بەیانییەک لە کتێبخانەی نەتەوەییدا خەریکی خوێندنەوە بووم و بۆ یەکەم کەڕەتیش لە ژیانمدا سەردانی باخچەی ئاژەڵانی (کاسا دی کامپۆ)م کرد.

دوو ئێوارەش خۆم کرد بە دوو باڕی جیاوازی (فلامینکۆ)دا، بەڵام نەک بۆ ئەوەی ئانا لە کاتی سەمادا ببینم، بەڵکو ئومێدەوار بووم ناوی لەسەر پۆستەرێک یان نامیلکەیەکی ڕیکلامدا ببینم. دەمزانی درەنگ یان زوو دەبێت هەوڵێک بدەم تا بیانبینمەوە، بەڵام هێشتا نەکەوتبوومە ئەوەی بەدوایاندا بگەڕێم، خۆشم نازانم بۆ؟! بەهەرحاڵ لەو کاتەدا نەمویست بەدوایاندا بگەڕێم، لەبەرئەوە باشترێک بوو بۆ خۆم بە مەدریدا بسوڕێمەوە. بەڕاست، ئێ خۆ ڕێشی تێدەچوو لەژێر قوبەکەی ئوتێلی (پالاس)دا چاوم بە پەیامنێرێکی تەلەفیزیۆن بکەوتایە، کێ دەزانێت؟

یەک و دوو معاشی مانگێکی تەواو لە ئوتێلی (پالاس)دا تەواو بوو، بەڵام مانەوەم لەو ئوتێلە تایبەتییەدا تەنها لەبەرئەوە نەبوو کە ڕاهاتبووم لەوێ لابدەم، هەروەها لەبەرئەوەش نەبوو کە من و تۆ یادگارییەکی تایبەتیمان لەو ئوتێلەدا هەبوو، بەڵکو لەبەرئەوە بوو کە ئەوێ تەنها ئوتێلێکی شارەکە بوو کە بوارێکی یەکجار بچکۆلەی تێدا بوو تۆ سۆراخێکی منی تێدا بکەیت. لێت ناشارمەوە هێشتا ئومێدەوار بووم کە تۆ تەلەفۆنێکم بۆ ئۆسلۆ بۆ بکەیت. بەتایبەتیش لەدوای ئەو ڕووداوەی کە لە دواهەمین ئێوارەماندا لە سالامانکادا ڕوویدا، ئێ لەوێدا بەدەر لە هەموو شتێکی تر، هەر هیچ نەبێت توانیم سەرلەنوێ بتخەمەوە پێکەنین. بیرم لەوە کردەوە ئەگەر تەلەفۆن بۆ ماڵەوە بکەیت و لەوێ من نەگریت، ئەوا ڕەنگە تەلەفۆن بۆ پەیمانگاکەی ئێرە بکەیت. ئەو کاتە ئەوانیش پێیان دەگوتیت کە من هێشتا هەر لێرەم. دەبێت ئەوەش بڵێم هەر پاش حەفتەی یەکەمم لێرە، بەتایبەتی سکرتێری پەیمانگاکەم ئاگادار کردەوە و پێم گوت لەو ئوتێلەدا لامداوە.

بەڵام لەپڕێکدا خەبەرم بووەوە، لە شتێک بەخەبەر هاتم کە ئەمڕۆکە ناوی دەنێم (سوڕی سڕبوونێکی دوورودرێژ). بەیانییەکیان لەناکاودا هێندەم بۆ ڕوون بووەوە کە لەوەوپێش چەندە بێئەقڵ بووم، بەڕاستی خۆم لەو شتە دزیبووەوە کە دەبووایە بمکردایە: ئاخر ڕاستەوخۆ هانیان دام سەردانی مۆزەخانەی (پرادۆ) بکەم تا لەوێ بەدوای شتێکی زۆر تایبەتیدا بگەڕێم. (جۆن) وەک هێمایەک پێی گوتم کە سەردانی ئەوێ بکەم، (خۆسێ)ش وەک نیمچە پاڕانەوەیەک هەمان شتی پێ گوتمەوە. بێگومان (پرادۆ) نیشانەیەک بوو کە دەیبردمە سەر شتێکی تر، واتە تەنها زایەڵەی ئەو قسەیەی من نەبوو کە بە شانازییەوە گێڕامەوە و وتم (پرادۆ) مۆزەخانەیەکی دەوڵەمەندە ... « تابلۆیەکی (مۆنێت) لە ژووری خەوەکەماندایە و دانەیەکی (میرۆ) ش لە ژووری دانیشتنەکەمان هەڵواسراوە. بەڕاست، ماوەیەک لەمەوبەر ئاوێنەیەکی (بارۆک)یمان لەسەر ئاگردانەکە هەڵواسی....»

سێشەممە ئەوەم بە خەیاڵدا هات، ڕێک دوو ڕۆژ لەمەوبەر. بەرەو دەرگای سەرەکیی (پرادۆ) هەنگاوم نا و لەو کاتەدا تەماشایەکی پەیکەرەکەی (گۆیا)م کرد، لە پشتیشیەوە ئوتێلە قەشەنگەکەی (ڕیتز)م کەوتە بەرچاو. لەویادا کتوپڕ هەستم کرد بەتەواوەتی لە مەبەستەکەم نزیک بوومەتەوە.

لە قاتی خواری خوارەوەوە دەستم پێ کرد و زۆر بە ڕاشکاوی کەوتمە تەماشاکردن، بەتایبەتیش سەرنجی میوانەکانم دەدا. هێندەی نەبرد و خۆمم لەبەردەم تابلۆی

(ئیل جاردین دی لاس دیلیسییەس)دا بینییەوە، یان هەروەک پێی دەڵێن (باخچەی حەز و ویست)، لەو تابلۆ پڕ لە وردەکارییەی (هیرۆنیموس بووس) ڕامام. ئەگەر خۆم تابلۆیەکم هەڵبژاردایە، کە پوختەی هەستم دەرببڕێت و پلە و شوێنی مرۆیی نیشان بدایە لەنێوان گیانەوەرە بڕبڕەدارەکاندا، ئەوا کتومت ئەو تابلۆیەم هەڵدەبژارد. ئەو وێنەکێشە لەو تابلۆیەدا پتر لە سەد شکڵی سەرنجڕاکێشەری مرۆڤی کێشاوە و بەدەر لەوەش نزیکەی هەمان ئەو ژمارەیە گیانەوەری بڕبڕەداریشی لەو تابلۆیەدا نەخشاندووە. ئەگەر لە یارییەکی وەک (مانای وشە)کاندا بەشدار بوومایە و لێیان بپرسیمایە وشەی (فەنتازیا) لەلای تۆ چی دەگەیێنێت، ئەوا یەکسەر دەمگوت (بووس). ئەگەر بشیان پرسیبایە وشەی (بووس) چیت بیر دەخاتەوە، ئەوا بێ سێ و دوو دەمگوت (باخچەی حەز و ویست)، خۆ ئەگەر وشە سەرەکییەکانیش (باخچەی حەز و ویست) بووایە، ئەوا دەمگوت (ناسک). ئەگەر ڕێگەشیان پێ بدامایە بە ڕستەیەک یان باشتر بە وتارێکی پوخت قسەی خۆمم بکردایە، ئەو کاتە شتێکم دەربارەی ژیان باس دەکرد و دەمگوت ژیان شتێکی سەرنجڕاکێشەر و پڕ نهێنییە، بەڵام ئاخ، چەندە ناسک و لاوازە.
لایەنی کەم بۆ ماوەی نیو سەعاتێک لەبەردەم تابلۆی (باخچەی حەز و ویست)دا مامەوە، بێگومان ئەوەش کاتێکی زۆر نییە، چونکە تەماشاکردنی ئەو تابلۆیە بەلایەنی کەمەوە یەک حەفتەی دەوێت. زۆر بەوردی تەماشای وردەکارییە بچکۆلەکانی ناو تابلۆکەم کرد، بەڵام تاوناتاوێک ناچار بووم لابچم تا ڕێگە بە خەڵکانی تریش بدەم تەماشای بکەن. ڤیرا، لەپڕێکدا لە پشتمەوە گوێم لە دەنگێک بوو کە پێی ئاشنا بووم و وتی:
– چەند ملیارد ساڵێکی پێدەچێت تا مرۆڤێک ئافەریدە دەکرێت، کەچی لە ماوەی یەک دوو چرکەدا دەمرێت.
بەهێواشی ئاوڕم لە خۆسێ دایەوە، ڕاستەوڕاست هێندە تێگەیشتم کە ئەو قسانەی بە مەبەستی لێکدانەوەی تابلۆیەک نەکرد کە نزیکەی پێنج سەد ساڵ لەمەوبەر کێشراوە، بەڵکو مەبەستی لەوە بوو کە ئانا مردبوو.
ئانا مردبوو، ئەو (ئانا)یەی کە پێی نەگوتم لەوەوپێش لە چ شوێنێکدا بینیبووم، ئەو (ئانا)یەی کە نەیویست سەمایەکی فلامینکۆمان پێشکەش بکات، ئەو (ئانا)یەی کە لەپڕێکدا لە کاتی نانخواردنی بەیانیدا بورایەوە، ئانا، ئەو (ئانا)یەی کە هەر چەند ڕۆژێک لەمەوبەر قاوەخانەکەی سالامانکای جێهێشت و بە دەنگی بەرز هاواری کرد:

«ئەمەویت بگەڕێمەوە بۆ ماڵەوە! گوێت لێیە؟ ئەمەوێت بڕۆمەوە بۆ ئیشبیلییە».
من هەر تەنها لە ڕێگەی وتە کورت و پڕ حیکمەتەکەیەوە لەوە تێنەگەیشتم کە مەبەستی لە (ئانا)یە، بەڵکو هاوکات لە ڕێگەی سیما ڕەنگپەڕیو و زەردهەڵگەڕاوەکەیەوە ئەوەم بۆ ڕوون بووەوە، بەئاشکرا دیاربوو کە تەنها بە جەستە لەوێدا بوو و خەیاڵی لە شوێنێکی زۆر زۆر دوور بوو. یەکسەر وێنەیەکی کۆنم هاتەوە بەرچاو. لە سالامانکادا کە (خۆسێ)م بینی، بە سیمایەکی سەرلێشێواوەوە سەیرێکی کردم و وتی: «فرانک، دەبێت لەگەڵ یەکتردا قسە بکەین! تۆ جارجارێک سەردانی مۆزەخانەی پرادۆ ناکەیت؟». پاش نەختێک لە تابلۆکە نزیک بووەوە، لەلای خواری خوارەوەی چەپی وێنەکەوە ئاماژەی بۆ دوو عاشق کرد کە لەناو بڵقێکی شووشەدان، بە توڕەیی و پەستییەوە بە چرپەیەک وتی:
– ئاسودەیی هەروەک شووشە ناسکە.
لەدوای ئەو قسەیەیەوە بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ هەردووکمان بێدەنگ بووین، بەڵام دڵنیا بووم دەیزانی کە منیش دەمزانی چی ڕوویداوە. بەهێواشی بەناو گەلەرییەکاندا ڕێگەمان بڕی و بەرەو قاتی یەکەم بەڕێ کەوتین. لەو ڕێگایەدا وتی:
– ئێمە دوو کەس بووین کە نەدەکرا لە یەک جودا بکرێینەوە.
نەمتوانی هیچ بڵێم، بەڵام تەماشایەکی ناو چاویم کرد، هەر لەوە دەچوو تەسلیمی قەدەری خۆی بووبێت، هێندەی بیرم بێت سەرم بۆ ڕاوەشاند، هەم بۆ ئەوەی نیشانی بدەم کە منیش توشی شۆک بووم و هەم وەک ئەوەش کە پێی بڵێم کە هاودەردیم و منیش لەو بارەیەوە هیچ دەسەڵاتێکم نییە. هێدی هێدیش هەستم کرد زیاترێک لە مەبەستەکەم نزیک دەبمەوە، چونکە لەویادا خۆسێ منی بردە ناو گەلەرییەکەی (گۆیا)وە، لەپڕێکدا لەبەردەم هەردوو تابلۆی (ماخا بە ڕووتی) و (ماخای جلپۆش)دا خۆمان بینییەوە. خەریک بوو ببورێمەوە و وابزانم (خۆسێ)ش هەستی بەوە کرد، چونکە بەتووندی قۆڵی چەپی گرتم. (ئانا)م بینی.
(ئانا)م بینی، ڤیرا. ئا لێرەدا بوو کە چەندین جار لەوەوپێش بینیبووم، چەندین جار. لەوەوبەر لە خەیاڵی خۆمدا دەمگوت ڕەنگە لە فیلمێکدا بینیبێتم یان لە خەونێکدا. بگرە وام مەزەندە دەکرد لە حەقیقەتێکی تردا بینیبێتم، بەڵام وا بۆم دەرکەوت لەوێدا بینیبووم. لەوێدا لە مەرسەمەکەی (گۆیا)دا لەسەر کورسییەکی درێژ پاڵکەوتبوو، لەوێدا بە دیواری مۆزەخانەی (پرادۆ)وە هەڵواسرابوو، هەم بە ڕووتی و هەم بە جلیشەوە. گەشتیارێکی زۆر و زەوەندیش لە دەوروبەری ئەو دوو

تابلۆیە کۆبووبوونەوە.
خۆسێ هێشتا هەر قۆڵی گرتبووم، لەویادا بۆ یەک دوو چرکە خەیاڵم چووەوە سەر تاقگەکەی (بۆئوما)ی تاڤیونی، لەویادا بوو کە بەدزییەوە بۆ ساتێک جەستەی ڕووتی (ئانا)م بینی. هەر لەویاشدا بوو کە گەیشتمە ئەوەی تەنها دەموچاویم دەناسییەوە و وا ئێستاش هۆی ئەوەم بۆ ڕوون بووەوە: ئانا لە تابلۆی (ماخا) کەی گۆیا زۆر جوانترێک بوو، وابزانم هەر لەبەر ئەوەش بوو کە نەمدەتوانی پێکەوە گرێیان بدەمەوە، هەر لەبەر ئەوەش بوو کە سەرم لێ تێک چووبوو. تەنانەت لەو کاتەشدا کە (ئانا)م بە خۆی و ماکسییە سوورەکەیەوە بینی، دوو خەیاڵ لە یەک کاتدا بە مێشکمدا هاتن: یەکەمیان ئەوە بوو دەمزانی لەوەوپێش بینیومە، دووهەمیشیان ئەوە بوو کە دەمزانی شتێک لە شتەکان ڕێک ناکەوێت.
لەویادا زۆر شتم بۆ ڕوون بووەوە و کۆمەڵێک شت چوونەوە شوێنی خۆیان. لەوەوپێش جۆن شتێکی دەربارەی ئینتەرنێت باس کرد، بێگومان هەر زۆر بەئاسانی دەتوانیت لەو ڕێگەیەوە تابلۆ هەرە بەناوبانگەکانی (گۆیا) ببینیت. پاشانیش ناڕاستەوخۆ هانی دام سەردانی مۆزەخانەی پرادۆ بکەم، بەڵام ئەی بۆ سەرتاپای شتەکانی پێ نەگوتم؟
من و خۆسێ هەروا لەویادا وەستا بووین. من پەشۆکابووم، من زیاد لە ڕادە هەستم وروژابوو، من تۆقی بووم. خۆ ئەگەر گۆیا ئەو تابلۆیانەی دوو سەد ساڵێک لەمەوبەر نەکێشابایە، ئەوا سوێندم دەخوارد کە ئانا وەک مۆدێلێک لەبەردەمیدا ڕاوەستاوە، یان ڕاستترێک بیڵێم ئانا لەبەردەمیدا ڕاکشاوە، یاخود هەر هیچ نەبێت دەموچاوی (ئانا)ی وەک مۆدێلێک لەبەردەستدا بووە.
بەدەر لە هەموو ئەوانەش شتێکی تریش لەئارادا بوو: ئانا نەیدەویست بناسرێتەوە، یان بەلایەنی کەمەوە خۆسێ پێی خۆش نەبوو کە ئانا بناسرێتەوە، هەربۆیە وتی: «ئافرەتی قژڕەش لە ئیسپانیادا زۆرن. ئەوە ڕاستییەکە و خۆشت باش ئەوە دەزانیت فرانک. لە مەدریدیشدا هەر وایە». تا ئێستاش سەرتاپای وەڵامەکەی لە مێشکمدا چەقیووە، بەڵام تەنها ئێستا دەتوانم وێنای ئەو حاڵەتە بکەم و تێدەگەم چەندە بەلای ئاناوە ناخۆش بووە کە بەردەوام خەڵکانی تر ناسیویانەتەوە. هەروەها دەبێت زیاترێکیش بەلایەوە ناخۆش بووبێت وەک ئافرەتێک بناسرێتەوە کە دوو سەد ساڵێک لەمەوبەر لە ئیسپانیادا ژیاوە.
(جۆن سپۆک)یش هێندەی تر حاڵەتەکەی شێواند، کاتێک کە پەنجەیەکی خستە

سەر ناوچەوانی ئانا و وتی: «ئەو ڕۆحەش ناوی (مایا)یە»، لەو کاتەدا ئەو خەیاڵی لەلای فەلسەفەی (ڤیدانتا) بوو، بیری لە وەهم دەکردەوە، لە خەیاڵ و هەڵخەڵەتاندنی هەستەکان دەکردەوە، بەڵام خۆ ڕەنگە تابلۆی (ماخا)ی (گۆیا)شی لە خەیاڵدا بووبێت، چونکە لەویادا وەسفی ئانای کرد و وتی: «بەدەر لەوەش لێرەدا باس لە هونەرێکی زۆر باڵا دەکەین»، هەر بەڕاستیش لەو کاتەدا لە مۆزەخانەی پرادۆ لەبەردەم تابلۆیەکی وەهادا وەستابووم، من لە هەموو ژیانمدا هونەرێکی باڵای ئاوهام ئەزموون نەکردبوو.

لەپڕێکدا خەیاڵێک بە مێشکمدا هات و ترساندمی: بۆچی ئانا لە (ماراڤیو)دا لەناکاوێکدا بورایەوە؟ ئەی بۆچی پاش یەک دوو مانگێک بەدوای ئەوەدا مرد؟ لە دڵی خۆمدا وتم: «بڵێیت مردنە ناوادەکەی و ئەو لێکچوونە زۆرەی لەگەڵ تابلۆی (ماخا)ی گۆیادا، پەیوەندییەکیان بەیەکەوە نەبێت؟» ئینجا وتم: «هەر کتومت وەک یەک وان».

خۆسێ سەری ڕاوەشاند و وتی:

- ئەوە خۆیەتی.. ئەوە (ئانا)یە.
- ئاخر ئەوە بە هیچ جۆرێک ڕێی تێناچێت.
- بێگومان ئەوە مەحاڵە، بەڵام ئەوە ئانایە.

لە پشتی هۆڵەکەدا وەستابووین و بەهێواشی قسەمان دەکرد، خۆسێ وتی:

- تۆ مێژووی ئەو تابلۆیانە دەزانیت؟

وەڵامم دایەوە و وتم:

- نەخێر.

وابزانم هەروا واقم وڕما بوو و چاوم تێبڕیبوو کە وتی:

- هیچ کەسێکی تریش ئەوە نازانێت، بەهەرحاڵ بەتەواوەتی نا، بەڵام بەلایەنی کەمەوە شتێکی کەم لەو بارەیەوە دەزانین.

خۆم پێ نەگیرا و وتم:

- لەو بارەیەوە چی دەزانین؟
- یەکەمین جار (ئاوگوستین سییان بیرمودز) و (پیدرۆ گۆنزالیس دی سیپولڤیدا) ی پەیکەرتاش ناوی (ماخای ڕووت)یان هێنا، کە لە ساڵی (١٨٠٠)دا لە ژوورێکی بچکۆلەی کۆشکە تایبەتییەکەی (مانوئێل گۆدۆیManuel Godoy) دا هەڵواسرابوو، لەگەڵ ئەو وێنەیەشدا کۆمەڵێک تابلۆی ڕووتی تری کلاسیکی

هەڵواسرابوون، مەبەستم لە تابلۆی (فینۆس و کوپیدۆ)ی (فیلاسکوین)ە لەگەڵ وێنەیەکی ئیتاڵی فینۆس کە لە سەدەی شانزەدا کێشرا بوو. ئەو دوو وێنەیە بە دیاری لەلایەن هاوسەری میری (ئالبا)ەوە بەخشراوە بە (گۆدۆی).
– کاتی خۆی ئەو خولیایەکی تایبەتی هەبووە و ئەو جۆرە تابلۆیانەی کۆکردۆتەوە کە ئافرەتی بەو شێوەیە تێدا کێشراوە؟
– بەڵێ بەدڵنیاییەوە دەتوانین وا بڵێین. هەر لە هەمان ژووردا کۆپییەکی وێنەی فینۆسی (تیزیانس)یشی هەڵواسیبوو. لەو سەردەمەدا وێنەی ڕووتی ئافرەت قەدەغە بوو، کەچی وێنە میسالییەکانی کەسایەتییە ئەفسانەییەکان، بۆ نموونە وەک وێنەی ڤینۆس، زیاترێک قبوڵ دەکرا وەک لە وێنەیەکی وەک (ماخای ڕووت).
– بۆ؟
– هەروەک خۆت دەیبینیت، (ماخا)کەی گۆیا بەهیچ شێوەیەک کەسایەتییەکی ئەفسانەیی نییە. ئافرەتێکی زیندووی ڕاستەقینەیە و لە گۆشت و خوێن پێکهاتووە، گومانی تێدا نییە کە لەبەر مۆدێلێکی زیندووەوە کێشراوە. بەو شێوەیەش وێنەکە زیاترێک سەرنجی خەڵکی ڕاکێشاوە، یان دەشتوانین بڵێین لەچاو تابلۆی ڤینۆسی (تیزیانس) و (فیلاسکوین)دا، زیاترێک وەک لادانێک لە دابونەریتی ئەو کاتەدا تەماشا کراوە. وەک وێنەیەکی ڕووت هەڵیانسەنگاندووە.
– بەڵێ، تێدەگەم.
– کاتی خۆی (کارلۆسی سێ) و (کارلۆسی چوار)یش بە جیددی بیریان لەوە کردۆتەوە سەرجەم ئەو جۆرە تابلۆیانە لە گەلەری هونەریی مەلەکیدا تەفروتونا بکەن، بەڵام لەوەدەچێت (گۆدۆی) ئیمتیازێکی تایبەتی هەبووبێت و ڕێگەی پێ درابێت ئەو وێنانە لە گەلەرییە تایبەتییەکەی خۆیدا بهێڵێتەوە.
– ئەی تابلۆی (ماخای جلپۆش)یشی هەبووە؟
خۆسێ سەرێکی بۆ لەقاندم:
– لەوەدەچێت تابلۆی (ماخای جلپۆش) لەدوای تابلۆی (ماخای ڕووت)ەوە کێشرابێت، چونکە ناوی ئەو تابلۆیە یەکەمجار لە کەتەلۆکێکدا هاتووە کە لە ساڵی (١٨٠٨)دا لەلایەن (فریدێریک کویلیت)ی وێنەکێشی فەڕەنسییەوە ساز کراوە، ئەو خۆی کارمەندێکی (خۆسێ بۆناپارت) بووە. لەو کەتەلۆکەدا بۆ یەکەم جار ناوی هەردوو تابلۆی (ماخای جلپۆش) و (ماخای ڕووت) تۆمار کراوە.
لەویادا خۆسێ بەهێواشی قسەی دەکرد تا خەڵکانی تری هۆڵەکە گوێیان لە

باسەکەمان نەبێت.
- وابزانم تۆش دەزانیت وشەی (ماخا) چ مانایەک دەبەخشێت؟ وەک دەزانیت گۆیا کۆمەڵێک وێنەی (ماخا)ی کێشاوە.
وەک پێشنیارێک وتم:
- واتای کچێکی لادێیی نابەخشێت؟
- یان کچێکی جوانی ئاسایی، یان کچێکی قەشەنگی جوانپۆش. لایەنی نێرینەش کە لە بەرامبەر (ماخا)دا دەوەستێتەوە، پێی دەڵێن (ماخۆ).
- تۆ خۆت (ئانا) وەک (ماخا)یەک ناوزەد دەکەیت؟
زۆر بەتوندی سەری ڕاوەشاند:
- ئانا قەرەج بوو، (جیتانا gitana) بوو. بەڕاست، جێگەی گومانە کە ناوی (ماخا)، ناوی بنەڕەتیی تابلۆکانی گۆیا بووبێت، چونکە کاتێک (فریدیناندی حەوت) لە ساڵی (١٨١٣)دا دەستی بەسەر موڵکەکانی (گۆدۆی)دا گرت، ناوی ئەو ئافرەتە وەک (جیتانا)یەک هاتبوو، نەک وەک (ماخا)یەک. هەروەها لە ساڵی (١٨٠٨)یشدا ناوی ئافرەتی ناو ئەو تابلۆیە وەک قەرەجێک هاتووە. دەبێت ئەوەشمان بیر نەچێت کە ئەو کاتە تەنها چەند ساڵێکی کەم بەسەر نەخشاندنی ئەو تابلۆیانەدا تێپەڕیبوو و خودی وێنەکێشەکەش هێشتا لە ژیاندا بوو، چەند ساڵێکیش دوای ئەوە کەم تا زۆر ناچار بوو لە ئیسپانیاوە هەڵبێت بۆ فەڕەنسا. یەکەم جار لە ساڵی (١٨١٥)دا ناوی (ماخا)یان بەسەر ئەو ئافرەتەدا دابڕی و لەوساکەشەوە تا ئێستا ئەو ناوە بەو دوو پۆرترێتەوە چەسپاوە.
خۆسێ بێدەنگ بوو، بەڵام من ئاماژەم پێدا لەسەر قسەکانی بەردەوام بێت. من خۆم هیچ جیاوازییەکی ئەوتۆم لەوەدا نەدەبینی کە ئافرەتی ناو ئەو تابلۆیانە (ماخا) بێت یان (جیتانا). لە هەموو بارێکدا هیچ شتێکیان لەو حەقیقەتە نەدەگۆڕی کە گۆیا لە ڕاستیدا دوو سەد ساڵ لەمەوبەر وێنەی دەموچاوێکی کێشاوە و دواتر تابلۆکەی چاوی بە دونیا هەڵهێنا. خۆسێ وتی:
- لە مانگی سێی ساڵی (١٨٢٥)دا بە مەبەستی لێکۆڵینەوە لەسەر ئەو دوو تابلۆیە، (گۆیا)یان بانگهێشتی دادگا کرد. داوایان لێ کرد دان بەوەدا بنێت کە ئەو وێنەکانی کێشاوە، هەروەها پرسیاریان دەربارەی هۆکاری کێشانی ئەو تابلۆیانە لێ کرد، داوایان لێ کرد ڕوونی بکاتەوە کە چ کەسێک داوای لێ کردووە ئەو وێنانەی بۆ بکێشێت و مەبەستیشی چی بووە. هەرگیزاو هەرگیز وەڵامی ئەو پرسیارانە

نەدرایەوە، تا ئەمڕۆکەش هیچ کەسێک بەدڵنیاییەوە نازانێت لەسەر داوای چ کەسێک ئەو تابلۆیانەی کێشاوە.
پاش ئەو قسانەی چیتر خەڵکێکی هێندە زۆر لە چواردەوری (ماخا)کان کۆنەبووبنەوە، زۆر بەوردی دیسانەوە تەماشایەکم کردەوە و وتم:
- تێدەگەم بۆچی ئاوها بەوردی چوویتەتە ناو ڕەگ و ڕیشەی مێژوویی ئەو تابلۆیانەوە..
خۆسێ وتی:
- شتگەلێکی زۆر ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە ئەو لە پێشدا وێنە ڕووتەکەی کێشاوە. هەردوو تابلۆکە لە کۆشکەکەی (گۆدۆی)دا هەڵواسرابوون، ئێ ئەویش لە هەموو بارێکدا شیاوی ئەوە بوو لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا بکرێت و دەبووایە ڕەچاوی ئەو خاڵەی بکردایە. خۆ پێشی دەچێت تابلۆی (ماخای جلپۆش) تەنها لەبەرئەوە کێشرابێت کە (ماخا) ڕووتەکە بشارێتەوە. بەڕاست، کۆمەڵێک هۆکاری تریش وای نیشان دەدەن کە ئەو دوو تابلۆیە وەک (نوکتەیەکی خۆش و بەردەست) کێشرابن، بەو شێوەیەی کە ژنە جلپۆشەکە لەبەرچاودایە و دواتریش بەهۆی جۆرە میکانیزمێکەوە دەکرێت وێنەی ژنەکە بە ڕووتی نیشان بدرێت. ئێ خۆ وەک دەزانیت ڕووتکردنەوەی ژنان یارییەکی یەکجار دێرینە.
دیسانەوە لەویاشدا خەیاڵم چووەوە سەر تاڤگەکەی (بۆئوما)، ڕێک چوومەوە سەر ئەو کاتەی دەستم بە چاومەوە گرتبوو و بەوپەڕی مەبەستەوە بۆشاییەکی بچکۆلەم خستە نێوان پەنجەکانمەوە تا تەماشایان بکەم.
خۆسێ بەردەوامی بە قسەکانی دا و وتی:
- لە ساڵی (١٨٣٦)ەوە تا ساڵی (١٩٠١) ئەو دوو تابلۆیە لە ئەکادیمی (سان فیرناندۆ)دا هەڵواسران، بەڵام تابلۆ ڕووتەکەیان قەت نمایش نەکرد. لە ساڵی (١٩٠١)یشەوە تابلۆکان لەم مۆزەخانەیەی (پرادۆ)دا هەڵواسراون، لێرەشدا لە سەرەتادا تابلۆی (ماخای ڕووت)یان بە تەنها لە ژوورێکدا هەڵواسی و خەڵکانێکی زۆر دیاریکراو بۆیان هەبوو بیبینن.
پەلەم بوو و دەمویست زیاترێک لەو بارەیەوە بزانم، ڕاستە گوێم بۆ سەرتاپای وشەکانی شل کردبوو، بەڵام لە ناوەوەمدا تەنها بیرم لە ئانا دەکردەوە. پرسیارێکم لێ کرد و وتم:
- کەس دەزانێت مۆدێلی ئەو تابلۆیانە کێ بووە؟

برۆی بەرز کردەوە و وتی:
- یان مۆدێلەکان.
کەرەتێکی تریش سەیری تابلۆکانم کردەوە:
- ئێ ئاخر کتومت هاوشێوەن.
- بەرلەوەی حوکمێکی وەها بدەیت، برۆ زیاترێک لە تابلۆکان نزیک بەرەوە و بەوردی تەماشایان بکە.
بە قسەم کرد و زیاترێک لە تابلۆکان نزیک بوومەوە. وا هاتە بەرچاوم کە تابلۆی (ماخای جلپۆش)، بە بەراوردکردنی لەگەڵ (ماخای ڕووت)دا، خێراتر و بەوردییەکی کەمترەوە کێشرابێت، مۆتیڤەکەشی لەچاو تابلۆ ڕووتەکەدا زیاترێک دەرخراوە و ئافرەتی تابلۆکە مکیاجێکی زیاتری پێوە دیارە. یەکەم جار تابلۆی (ماخای ڕووت) کێشراوە، ڕەنگە (گۆیا) بەپەلە وێنەی ئافرەتە جلپۆشەکەی کێشابێت تا وێنە ڕووتەکەی پێ بشارێتەوە، بەڵام ئافرەتەکان هەر هەمان کەس بوون و هەردووکیان ئانا بوون، هەرچەندە تەنها سەری، دەموچاو و قژی ئانا بوو. مەبەستەکەی (خۆسێ)ش کتومت لەو خاڵەدا بوو. لەویادا بەڕوونی بۆم دەرکەوت کە (گۆیا) وێنەی لەشێکی ڕووتی ئافرەتێکی کێشاوە و دواتر هاتووە دەموچاوی ئافرەتێکی تری خستۆتە سەر. خۆ ئەگەر زۆر بەوردی و بە سەرنجەوە تەماشایان بکەین، بەڕوونی دەبینین کە شکڵی ئافرەتەکە کراوە بە دوو لەتەوە: سەر و لەشی، زیاترێکیش لە وێنەی ئافرەتە ڕووتەکەدا ئەو حاڵەتە هەست پێ دەکرێت.
ئەوەی بینیم سەری ئانا بوو، بەڵام لەشی هی ئەو نەبوو. لەوەدەچوو سەری (ئانا) یان لێکردبێتەوە و لکاندبێتیان بە مۆدێلە ڕووتەکەوە.
گەڕامەوە بۆ لای خۆسێ و وتم:
- گۆیا دوو مۆدێلی بەکارهێناوە. یەکەمیان تەنها لەشی کێشاوە و ئەوی تریشیان سەری.
سەری بۆ لەقاندم، بەڵام خەندە نەیگرت. ئەم بابەتە بەلای (خۆسێ)وە بابەتێکی جیددی بوو و وەک یارییەک نەیدەبینی. وتی:
- لەوەدەچێت مۆدێلە ڕووتەکە ئافرەتێکی زۆر بەڕێز بووبێت، بەو شێوەیەش بێگومان گۆیا نەیتوانیووە دەموچاوی بکێشێت.
لە دڵی خۆمدا وتم: «ئینجا هاتووە و وێنەی دەموچاوی ئانای لەبری مۆدێلەکەی کێشاوە». پاشان لە خۆسێم پرسی:

- ئەی هیچ شتێک دەربارەی ئەو ئافرەتە بەڕێزە دەزانرێت؟

- لەو بارەیەوە کۆمەڵێک تیۆریمان هەیە. بەناوبانگترینیان دەڵێت گوایە (گۆدۆی) داوای لێ کردووە ئەو دوو تابلۆیە بکێشێت، گۆدۆی کەسێکی نزیک و خۆشەویستی شاژن بووە و گوایە ئەو مۆدێلەش، مەبەستم لە ئافرەتە ڕووتەکەیە، (پیپیتا تودۆ) ی دەستگیرانی بووە. ئەگەر وا بووبێت، ئەوا بێگومان شاردنەوەی کەسایەتییەکی وەک ئەو شتێکی زۆر زۆر گرنگ بووە، بەڵام تیۆرییەکی تریش لەئارادایە.

- ئەویان چۆنە؟

- ئێمە دەزانین کە هاوسەری میری (ئالبا) بۆ ماوەیەک پەیوەندییەکی گەرموگوڕی لەگەڵ (گۆیا)دا هەبووە، لەو ماوەیەشدا کە تابلۆی (ماخای ڕووت)ی کێشاوە، واتە لە سالانی (١٧٩٦ و ١٧٩٧)دا، گۆیا لە خانووە هاوینەکەی ئەودا لە (سانلوکار دی باڕامیدا)دا ژیاوە کە دەکەوێتە سەر ڕێژاوی ڕووباری (گوادالکیوڤیر). هەر زوو لە سەرەتای سەدەی نۆزدەدا دەنگۆیەکی زۆر بەقووەت بڵاو بووەوە کە گوایە مۆدێلی تابلۆی (ماخای ڕووت) هاوسەری میری (ئالبا)یە. ئێ هەتاوەکو دەنگۆکانیش کۆنترێک بن، متمانەیەکی زیاتریان پێ دەکرێت.

- بەڵێ تێدەگەم، وایە ئەوە ڕاستە.

- ئەگەر تەماشای هەندێک لەو تابلۆیانە بکەیت کە تیایاندا گۆیا وێنەی هاوسەری میری (ئالبا)ی کێشاوە، هەر بۆ نموونە تابلۆ بەناوبانگەکەی ساڵی (١٧٩٧)ی و هێڵکارییەکەشی کە قژی دادەهێنێت و هەر لە هەمان ساڵدا کێشاویەتی، ئەوا هیچ شتێکی وا لە کەسایەتی هاوسەری میردا نابینیت وات لێبکات بەدووری بزانیت کە ئەو مۆدێلی (ماخای ڕووت) بووبێت.

- پەیوەندیی سێکسیشیان پێکەوە هەبووە؟

- هیچ کەسێک ئەوەیان نازانێت، هەرچەندە کۆمەڵێک نیشانەی بەردەستمان وا دەردەخەن کە گۆیا خۆی لەو بارەیەوە هیچ لارییەکی نەبووبێت. لە نامەیەکیدا کە لە ساڵی (١٧٩٥)دا نووسیویەتی، باسی ئەوە دەکات کە هاوسەری میر سەردانی مەرسەمەکەی کردووە تا مکیاج بکات. هەروەها لەو نامەیەدا لەو بارەیەوە دەڵێت: «من ئەوەیانم بەلاوە خۆشتر بوو وەک لەوەی کە وێنەیەکیم لەسەر تابلۆیەک بکێشایە». لەو تابلۆ زەیتییەدا کە لە (سانلوکار)دا کێشاویەتی، وێنەی ئەوی بە جلی ڕەشەوە کێشاوە و ڕووپۆشێکی تەنک دەموچاوی داپۆشیوە، لەویادا دوو ئەڵقەی لە پەنجەدایە کە نەخشی (گۆیا — ئالبا)ی لەسەرە. لەوەش زیاتر، هاوسەری

میر لەو تابلۆیەدا زۆر بەگوڕ چاوی بڕیوەتە لمەکەی بەردەمی کە لێی نووسراوە (تەنها گۆیا). بێگومان هاوسەری میری ئالبا ژنێکی جوان و سەرنجڕاکێش بوو، بەڵام لە (٩ی ٦ی ١٧٩٦)دا میری ئالبا، کە زۆر لە خۆی بەتەمەنتر بوو، لە شاری ئیشبلییەدا مرد و بەو شێوەیەش بوو بە بێوەژن.

- کەواتە بۆچی پێی ناچێت پەیوەندیی سێکسییان هەبووبێت؟

- ئەو تابلۆیەی هاوسەری میر لەلای گۆیا پارێزرابوو، بێگومان پێدەچێت تەنها فەنتازیا و خەونێکی خوازراوی خۆی بووبێت و دوور بووبێت لە حەقیقەتەوە. ڕاستە هاوسەری میر کەسێکی لیبراڵ بوو، بەڵام تا ئەندازەیەک ڕێی تێناچێت پۆرترێتێکی ئاوها بێڕحمانەی قبوڵ کردبێت کە ڕاستەوخۆ بەو شێوەیە لوتبەرزی ئەو نیشان بدات. هەروەها چەندە ڕێی تێدەچێت کە کچێکی جوان و قەشەنگی تەمەن (٣٤) ساڵان لەگەڵ پیاوێکی پەککەوتە و لاوازی تەمەن (٥٠) ساڵاندا بکەوێتە خۆشەویستییەوە، بەتایبەتیش کە کەڕ بێت؟

- ڕاستە، توشی ئەو نەخۆشییە بوو...

- لەگەڵ ئەوەشدا هیچ بەدوور نازانرێت کە هاوسەری میر، مۆدێلی تابلۆی (ماخای ڕووت) بووبێت. هەر ئەو هێڵکارییانەی کە گۆیا لەبارەی ئەوەوە کێشاونی، وای دەردەخەن کە گۆیا نیمچە سەربەستییەکی تەواوی هەبووبێت و کاتی خۆی توانیویەتی لە بازنەی هەرە تایبەتی هاوسەری میر نزیک ببێتەوە. بەهەرحاڵ پەیوەندیی نێوان گۆیا و هاوسەری میر قەت بەتەواوەتی دەرناکەوێت، ئێ لە هەموو بارێکیشدا چیتر هیچ گرنگییەکی وای نییە. هەر ئەوەندەیە بۆ ماوەیەک دوو برادەری زۆر باش بوون و تەواو.

لەو کاتەدا کە ئەو قسەی دەکرد، من بەردەوام سەیری دەموچاوی ژنی ناو تابلۆکەم دەکرد، چونکە بە ڕاستی نەمدەتوانی ئانا لە خەیاڵمدا لاببەم، وتم:

- تا ئێستا تەنها باسی ئەو کەسەمان کرد کە کاتی خۆی بووە بە مۆدێلی لەشی ئەو تابلۆیە، بەڵام هێشتا هیچ شتێکمان دەربارەی ئەو کەسە نەگوتووە کە بۆتە مۆدێلی سەری ئەو تابلۆیە.

دڵنیا نیم بەڵام وابزانم ناڕاستەوخۆ خەندەیەکی بچکۆلەم لەسەر دەموچاوی بینی و وتی:

- ئەوەیان چیرۆکێکی زۆر دووروودرێژتر و ئاڵۆزتریشە. بەدەر لەوانەش تێگەیشتنیشی سەختترە. بڕۆین؟

سەرم بۆ لەقاند.

- بەدڵی خۆت تەماشات کردن؟

بۆ دواجار گەڕامەوە لای دوو تابلۆکە. سەیری چاوی (ئانا)م کرد. ئەو کاتەی لە تاقیونی بووین زۆرجار کتومت بە هەمان ئەو نیگایەوە تەماشای دەکردم. بە هەمان ئەو دەمە بچکۆلە و نوقاوە و ئەو نیگا لارەی دوو چاوە ڕەشەکانییەوە سەیری دەکردم.

پێکەوە لەگەڵ (خۆسێ)دا لە گەلەرییەکەی (گۆیا)دا چووینە دەرەوە، بە پلیکانەکاندا بەرەو قاتی ئەرزی بیناکە هاتینە خوارەوە و چووینە ناو گۆڕەپانی (موریللۆ). بەگوڕ بە گۆڕەپانەکەدا تێپەڕی و بەرەو (باخی ڕووەک) هەنگاوی نا، لەویادا بە (٢٠٠) (پیزیتا) بلیتێکی کڕی. منیش وەک ئەو بلیتێکم کڕی و هەر بەدوایەوە بووم.

بەنێو باخی ڕووەکدا ڕۆیشتین و یەکسەر سەمفۆنیایەکی بۆن و بەرامەی ڕووەک و درەختەکان چواردەوریان تەنین، سەرەتای مانگی پێنج بوو و گوڵەکان لە ترۆپکی گەشانەوەیاندا بوون. هەروەها بولبول و باڵندەکانیش لە چالاکترین وەرزدا بوون، لەویادا هەروا بەئاسانی نەغمەی بولبولێک لە بولبولێکی تر جودا نەدەکرایەوە.

لە سەرەتادا خۆسێ یەک دوو هەنگاوێک لە پێشمەوە بوو، بەڵام هێندەی نەبرد و ڕێگەی دام لە تەنیشتییەوە بڕۆم. بێئەوەی سەری بەرەوڕووم وەرچەرخێنێت وتی:

- ئانا زۆر حەزی لەم مێرگەی ناو شاری مەدرید بوو. هەموو کەڕەتێک کە ڕێمان دەکەوتە ئەم پایتەختە و لە هەر وەرزێکدا بووایە، داوای دەکرد بەلایەنی کەمەوە ڕۆژانە پیاسەیەک بێرەدا بکەین. ئەو کاتانەش کە من لە کۆبوونەوەیەکدا بەشدار دەبووم، ئەو بە تەنها بۆ خۆی دەهاتە ئێرە و نیوەی ڕۆژەکەی لێرەدا بەسەر دەبرد، خۆ ئەگەر کۆبوونەکەشم سەعات دەی بەیانی دەستی پێ بکردایە، ئەوا چەندین کاتژمێر تێدەپەڕی و ئینجا دەهاتم بەدوایدا تا نانی نیوەڕۆ پێکەوە بخۆین. هەموو جارێکیش لەو ماوەیەدا شتێکی نوێی دەدۆزییەوە. وەک جۆرە یارییەکی لێهاتبوو و دەبووایە لەم باخەدا بەدوایدا بگەڕامایە و بمدۆزیبایەتەوە، لەو کاتانەدا خۆم بە خۆمم دەگوت «ئاخۆ ئەمڕۆ لە چ شوێنێکدا بیدۆزمەوە؟ چەندی پێدەچێت تا دەیدۆزمەوە؟»، بەتایبەتیش پەرۆشی ئەو شتە نوێیانە بووم کە هەموو جارێک پێی دەگوتم. هەندێک جار ئەو لە پێشدا چاوی بە من دەکەوت، ئیدی چێژی لەوە وەردەگرت کە خۆیم لێ بشارێتەوە، ڕێشدەکەوت لەو کاتەدا کە من بەدوایدا دەگەڕام، ئەو بەدزییەوە دوام بکەوێت. هێدی هێدی ناوی هەموو درەخت و دەوەنەکان فێر

بوو، دواجاریش ڕێک دەیزانی چ تەیرێک لەسەر کام درەختە هێلانەی دروست کردووە.

- بەڵام ئێوە زیاترێک لە ئیشبیلییەدا دەژیان؟

لە پێشدا سەری بۆ لەقاندم و پاش نەختێک سەری ڕاوەشاند و وتی:

- حەوت هەشت ساڵێک لەمەوبەر کارم لەسەر زنجیرەیەکی تەلەفیزیۆنی کرد کە لەسەر مێژووی قەرەجەکانی ئەندەلووس بوو. هەوڵم دا شتێکی نوێ لە پەرەسەندنی کەلتووری (فلامینکۆ)دا بدۆزمەوە کە لەناو بۆتەی دێرینی کەلتوورەکانی تردا تواونەتەوە، هەروەک کەلتووری (ئیبری)[٦١] و یۆنانی و ڕۆمانی و (سێلتیک)[٦٢]ی و (موور)[٦٣]ی و یەهودی و بەتایبەتیش لە دابونەریتی مەسیحییەتدا. ئا بەو شێوەیە (ئانا)م لە ئیشبیلییەدا ناسی. سەماکەرێکی نایابی فلامینکۆ بوو، بەدەر لەوەش هەر لە تەمەنی شانزە ساڵییەوە (بایلائۆرا)یەکی (سەماکەرێکی) بەتوانا بووە. هەر پاش چەند حەفتەیەک لەدوای پێکگەیشتنمان ئیتر لەیەک جودا نەبووینەوە، دوای ئەوەش تەنانەت یەک شەویش چییە لە یەکتری دانەبڕاین.

من هێشتا هەر سەرسامی ئەو لێکچوونە زۆرەی نێوان شێوەی دەموچاوی ئانا و (ماخا)ی گۆیا بووم، لەبەرئەوە ناچار بووم زۆر بەوردی گوێی بۆ شل بکەم تا لە تەواوی قسەکانی بگەم. بەبێ ئەوەی ئاوڕم لێ بداتەوە درێژەی بە قسەکانی دا:

- ناوی (ئانا ماریا) بوو. لەسەر ڕیکلامەکانیش هەر ئەو ناوە دەنووسرا و هەموو خێزانەکەشی هەر بەو ناوەوە بانگیان دەکرد. منیش خۆم هەر لە خۆشەویستیدا بوو کە بە ئانا بانگم دەکرد.

- ئێ خۆ دەبێت لەقەبێکیشی هەبووبێت، وا نییە؟

زۆر بەگوڕ سەری بۆ لەقاندم، لەوەدەچوو چاوەڕوانی ئەو پرسیارەم بووبێت. لە وەڵامدا وتی:

- مایا.

- بەڵێ؟

- ناوی تەواوەتی ئەو، (ئانا ماریا مایا) بوو.

سەرسام بووم. هەر ئەوەندە نەبوو کە ئانا لە (ماخا)ی گۆیا دەچوو، بەڵکو ناوی (مایا)ش بوو. دیسانەوە لەویاشدا گەڕامەوە بۆ (تاڤیونی)، بۆ ئەو کاتەی کە جۆن پەنجەیەکی خستە سەر ناوچەوانی ئانا و بە شێوازە تایبەتییەکەی خۆی ڕایگەیاند کە ئانا ناوی (مایا)یە. ئەو کاتە خۆسێ ئەو ڕەفتارەی ئەوی بەلاوە خۆش نەبوو.

وتم:

- ئەوە مەحاڵە.

سەرلەنوێ سەری بۆ لەقاندمەوە:

- ئەو ناوە زۆر ناوازە نییە لەنێوان هونەرمەندە ئەندەلوسییەکاندا کە لە بواری فلامینکۆدا چالاکن. بێگومان بەناوبانگترین (بایلائۆرا)، (ماریۆ مایا)یە، بەڵام (بیلێن مایا)ی کچیشی ناوبانگێکی باشی پەیدا کرد، هەروەها کوڕەزاکەشی ناوبانگی دەرکرد کە ناوی (جۆن ئاندەرس مایا) بوو. زۆرجار ناوی ئەو زنجیرە فلامینکۆیە بە (لۆس مایا) ناو دەهێنرێت، بەڵام ئانا سەر بە خێزانێکی تری (مایا) بوو، یان بەلایەنی کەمەوە لقێکی تری ئەو خێزانە بوو.

- ئەو ناوە هیچ مانایەکی هەیە؟

- مایا ناوی ڕووەکێکە کە سەر بە خێزانی (کەمپۆزیت composite)ە، واتە گوڵی هەمیشە بەهار، بە لاتینی پێی دەگوترێت بیلّیس پێرینیس (Bellis perennis). ڕاست و دروست نازانم بۆچی ئەو گوڵە جوانە لە زمانی ئیسپانیدا ناوی (مایا)ی وەرگرتووە، بەڵام ڕەنگە لە داتاشینی وشەی مانگی (مایۆ — ئایار) وە هاتبێت، چونکە لە هەندێک وڵاتدا بە گوڵی هەمیشە بەهار دەڵێن (گوڵی ئایار). لەوانەیە ناوە لاتینییەکەشی ئاماژەیەک بێت بۆ ئەوەی کە ئەو ڕووەکە بەدرێژایی ساڵ گوڵ دەردەکات. لەلایەکی تریشەوە وشەی (مایا Maya) لە زمانی ئیسپانیدا واتای کچێکی گەنج دەبەخشێت، شاژنێکی مانگی ئایار، یاخود ژنێکی ڕازاوە یان ژنێک کە ماسکی هەڵبەستبێت.

منیش ئاماژەم بە شتێک دا و وتم:

- تاڕادەیەک هەروەک وشەی (ماخا)یە، بەشێوەیەکی گشتی ئەو وشەیەش هەر هەمان مانا دەبەخشێت.

- بەڵێ وایە. ئەو دوو وشەیە لە هەمان سەرچاوەی هیندۆ ئەوروپییەوە هاتوون. هەمان ڕەگی زمانەوانیش لە وشەی مانگی (مەی may) و (مایا maia)ی خواژنی ڕۆمانیدا، لە هەموو داتاشینەکانی وشەی لاتینی (ماگنوس magnus) یان (مایۆر maior)دا بەدی دەکرێت، بۆ نموونە وەک (پلازا مایۆر)، هەروەها لە داتاشینی وشەی یۆنانی (میگاس megas)دا، لە کۆمەڵێک زمانە هیندۆئەوروپییەکاندا وشەی (زۆر) لەو وشەیەوە داتاشراوە، هەروەک وشەی (much)ی ئینگلیزی، یان (ماها maha)ی سانسیکریتی.

- هەروەک (ماهاتمان mahatman)، کە مانای ڕۆحی جیهان دەبەخشێت؟
سەری بۆ لەقاندم.
وەک سەرنجێک وتم:
- ئێ خۆ (لاورا)ش لە ماراڤیودا زۆر باسی ئەوەی دەکرد. لاورا باسی (گایا) و (مایا)ی کرد و لێرەش لە ئیسپانیادا باسی (گۆیا) و (ماخا) دەکەین. لەوەدەچێت پەیوەندییەک لەنێوان ئەو وشانەدا هەبێت.
خۆسێ وتی:
- هەموو شتەکان پێکەوە بەستراونەتەوە.
کە ئەو قسەیەی کرد، وا هەستم کرد سەرلەنوێ گوێم لە دەنگی لاورا بووەوە.
تا ئەو کاتەش هەر سەیری نەدەکردم. بە دەوری نافورەیەکی مەڕمەڕدا خولاینەوە و وتی:
- (ئانا ماریا) کچە هەرە بچکۆلەی خێزانێکی قەرەجی پڕ دابونەریت بوو، هەر لە سەرەتای سەدەی ڕابردووەوە لە گەڕەکی (تریانا)ی شاری ئیشبیللییەدا ژیاون، ئێستاش دایک و باوکە بەدبەختەکەی و داپیرە و باپیرەیەکی هەر لەوێ دەژین. لەوەدەچێت لقێکی خێزانەکەی لە (ئیل پلانیتا)ی گۆرانیبێژی بەناوبانگی (کانتی جۆندۆ)وە هاتبێت، کە لە بنەڕەتدا بە دامەزرێنەری قوتابخانەی هەرە تایبەتیی گۆرانیی (تریانا) دادەنرێت. ئەو لە بنەڕەتدا خەڵکی (کادیز) بووە و لەنێوان ساڵانی (١٧٨٥ بۆ ١٨٦٠)دا ژیاوە. وەک دەڵێن ئەو باوەڕی بە کاریگەریی ئەستێرە و ئەستێرە گەڕۆکەکان هەبووە، لێرەشەوە پێدەچێت هەر بەهۆی ئەوەوە ناوی (ئیل پلانیتا)ی بەسەردا سەپابێت. بەهەرحاڵ لە زۆربەی گۆرانییەکانیدا ناڕاستەوخۆ باسی تەنە ئاسمانییەکان دەکات. بەدەر لەوەش ڕەنگە ناوەکەی ئاماژەیەک بێت بۆ ئەوەی کە ئەو کەسێکی (گەڕۆک) بووە، یان (ئەستێرەیەکی گەڕۆک) بووە. لە سەرەتای سەدەی نۆزدەدا گەیشتۆتە ئیشبیلییە و لەلای ئاسنگەرەکانی (تریانا) دا کاری کردووە، لەو سەردەمەدا زۆرینەی قەرەجەکان کاری ئاسنگەرییان کردووە. ئەو پیاوە بەپێی قسەی خێزانەکەی ئانا، باوە هەرە هەرە هەرەگەورەی ئانا بووە، هەرچەندە من خۆم هیچ بەڵگەیەکم دەست نەکەوت کە ئیسپاتی ئەوە بکات. بێگومان پاش حەوت نەوەش، چەند سەد وەچەیەکی لێ کەوتۆتەوە، خۆ ڕەنگە چەند هەزارێکیش، ئێ ئیتر بۆچی ئانا یەکێک نەبووبێت لەوانە؟
- بەڵێ ئەی دواتر؟

- هەر پاش تێپەڕبوونی چەند حەفتەیەک زۆر هۆگری یەکتری بووین، هەر زۆر زۆر... تێدەگەیت؟ ئێمە لەڕادەبەدەر پەیوەستی یەکتری بووین. جگە لەوەش ئانا منی خستە ناو دابونەریتێکی خێزانییەوە کە نەک هەر بەلامەوە خۆش بوو، بەڵکو بیرم لێ کردەوە کە بیخەمە ناو زنجیرە تەلەفیزیۆنییەکەمەوە. بەڕاست.. ئەو پرۆژەیەم قەت بە هیچ نەگەیشت..

- بۆ نا؟

- چونکە من خۆم بووم بە قەرەجێکی ئەندەلووسی. یان بەلایەنی کەمەوە بووم بەو شتەی کە پێی دەڵێن (ئافیسیۆنادۆ)، واتە کەسێک کە لە دڵەوە عاشقی نهێنیی کەلتووری فلامینکۆیە. هەستم کرد وەک زاوایەک لەو خێزانە پڕ لە دابونەریتەی مایادا هەڵگیرامەوە و نەمتوانی زنجیرەیەکی تەلەفیزیۆنی لەسەر خێزانەکەی خۆم بەرهەم بهێنم. هێدی هێدی لەبارەیانەوە ئاشنای شتگەلێکی زۆر بووم. کۆمەڵێک لایەنی زۆر تایبەتی لە دابونەریتی ئەو خێزانانەدا هەیە. ئەگەر شتێک هەبێت و قەرەجەکانی ئەندەلووسیا بەدرێژایی زیاتر لە (٥٠٠) ساڵی ڕابردوو توانیبێتیان بیپارێزن، ئەوا لایەنی هێشتنەوەی نهێنییەکانیانە. وەک دەزانیت ئەوان بۆ ماوەیەکی زۆر ناچار بوون خۆیان لە لێپرسینەوەی دادگاکانی ئەو کاتە بشارنەوە. لە خێزانی (ئانا)دا یەک چیرۆکی زۆر تایبەتییان هەیە کە نەوە لەدوای نەوە دەیگێڕنەوە، چیرۆکێک کە ناچێتە ئەقڵەوە و دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی (ئیل پلانیتا)، هەروەها پەیوەندییەکی بە مردنی باپیرە گەورەی (ئانا)شەوە هەیە کە لە ساڵی (١٨٩٤)دا لە پاش شەڕێک مردووە. پرسیارەکە لەوەدایە ئایا ئەو چیرۆکە، یان ئەو ئەفسانەیە، تیشکێکی زیاتر دەخاتە سەر ئەو شتەی کە بەسەر ئانادا هات یان نا؟! بەلایەنی کەمەوە هەتا مابوو، کاریگەرییەکی زۆری کردبووە سەر ژیانی.

دوو ساڵێک پاش ئەوەی (ئانا)م ناسی، دەرکەوت کە دڵی نەخۆشە. نەخۆشییەکی بچکۆلەی دڵی هەبوو و سەخت بوو نەشتەرگەری بۆ بکرێت، هەڵبەتە دەکرا، بەڵام مەترسییەکی گەورەی لەسەر ژیانی هەبوو. خۆشی دەیویست لەگەڵ ئەو نەخۆشییەدا بژی بەبێ ئەوەی لە ژیانی ڕۆژانەیدا هێندە بیری لێ بکاتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا لە ماوەی ئەو چەند ساڵەی پێشوودا هەندێکجار سوڕی خوێنی هێندە خراپ دەبوو کە لەپڕێکدا سەری گێژی دەخوارد، کەمیش ڕێدەکەوت لە دوو خولەکێک زیاتر بخایەنێت. بەپێی قسەی دکتۆرەکانیش ئەو حاڵەتەی شتێکی وا نەبوو کە نیگەرانی بین، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەس بوو بۆ ئەوەی من و ئانا بتۆقێنێت. ساڵی پار

بۆ یەکەمین جار دڵی زۆر بە پیسی لێیدا، ئەوەبوو لە ناوەڕاستی تەختەی شانۆدا کەوت و بەپەلە گەیاندیانە خەستەخانە. تا ئەو کاتەش دکتۆرەکان هەر ئارامیان دەکردینەوە، بەڵام وایان بە باش زانی چیتر نەچێتە سەر شانۆ. وەک خۆت دەزانیت فلامینکۆ سەمایەکی توونده، زۆر زۆر توونده. هاوکاتیش ئامۆژگارییان کرد کە دووگیان نەبێت، دوو شکستی یەک لە یەک گەورەتر، خۆشم نازانم کامیان لە کامیان گەورەترێک بوو.

– ئەی ئانا خۆی هەموو ئەو شتانەی بەلاوە چۆن بوو، چۆن مامەڵەی لەگەڵدا کردن؟

لە حەشمەتدا مشەمشێکی لێ بەرز بووەوە و وتی:

– بەلایەوە قورس بوو. فلامینکۆ ڕۆحی ئانا بوو. دەشیویست منداڵێکی ببێت. تەنانەت هەندێکجار کە جلێکی جوانی منداڵانی دەبینی، یەکسەر دەیکڕی.

– دواتریش سەفەرتان کرد بۆ دوورگەکانی فیجی؟

وەڵامی پرسیارەکەی نەدامەوە، بەڵام وتی:

– دواتر لە (سالامانکا)دا یەکتریمان بینی. من و ئانا گواستبوومانەوە بۆ مەدرید، بەڵام بە مەبەستی سەردانی کەسوکاری من، چەند ڕۆژێکمان لە (سالامانکا) دا بردەسەر. لە قاوەخانەکەی (پلازا مایۆر) دانیشتبووین و لەپڕێکدا مۆسیقای فلامینکۆیان خستە سەر، چەند ساڵێک لەوەوبەر ئانا خۆی لەگەڵ ئەو گروپەدا لە شاری ئیشبیلییە کاری دەکرد. بەڕوونی بینیم مۆسیقاکە جەستەی داگرت، پاش نەختێک دەستی کێشا بە مێزەکەدا و کەوتە چەقەنەلێدان. دواتریش داوام لێ کرد بوەستێت، چونکە بە پێویستم نەزانی هێندەی تر ئازاری خۆی بدات. ئینجا بەپەلە هەستایە سەرپێ و ڕایکردە دەرەوە، لەویادا بوو کە هاواری کرد و وتی: «دەمەوێت بگەڕێمەوە بۆ ئیشبیلییە». من دەترسام سەما بکات، لەوە دەترسام کە نەتوانم ڕێگەی لێ بگرم. بەهەرحاڵ گەڕاینەوە بۆ ئیشبیلییە و لە (تریانا)دا چەند ڕۆژێک لەگەڵ دایک و باوکی ئانادا ماینەوە. شەش مانگ بوو سەردانی ئەوێمان نەکردبوو، یەک دوو ڕۆژمان تەنها بۆ پیاسەی دووروودرێژ تەرخان کرد، چووین بۆ پارکی (ماریا لویسا)، سەردانی (پالازا ئیسپانیا) و باخچەکانی (ئالکازار)مان کرد، کە دەکەوێتە گەڕەکی دێرینی (سانتا کروز)ی جوولەکەکانەوە، بەڵام بەهیچ شێوەیەک نەیویست سەردانی خودی (پلازا سانتا کروز) بکات، کە هەموو تاقە ئێوارەیەکی چەند ساڵانی پێشوو سەمای تیدا دەکرد، هەر لەوێشدا بوو کە دوا ئێوارە کەوت و

بە ئەمبولانسێک گەیاندیانە خەستەخانە. ئانا لەو بارەیەوە هیچی نەگوت، تەنانەت یەک وشەشی دەربارەی نەخۆشیی دڵ و فلامینکۆ نەدرکاند، بەڵام هەموو کەڕەتێک کە نزیک دەبووینەوە لە گۆڕەپانەکە و خاچە ئاسنینە دێرینەکەمان دەبینی، یەکسەر بەرەولایەکی تر ڕایدەکێشام. بەڕاست، کاتی خۆی ڕێک لەو شوێنەدا کڵێسەیەکی بەناوبانگی لێبووە.

من و خۆسێ گەیشتبووینە خواری خوارەوەی (باخچەی ڕووەک)ەکە، لەویادا شورایەکی لاری بە ڕووەک داپۆشراو سنووری باخەکە و (کلاودیۆ مۆیانۆ) دەستنیشان دەکات، ئەو شەقامەیە کە کۆمەڵێک کتێبفرۆشی دەستی دووی تێدایە. ڤیرا، هەر لەویادا بوو کە تۆ چەند ساڵێک لەمەوبەر تەرجەمەیەکی کۆنی کتێبی (فیکتۆریا)ی (هامسون)ت کڕی. خۆسێ لەسەر قەراغی نافورە مەڕمەڕییەکە دانیشت، کەمێک دواتر منیش لەلایەوە دانیشتم و بەردەوامی بە قسەکانی دا:

- هەردووکمان حەزمان لە باخچەکانی (ئالکازار) بوو و من یەکەم جار (ئانا)م برد بۆ ئەو باخانە. ڕاستە ئەو خۆی لە شاری ئیشبیلییەدا گەورە بووبوو، بەڵام قەت ئەو باخچانەی نەدیبوو. لەو کاتەشەوە لە ئیشبیلییەدا بوو بە پەناگەیەک بۆ ئانا، بۆ ماوەیەک بەلایەنی کەمەوە حەفتەی دوو جار پیاسەمان لەناو ئەو باخچانەدا دەکرد. بەڵێ، بەهەرحاڵ لە سێهەم ڕۆژی سەفەرەکەماندا پیاسەیەکمان بە هەموو باخچەکاندا کرد، هەروەک چۆن لەوەوپێش چەندین جار پیاسەمان پێدا دەکردن. بەلای ئێمەوە ئەو باخچە بە پەرژین گیراوانە جیهانێک بوون بۆ خۆیان، ئەو ڕۆژە هەروا بۆ خۆشی وتمان «خۆمان باخچەکانی (ئالکازار) داگیر دەکەین و تا دوا ساتی ژیانمان لەویادا دەمێنینەوە». پێم وابێت کتومت نەدەبووایە ئەوەمان بگوتایە. نا، نەدەبووایە ئەوەمان بگوتایە.

سەبرم نەکرد و پرسیم:

- چی ڕوویدا؟

- لە قاوەخانەکەی خواری خوارەوەدا لەسەر کورسییەک دانیشتبووین، ئانا لەپڕێکدا چاوی بە کورتەبنەیەک کەوت. ئاماژەی بۆ سەرەوە کرد بەرەو (پۆرتا دی مارشینا) و وتی: «کورتەبنەیەکم بینی سەری لە (گالیریا دیل گروتیسکۆ)وە دەرهێنابوو». هەروەها وتی: «ڕەسمێکی گرتم»، وەک ئەوەی دڵی خورپەی کردبێت و ئەوەی بە زەنگێکی کوشندە دانابێت. چرکەیەک دوای ئەوە هەردووکمان چاومان بە کەسێکی بچکۆلە کەوت، لە کونێکی بچکۆلەی سەر شورا دووردرێژەکەوە تەماشای دەکردین،

ڕێک لەو شوێنەوە کە بەشی کۆن و نوێی باخچەکە دەکات بە دوو بەشەوە. هەمدیسان لەو سەرەشەوە کامێرایەکی بەدەستەوە بوو و کەوتەوە چرکەچرک. ئانا هاواری کرد و وتی: «ئەوە خۆیەتی! ئەوە کورتەبنەکەیە بە خۆی و زەنگۆڵە زرنگەدارەکانییەوە».

قسەکەیم پێ بڕی و وتم:

- کێ؟ کام کورتەبنە؟

خۆسێ وەڵامی نەدامەوە، بەڵام هەروا لەسەر قسەکانی خۆی بەردەوام بوو:

- ئانا بەپەلە لەسەر کورسییەکە بەرز بووەوە و دوای کورتەبنەکە کەوت، دیسان لە خوارووی (پۆرتا دی مارشینا)دا بۆ ساتێک بینیمانەوە. هێندەی بیرم بێتەوە لە پێشدا هەوڵم دا ئانا بگەڕێنمەوە، بەڵام دواجار منیش بەدوای هەردووکیاندا ڕامکرد. بەدرێژایی ئەو ماوەیەی کە من (ئانا)م تیایدا ناسی، زۆر زۆر باسی کورتەبنەیەکی تایبەتی بۆ دەکردم. ئانا لەدوای دەرگا ئاسنینەکەوە بەرەو لای چەپ ڕایکرد، بەلای حەوزەکەدا تێپەڕی کە پەیکەری (میرکوری) تێدایە، بە پلیکانەکاندا بەرەو (باخچەی سەما) چووە خوارەوە، دواتریش بەرەو (باخچەی ئافرەتان)، بەلای نافورەی (نیپتون)دا تێپەڕی، بە دەرگا گەورەکەدا چووە دەرەوە و بە دەوری خانۆچکەکەی (کارلۆسی پێنج)دا خولایەوە و خۆیکرد بەناو پەرژینە پێچاوپێچەکاندا کە هەموویان مەترێک بەرزن، ئینجا بەدرێژایی (گارلیریا دیل گروتیسکۆ) ڕایکرد، پاشان بەرەولای ڕاست و بە (پۆرتا دیل پریڤیلیجۆ)دا تێپەڕی و دواجاریش بۆ خوارەوە بەرەو (باخچەی شاعیران) ڕایکرد. ئانا و کورتەبنەکە لە من خێراتر ڕایاندەکرد. جگە لەوەش خەڵکانێکی زۆر هاواریان لە من دەکرد، چونکە وا دەهاتە بەرچاو کە ئانا دوای کورتەبنەیەکی نەگبەت کەوتبێت، بەڵام لە ڕاستیدا ڕێک پێچەوانەکەی بوو. ئانا ڕێک لەبەرئەوە بەدوایدا ڕایکرد تا بەشێوەیەکی یەکجارەکی کۆتایی بە هەموو شتێک بهێنێت. لە (باخچەی شاعیران)دا کەوت، لەلای پەرژینی چواردەوری حەوزەکەی خواری خوارەوەدا کەوت، لەویادا ئەگەر بەردێک هەڵبدەیت دەگاتە (پلازا سانتا کروز). لەویادا کە کەوت تەنها یەک دیواری بەرز لەنێوان ئەو و تەختەی شانۆی فلامینکۆی (لۆس گالۆس)دا هەبوو، ئەو ماوەیەکی دوورودرێژ لەویادا سەماکەرێکی مەزن بوو. بەرلەوەی من بگەمە لای، کۆمەڵێک خەڵکی زۆر لە دەوری کۆبووبوونەوە. هێشتا لە هۆش خۆی نەچووبوو، بەڵام دەموچاوی شین بووبووەوە و هەناسەبڕکێی بوو. بەرزم کردەوە و خستمە سەر مەرمەڕی نافورە

گەورەکەی نێوان دوو حەوزەکەوە، لەشی گەرم داگیرسابوو، بۆیە بۆ ماوەی یەک دوو دەقەیەک خستمە ناو ئاوەکەوە تا فێنکی بکەمەوە. هاوارم کرد نەخۆشیی دڵی هەیە و وابزانم پاش نەختێک ئەمبولانسێک گەیشتە شوێنەکە و بە دەستەبەرێکەوە بەرەو لامان هاتن. بەڕاستی ئاگام لە کات نەبوو و نازانم چەندێکی پێچوو تا گەیشتنە لامان.

بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ خۆسێ هەروا دانیشتبوو و تەماشای (باخی ڕووەک)ی مەدریدی دەکرد. لەو ناوەدا کەسی تری لێ نەبوو، چەهچەهەی بولبولەکانیش زۆر بەگوڕ بوون، هێندە بەگوڕ دەیانخوێند تاڕادەیەک دەنگی فڕکوهوڕی سەیارەکانی (پاسیۆ دیل پرادۆ)یان شاردبووەوە. لەوەدەچوو بولبولەکانیش گۆرانی بۆ مردنی هاوڕێکەیان بچڕن.

پرسیم:

- ئەی کورتەبنەکە؟
- کەس بیری لەو نەکردەوە. ون بوو، لەوەدەچوو عەرزەکە قوتی دابێت.
- ئەی ئانا؟

- لە خەستەخانە چەند دەرزییەکیان لێ دا و یەک دوو سەعاتی یەکەم تۆزێک باشترێک بوو، بەڵام قەت هەڵنەسایەوە سەر پێ. دکتۆرەکان وتیان هەر کاتێک لێدانی دڵی ئاسایی ببێتەوە، نەشتەرگەرییەکی بۆ دەکەن، بەڵام نەگەیشتە ئەوە. نزیکەی حەفتەیەک لەمەوبەر مرد و ڕۆژی هەینیش لە کڵێسەی (سانتا ئانا) لە تریانا پرسەی بۆ دادەنرێت.

تەماشایەکی کردم و وتی:

- زۆرم پێ خۆش دەبێت ئەگەر تۆش بێیت، هەڵبەتە ئەگەر بتوانیت.
- بێگومان دێم.
- زۆر چاکە!

- باشە ئەو ماوەیەی ئانا لە خەستەخانە کەوت، هیچی دەگوت؟ بەدرێژایی ئەو ماوەیە هەر ئاگای لە خۆی بوو؟

- لەو ماوەیەدا لە هەموو کاتێک زیاتر بیری تیژ بوو. زۆر شتی بۆ گێڕامەوە کە من لەوەوبەر هەر نەمبیستبوون، بۆ نموونە دەربارەی کورتەبنەکە و (ئیل پلانیتا) و باپیرە هەرەگەورەکەی کە لە پاش شەڕە چارەنووسسازەکەیەوە مردبوو، هەروەها دونیایەک نهێنیی فلامینکۆشی بۆ درکاندم. دوا قسەشی، بەرلەوەی دڵی

لە لێدان بکەوێت، وتی: «چەند ملیارد ساڵێکی پێدەچێت تا مرۆڤێک ئافەریدە دەکرێت، کەچی لە ماوەی یەک دوو چرکەدا دەمرێت». ئەو وشانە هی من بوون و دەربڕینێک بوون بۆ شێوازی ژیانی من، بەڵام دواجار ئەویش هەمان شێوازی ژیانی منی هێنایە ناو ژیانی خۆیەوە، هەروەک چۆن من خۆم بووبووم بە (ئافیسیۆنادۆ) یەکی فلامینکۆ. بەلای منەوە ئەو وشانەی لە یەک کاتدا وەک ماڵئاواییەک و وەک ڕاگەیاندنێکی خۆشەویستیش وابوو.

فریا نەکەوتم پرسیاری لێ بکەم و بزانم مەبەستی چییە، چونکە لەپڕێکدا هەستا و بەناو باخچەکەدا کەوتە ڕێ. منیش دوایکەوتم.

لەو کاتەدا کە ئەو باسی (ئانا)ی بۆ گێڕامەوە، من دوو تابلۆکەی مۆزەخانەی (پرادۆ)م هاتەوە بەرچاو. بیرم لەو کورتەبنەیە دەکردەوە کە ئانا لە باخچەکانی (ئالکازار)دا دوایکەوتبوو، هەروەها بیرم لەو لێکچوونە زۆرەی نێوان ئانا و (ماخا) کەی گۆیا دەکردەوە، لە دڵی خۆمدا وتم: «بڵێیت پەیوەندییەک هەبێت لەنێوان ئەو دووانەدا؟» وتم:

– چەند ساڵێک لەوەوپێش کە بۆ یەکەم جار (ئانا)ت بینی..

وابزانم یەکسەر لە مەبەستەکەم تێگەیشت، چونکە قسەکەی پێ بڕیم و وتی:

– نەخێر، ئەو کاتە بیرم لە گۆیا نەدەکردەوە. وابزانم منیش لەو لایەنەوە وەک تۆ هەر هەمان هەستم هەبوو. ئێ منیش دڵنیا بووم کە لەوەوپێش (ئانا)م بینیبوو، بەڵام من زۆر بە قووڵی عاشقی بووم و پێم وابوو سەرچاوەی ئەو هەستەم لەوەوە هاتبێت.

وتم:

– خۆ ڕەنگە جۆرە میکانیزمێکی بەرگریمان هەبێت و نەهێڵێت کەسێک بناسینەوە کە لە ژیانی ئێستادا دەیبینین و هاوکاتیش لە کەسێکی تر بچێت کە دوو سەد ساڵێک لەمەوبەر ژیاوە.

هەروا شانێکی هەڵتەکاند و منیش پرسیم:

– بیر لە چی دەکەیتەوە؟

بە سیمایا دیاربوو بە قووڵی بیری دەکردەوە، وتی:

– ئاخر هەر ئەوەندە نەبوو کە لە یەکتری دەچوون، بەڵکو نەختە نەختە پڕاوپڕ وەک یەکیان لێ هات. هەر لەو کاتەوەی کە ئانا گەنج بوو، ناچار بوو بەرەبەرە زیاتر و زیاتر لەگەڵ ئەو لێکچوونەدا بژی، دواجاریش لە ئیشبیلییەدا نازناوی (لا نینا دیل

پرادۆ)یان لێنا.
- گوتت زیاتر و زیاتر؟
- هەتا دەهات زیاتر و زیاتر لە (جیتانا)کەی گۆیا دەچوو.
سەرم سوڕما و لەتاوا دەستم گرت بە دەممەوە، هاوکاتیش خۆسێ لەسەر قسەکانی بەردەوام بوو:
- لەو کاتەشدا مرد کە کتومت لە مۆدێلەکەی ئەو وێنەکێشە دەچوو. لەویادا کارەکەی تەواو بوو و تەنانەت یەک ڕۆژی زیاتریش نەژیا.
- بەڵام تۆ خۆت چۆن ئەو لێکچوونە سەیروسەمەرەیەی نێوانیان لێک دەدەیتەوە؟
- کۆمەڵێک لێکدانەوەی شیاو هەیە. یان ڕاستترێک بیڵێم: دەتوانین زنجیرەیەک لێکدانەوەی جیاوازی بۆ بهێنینەوە، بەڵام یەک خاڵی هاوبەش لەنێوان هەموویاندا هەیە: ئەویش ئەوەیە کە هیچ دانەیەکیان ڕێی تێناچێت.
- پێم خۆشە گوێم لە هەموویان بێت.
بەلای ڕاستدا خۆی بەرەو خانۆچکە بچکۆلەکەی ناو باخەکەدا وەرچەرخاند و وتی:
- لەوانەیە داپیرە هەرە هەرە هەرەگەورەکەی ئانا مۆدێلی ئەو دەموچاوەی گۆیا بووبێت کە خراوەتە سەر وێنە ڕووتەکە...
- ئاوها؟
- بەڵام چەندە ڕێی تێدەچێت کە ئەو هێندە زۆر لە یەکێک لە وەچەکانی دواتری خۆی بچێت؟ یان بێگومان بەپێچەوانەوە دەتوانین بڵێین: چەندە ڕێی تێدەچێت ئافرەتێک کتومت لە داپیرە هەرە هەرە هەرەگەورەکەی خۆی بچێت؟ تۆ خۆت زیندەوەرناسی، بەشێوەیەکی گشتی شتێکی وا ڕێی تێدەچێت؟
سەرم بۆ ڕاوەشاند:
- پاش حەوت نەوە ڕێی تێناچێت. ئەگەر باوکی (ئانا)ش لە هەمان ئەو داپیرە هەرە هەرە هەرەگەورەیەوە هاتبێت، کە ئەمەش ڕێی تێدەچێت، ئەو کاتە دەکرێت جۆرە لێکچوونێک لە سیماکانیاندا هەبێت، بەڵام کتومت وەک یەک نابن. دەتوانم بڵێم شەنسی بردنەوەی خەڵاتی یەکەم لە یانسیبێکدا حەوت کەڕەت لەسەر یەک، کە ڕێی تێناچێت، زۆر زیاترە لەوەی کە ئەو دووانە کتومت وەک یەک بن.
وەک سەرنجێک وتی:
- کەواتە لەوانەیە هەر ڕێکەوتێک بێت و هیچی تر. ئانا و (جیتانا)ی گۆیا کتومت لە یەک دەچوون. وەک دەزانین ئەو لێکچوونەیان خۆی لە خۆیدا حەقیقەتێکە.

دیسانەوە سەرم بۆ ڕاوەشاندەوە، لەگەڵ قسەکەیدا نەبووم و وتم:

- هیچ دوو مرۆڤێک نییە کە کتومت وەک یەک بن. کەمێک لەمەوبەر ئەو بوارەمان ڕەت کردەوە کە لە ڕێگەی نەوەکانەوە شتی وا ڕووبدات. هیچ تیۆرییەکی ترت هەیە؟

- بەڵێ، بەڵێ.. زۆریش. زۆر بەوردیش هەموویانم هەڵسەنگاندووە.

من خۆم هیچ بوارێکی ترم بە خەیاڵدا نەدەهات، کەچی وتی:

- هەرەساکارترین تیۆری ئەوەیە کە ئانا خۆی مۆدێلی ئەو تابلۆیە بووبێت کە تۆ لە مۆزەخانەکەدا لێی ورد بوویتەوە.

- ئاخر ئەو تابلۆیە دوو سەد ساڵ لەمەوبەر کێشراوە.

- بەڵێ، وا دەڵێن.

کەمێک دوودڵ هاتە بەرچاوم، ئینجا وتی:

- من ناچار بووم زۆر لە خۆم بکەم و هەموو گریمانەکان هەڵبسەنگێنم، هەم ئەوانەی ڕێیان تێدەچێت و هەم ئەوانەش کە ڕێیان تێناچێت. بێگومان ڕێی تێدەچێت ئانا لەسەروو دوو سەد ساڵەوە ژیابێت.

تەماشایەکی دەموچاوە زەردهەڵگەڕاوەکەیم کرد، ئەگەر خۆم بە چاوی خۆم ئەو لێکچوونە گەورەیەی نێوان ئانا و وێنەی تابلۆکەم نەدیبایە، ئەوا دەمگوت خۆسیێ نەخۆشییەکی دەروونیی گەورەی هەیە، یان بەلایەنی کەمەوە دەمگوت توانای حوکمدانی لە نزمترین ئاستدایە. وتم:

- پێم وانییە ئەم بابەتە شایانی نوکتە بێت.

- ئێ خۆ منیش نوکتەت بۆ ناکەم، بەڵام هەست دەکەم کەوتوومەتە ناو شتێکەوە و هیچ دەسەڵاتێکم نییە، بگرە زۆر زیاتریش وەک لەوەی تۆ مەزەندەی دەکەیت. ئاخر من بووم کە ئەو ڕۆژە لەگەڵ (ئانا)دا لە باخچەکانی (ئالکازار)دا دانیشتبووم، ئەو ڕۆژە کتومت هەر لە (جیتانا)کەی گۆیا دەچوو، تەنانەت قژیشی پڕاوپڕ لە قژی ئافرەتەکەی ناو تابلۆکە دەچوو، تەنانەت مکیاجەکانیشیان وەک یەک بوون، تێدەگەیت؟

- وابزانم تێدەگەم.

- بێگومان بەپێی ئەزموون، ڕێی تێناچیت کە ئانا مۆدێلی ئەو تابلۆ کۆنە بووبێت، بەڵام بەپێی لۆجیک شتێکی مەحاڵ نییە.

- بەپێی ئەم بۆچوون و لۆجیکە لیبراڵەت بێت، ئەوا گومانم نییە تیۆری تریشت

لا گەڵاڵە بووە.

بەرلەوەی وەڵامم بداتەوە، دەستی خستە سەر ناوچەوانی، قورگی پاک کردەوە و یەک دوو جارێک بۆی کۆکی:

– ئەگەر (جیتانا)کەی گۆیا لە کۆتایی سەدەی هەژدەدا کێشرابێت، ئەو کاتە دەکرێت مەزەندەی ئەوە بکەین کە بەشێوەیەک لە شێوەکان ئانا لە مۆدێلی تابلۆکەدا دارێژراوە.

– چۆن (دارێژراوە؟)

– من ئەندێشەکانم بەردەدەم. خۆ تۆ چیرۆکی (پیگمالیۆن Pygmalion)ت بیستووە؟

وەڵامم دایەوە و وتم:

– (میتامۆرفۆسیس Metamorphosis)ەکانی (ئۆڤید Ovid). پیگمالیۆن عاشقی پەیکەرێکی ئافرەتی قەشەنگ دەبێت کە خۆی دایتاشیوە. پاشان (ئافرۆدیت Afrodite) بەزەیی پێدا دێتەوە و گیان بە بەری پەیکەرەکەیدا دەکات. هیچ تیۆرییەکی ترت هەیە؟

بۆ ساتێک بێدەنگ بوو و بە نیگایەکی خەیاڵاوییەوە سەیرێکی کردم، ئینجا وتی:

– ئاخر زۆر لە یەک دەچوون، هەر دەتگوت ئانا و مۆدێلی وێنەی تابلۆکە دووانەیەکن و لە یەک هێلکەوە هاتوون.

هەرچەندە بەتەواوەتی نەمزانی مەبەستی چییە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا وتم:

– بێگومان.

پرسی:

– بە بڕوای تۆ هەر بەتەواوەتی مەحاڵە دوو سەد ساڵێکی تر پیاوێکی پڕاوپڕی وەک من لەم ژیانەدا بێت؟ هەڵبەتە مەبەستم لەوەیە کە هەر بۆ نموونە پەنجەمۆر و هەموو شتێکی لە من بچێت.

وتم:

– نا، ئەوە شتێکی مەحاڵ نییە. هەر ئەوەندە یەک دوو خانەی زیندووی خۆت و ئامێرێکی فریزەری باشم بدەرێ تا دوو سەد ساڵی تر کۆپییەکی (کلۆن) خۆت دروست بکەینەوە، بەڵام دەبێت ئەوەشت پێ بڵێم کە خۆت هیچ سوودێکی وا لەو (لەدایکبوونەوەیە)ت نابینیت.

تەنها ئەو کاتە لە مەودای ئەو قسانەی خۆم تێگەیشتم کە وتی:

- کەواتە ڕێی تێدەچێت کە شانەیەکی مۆدێلەکەی گۆیا وەک نموونەیەک وەرگیرابێت و بەشێوەیەکی زۆر سەرسوڕهێنەر بۆ ماوەی دوو سەد ساڵێک پارێزرابێت، ئینجا نزیکەی سی ساڵێک لەمەوبەر ماددەی بۆ ماوەی ئەو خانەیە خرابێتە ناو خانەی هێلکەیەکەوە کە ماددەی بۆماوەی تێدا نەبووە.

لەویادا موچوڕکەیەکی سارد بە لەشما هات، هەروەک ئەو کاتەی کە ئانا و خۆسێ بەناو دارگوێزە هیندییەکاندا دەڕۆیشتن و گوێم لێ بوو ڕستە بەدوای ڕستەیان بۆ یەکتری دەگوت، باسی خەلقکردنی مرۆڤ و سەرسامنەبوونی ئادەمیان کرد. وتم:

- زۆرباش لە مەبەستت تێدەگەم. بەڵێ لە ڕاستیدا ئەوەیان ڕێی تێدەچێت. لە بواری مایکرۆبایۆلۆجی و دەرمانسازیی پیتاندندا پێشکەوتنێکی مەزن هاتۆتە ئاراوە، بەتایبەتیش لە سی ساڵی ڕابردوودا، ئەوە با باسی دوو سەد ساڵی ڕابردووش هەر نەکەین.

وەک دەرئەنجامێکی قسەکانم وتی:

- کەواتە ئەوەش هەر زۆر مەحاڵە.

- بەڵێ ئەوەشیان زۆر مەحاڵە. پێم وابێت باشترە گەر وایدابنێین کە ئەو لێکچوونە ڕێکەوتێکی پەتی بووبێت و تەواو، هەرچەندە ئەوەشیان خۆی لە خۆیدا مەحاڵە بڕوای پێ بکرێت. من بە ڕێزەوە نکوڵی لەو جۆرە ڕێکەوتانە دەکەم، مەبەستم لەوەیە پێم وا نییە سروشت چەند ڕێگایەکی جیاواز بگرێتە بەر بۆ ئەوەی بە هەمان ئامانج بگات. سروشت بەو شێوەیە کار ناکات. سروشت لەپڕێکدا باز نادات، بەرەو ئامانجێکی دیاریکراو ناڕوات.

- ئێ لەوەوپێش گفتوگۆمان لەسەر ئەوە کرد.

- بەڵێ؟

- گفتوگۆمان لەسەر ئەوە کرد کە سروشت ئامانجێکی هەیە یان نا؟ ئامانجێک کە دەبێت بیهێنێتە دی، ئامانجێک کە سروشت دەیەوێت یان نیشانی بدات یاخود حوکمی بەسەردا بدات. وتیشمان ئەو شتەی کە ئەمڕۆ ڕوودەدات ڕەنگە بەهۆی شتێکی ترەوە بێت کە زۆر زۆر لەوەوبەر ڕوویداوە.

ئەو باسەمان لە (کۆبوونەوە باڵاکەی ناوچە گەرمەکان)دا دامەزراند کە جۆن ڕێکی خست. دوابەدوای ئەوە شتگەلێکی زۆر ڕوویاندا، بەڵام لەویادا شتێکی تەواو نوێ بە خەیاڵمدا هات و وتم:

- خۆ پێی دەچێت ئێمە لەوەیاندا هەڵە بین کە وایدادەنێین (گۆیا) وێنەی

ئەو دەموچاوەی لە کەسێکی ڕاستەقینەوە کێشابێت. ئێ خۆ ناچار بووە وێنەی دەموچاوێک لەسەر ئەو لەشولارە بکێشێت تا کەسایەتیی ڕاستەقینەی مۆدێلەکەی بپارێزێت، مەبەستم لەوەیە کە تەنها وەک پەردەپۆشێک بەکاری هێنابێت و هیچی تر.

وەک کەسێکی سەرسەخەت خەندەیەکی خستە سەر لێوانی، دیاربوو ئەویش ئەو گریمانەیەی هەڵسەنگاندبوو، وتی:

– ئێ؟

– بەو شێوەیەش لەوانەیە هەر بە ڕێکەوت دوو سەدساڵێک دواتر ئافرەتێک دەربکەوێت کە کتومت لە وێنەی خەیاڵی ئەو وێنەکێشە بچێت.

بێهودە سەری ڕاوەشاند و وتی:

– تارادەیەک لە چیرۆکەکەی (پیگمالیۆن) دەچێت. ڕۆژێک لە ڕۆژان خوا گیانی بە بەری وێنە خەیاڵییەکەی (گۆیا)دا کرد.

– من زۆر بەڕوونی گوتم ڕەنگە وابووبێت، بەڵام دەبێت دان بەوەشدا بنێم کە ئەوە ڕێکەوتێکی زۆر ناوازەیە.

– کەواتە (ڕێکەوت)یش ڕێی تێدەچێت، هەڵبەتە بەمەرجێک کاتی خۆی گۆیا ئاگای لە پلانی خواوەند نەبووبێت. مەبەستمە بڵێم: بڵێیت ئەو وێنەکێشە پەنهانبینە، کەمێک توانای (کلاڤۆیانت)یشی نەبووبێت؟

لەویادا گەیشتبووینە لای پەیکەرەکەی (کارڵ ڤان لیننێ). پرسیارێکم لێ کرد و وتم:

– هیچ تیۆرییەکی ترت پێیە؟ یان تەواو و هیچی ترت پێ نەماوە؟

دانی پیادا نا و وتی:

– بەڵێ تەواو، هیچی ترم پێ نییە.

یەک دوو چرکەیەک بێدەنگ بوو و پاشان وتی:

– بەڵام لێکدانەوەیەکی تەواو جیاوازیشمان لەبەردەستدایە. لێکدانەوەیەک کە ئانا و کەسوکاری زۆر بەگوڕ بڕوایان پێ بوو. وەک دەزانیت ئەوان خێزانێکی قەرەجی دێرینن و منیش چەند ساڵێکی کەمە بووم بە قەرەج.

لەپڕێکدا تەماشای کاتژمێرەکەی کرد، ڕێک لەو کاتەدا کە بەوپەڕی پەرۆشییەوە چاوەڕوان بووم تا بیروڕای (ئانا)م لەو بارەیەوە بۆ بگێڕێتەوە، وتی:

– بەداخەوە دەبێت جێت بهێڵم و بەپەلە بڕۆم، کارێکی گرنگم هەیە و هەر لە

ئێستاوە چارەکێک دواکەوتووم.
دەسخەڕۆی کردم، وابزانم خۆشی هەستی بەوە کرد، چونکە بەرلەوەی ئاوڕ بداتەوە و بەپەلە بۆی دەربچێت، دەستێکی خستە سەر شانم و وتی:
- لە ماوەی ئەم چەند ڕۆژەدا سەرم زۆر قاڵە. چەند ئەرکێکی زۆر کەوتۆتە سەرشانم، ئەرکی خۆش و ناخۆش و قورسیش. بۆ من ئەرکێکی خۆش بوو کە بەردەوام سەردانی مۆزەخانەی (پرادۆ) بکەم تا تۆ ببینم، بەڵام ئەرکی تریشم لەسەرە و ناچارم بیریان لێ بکەمەوە.
هێندەی گوت و بەپەلە بەرەو دەرگای دەرەوەی باخەکە بۆی دەرچوو.
بەو شێوەیە کۆمەڵێک پرسیاری بێ وەڵامم لەلا مایەوە: ئەو کورتەبنەیەی ئیشبیلییە کێ بوو؟ ئانا چ جۆرە لێکدانەوەیەکی هەبووە بۆ ئەو لێکچوونە زۆرەی نێوان خۆی و وێنەی تابلۆکە؟ چیرۆکی (ئیل پلانیتا) و باپیرە هەرەگەورەکەی چی بوو کە لە ساڵی (١٨٩٤)دا لە پاش شەڕێک گیانی لەدەست داوە؟ بەدەر لەوانەش نەمدەزانی بۆچی کاتێک کە ئانا و خۆسێ لە تاڤیونی بوون، ئەو ڕستە سەیر و پڕ حیکمەتانەیان لەبەرخۆیانەوە دەگوت، بەڵام تەنانەت کاتێکی نوێشمان دانەنا تا یەکتری ببینینەوە. بڵێیت بەشێوەیەک لە شێوەکان زانیبێتی کە من لە ئوتێلی (پالاس) لامداوە؟ نازانم، ناوی ئەوەم هێنا یان نا؟
تەنها شتێک کە دەمتوانی پشتی پێ ببەستم، پرسەکەی ئانا بوو کە هەینی دواتر لە کڵێسەی (سانتا ئانا) لە ئیشبیلییە بۆی دادەنرا. دیسانەوە لەوێشدا جۆرە لێکچوونێکی نیمچە ناخۆش لەنێوان ناوەکاندا هەبوو.
لەو کاتەدا کە لەپڕێکدا بە تەنیا لە (باخی ڕووەک)دا مامەوە، وام بە خەیاڵدا هات داوات لێ بکەم کە کۆتایی حەفتەی داهاتوو لەگەڵمدا بێیت بۆ ئیشبیلییە. پێم وابێت قەرزاربارم بوویت، چونکە زۆر پێکەنیت کاتێک کە وتم (ئانا و خۆسێ)م لەسەر قەراغی ڕووباری (تۆرمس)دا بینی. گەر واش نەبێت، خۆ هەر هیچ نەبێت دەتوانیت چاکەیەکم لەگەڵدا بکەیت و لەگەڵمدا بێیت بۆ ئەو پرسەیەی کە بەلای منەوە زۆر گرنگە.
ئای کە تۆ پێکەنیت ڤیرا، بەڵام پێکەنین و گریان هێندە دوور نین لە یەکەوە، چونکە ئاسوودەیی هەروەک شووشە ناسکە. ئێ خۆ هەر هیچ نەبێت من و تۆ ئەزموونی ئەوەیانمان کردووە.
تەماشای (کارلۆس دی لینییۆ)م دەکرد. ڕەنگە کاتی خۆی ئەو ناوی گوڵی هەمیشە

بەهاری نابێت (بیلّیس پێرینیس Bellis perennis). بەهەرحاڵ، لایەنی کەم هەوڵی داوە لەم دونیا سەیروسەمەرەیە تێبگات کە هەموومان سەفەرێکی کورتخایەنی پێدا دەکەین.

لە ڕێگادا بەرەو ماڵەوە، سەرلەنوێ خۆم کردەوە بە مۆزەخانەی (پرادۆ)دا و چوومەوە سەر بەشی تابلۆکانی گۆیا. دەبووایە کەڕەتێکی تریش بەوردی تەماشام بکردایەتەوە، دەبووایە بمزانیبایە ئەو ڕۆژە دەموچاوی (ئانا ماریا مایا) چۆن بووە کە لە باخچەکانی (ئالکازار)دا دوای کورتەبنەکە کەوتبوو. دوو مانگێک لەوەوبەر (لا نینا دیل پرادۆ)م لە (تاڤیونی)دا بینی و لەو کاتەوە سیمای هیچێکی وا نەگۆڕابوو. لە (سالامانکا)شدا بۆ چەند ساتێکی کەم بینیم، ئەو کاتە بوو کە بەپەلە لە قاوەخانەکەدا هاتە دەرەوە، بەڵام کورتەبنەکە وێنەیەکی (ئانا)ی لە (گالیریا دیل گروتیسکۆ) وەرگرتبوو.

ئەو وێنەیەی بۆچی بوو؟

لە یەکێک لە باڕەکاندا پارووپەک نانم خوارد و بەرلەوەی بگەڕێمەوە بۆ ئوتێلەکە، بۆ ماوەیەک بە جادەکاندا خوولامەوە. دواجاریش کە گەیشتمەوە ژوورەکەم، چوومە لای پەنجەرەکەوە و لەوێوە سەیری (نیپتونۆ)م کرد کە دەکەوێتە ئەوبەری (ڕیتز) ەوە، هەروەها تەماشای بینای (پرادۆ)م کرد کە دەکەوێتە ئەوبەری (پاسیۆ دیل پرادۆ)وە. لەویادا دوو تابلۆی (ئانا ماریا مایا) هەڵواسرابوو.

ڕێک لەو کاتەدا بوو کە بڕیارم دا بەوپەڕی توانامەوە هەوڵ بدەم تا تۆش لەگەڵمدا بێیت بۆ ئیشبیلییە، هەربۆیە ناچار بووم لە پێشدا سەرتاپای ئەو چیرۆکە دووروودرێژەت بۆ بگێڕمەوە کە وا دوو ڕۆژ زیاترە لەم ئوتێلەدا دانیشتووم و دەیخنمە ناو (هارد دیسک)ی کۆمپیوتەرە دەستییەکەمەوە.

لەسەر مێزی نووسینەکەم دانیشتم، کۆمپیوتەرەکەم داگیرساند و نووسیم ئیمڕۆ ڕۆژی سێشەممەیە و (٥ی ئایاری ١٩٩٨)ە، ئیدی بەو شێوەیە بەش بە بەش دەستم بە نووسینی تێکستەکەم کرد. واتە بەرلەوەی پێشنیوەڕۆی دوێنێ، کە چوارشەممە بوو و لە پارکی (ڕیتیرۆ)دا چاوم بە خۆسێ کەوت، من دەستم بە نووسینی ئەم نامەیە کردبوو، دیسانەوە واتە بەرلەوەی هیچ شتێک دەربارەی بەسەرهاتی (ئیل پلانیتا) ببیستم و بزانم لە هاوینی (١٨٤٢)دا لە (مارسیلیا) چی بەسەرهاتووە، هەروەها بەرلەوەی هیچ شتێک دەربارەی ئەو ڕووداوە بزانم کە لە شەوێکی زستانی (١٧٩٠)دا لە بەندەری (کادیز)دا ڕوویداوە، من دەستم بە نووسینی ئەم نامەیە کردبوو.

له کاتی ئێستادا کە ئەم وشانە دەنووسم، ڕۆژی پێنج شەممەیە و ٧ی مانگی ئایارە، کاتژمێر چواری پاشنیوەڕۆیە. بۆ سەرلەبەیانی سبەینێش سواری شەمەندەفەر دەبم و بەرەو ئیشبیلییە دەکەومەڕێ. سەفتەیەک وێنەی فۆتۆگرافم لەبەردەستدایە، ئەو شتەی کە زیاتر مایەی سەرنج و سەرسوڕمانە خودی بابەتی وێنەکان نییە، بەڵکو ئەو وشانەیە کە ئانا لە پشتی هەر وێنەیەکدا نووسیونی. هەروەها لێکدانەوەیەکی یەکجار سەیرم بۆ ڕوون بووەوە و ئێستا دەزانم بۆچی ئانا هاوشێوەی ئەو پۆرترێتە بوو کە دوو سەد ساڵ لەمەوبەر کێشراوە.

بەکورتی وا دوو ڕۆژە خۆمم خزاندۆتە ژووری ئوتێلەکەمەوە، دوو ڕۆژ لەمەوبەر (خۆسێ)م لە باخی ڕووەکدا بینی و لەو کاتەوە گرنگیی ناردنی ئەم نامە ئەدەبییەم بۆ تۆ بەردەوام پەرە دەسێنێت. چیتر ناوێرم بیر لەوە بکەمەوە کە ئەم نامەیەت بەدەست نەگات، چونکە دەمەوێت بەیانی لەگەڵمدا بێیت بۆ ئیشبیلییە. دەبێت بێیت، هیواداریشم بەرلەوەی فریای خوێندنەوەی ئەم نامەیە بکەویت، بڕیارت دابێت کە بەیانی لەگەڵمدا بێیتە ئەوێ. لەبەرئەوە هەر ئێستا بڕیارم دا تەلەفۆنێکت بۆ بکەم، بەو شێوەیەش لە نامە دووردرێژەکەمدا ئەوەش دەنووسرێت کە من بەرلەوەی نامەکەت بۆ بنێرم، هەوڵم داوە پەیوەندیت پێوە بکەم، لەبەرئەوە بەوردی وشەکانت هەڵببژێرە، چونکە پاش نەختێکی تر هەمان ئەو وشانە دێنەوە سەر شاشەی کۆمپیوتەرەکەت.

ئێستاکە لەسەر مێزی نووسینەکەم دانیشتووم، گوشی تەلەفۆنەکەم بەرز دەکەمەوە و ژمارەی تەلەفۆنەکەی بەرشەلۆنەی تۆ لێدەدەم...

... بێگومان وشە بە وشەی قسەکانم لەیاد نییە، بەڵام من بەم شێوەیە ئەو تەلەفۆنەم لە خەیاڵدایە.

- ڤیرا.
- خۆمم.
- فرانک؟
- ئانا مردووە.
- دەزانم.
- چیت گوت؟
- دەزانم ئانا مردووە.
- بەڵام خۆ تۆ ئانا ناناسیت؟

- نەخێر، ڕاست دەکەیت نایناسم. من قەت ئەوم نەدیوە.
- بەڵام دەزانیت کە مردووە؟
- ئەمە چییە فرانک؟
- تۆ چۆن دەزانیت کە ئانا مردووە؟
- نازانم مەبەستت چییە. بەڕاستی هەر لە بنەڕەتەوە نازانم بۆچی تۆ سەرتاپای ئەم بابەتە دەوروژێنیت؟
- خۆشم نازانم... مەبەستم لەوەیە.. نازانم تۆ مەبەستت چییە.
- دە کەواتە بیبڕەوە.
- بە تەنیا لە ژووری ئوتێلێکدا دانیشتووم، وا نزیکەی دوو حەفتەیە لێرەم. پێویستم بە کەسێک بوو قسەی لەگەڵدا بکەم و پێی بڵێم ئانا مردووە.
- تۆ ژمارەی تەلەفۆنەکەی منت دابوو بەو؟
- بە کێ؟
- نازانم، خۆی بە (خۆسێ) ناساند.
- چی؟
- کەمێک لەمەوبەر پیاوێک تەلەفۆنی بۆ کردم و وتی تۆی لە پارکی (ڕیتیرۆ) بینیووە. دیارییەکیشی پێ بەخشیویت تا من و تۆ بەشی بکەین.
- وای گوت؟
- ئینجا وتی ئانا مردووە.
- بەڕاست وای پێ گوتیت؟
- واتە نازانی کە تەلەفۆنی بۆ کردووم؟
- نەخێر.
- ئەو (دیاری)یە چییە؟
- وتی ئەو دیارییە هی هەردووکمانە.
- ئەگەر هەر ئێستا پێم نەڵێیت ئەو دیارییە چیە، ڕێک تەلەفۆنەکە دادەخەمەوە.
- تێناگەم بۆچی ئەوەندە توڕەیت؟
- توڕە نیم.
- باشە توڕە نیت، بەڵام هەڵچوویت.
- نەخێر هەڵیشنەچووم، زۆر بە ساکاری وتم ئەو (دیاری)یە چییە.
- کۆمەڵێک وێنەی فۆتۆگرافە. لەگەڵ جۆرە (مانیفێست)ێکدا.

- لەگەڵ چیدا؟
- (مانیفێست)ێک.
- ئاوها. دە کەواتە هەر بۆ خۆت هەڵیبگرە فرانک.
- بەڕاستی نەمزانیبوو کە تەلەفۆنی بۆ کردوویت.
- بەڵام خۆ هەر هیچ نەبێت ئەوەیان دەزانیت کە تۆ ژمارەکەی منت داوەتێ.
- من هیچ شتێکم نەداوە بەو.
- خۆ لایەنی کەم ناوی منت پێ گوتووە.
- ڕەنگە ئەوەیانم پێ گوتبێت.
- گوتت (مانیفێست)؟
- بەڵێ، بەڵام من بۆ ئەوە تەلەفۆنم نەکرد تا باسی ئەوە بکەین.
- ئەی بۆ تەلەفۆنت کرد؟ بەڕاستی سەرم قاڵە دەزانی؟
- بیرتە چۆن پێکەنیت؟
- ...
- وەڵامت نەدامەوە.
- ئێوارەیەکی خۆش بوو فرانک. ببوورە کەمێک تورە بووم. مەبەستم لە کەمێک لەمەوبەرە. بێگومان وامدەزانی تۆ پێت گوتووە تەلەفۆنم بۆ بکات و باسی دیارییەکم بۆ بکات کە هی هەردووکمانە، تێدەگەیت؟ ئینجا پاش نیوسەعاتێکیش خۆت تەلەفۆنم بۆ دەکەیت.
- بەڕاستی بەهیچ شێوەیەک ئاگام لەوە نییە کە تەلەفۆنی بۆ کردوویت.
- بەڵێ ئەوەم باش لەیادە کە چۆن پێکەنیم. بێگومان وامدەزانی تۆ خۆت هەموویت هۆنیوەتەوە. ئاخر تۆ ئەو دوو شتەت لێ دەوەشێتەوە.
- ئەو دوو شتە؟
- مەبەستم لەوەیە کە هەم چیرۆک بهۆنیتەوە و هەم جۆرە برادەرێکت ڕابسپێریت کە تەلەفۆنم بۆ بکات و باسی (دیاری)یەکم بۆ بکات.
- ئینجا تۆ ئەو باسە ببڕەوە، ئەگینا من تەلەفۆنەکە دادەخەمەوە...
- ئەلو؟
- من لێرە شەو و ڕۆژ خەریکی نووسینی نامەیەک بووم بۆ تۆ.
- دەربارەی من و تۆیە؟
- دەربارەی (ئانا و خۆسێ)یە.

- فەرموو بینێرە بۆم. دڵنیابە دەیخوێنمەوە.
- بەڵام پەلەمە پەلە، تێدەگەیت؟ ئەم ئێوارەیە کۆمپیوتەرەکەت دادەگیرسێنیت؟ پێویستیم بە چەند سەعاتێکی ترە تا تەواوی بکەم.
- زۆرباشە، چاوەڕوانم.
- لە نامەکەمدا داوات لێ دەکەم چاکەیەکم لەگەڵدا بکەیت. تەنانەت ئەگەر ئەوە دوا شتیش بێت کە تۆ بۆ منی دەکەیت.
- ئەو شتە چییە کە ئەوەندە گرنگە؟
- ئاخر ئەگەر ئێستا پێت بڵێم، یەکسەر داواکەم ڕەت دەکەیتەوە.
- بیڵێ، بیڵێ.
- دەمەوێت لەگەڵمدا سەفەرێک بکەیت بۆ ئیشبیلییە، تا سبەی ئێوارە ئامادەی پرسەکەی ئانا ببین.
- ئێ خۆ لەوەوپێش داوای ئەوەت لێ کردم.
- بەڕاست؟
- ڕاستترێک بیڵێم، ئەو کەسەی تەلەفۆنی بۆ کردم داوای ئەوەی لێ کردم. ئێ بەلای منەوە لە دواجاردا هەردووکتان تا ئەندازەیەک هەر هەمان کەسن.
- داوای لێ کردیت بێیت بۆ ئیشبیلییە؟
- بەڵێ، چییە ئاگات لەوەشیان نییە؟
- نەخێر! ببوورە بەڵێ. هیچ شتێک لەو بارەیەوە نازانم. ڕەنگە ژمارەکەتی لە بەشی زانیاریی دائیرەی تەلەفۆنەوە وەرگرتبێت.
- وتم ناتوانم بەیانی بێم، چونکە ڕێک بەیانی سەرم زۆر زۆر قاڵە. فرانک، ئێ خۆ من ئەو ناناسم.
- بەڵام خۆ من دەناسیت.
- خۆشبەختانە ئەو کەسەی کە مردووە تۆ نیت.
- وابزانم لە پرسەکەی (سۆنیا)شدا خەڵکانێکی زۆر ئامادە بوون و قەتیش نەیاندیبوو.
- ئەوەیان شتێکی تەواو جیاواز بوو.
- هیچ جیاواز نییە، من دەڵێم ئانا برادەرێکی نزیکم بوو.
- باش تێدەگەم، بەڵام ئاخر من و تۆ چیتر پێکەوە ناژین.
- دێیت بۆ پرسەی دایک؟

- ئا ئێستا پێم وایە کەسێکی ترسناکیت!
- پێویست ناکات شەڕ لەسەر ئەوە بکەین کاممان لە کاممان ترسناکترین.
- من بەڕاستی نامەوێت شەڕ بکەم. هەر ئەوەندەیە کە من کۆتاییم بەو شتانە هێناوە. فرانک، من و تۆ ماڵئاواییمان لە یەکتر کردووە. تۆ کەی لەوە تێدەگەیت؟
- برادەرێکی نوێت هەیە؟
- لەسەر پردەکەش هەمان ئەو پرسیارەت لێ کردم. ئینجا دەستت کرد بە هۆنینەوەی چیرۆکە سەرنجڕاکێشەکانت.
- برادەرێکی نوێت هەیە؟
- پێم وا نییە مافی ئەوەت هەبێت پرسیارێکی لەو جۆرەم ئاراستە بکەیت.
- چەند ڕەزیلیت! هەر ئەوەندەیە دەمەوێت بزانم دەستگیرانت هەیە یان نا.
- نەخێر نیمە.
- بەڵێ؟
- نامەوێت کەڕەتێکی تر شوو بکەمەوە.
- چۆنە هێندە دڵنیایت؟
- بەهەرحاڵ، کۆمەڵێک برادەری باشم هەیە. ئومێدەوارم تۆش برادەری باشت هەبێت.
- لە ئیسپانیادا کەسم نییە. هەر لەبەرئەوەیە کە داوات لێ دەکەم لەگەڵمدا بێیت بۆ ئیشبیلییە. بێگومان هەموو مەسرەفێکیشت لەسەر من دەبێت.
- نازانم، فرانک.. بەڕاستی نازانم.
- کەواتە با ئێستا واز لەو بابەتە بهێنین، بەڵام پەیمانم دەدەیتێ ئەو نامەیە بخوێنیتەوە کە ئەم ئێوارەیە بۆت ڕەوانە دەکەم؟
- ئێ لەوەوپێش ئەوەیانم پێ گوتیت. هەرچۆنێک بێت کاتێکی هەر بۆ دەدۆزمەوە.
- زۆرباشە. کەواتە با بزانین دوای ئەوە ڕای خۆت دەگۆڕیت یان نا.
- دەربارەی چی دەنووسیت؟ هەر باسی ئەو شتانە دەکەیت کە لەسەر پردەکە پێت وتم؟
- تاڕادەیەک، بەڵام ئەو کاتە هیچێکی وام نەدەزانی.
- پەرۆش بووم. ناتوانیت هەروا پوختەیەکی بابەتەکەتم پێ بڵێیت؟
- نەخێر، ئەوەیان مەحاڵە. دەبێت سەرتاپای بابەتەکەت بەیەکەوە بەدەست بگات.

یان هەمووی یان هیچ، تێدەگەیت؟
– باشە، کەواتە تا ئەم ئێوارەیە چاوەڕوان دەبم.
– دەتوانم مەتەڵێکت پێ بڵێم؟ هەر تەنها بۆ ئەوەی شتێکت لەبەردەستدا بێت و تێی بڕوانیت.
– مەتەڵ؟
– چۆن ڕێی تێدەچێت مرۆڤێک، کە لە ئێستادا دەژی، کتومت سیمای وەک کەسێکی تر بێت کە دوو سەد ساڵێک لەمەوبەر ژیاوە؟
– نازانم، بەڕاستی نازانم چۆن ئەوە ڕێی تێدەچێت. ئێ خۆ هیچ کەسێک نازانێت سیمای ئەو کەسانە کتومت چۆن بوون کە دوو سەد ساڵێک لەمەوبەر ژیاون.
– ئاخر کۆمەڵێک پۆرتریتمان لەبەردەستدایە.
– فرانک، هیچ دوو کەسێک پڕاوپڕ لە یەکتر ناچن. لای خۆی تۆ زانستی بۆماوەت خوێندووە، یان چی؟
– وتم ئەوە مەتەڵە مەتەڵ.
– هیچت خواردۆتەوە؟
– سەرلەنوێ هەروا لە خۆڕا هەڵمەچۆرەوە.
– ئاخر ئەزانم تۆ بەرگەی خواردنەوەی زۆر ناگریت.
– دەزانیت تۆ کێم بیر دەخەیتەوە؟
– وتم خواردووتەتەوە؟
– تۆ مارمێلکەیەکم بیر دەخەیتەوە.
– بەسە بەس!
– مەبەستم لە مارمێلکەیەکی زۆر دیاریکراوە.
– لەوەدەچێت لە کاتی ئێستادا کەمێک باری دەروونیت تەواو نەبێت.
– تۆ باوەڕت بە کورتەبنە هەیە؟
– کورتەبنە؟!
– لەوە گەڕێ. پرسەکە لە (تریانا)یە، کاتژمێر (٩) ی ئێوارە لە کڵێسەی (سانتا ئانا) بەڕێوە دەچێت.
– با بزانین چۆن دەبێت. بەهەرحاڵ نووسینەکەت دەخوێنمەوە.
– لە ئوتێلی پالاس لامداوە.
– تۆ شێتیت شێت. پێم خۆشە چیتر یەک حسابمان نییە.

- بێگومان ئەگەر تا ئێستاش هەواڵی تۆم بەلاوە گرنگ نەبووایە، ئەوا نە نامەم بۆ دەنووسیت و نە پەیوەندیشم پێوە دەکردیت.
- خۆ ئەگەر منیش نیمچە هەستێکی وەهام بەرامبەر تۆ نەبووایە، ئەوا نەمدەهێشت تەلەفۆنێکی بێ مانای ئاوها هێندە درێژە بخایەنێت.
- کاتێکی خۆش، ڤیرا.
- هەروەها بۆ تۆش. بەڕاستی کەسێکی تایبەتیت. تۆ هەمیشە تایبەتی بوویت.

# کورتەبنەکە و وێنە ئەفسووناوییەکە

سەرلەبەیانی ڕۆژی چوارشەممە لەناو مۆزەخانەی (پرادۆ)دا بووم. کاتژمێر، کەمێک لە نۆ لایدابوو، یەک دوو خولەک بەسەر کردنەوەی مۆزەخانەکەدا تێپەڕیبوو. بەو ئومێدە چوومەوە ئەوێ کە دیسانەوە خۆسێ ببینمەوە، چونکە دواجار کە یەکتریمان بینی هیچ کات و شوێنێکی نوێمان دانەنا تا یەکتر ببینینەوە. بواری داهاتووی بەردەستم کڵێسەکەی (سانتا ئانا) بوو، لەویادا دەمتوانی بیبینم، بەڵام بێگومان خەڵکانێکی زۆری تریش ئامادە دەبوون.

سەرلەنوێ بەلای تابلۆی (باخچەی حەز و ویست)دا تێپەڕیمەوە، کەمێک لە هۆڵەکەدا مامەوە، چونکە دوێنێ لەویادا (خۆسێ)م بینی. ئیدی چوومە قاتی سەرەوە و پاش نەختێک لەبەردەم دوو (ماخا)کەدا خۆم بینییەوە. بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ هەروا وەستابووم چاوم بڕیبووە ناو چاوی ئانا، ئەویش بەهەمان شێوە تەماشی دەکردم و تاڕادەیەک ترسم لێ نیشت. لەویادا هێندە سەرسام نەدەبووم ئەگەر لەپڕێکدا چاوێکی لێ دابگرتمایە.

پاش سەعاتێک مۆزەخانەکەم بەجێهێشت، بەرەو سەرەوە بە شەقامی (فیلیپ)ی چواردا ڕۆیشتم، لە شەقامی جەنجاڵی (ئالفۆنس)ی دوانزە پەڕیمەوە و بەردەوام بووم بەرەو پارکی (ڕیتیرۆ). چیمەنی سەرتاپای پارکەکە پڕ بوو لە گوڵی (مەی) ی زەرد و سپی و سوور. گوڵی هەمیشە بەهار، بیلیس پێرینیس، هەرێزەکەی تەنیبوو. هەروا بێهوودە بۆ ماوەیەک بەو پارکە گەورەیەدا خوولامەوە، کۆمەڵێک منداڵم بینی جلی قوتابخانەیان لەبەردا بوو، کۆمەڵێک قوتابی گەنجی کوڕ و کچ دوو دوو دەسوڕانەوە، تەماشای کەسانی بەتەمەن و خانەنشینم کرد، توشی چەند داپیرە و باپیرەیەکیش بووم کە منداڵی بچکۆلەیان لەگەڵدا بوو، زۆربەیان کیسەیەک خواردنیان لەگەڵ خۆیاندا هێنابوو بۆ سمۆرەکانی پارکەکە. لەبەر دیدەی مندا جۆرە دژایەتییەکی ڕوون لەنێوان دوو شتدا هەبوو: لەلایەکەوە ژیانی ڕاستەقینەی ڕۆژانە وەک حەکایەتێکی بێ وێنە دەهاتە بەرچاوم و لەلایەکی تریشەوە وا دیاربوو ئەو کەسانە ژیانیان هەر زۆر بە شتێکی ئاسایی وەرگرتبێت. لەویادا قسەیەکم بیرکەوتەوە کە لە تاڤیونیدا بەرگوێم کەوت، نازانم ئانا بوو یان خۆسێ بوو کە وتی: « ئێستاکە

پەرییەکان لەنێو حەکایەتەکەدان، هەربۆیە ناتوانین بە وشە گوزارشتیان لێ بکەین.
ئەگەر خۆیان توانایان هەبووایە کە خۆیان ببینن، بڵێیت ئەو کاتە حەکایەتەکەیان ببووایەتە حەکایەتێکی ڕاستەقینە؟! بڵێیت ژیانی ڕۆژانە شتێکی ناوازە و تایبەت بووایە؟! ئەگەر بەردەوام بەڕوونی لە ماناکەی بگەیشتینایە؟»».
بڕیارم دا سەرلەنوێ بڕۆمەوە بۆ پرادۆ، بەڵام لە پێشدا لەسەر کورسییەکی پارکەکە دانیشتم، لەنێوان بێستانی گوڵ و دەوەنی ڕازاوەی پارکەکەدا دانیشتم. لەناکاوێکدا خۆسێ لەبەردەممدا قوت بووەوە، هەر دەتگوت یەکێک پێی گوتووە کە من ڕۆژانە پیاسەیەک بە پارکی (ڕیتیرۆ)دا دەکەم.
لە تەنیشتمەوە دانیشت و پێکەوە دوو سەعات لەویاداماینەوە. ڕۆژنامەیەک و زەرفێکی زەردی گەورەی بەدەستەوە بوو. پێی وتم کە دەیەوێت کاتژمێر دوانزە فریای شەمەندەفەری ئیشبیلییە بکەوێت، منیش سەرلەنوێ دڵنیام کردەوە کە ڕۆژی هەینی ئامادەی پرسەکەی ئانا دەبم، بەڵام پێم نەگوت کە ڕەنگە تۆش ئامادە بیت، ئەو ئومێدەم بە نهێنی لەلای خۆم هێشتەوە. وابزانم کاتێک کە لە دوورگەکانی فیجی بووین، ناوی تۆم هێنا، بەلایەنی کەمەوە بیرمە ناوی لەقەبی تۆم بە جۆن گوت، ئەو کاتەی من سەفەرم کرد، ئەو لە (ماراڤیو)دا مایەوە.
یەک دوو خولەک تێپەڕی و خۆسێ هەر هیچی نەگوت. لەویادا هەر دەموچاوی زەرد هەڵنەگەڕابوو، بەڵکو کەم تا زۆر تەواوی شکڵی هەر لە تارماییەک دەچوو. بیرمە لەو کاتەدا (ئۆرفیۆس)م بیرکەوتەوە کە لە مەملەکەتی مەرگەوە دەگەڕێتەوە، بەڵام بەبێ (یوریدیس)ی خۆشەویستی.
دواجار من بێدەنگییەکەم شکاند و وتم:
– دیارە ڕۆژانێکی سەخت بەسەردەبەیت.
ئەو شتانەی گووشی کە بە دەستییەوە بوون.
درێژەم بە قسەکەم دا و وتم:
– من زیاترێک بیرم لەو لێکچوونە سەرسوڕهێنەرەی نێوان ئانا و ئافرەتی ناو تابلۆکەی گۆیا کردەوە. هەوڵ دەدەم قەناعەت بە خۆم بهێنم کە تەنها ڕێکەوتێکە و هیچی تر.
سەرێکی بۆ لەقاندم. لەوەدەچوو بەرلەوەی بیەوێت وەڵامم بداتەوە، ئەندێشەکانی کۆبکاتەوە. وتم:
– بەڵام تۆ خۆت گوتت کە ئانا و کەسوکارەکەی لێکدانەوەیەکی تەواو جیاوازیان

هەبووە، وا نییە؟

دیسانەوە سەری بۆ لەقاندمەوە و وتی:

- ئەوان ئەو لایەنەیان بە چیرۆکێکی کۆنەوە گرێ دەدایەوە. چیرۆکێک، کە بە بڕوای من تا ئەندازەیەک ڕێی تێناچێت و هەڵبەستراوە. لە شتێکەوە دەست پێ دەکات کە گوایە کاتی خۆی لە فەرەنسادا بەسەر (ئیل پلانیتا)دا هاتووە.

وتم:

- تکایە بۆم باس بکە، تکایە.

- دەڵێن گوایە (ئیل پلانیتا) لە بەهاری ساڵی (١٨٤٢)دا بە مەبەستی حەجکردن لە (کادین)ەوە بەرەو مەزاری پیرۆزی (مارییاس دی لا میر Maries de la mer) ڕۆیشتووە کە دەکەوێتە دوورگەی (کامارگیو Camargue)، لەویادا ڕووباری (ڕۆون) دەڕژێتە ناو دەریاوە. وەک دەڵێن لە ڕۆژی (٢٦) ئایاری هەمان ساڵدا گەیشتۆتە شاری (مارسیلیا)، لەویادا بۆ ماوەیەکی کەم وەک کرێکارێکی بەندەر کاری کردووە تا پارەی گەڕانەوەی بۆ شاری خۆی پەیدا بکات. بەپێی قسەی ئەوان دەڵێن پاش دوو حەفتەیەک شتێکی وای بینیووە کە لەو کاتەوە و تا ئێستاش نەوە لەدوای نەوە بۆ یەکتری دەگێڕنەوە. من خۆم هەر کەمێک پاش ئەوەی ئانا و کەسوکارەکەیم ناسی، ئەو چیرۆکەم بەرگوێ کەوت. گرنگە بڵێم ئەو چیرۆکە بە چەندەها شێوازی جیا جیا دەگێڕدرێتەوە، بەتایبەتیش لە خێزانی (مایا)دا. هەڵبەتە لێرەدا باس لە نەریتێک دەکەین کە دەماودەم گواستراوەتەوە، بگرە تاڕادەیەک بەتەواوەتی دەچێتە بازنەی ئەفسانەوە. من نەمتوانی هیچ دیکۆمێنتێکی نووسراو دەربارەی ئەم نەریتە ئەندەلوسییە بدۆزمەوە، تەنانەت لەم ساڵانەی دواییشدا هیچ شتێک لەو بارەیەوە نەنووسراوە، بەڵام دەڵێن گوایە چیرۆکێکی تری سویسریش هەیە و لەوەدەچێت ڕێک هێندەی ئەو چیرۆکە ئەندەلوسییە کۆن بێت. بەهەرحاڵ هەوڵ دەدەم پوختەی چیرۆکەکەت بۆ بگێڕمەوە.

- فەرموو.

- پاشنیوەڕۆیەکی درەنگی یەکێک لە ڕۆژەکانی سەرەتای مانگی شەشی ساڵی (١٨٤٢)، (ئیل پلانیتا) لە بەندەری مارسیلیادا لەبەردەم بەلەمێکی بچکۆلەدا وەستاوە کە بە مەبەستی بارداگرتن لە بەندەرەکەدا لەنگەری گرتووە. بەئاشکرا دیار بووە کە بەلەمەکە لە کاتی دەریاوانیدا توشی ڕەهێڵە و ئاو و هەوایەکی توندوتیژ بووە، بەڕاست، دەڵێن گوایە ئەو بەلەمە بەلەمێکی نەرویجی بووە. هەر پێش ئەوەی

پەیژەی پیا هەڵبسپێرن، پیاوێکی بچکۆلە لەناو بەلەمەکەوە بەسەر قەراغەکەیدا خۆی شۆڕ کردۆتەوە و خۆی هەڵداوەتە خوارەوە بۆ سەر وشکانی. ڕایکردووە و خۆی لەنێوان کۆگاکانی بەندەرەکەدا ون کردووە.

- پیاوێکی بچکۆلە؟

- کورتەبنەیەک. کورتەبنەیەک کە بەرگی موهەریجی لەبەردا بووە، هەروەک موهەریجێکی سەردەمی پاشایی جاران. وەک دەڵێن بەدلەیەکی وەنەوشەیی لەبەردا بووە و کڵاوێکی سەوز و سووری لەسەردا بووە کە چەند پارچە قوماشێکی درێژکۆلەی پێوە بووە. زەنگۆڵەی وردوردیش هەم بە کڵاو و هەم بە بەدلەکەشیەوە بووە، کاتێک کە ویستویەتی لەنێوان کۆگاکانی بەندەرەکەدا خۆی بشارێتەوە، زرنگەیان لێ بەرز بۆتەوە. پاشانیش لەپڕێکدا ون بووە. خەڵکانێکی زۆر لەسەر ئەو بەندەرە بینیویانە، پرسیاریان لە دەریاوانەکانی ئەو بەلەمە کردووە و ویستویانە بزانن ئەو پیاوە بچکۆیە کێ بووە.

- ئەی ئەوان چییان گوتووە؟

- بەلەمەکە خۆی لە کەنداوی مەکسیکەوە هاتووە، لە شوێنێکی خوارووی (بەرمۆدا) دا ئەو کورتەبنە بێدەنگە و دەریاوانێکی ئەڵمانییان هەڵگرتۆتەوە کە لەناو بەلەمێکی بچکۆلەدا بینیویانن. دەریاوانە ئەڵمانییەکە گوتوویەتی کە ئەوان لەسەر بەلەمی چارۆکەداری (ماریا) بوون، کە چەند ڕۆژێک لەوەوبەر تێکشکاوە و پێشی وابووە کە لە پاش نغرۆبوونی بەلەمەکەیان تەنها ئەو دوو کەسە ڕزگاریان بووبێت.

- لەوە زیاتری نەگوتووە؟

- نەخێر، دەریاوانە ئەڵمانییەکەش کەسێکی زۆر زۆر کەمدوو بووە. بەدەر لەوەش نە زمانی فەرەنسی زانیووە و نە ئیسپانیش، هەر پاش نەختێکیش ئەویش هەروەک کورتەبنەکە ون بووە. بەپێی یەکێک لە چیرۆکەکان گوایە ئەو پیاوە دواتر وەک نانەوایەک لە یەکێک لە لادێکانی ناوچە شاخاوییەکانی سویسرادا ژیانی خۆی دامەزراندووە.

- ئیدی پاشان هیچ کەسێک ئەو دووانەی نەدیوەتەوە؟

- تەنها کورتەبنەکە بینراوەتەوە. (ئیل پلانیتا) لە بەندەرەکەدا لەنێوان کۆگاکاندا ژیاوە، چونکە وەک وتم ویستویەتی کەمێک پارە کۆبکاتەوە و بگەڕێتەوە بۆ (کادین). پاش ئەوەی شتومەکی ناو بەلەمەکەیان داگرتووە، گەڕاوەتەوە نێو کۆگاکان تا بخەوێت، بەڵام لە ڕێگایدا لەنێوان چەند بەرمیلێکی بەتاڵی شەرابدا گوێی لە کەسێک

بووه بەکوڵ گریاوە. (ئیل پلانیتا)ش بەرەو شوێنەکە ڕۆیشتووە و لەویادا کورتەبنە بەدبەختەکەی بینیووە.

– ئەی ئەو چی گوتووە؟

– ئەو تەنها زمانی ئەڵمانی زانیووە، قەرەجەکەی (کادین)یش زۆر کەمی لێ تێگەیشتووە، لە ڕاستیدا هەردووکیان وەک یەک بڕێکی زۆر کەم لە زمانی یەکتر گەیشتوون، بەڵام هەموو چیرۆکەکان کە باسی ئەو پێکگەیشتنەی (ئیل پلانیتا) و کورتەبنەکە دەکەن، دەڵێن پیاوە بچکۆلەکە ویستویەتی شتێک بشارێتەوە.

– چی بشارێتەوە؟

– بەدلەی موهەریجییەکەی. بەپێی چیرۆکەکە شاردنەوەی ئەو بەدلەیە زۆر گرنگ بووە بەلای کورتەبنەکەوە، هەروەک چۆن کەسێک کە لە زیندانێک هەڵدێت و شاردنەوەی بەدلەکەی بەلاوە گرنگە، ئەویش هەمان هەستی هەبووە. کورتەبنەکە نەیویستووە بناسرێتەوە، بەتایبەتیش وەک موهەریجێک. وەک دەڵێن ئیل پلانیتا چاکەتێکی کورتی بەقەرز داوەتێ و لەوەبەدواوە هەموو شوێنپێکانی کورتەبنەکە لە مارسیلییادا ون دەبێت.

– ئەی ئیل پلانیتا قەت چاوی پێ نەکەوتۆتەوە؟

– لێرەدا کۆمەڵێک چیرۆکی جیاوازمان هەیە. هەندێک لە چیرۆکەکان دەڵێن گوایە (ئیل پلانیتا) و کورتەبنەکە بۆ ماوەی چەند ڕۆژێک لەنێوان کۆگاکانی بەندەرەکەدا پێکەوە ژیاون و ئێوارەیەکیان کورتەبنەکە ویستویەتی چیرۆکی خۆی لە ڕێگەی ئیشارەت و هێڵکارییەوە بۆ بگێڕێتەوە.

– هێڵکاری؟

– کورتەبنەکە وێنەی دەستەیەک وەرەقەی یاری کێشاوە، هەڵبەتە لەسەر جۆری فەرەنسی کە کوپ و دینار و سینەک و قەرەی تێدایە. ئینجا، بێگومان بە زمانی ئەڵمانی، شیعرێکی بچکۆلەی بۆ هەر یەکێک لەو (٥٢) وەرەقەیە خوێندۆتەوە. ئیل پلانیتا هەندێک لەو شیعرانەی لەیاد بووە، هەرچەندە بە زمانێک بووە کە لێی تێنەگەیشتووە. تەنها یەک وێنەی ئیل پلانیتا ماوەتەوە، لە ڕاستیدا نەخشێکە کە (د. ف. لامییر) لەسەر لەوحێکی مس دایڕشتووە، دەڵێن گوایە لەو وێنەیەدا ئیل پلانیتا وەک جۆکەرێک خۆی نیشان داوە، واتە وەک موهەریجێکی سەردەمی پاشایی جاران. بەهەرحاڵ تەنها شتێک کە بەدڵنیاییەوە دەزانرێت، ئەوەیە کاتێک کە گەڕاوەتەوە بۆ ئیشبیلییە باسی ئەو کورتەبنە پڕ نهێنییەی گێڕاوەتەوە. دەشزانین

ئەو چیرۆکە چیرۆکێکی باو بووە کاتێک کە باپیرە هەرەگەورەکەی ئانا کتومت (٥٢) ساڵ دوای ئەوە، لە مانگی شەشی (١٨٩٤)دا، شتێکی یەکجار سەرسوڕهێنەری بەسەردا هاتووە.

وتم:

- واتە (١٠٤) ساڵ لەمەوبەر.

- بەڵێ، (١٠٤) ساڵ لەمەوبەر. باپیرە هەرەگەورەکەی ئانا ناوی (مانۆئیل) بووە و ئەویش هەروەک باپیرە هەرەگەورەکەی خۆی، گۆرانیبێژێکی بەناوبانگ بووە، لە گەڕەکی (تریانا)دا ژیاوە، ئەو گەڕەکەی کە دواتر ناوی (ئیل باریۆ جیتانا)یان لێ نا. مانۆئیل لەو کاتەدا ژیاوە کە پێی دەڵێن سەردەمی ئاڵتونی فلامینکۆ، لەو کاتەدا بوو کە لە ئیشبیلییەدا قاوەخانەی تایبەت بە گۆرانی گەشەی سەند. ئەمیش وەک کەسێکی ئەفسانەیی خێزانەکە تەماشا دەکرێت و لەقەبی (ئیل سۆلیتاریۆ)یان لێ ناوە و پێیان گوتووە (مانوئێل ئیل سۆلیتاریۆ). ڕەنگە وەک کەسێکی چڵەکێش تەماشایان کردبێت، هەربۆیە ئەو ناوەیان لێ ناوە، یان وەک کەسێک بینیبێتیان کە حەزی لە ڕامانی قووڵ بووە، خۆ پێشی دەچێت لەبەر تەنهاییەکەی ئەو ناوەیان لێ نابێت، چونکە کۆمەڵێک لە گۆرانییەکانی دەربارەی تەنهایی مرۆڤە. هەروەها دەڵێن دەستێکی باڵای لە یاریی کاغەزدا هەبووە و حەزی لە یاری خوێندنەوەی بەخت بووە کە بە وەرەقەی یاریی کاغەز دەکرێت. دەڵێن گوایە لە کۆمەڵێک بواردا کارامە بووە، بەتایبەتی لە خوێندنەوە و پێشبینیکردنی کاغەزەکاندا. ڕەنگە هەر بەهۆی ئەو وەرەقەی یارییانەوە بووبێت کە...

خۆسێ لەپڕێکدا بێدەنگ بوو، لەوەدەچوو شتێکی گرنگی لەیاد چووبێت و باسی نەکردبێت. ویستم بیهێنمەوە ناو بابەتەکە و پرسیم:

- ئەو وەرەقەی یارییانە چی بوون؟

وتی:

- وا باشترە لە شوێنێکی ترەوە دەست پێ بکەم.

- ئەگەر دواجار چیرۆکەکە ڕوون ببێتەوە، ئەوا لە هەر شوێنێکەوە دەست پێ بکەیت وەک یەکە، هیچ گرنگییەکی نییە.

لەسەر قسەکانی بەردەوام بوو:

- ئێوارەیەکی هاوینی ساڵی (١٨٩٤)، مانوئێل ئیل سۆلیتاریۆ بەلای قەراغ ئاوی (گوادالکیوڤیر Guadalquivir)دا ڕۆیشتووە. بەهیچ جۆرێکیش ئەوە یەکەمجاری

نەبووە بەویادا بڕوات، ئەو هەموو ئێوارەیەک لەدوای ئەوەی لە قاوەخانەی (سیلڤیریۆ فرانکۆنیتی) گۆرانی چڕیووە، لەو بەشەی ئیشبیلییەدا پیاسەیەکی کردووە. دایکی (سیلڤیریۆ) بە ڕەچەڵەک قەرەج بووە، بەڵام قەرەجەکانی ئیشبیلییە (سیلڤیریۆ) یان بە (نا- قەرەج) داناوە، یان هەروەک خۆیان پێیان دەڵێن (پایۆ payo). ئەو کاتە شتێکی زۆر نوێ بووە کە (پایۆ)یەک گۆرانیی قەرەجی بڵێت...

لەدوایەوە گوتمەوە:

- ئێوارەیەکی هاوینی ساڵی (١٨٩٤)، مانوئێل ئیل سۆلیتاریۆ بەلای قەراغ ئاوی (گوادالکیوڤیر)دا ڕۆیشتووە.

- وەک دەگێڕنەوە گوایە ئەو ئێوارەیە لەناو تاریکیی خواری خوارەوەی قەراغ ئاوەکەدا تارمایی کەسێکی سەیری بینیووە. وردترێک شوێنەکەی دیاری بکەم، لەو بەشەی (تریانا)دا بینیویەتی کە دەکەوێتە نێوان هەردوو پردی (پیونتی دی ترینتا) و (پیونتی سان تیلمۆ)، هەر ڕێک لە نزیک کڵێسەی (سانتا ئانا)وە. ئەگەر بوارم بۆ بڕەخسێت لە کۆتایی ئەم حەفتەیەدا ئەو شوێنەت نیشان دەدەم، چونکە تا ئێستاش ناوچەی (بیتیس) ئەوە دەهێنێت کە ئێواران پیاسەیەکی تێدا بکەیت. لەوێوە بەسەر ڕووبارەکەدا دیمەنێکی قەشەنگی هەردوو گۆڕەپانی (زۆرانبازیی گا)ی (تۆرە دی ئۆرۆ) و (لا گیرالدا) دێتە بەرچاو. بەکورتی، وەک دەڵێن ئەو تارماییەی ناو تاریکییەکە کورتەبنەیەک بووە.

بەدەست خۆم نەبوو، لەویادا بە دەنگی بەرز وتم:

- دیسان؟

- لێرەدا دەبێت ئەوەت لەیاد بێت کە مانوئێل ئاشنای چیرۆکە کۆنەکە بووە و زانیویەتی کە کاتی خۆی ئیل پلانیتا لە مارسیلیادا چاوی بە کورتەبنەیەک کەوتووە...

- بەڵام بێگومان ڕێی تێناچێت کە هەر هەمان کورتەبنە بووبێت.

بۆ ساتێک خۆسێ هەروا بە بێدەنگی چاوی بڕیبووە پارکەکە. ئینجا زۆر بەهێواشی کەوتەوە قسەکردن، هەر دەتگوت قسە بۆ خۆی دەکات نەک بۆ من، وتی:

- نەخێر، بێگومان نابێت هەر هەمان کورتەبنە بووبێت.

- ئاخر ئەگەر هەر هەمان کورتەبنە بووبێت، ئەوا دەبێت هەر زۆر زۆر بەتەمەن بووبێت.

خۆسێ سەری ڕاوەشاند و وتی:

- بەتەمەن نەبووە. هەروەک دەگێڕنەوە دەڵێن گوایە مانوئێل وەستاوە و تەماشای کردووە، چونکە، بەپێی قسەی داپیرە هەرەگەورەی ئانا، لەویادا سەفەرەکەی (ئیل پلانیتا)ی بیر کەوتۆتەوە کە کاتی خۆی بەرەو شاری مارسیلییا کردوویەتی. ئینجا کورتەبنەکە پەنجەی دۆشاومژەی چەپی بۆ ڕاوەشاندووە، هەر کتومت وەک وێنەی سەر لەوحە مسینە دێرینەکەی ئیل پلانیتا، لەویادا ئەویش پەنجەی دۆشاومژەی چەپی بەرز کردۆتەوە. ڕۆیشتۆتە خوارەوە بۆ لای کورتەبنەکە، بینیویەتی قاتێکی هەر زۆر ئاسایی لەبەردا بووە، هەروەک جلوبەرگی باوی ئەو کاتەی (پایۆ)کانی پۆشیوە. لەویادا کورتەبنەکە وتوویەتی: «لەوەدەچێت پیاسە بکەن»، ئیدی ئەو وشانە سەرەتای گفتوگۆیەکی گەرموگوڕیان لەنێوان کورتەبنەکە و (مانوئێل ئیل سۆلیتاریۆ)دا دامەزراندووە.

- کەواتە ئەو کورتەبنەیە زمانی ئیسپانی زانیووە؟

- بەڵێ نەک هەر زانیویەتی، بگرە بە لەهجەیەکی نزیک لە ئەندەلوسیش قسەی کردووە، ئەوەش خۆی لە خۆیدا بەشێوەیەک لە شێوەکان بەڕوونی نیشانی دەدات کە نە لە ئیشبیلییەدا لەدایک بووە و نە لە ئەندەلوس و نە لە هیچ شوێنێکی تری نیمچەدوورگەی (ئیبری)شدا هاتۆتە دونیاوە.

- ئەی باشە باسی چیان کردووە؟

- چاوەڕوان مەبە لەو بارەیەوە شتێکی هێندە زۆر بزانیت، چونکە لێرەدا ئێمە باس لە گفتوگۆیەک دەکەین کە پتر لە سەد ساڵ لەمەوبەر ڕوویداوە. بەدەر لەوەش دەمەوێت جەخت لەسەر ئەوە بکەمەوە کە من چەندین شێوازی جیاوازی ئەو گفتوگۆیەم بەرگوێ کەوتووە و هەر لە بنەڕەتدا من وشەی (گفتوگۆ) بە وشەیەکی پڕاوپڕ دانانێم بۆ ئەو شێوازەی کورتەبنەکە دەربارەی بنەچە و ئەسڵ و فەسڵی خۆی باسی کردووە. کچی مامەکانی ئانا و چەند خزمێکی تریشی ئەو چیرۆکەیان بۆ گێڕاومەتەوە، بەڵام تا ئێستاش دوو جار کتومت ئەو چیرۆکەم وەک یەک گوێ لێ نەبووە.

- کەواتە خۆت یەکێکیان هەڵبژێرە، یاخود هەموویانم بۆ بگێڕەوە.

- تێکەڵەیەکیانت بۆ دەگێڕمەوە. دەمەوێت بەکورتی باس لەو خاڵانە بکەم کە هەموو چیرۆکەکان تەبان لەسەری. ئێ وەک دەزانیت خۆ کاتێکی بێ سنووریشمان لەبەردەستدا نییە.

بێگومان دەمویست هەتا بکرێت زیاترێکم لەو بارەیەوە بۆ بگێڕێتەوە، هەر لەویادا

لەوە دەترسام لەپڕێکدا بڵێت (کاتم نەما)، هەروەک چۆن لەوەوپێش لە باخی ڕووەکدا ڕوویدا. هەتا دەهات زیاتر و زیاتر ئەو ئیسپانییە قژ زەرد و چاوشینەم وەک نهێنییەک دەهاتە بەرچاو و هەستم دەکرد کەمتر و کەمتر تێی دەگەم.

وتم:

- بەردەوام بە.

- کورتەبنەکە وا خۆی نیشان دەدات کە هەمان ئەو کورتەبنەیە بێت کە (٥٢) ساڵ لەوەوبەر چاکەتێکی لە ئیل پلانیتا قەرز کردووە، هەروەها دەڵێن گوایە یەکسەر زانیویەتی کە لەگەڵ منداڵی منداڵی (ئیل پلانیتا)دا قسەی کردووە. بەدەر لەوەش وەک بەڵگەیەک بۆ سەلماندنی ڕاست و دروستی قسەکانی، چاکەتێکی زۆر کۆنی لە کیسەیەکدا دەرهێناوە و داویەتی بە مانوئێل. لەو کاتەشدا کە کیسەکەی کردۆتەوە، مانوئێل لەژێر چاکەت و پانتۆڵەکەیەوە گوێی لە زرنگەی زەنگۆڵەکانی بووە.

- بەڵام کورتەبنەکە زۆر پیر نەبووە؟

خۆسێ سەری بۆ ڕاوەشاندم و وتی:

- لە هەرەتی گەنجێتیدا بووە.

وتم:

- خەریکە جۆرە پەیوەندییەکم لەنێوان ئەم چیرۆکە و (ئانا)دا بۆ ڕوون دەبێتەوە، بەڵام کورتەبنەکە چی تری گوتووە؟

- ڕاستە ئەو بەلەمەی کە گەیشتۆتە مارسیلیا، لە شوێنێکی خوارووی بەرمۆدادا ئەم و دەریاوانە ئەڵمانییەکەیان لەناو بەلەمێکی بچکۆلەدا بینیوە و هەڵیان گرتوونەتەوە، بەڵام لەدوای نغرۆبوونی کەشتییەکەوە ڕزگاریان نەکردوون.

- ئەی کەواتە لەناو بەلەمێکی بچکۆلە و لە ناوەڕاستی ئۆقیانووسێکدا چیان کردووە؟

- کورتەبنەکە لە دوورگەیەکی بورکاناویدا ژیاوە کە لەپڕێکدا نوقمی ئۆقیانووس بووە. بەرلەوە بە چەند ڕۆژێک، دەریاوانە ئەڵمانییەکە کەشتییە چارۆکەدارەکەی خۆی کە ناوی (ماریا) بووە، تێک دەشکێت و خۆی دەگەیێنێتە سەر ئەو دوورگەیە.

- ئەی کورتەبنەکە؟

- کورتەبنەکە لە ساڵی (١٧٩٠)دا لەگەڵ دەریاوانێکی تردا گەیشتۆتە سەر ئەو دوورگەیە. لەویادا بۆ ماوەی (٥٢) ساڵی ڕەبەق ژیاوە و ئینجا لێی دوور کەوتۆتەوە، ئەویش پاش ئەوەی عەرزەکەی شەقی بردووە و دواجاریش نغرۆی ئۆقیانووس

بووە.
وەک ئەوەی قەشمەریم بە قسەکانی بێت، کەمێک پێکەنیم و وتم:
- وایە. کەواتە کورتەبنەکە (١٠٤) ساڵ بەرلەوەی مانوئێل لە ئیشبیلییەدا ببینێ، لەسەر ئەو دوورگەیەی ئۆقیانووسی ئەتڵەسیدا ژیاوە. کە ئەویشی بینیووە هەر لە هەڕەتی گەنجێتیدا بووە.
تەنانەت بزەیەکی بچکۆلەشم لەسەر سیمای خۆسێدا نەدی، بگرە بەپێچەوانەوە لەسەر قسەکانی بەردەوام بوو و وتی:
- (٥٢) ساڵ دواتر، لە شەوێکی مانگی شەشی ساڵی (١٩٤٦)دا، سەرلەنوێ ئەو کورتەبنەیە لە گۆڕەپانی (ڤیرجین دی لۆس ڕیییس)دا لەبەردەم کاتیدرالییەکەی ئیشبیلییەدا بینراوەتە. مامی باوکی ئانا سوێندی خواردبوو کە لەویادا بینیبووی. لەو گۆڕەپانەدا، بەهۆی (لا گیرالدا) و دیوارە بەرزەکانی چواردەوری (ئالکازار)ەوە، هەموو شتێک دەنگ دەداتەوە. گوایە لەویادا زۆر بە بەرزی گوێی لە زرنگەی چەند زەنگۆڵەیەکی بچووک بووە و موهەریجە بچکۆلەکەی بینیوە بەپەلە بە گۆڕەپانەکەدا ڕایکردووە بەرەو (ئارشیڤۆ دی ئیندیاس) و (پیورتا دی جیریس).
تا ئەویاش خۆسێ هەر زۆر بە جیددی قسەی دەکرد. بۆ ساتێک وامزانی پێم ڕادەبوێرێت. لە دڵی خۆمدا وتم: «خۆ ڕەنگە شێتیش بووبێت، یان پێدەچێت دەستێکی باڵای لە هەڵخەڵەتاندندا هەبێت، ئەگەر وابێت، کەواتە لەوانەیە مردنەکەی (ئانا)ش ڕاست نەبێت». وتم:
- دەترسم ئێستا بڵێیت هەر هەمان ئەو کورتەبنەیەش بوو کە ئانا لە باخچەکانی (ئالکازار)دا بەدوایدا ڕایکرد؟
پەنجەی دۆشاومژەی دەستی ڕاستی خستە سەر دەمی و سەری بۆ ڕاوەشاندم. ئینجا وتی:
- ئانا پێی وابوو ئەو بووبێت و تەواو دڵنیابوو کە هەمان ئەو کورتەبنەیە بێت. ئەو کاتەش کە لە باخچەی شاعیراندا گەیشتمە لای، یەکسەر بە چرپەچرپێک وتی: «گوێم لە زەنگۆڵەکانی بوو». بەر لە مردنیشی، چەندین کەڕەت ئەو ڕستەیەی دووبارە کردەوە. ئێستاکە ئێمە لە ساڵی (١٩٩٨)داین و کتومت (٥٢) ساڵ بەسەر ساڵی (١٩٤٦)دا تێپەڕیووە.
کەوتمە حسابکردن و بۆم دەرکەوت چیرۆکی ئەو کورتەبنەیە هەر (٥٢) ساڵ کەڕەتێک دەردەکەوێتەوە. بە گاڵتەوە وتم:

- کەواتە با چاوەڕوان بین و بزانین لە ساڵی (٢٠٥٠)دا چی ڕوودەدات. پێم خۆشە بزانم تۆ خۆت بڕوات بەو چیرۆکانە هەیە؟

وا هاتە بەرچاوم کە نەیەوێت ڕاستەوخۆ وەڵامم بداتەوە، چونکە دیسانەوە وتییەوە:

- ئانا پڕاوپڕ بڕوای پێ بوو. بەدرێژایی ژیانی پەرۆشی ئەوە بوو بزانێت ڕێک لەم ساڵدا چ شتێک لە ئیشبیلییەدا ڕوودەدات.

- تۆ گوتت مانوئێل لەدوای شەڕێکەوە مردووە؟

- دوو ساڵ پاش ئەوەی لە ئیشبیلییەدا کورتەبنەکەی بینیووە، ئینجا مردووە. مانوئێل یاریی کاغەزی لەگەڵ چەند برادەرێکیدا کردووە و بەردەوام بردوویەتیەوە. پێی خۆش بووە وا خۆی نیشان بدات کە جادووگەرە، کە توانایەکی تایبەتی هەیە و زۆر بەئاسانی دەتوانێت هەمیشە بیباتەوە. ئینجا لەویادا هەموو چیرۆکەکانی کورتەبنەکەیان بۆ دەگێڕێتەوە: هەر لەو کاتەوەی کە لەسەر دوورگەکە دەبێت کە نغرۆی دەریا دەبێت تا ئەو کاتەی ئیل پلانیتا دەبینێت، هەروەها چیرۆکەکەی خۆشی دەگێڕێتەوە کە لە قەراغ ئاوی (گوادالکیوڤیر)دا کورتەبنەکەی بینیووە.

- باسی هیچ شتێکی تری گێڕاوەتەوە کە تۆ تا ئێستا باست نەکردبێت؟

- باسی ئەسڵ و فەسڵی کورتەبنەکەشی کردووە...

- ئاوها؟

- ... هەر ڕێک لە کاتی گێڕانەوەی ئەو خاڵەدا بووە کە ئەو شەڕە شوومە لە (تریانا)دا هەڵگیرساوە. پۆلیسیش ئەو هەواڵەیان بۆ پشتڕاست کردمەوە کە ڕێک لەو کاتەدا لە تریانادا، (مانوئێل) ناوێک لە شەڕێکدا کوژراوە. واتە لەم خاڵەیاندا بەڵگەی مێژووییمان لەبەردەستدایە، بەلایەنی کەمەوە دەربارەی خودی شەڕەکە.

- دواتر چی؟

- من وتم کورتەبنەکە لە ساڵی (١٧٩٠)دا لە پاش تێکشکانی کەشتییەک گەیشتۆتە سەر ئەو دوورگەیە. ئەمەیان تاڕادەیەک ڕاستە.

پێکەنیم و وتم:

- یان ئەوەتا لە ساڵی (١٧٩٠) کەسێک گەیشتۆتە سەر ئەو دوورگەیە یان نەگەیشتووە، ئاخر ناکرێت (تاڕادەیەک) بگەینە شوێنێک یان (تاڕادەیەک) شوێنێک بەجێبهێڵین.

- ئارام بە، ئارام. من هەوڵ دەدەم سەرلەنوێ چیرۆکێکی کۆنت بۆ بگێڕمەوە، هەمان

ئەو چیرۆکەی کە کورتەبنەکە خۆی بۆ (مانوئێل ئیل سۆلیتاریۆ)ی گێڕابووەوە. دەریاوانێکی تەنها لە ساڵی (١٧٩٠)دا کەشتییەکەی تێک دەشکێ و دەگاتە ئەو دوورگەیەی کە دواتر نغرۆی دەریا دەبێت. ئەویش کابرایەکی ئەڵمانی بووە، لەو کاتەدا کە خۆی گەیاندۆتە سەر دوورگەکە، تەنها شتێک کە لە گیرفانی کراسەکەیدا بووە، دەستەیەک یاریی کاغەز بووە. بۆ ماوەی (٥٢) ساڵی ڕەبەق بە تاک و تەنیا لەسەر ئەو دوورگەیە ژیاوە و جگە لەو دەستە کاغەزە هیچ هاودەمێکی تری نەبووە. دەستەیەک کاغەزی زۆر قەشەنگ و جوانی پێبووە، وەرەقەکان بەشێوەیەکی هونەری زۆر بەرز دروست کراون و لەسەر هەر دانەیەکیان وێنەی مرۆڤێکی تەواوی لەسەر بووە. شکڵەکان زیاترێک لە وێنەی کەسایەتی ناو حەکایەتەکان چوون، هەموویان بچکۆلە بچکۆلە بوون و لەو پەرییانە چوون کە لە حەکایەتەکاندا بەرگوێ دەکەون. وەک پێشنیارێک وتم:

– ڕەنگە لە وێنەی مرۆڤەکانی ناو تابلۆی (باخچەی حەز و ویست) چووبن؟

– چیت گوت؟

پرسیارەکەم دووبارە کردەوە و لە وەڵامدا وتی:

– لەوانەیە، بەڵام لە تابلۆکەی (بووس)دا مرۆڤەکان ڕووتن. پەرییەکانی سەر وەرەقەکان قەشەنگترین و ڕازاوەترین جلوبەرگی سەردەمی ڕێنیسانسی فەرەنسیان لەبەردابووە. جۆکەریش بەدلەیەکی وەنەوشەیی لەبەردا بووە، هەروەها کڵاوێکی لەسەردا بووە کە چەند پارچە قوماشێکی درێژکۆلەی پێوە بووە. چەند زەنگۆڵەیەکی وردیش بە بەدلەکەیەوە بووە و لەگەڵ بچووکترین جووڵەیدا زرنگاونەتەوە.

– نازانم ئەگەر من...

– ئەو دەریاوانە ڕۆژانی دوورودرێژی خۆی بە یاریی کاغەزەوە بردۆتەسەر، هەر کتومت وەک ناپلیۆن، ئەویش کاتی خۆی کە لە دوورگەی (سانت هیلینا)دا دەستبەسەر بوو، هەر خەریکی یاریی کاغەز بوو. بەهەرحاڵ، پاش ماوەیەک خەونی بە کەسایەتیی ناو وەرەقەکانەوە بینیووە، وەک دەزانیت بۆ ماوەی چەندین ساڵی دوورودرێژ تەنها ئەو وەرەقانە هاودەمی بوون. زۆر بەگوڕ خەونی بە وێنەی مرۆڤە پەرییەکانی ناو وەرەقەکانەوە بینیووە، هێندە بەگوڕ خەونی پێوە بینیوون تا گەیشتۆتە ئەو ئاستەی کە پێی وابووە لە ڕاستیشدا بیانبینێت، تەنانەت بە ڕۆژیش. هەستی کردووە وەک چەند ڕۆحێکی خەیاڵی بە چواردەوریدا خولاونەتەوە. ئیدی کەوتۆتە قسەکردن لەگەڵیاندا و گفتوگۆی دوورودرێژی لەگەڵیاندا دامەزراندووە،

بێگومان ئەو دەریاوانە تەنیایە هەر لەگەڵ خۆیدا قسەی کردووە، بەڵام پێش نیوەڕۆیەک...

- بەڵێ چی ڕوویدا؟

- ڕۆژێکیان بەڕاستی پەرییەکان ڕێگایەک دەدۆزنەوە و دەتوانن لە فەنتازیای دەریاوانەکەدا بێنە دەرەوە، پەرییەکان لەو دوورگە چۆڵ و هۆڵەی دەریای (کاریبی) دا، کە خۆی پاش تێکشکانی کەشتییەکەی ڕوویتێکردبوو، پێدەخەنە سەر دونیای ڕاستەقینە. دواجار توانیویانە ئەو دەرگایە واڵا بکەن کە لەنێوان بۆشایی خولقێنەری ئاگایی دەریاوانەکە و بۆشایی خولقێندراوی ژێر ئاسمانی دەرەوەدا بووە. یەک بەدوای یەکدا خۆیان هەڵداوەتە دەرەوە، هەروەک ئەوەی لە ناوچەوانی کابرای دەریاوانەوە بێنە دەرەوە و پاش چەند مانگێکیش تەواوی دەستەی کاغەزەکە لە دەرەوە بوون. دواهەمین کەسیش جۆکەر بووە، هەروەک دواهەمین منداڵی ئەو خێزانە هاتۆتە دونیاوە. پاش ئەوەش دەریاوانەکە چیتر تەنها نەبووە، (٥٢) پەری زیندوو لە چواردەوری بوون، هەروەها موهەریجێکی بچکۆلەش.

- کەواتە توشی هەلوەسە بووە. چەندین ساڵ بە تەنها ژیاوە و هەر ئەوە شێتی کردووە. پێم وانییە تێگەیشتنی ئەوەیان شتێکی هێندە سەخت بێت.

- ئەویش کتومت ئەو پرسیارەی لە خۆی کردووە، مەبەستم لەوەیە خۆشی نەیزانیوە کە توشی هەلوەسە بووە یان نا، بەڵام ئەو خاڵەی کە سەختە لێی تێبگەین ئەوەیە کە لە ساڵی (١٨٤٢)دا کاتێک کە کەشتیی (ماریا) تێک دەشکێت و دەریاوانە گەنجەکە دەگاتە سەر دوورگەکە، ئەویش (٥٢) پەرییەکە دەبینێت. هاوکاتیش سەرنج دەدات کە هیچیان بەهیچ شێوەیەک نازانن کێن و لەکوێوە هاتوون. هەروا لەسەر دوورگەکە بوون و تەواو، هەروەک چۆن زۆربەی خەڵکی ژیانی سەر ئەم زەوییە بە شتێکی زۆر ئاسایی دادەنێن و بۆیان نییە پرسیار بکەن کێن و لەکوێوە هاتوون، جیهانێک هەیە و لەسەری دەژین و تەواو، ئەوانیش بەهەمان شێوە ڕوانیویانە. تەنها جۆکەر جیاواز بووە. ئەو لە پەرییەکانی تر نەچووە، تێدەگەیت؟ ئەو توانیویەتی ئەودیوی پەردەی وەهم ببینێت و دواجار تێگەیشتووە کە کێیە و لەکوێوە هاتووە. لەوە تێگەیشتووە کە بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر هاتۆتە دونیاوە و کەوتۆتە ناو حەکایەتێکەوە کە لێکدانەوەی سەختە. بەلای جۆکەرەوە (هەبوون) پەرجوویەکی گەورە بووە. یان هەروەک خۆی گوتوویەتی، هەڵبەتە بەپێی قسەکانی مانوئێل ئیل سۆلیتاریۆ: (لەپڕێکدا خۆت لە دونیادا دەبینیتەوە، ئاسمانێک و زەوییەک دەبینیت). پەرییەکانی تر، کە لە

پێشدا هاتبوونە دونیاوە، ئەو دوو لایەنەیان بە شتێکی زۆر ئاسایی وەرگرتووە، بەڵام جۆکەر جیاواز بووە، ئەو کەسێکی دەرەوەی ئەو گروپە بووە و ئەو شتەی بینیووە کە پەرییەکانی تر لە ئاستیدا کوێر بوون. یان با بە وشەکانی خۆی بیڵێم: «جۆکەر بەخشکەیی و نیگەرانییەوە وەک سیخوڕی حەکایەتێک بەناو شەکرەپەرییەکاندا دێت و دەڕوات. دەگاتە دەرئەنجامەکانی، بەڵام کەس شک نابات تا پێی بڵێت. تەنها جۆکەر ئەوە دەبینێت. تەنها جۆکەر ئەوە دەبینێت کە خۆی چییە».

- بەڵام تۆ گوتت دوورگەکە نغرۆی دەریا بووە؟

خۆسێ بە چاوە شینەکانی تەماشایەکی کردم، منیش چیتر نەمتوانی بڕوا بەوە بکەم کە سەرتاپای ئەو چیرۆکەی هۆنیوەتەوە. وتی:

- دەریاوانە پیرەکە و (٥٢) پەرییەکە لەگەڵ دوورگەکەدا ون بوون. تەنها جۆکەر و ئەو دەریاوانە ئەڵمانییە توانیویانە خۆیان بگەیننە بەلەمە بچکۆلەکە و خۆیان ڕزگار بکەن، بەڵام هێشتا شتێکی تریش ماوە و دەبێت بیزانیت، هەڵبەتە ئەگەر بتەوێت لە ڕووداوی دواتر تێبگەیت.

سەیرێکی کاتژمێرەکەم کرد و وتم:

- فەرموو، فەرموو.. تکایە باسی بکە.

لەگەڵ ئەوەشدا یەک دوو چرکەیەک بێدەنگ بوو و ئینجا وتی:

- هەم جۆکەر و هەم پەرییەکانیش بەدرێژایی ئەو هەموو ساڵەی لەگەڵ دەریاوانەکەدا لەسەر دوورگەکە ژیانیان بەسەر بردووە، بەهیچ شێوەیەک هیچ گۆڕانکارییەکیان بەسەردا نەهاتووە. دەریاوانەکە خۆی بەرەبەرە پیر بووە، بەڵام هیچ یەکێک لە پەرییەکان چرچێک یان تەنانەت پەڵەیەکیش لەسەر جلوبەرگە پڕ ڕەنگەکانیان دەرنەکەوتووە. هۆکەشی بۆ ئەوە گەڕاوەتەوە کە ئەوان لە ڕۆح پێکهاتوون، واتە وەک ئێمەی ئاسایی و (فانی) لە گۆشت و خوێن دروست نەبوون.

- ئەی شەڕەکە چی؟

- مانوئێل ئیل سۆلیتاریۆ سەرجەم ئەو یاریی کاغەزانەی بردۆتەوە کە بەشداری تێدا کردوون، کاتێکیش داوایان لێ کردووە هۆی بردنەوەکانی ڕوون بکاتەوە، گوتوویەتی هەر ئەو کورتەبنەیەی کاتی خۆی ئیل پلانیتا لە مارسیلیادا بینیویەتی، چەند فێڵێکی فێر کردووە. یەکێک لە یاریکەرەکان زۆری دۆڕاندووە و بەردەوامیش شەرابی (مانزانیللا)ی خواردۆتەوە، بەکورتی زۆر مەست بووە و هەرکە گوێی لەو قسەیە دەبێت، یەکسەر بە چەپ و ڕاستدا پیادەکێشێت و چەند ڕۆژێک دواتریش لەبەر

سەختی برینەکانی گیانی لەدەست داوە. ژنێک و دوو منداڵی بچووکی لەدوای خۆی جێهێشتووە، کوڕێک و کچێک. هەندێک دەڵێن مانوئێل پاش ئەوەی کە چیرۆکی دەریاوانەکە و دەستە کاغەزە ئەفسووناوییەکەی گێڕاوەتەوە، ئینجا ئەو لەقەبەیان لێ ناوە. وەک دەزانیت (سۆلیتاریۆ) تەنها مانای (کەسێکی تەنیا) نابەخشێت، بەڵکو مانای کەسێکی (دوورەپەرێز)یش دەگرێتەوە. بەدەر لەوەش وشەی (سۆلیتاریۆ) لە زمانی ئیسپانیدا بەرامبەر وشەی (یاریی کاغەز) دێت، هەر بۆ نموونە کاتێک کە دەڵێین «hacer un solitario».

وتم:

– نازنم چەپڵەت بۆ لێ بدەم؟ یان زۆر بە ساکاری بڵێم: «بەو شێوەیە چیرۆکەکە کۆتایی پێهات و منیش هاتمەوە هیچیان نەدامێ».

– نە پێویست دەکات چەپڵە لێبدەیت و نە پێویستیش دەکات شتێکی وا بڵێیت. تۆ هەر خۆت گوتت کە سەرسامی ئەو لێکچوونە مەزنەی نێوان ئانا و (ماخا)کەی (گۆیا)یت.

بەتەواوەتی ئەوەم بیر چووبووەوە کە چیرۆکەکەی پەیوەندیەکیشی بە (ئانا)وە هەبوو، بگرە بەشێوەیەک لە شێوەکان پەیوەندییەکیشی بەو بەشە بچکۆلەیەی نهێنییەکەوە هەبوو کە خۆم بە چاوی خۆم بینیم. لەبەرئەوە وتم:

– تۆ ویستت ئەو لێکچوونە گەورەیەم لە ڕوانگەی ئانا و کەسوکاریەوە بۆ ڕوون بکەیتەوە، وا نەبوو؟

– بەڵێ بەڵام پاش ئەوەی باسی ئەو موهەریجەم بۆ گێڕایتەوە کە بەدرێژایی چیرۆکەکە دێت و دەڕوات، ڕەنگە مەزەنەی ئەو پەیوەندییە بکەیت کە لەنێوان ئەو دوو چیرۆکەدایە. ئەوەشم پێ وتیت کە هەر چەند ڕۆژێک لەمەوبەر کورتەبنەکە وێنەیەکی (ئانا)ی لە باخچەکانی (ئالکازار)دا گرت... دەبێت نەختێکی تر بەجێت بهێڵم تا فریای شەمەندەفەرەکەم بکەوم.

وتم:

– کەمێک بوەستە. کورتەبنەکە لە ساڵی (١٨٤٢)دا هاتۆتە مارسیلیا، لە ساڵی (١٨٩٤)یشدا لە تریانا چاوی بە مانوئێل کەوتووە، هەروەها لە ساڵی (١٩٤٦)دا بە گۆڕەپانی (ڤیرجین دی لۆس ڕیيس)دا ڕایکردووە. (ئانا)ش لەو بڕوایەدا بوو هەمان کورتەبنەی لە باخچەکانی (ئالکازار)دا لەم ساڵدا لە (١٩٩٨)دا بینیبێت.

– بەڵێ چیرۆکەکە بەو شێوەیە هاتووە.

- کەواتە ناکرێت کورتەبنەکە (گۆیا)ی بینیبێت، چونکە ئەو وێنەکێشە بەتوانایە زۆر پێش ئەوەی ئیل پلانیتا بێتە مارسیلییا مردووە.
- گۆیا لە ساڵی (١٨٢٨)دا مرد.
- وە تەنانەت ئەگەر کورتەبنەکە فریای ئەوەش کەوتبێت گۆیا ببینێت، ئەی ئانا؟ ئەو چەندین ساڵ لەدوای ئەوەی ئەو وێنەکێشە مەزنە تابلۆی (ماخای ڕووت و جلپۆشی) کێشاوە ئینجا (ئانا)ی دیوە.
- ناچارین یەک یەک شتەکان ڕوون بکەینەوە.
- بەڵێ فەرموو پێم بڵێ، تۆ خۆت پەیمانت دامێ بۆم ڕوون بکەیتەوە.
- دەریاوانەکە بە خۆی و دەستەیەک یاریی کاغەزی ئەفسووناوییەوە گەیشتۆتە سەر ئەو دوورگەیەی کە دواتر نغرۆ بووە. لە سەرەتای ساڵی (١٧٩٠)دا بە کەشتییەکی ئیسپانی کە ناوی (ئانا) بووە لە (کادیز)ەوە کەوتۆتە ڕێ، ئەو کاتە ئاسایی بووە کە ناوی (ئانا) بۆ کەشتی بەکاربهێنرێت. (ئانا) بەرەو شاری (ڤیراکروز)ی مەکسیکی کەوتۆتە ڕێ و لە کاتی گەڕانەوەیدا بەرەو (کادیز) بە بارێکی گەورەی زیوەوە نوقمی ئاو دەبێت. هەتا ئێرە هەمووی تەواوە، من خۆم لە ئەرشیفی ساڵانەی کۆن و تۆماری کەشتیی ئەو ساڵانەدا گەڕاوم و ئەوەم بینیوەتەوە.
- تۆ دڵنیایت لەوەی بەڕاستی کەشتییەک بە ناوی (ئانا)وە بارێکی گەورەی زیوی هەڵگرتووە و لە ساڵی (١٧٩٠) لە کاتی گەڕانەوەیدا بەرەو (کادیز) نقووم بووە؟
- بەڵێ. بەدەر لەوەش بەپێی ئەرشیفەکان هیچ کەسێک لە سەرنشینەکانی ئەو کەشتییە دەرنەچووە و هیچ دەنگۆیەکیش لەو بارەیەوە نەبیستراوەتەوە.
- ئێ بەشێوەیەک لە شێوەکانیش هیچ کەسێک ڕزگاری نەبووە، چونکە دەریاوانەکە پاش (٥٢) ساڵ لەگەڵ دوورگەکەدا دەفەوتێت و قەت نەیتوانیوە بگەڕێتەوە ناو شارستانی.
- پێم خۆشە ئاوها بەگوڕ لەگەڵ چیرۆکەکەدا دەڕۆیت. ئەو کاتەی کە ئەو لە ساڵی (١٧٩٠)دا لە (کادیز)ەوە سەفەری کردووە، دەستەیەک کاغەزی پێ بووە. دەتەوێت چیرۆکێکی تایبەتیت لەو بارەیەوە بۆ بگێڕمەوە کە پەیوەندی بەو دەستە کاغەزە سەیروسەمەرەیەوە هەیە، یان ڕاستتریک بیڵێم پەیوەندی بەو شێوازەوە هەیە کە ئەو دەستە کاغەزەی لێوە دەستکەوتووە؟
بەدڵنیاییەوە وتم:
- بەڵێ، زۆرم پێخۆشە بۆم بگێڕیتەوە.

- ئەو کەشتییە لە ساڵی (١٧٩٠)دا پاش ئەوەی لە (سانلوکار دی باڕامیدا) وە هاتۆتەوە، لە بەندەری (کادیز)دا لەنگەری گرتووە. بێگومان وەک هەمیشەش کۆمەڵێک قەرەج لە بەندەرەکەدا بوون و شتی جۆراوجۆریان بەو دەریاوانانە فرۆشتووە کە ویستویانە دەریای بەرین ببڕن، هەر لە پرتەقاڵ و زەیتونەوە هەتا جگەرە و چەرخ و یاری وەرەقە. گوایە ئەو دەریاوانەی کە ئێمە باسی دەکەین، ئەو دەستە کاغەزە سەیروسەمەرەیەی لە منداڵێکی قەرەجی پێنج شەش ساڵان کڕیووە کە ناوی (ئەنتۆنیۆ) بووە، هەر ئەویشە کە دواتر پاش ماوەیەکی یەکجار زۆر بە ناوی (ئیل پلانیتا) دەناسرێت.

- هەر بەڕاستیش ئەو کاتە لەدایک بووە؟

- ئیل پلانیتا لە نزیکەی ساڵی (١٧٨٥)دا لە شاری (کادیز) لەدایک بووە. هەموو کەسێک دەتوانێت ئەوەیان لە (لێکسیکۆن)ێکدا بدۆزێتەوە.

بە دەنگی بەرز وتم:

- لەگەڵ ئەوەشدا چیرۆکێکی سەیرە. بەهەرحاڵ گومانی تێدا نییە کە ئەو قەرەجانە داهێنەرن.

- هەروەها لەو کاتەدا کورتەبنەیەکیش لەو بەندەرەدا بووە. بەپێی ئەو چیرۆکانەی کە ماونەتەوە ئەو کورتەبنەیە لەژێر جلوبەرگە ئاساییەکەیەوە چەند زەنگۆڵەیەکی حەشارداوە، هەر کتومت وەک موهەریجەکانی سەردەمی پاشایی ئەو کاتە.

زۆر بەوردی تەماشایەکی دەموچاوە زەردهەڵگەڕاوەکەی (خۆسێ)م کرد و وتم:

- بە بڕوای من هەقە ئەو بەشەی چیرۆکەکە لاببرێت.

- بۆ؟

- ئێ ئەو لە کاغەزی یارییەکەدا بووە، ئەو لە گیرفانی دەریاوانەکەدا بووە و بەو شێوەیەش ناکرێت لەو کاتەدا لە بەندەرەکەدا بووبێت و تەماشای کەشتییەک بکات کە لەنگەری گرتووە. جگە لەوەش...

لەویادا وا هەستم کرد کە زەنگێکی گەورەی ناو کەشتییەکان دەکێشن بە سەرمدا و یەکسەر بێدەنگ بووم.

خۆسێ وتی:

- جگە لەوەش چی؟

- با بڵێین ئەوەشیان قبووڵ دەکەین کە ئەو کورتەبنەیەی لە یاریی کاغەزە ئەفسووناوییەکەوە هاتووە و وەک ئێمەی ئاسایی و فانی پیر نەبووە، چونکە ئەو لە

ڕۆح پێکهاتووه نەک لە گۆشت و خوێن..
- ئێێ؟
- بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ناکرێت لەتوانایدا بووبێت کە بگەڕێتەوە بۆ زەمەنی ڕابردوو. ئێ ئەو یەکەم جار لە ساڵی (١٨٤٢)دا گەیشتۆتە ئەوروپا.
لەویادا ڕووناکییەک کەوتە ناو چاوە شینەکانی (خۆسێ)وە و وتی:
- بۆ شتێک کە لە ڕۆح پێکهاتبێت، ناتوانێت بۆ دواوەی زەمەن بگەڕێتەوە؟
- بەڵێ، لە ڕۆحانییەتدا ئەو شتەی کە لە ڕۆح پێکهاتووە دەتوانێت لەنێوان زەمەنی ڕابردوو و داهاتوودا بێت و بچێت.
وەک ڕازیبوونێک لەسەر قسەکانم، خۆسێ سەری بۆ لەقاندم و وتی:
- وا لە کرۆکی بابەتەکە نزیک دەبیتەوە، بەڵام هێشتا پێچێکی بچکۆلە لە چیرۆکەکەدا ماوە، گەر پێت خۆشە ناوی بنێ لایەنی داستانی چیرۆکەکە. هەموو ئەو چیرۆکانەی ماونەتەوە پێ لەسەر ئەوە دادەگرن کە ئەو کورتەبنەیە بەشێوەیەک لە شێوەکان فەنتازیا بووە و شتێکیش کە فەنتازیا بێت وەک ئێمە و مانان پیر نابێت. هەر بۆیە ئەو کورتەبنەیە هێندە بەتەمەن بووە. بەدەر لەوەش ئاماژە بۆ ئەوە دەکرێت کە کورتەبنەکە توانیویەتی بگەڕێتەوە بۆ زەمەنی پێشووتر، بەڵام بێگومان نەیتوانیووە بگەڕێتەوە پێش ئەو کاتەی کە تێیدا داهێنراوە. هەروەک چۆن هەتا ئەو کاتەی (سەینت ئێگزوپێری) و (لویس کارۆڵ) هاتن و هەردوو چیرۆکی (کوڕە بچکۆلەی پاشا) و (ئالێس لە وڵاتی حەکایەت) دەیاننووسی، هیچ شتێک دەربارەی ئەو دووانە بوونی نەبوو، هەرچەندە لەو کاتەوە چەندین جار بە چەپ و ڕاستدا ئاماژە بەو دووانە کراوە.
- من پێم وابوو کە ئەو کورتەبنەیە لەوبەری ئۆقیانووسەوە لەلایەن دەریاوانێکەوە (داهێنرابوو)، یان بەلایەنی کەمەوە لەو کاتەوە کە کەشتیی (ئانا) کەوتۆتە ڕێ.
خۆسێ حسابی جۆرە بەرپەرچێکی لەو جۆرەشی کردبوو، بۆیە وتی:
- جۆکەر لە دەستەیەک یاریی کاغەزەوە هاتووە کە لە کۆتایی ساڵەکانی (١٧٨٠) کاندا لە فەرەنسا چاپ کراوە. لەو کاتەشەوە بەلایەنی کەمەوە کەسێک هەبووە کە لەو دونیا کۆنەدا سیمای ببینێت، ئەوەش کتومت ئەو زەمەنەیە کە دەتوانێت بۆی بگەڕێتەوە. لەلایەکی تریشەوە...
- بەڵێ، فەرموو بەردەوام بە، بەردەوام بە.
- دەڵێن خەڵکانێک لەو ڕۆژی زستانەی ساڵی (١٧٩٠)دا لەسەر مینای (کادین)

بینیویانە، بەڵام لەوێوە ئیدی هەموو شوێنپێکانی ون دەبن. هیچ چیرۆکێکمان نییە کە لەو ڕۆژە زیاترێک بچێتەوە دواوە. بەر لەو کاتە هیچ شوێنپێیەکی نییە.

- (ئانا)ش بەڕاستی باوەڕی بە هەموو ئەو شتانە بوو؟

خۆسێ سەری ڕاوەشاند و وتی:

- ئاشنای هەموو ئەو چیرۆکانە بوو کە دەربارەی (ئیل پلانیتا) و (مانوئێل ئیل سۆلیتاریا) و مامی باوکی بوو، کە چەند ساڵێک لەمەوبەر گیانی لەدەست دا، بەڵام ناتوانم بڵێم باوەڕی پێیان بوو، بگرە هەندێکجار نیمچە شەرمێکی لەو جۆرە (چیرۆکە قەرەجیانە) دەکرد، کە هەر لە منداڵییەوە لەگەڵیاندا گەورە بووبوو، بەتایبەتیش چونکە دونیایەک لایەنی فرت و فێڵ و هەڵخەڵەتاندن لەگەڵ دونیای قەرەجەکاندا تێکەڵ کراوە، بەڵام دڵنیا بوو کە لە باخچەکانی (ئالکازار)دا بەدوای ئەو کورتەبنەیەدا ڕایکرد کە زەنگۆڵەکانی پێوە بوو. ئانا وتی:

- گوێم لە زەنگۆڵەکانی بوو.

هەربۆیە دوای کەوتبوو. وەک ئەوەی بەو شێوەیە بیەوێت سەرلەنوێ متمانەی خێزانەکەیان زیندوو بکاتەوە.

- ئەی دەربارەی (ماخا)ی گۆیا چی؟

- ئا ئێستا دێینە سەر ئەو باسە. ئەو کاتەی جۆکەر لەسەر بەندەرەکەی (کادین) وەستاوە و تەماشای کەشتیی (ئانا)ی کردووە کە بەڕێ کەوتووە، لە گیرفانی چاکەتەکەیدا شتێکی سەیری پێبووە. دەگێڕنەوە دەڵێن گوایە چەندین جار ئەو شتەی بۆ ڕزگارکردنی خۆی بەکارهێناوە کاتێک کە گەنجە سەرخۆشەکان گاڵتەیان پێکردووە، چونکە کورتەبنە بووە.

- ئەو شتە چی بووە؟

- وێنەی کچێکی گەنج بووە.

- بەڕاست؟

- وێنەیەکی زۆر بچکۆلە بووە و بە تەکنیکێکی تەواو نەناسراو کێشراوە. نە نەخشی سەر لەوحی مس بووە و نە وێنەیەکی زەیتیش، ڕووکەشەکەی هەروەک ئاوریشم ساف بووە. بەدەر لەوانەش ئەو پۆرترێتە سەیروسەمەرەیە هەر کتومت وەک وێنەیەکی ڕاستەقینە وابووە، وەک دەگێڕنەوە گوایە هێندە ڕاستەقینە بووە کە خەڵکی کورتەبنەکەیان وەک هونەرمەندێکی بلیمەت تەماشا کردووە و وایانزانیووە خاوەنی بەهرەیەکی سەرووسروشتییە. ئەو وێنەیەی کە پیشانی داون، ڕاست و

دروست وەک ئەو وێنەیە بووە کە ئێمە بە چاومان دەیبینین.
خەیاڵم چووەوە سەر (پرادۆ)، لەویادا دوو تابلۆی ئافرەتێکیان هەڵواسیووە کە کەمێک بەر لە مردنی لەسەر کورسییەکی ناو باخچەکانی (ئالکازار)دا دانیشتبوو. هەر لەوێشدا کورتەبنەیەک دەردەکەوێت و وێنەیەکی ئەو ئافرەتە دەگرێت..

- دەزانم مەبەستت لە چ وێنەیەکە، بەڵام ئاخر ئەو وێنەیە هەر زۆر نوێیە.

- بەڵێ بەلای ئێمەوە نوێیە، بەڵام بەلای ئەو کەسانەی کاتی خۆی لە بەندەری (کادین)دا بوون، هەر زۆر نوێتر بووە.

- مەبەستت چییە؟

- بەلایانەوە ئەو وێنەیە سەر بە پاشەڕۆژێکی زۆر دوور بووە، هەر لەبەرئەوەیە کە وەک جادوویەک بیریان لێ کردۆتەوە. گوتوویانە هەبێت و نەبێت ئەوە کاری شەیتانە شەیتان.

- هەر بەڕاستیش چەند چیرۆکێک دەربارەی کورتەبنەیەک هەیە کە وێنەی پۆرترێتێکی ئاوها پڕاوپڕی ئافرەتێکی جوانی پێ بووبێت؟

- بەڵێ بەڵام چیرۆکێک کە هۆنراوەتەوە، چیرۆکێک کە ناچێتە ئەقڵەوە، چیرۆکێک کە قەرەجەکان هەڵیان بەستووە. سەختە بڕوا بە سەرتاپای ئەو جۆرە چیرۆکانە بکرێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەفسانەکان جۆرە ڕەونەقێکیان هەر هەیە. چیرۆکی (کورتەبنەکە و وێنە ئەفسووناوییەکە) ئەفسانەیەکی لەو جۆرەیە. هەرچەندە تەنها ئەمڕۆ لە نرخی تەواوەتی چیرۆکی ئەو کورتەبنەیە و وێنە ئەفسووناوییەکەی تێدەگەین، چونکە ئەو چیرۆکە لە هونەری فۆتۆگراف زۆر زۆر کۆنترە.

- ئەی گۆیا؟

- نموونەی هەرەبەرزی گۆیا، (فیلاسکوین)ی وێنەکێشی سەدەی حەڤدە بوو، کە خەڵکی ئیشبیلییە بووە و دواتریش لەلای (فیلیپ)ی چوارهەم وەک وێنەکێشێکی کۆشکی پاشایی دامەزراوە. ئەو مامۆستا دێرینە وێنەی چەندین کورتەبنە و موهەریجی کێشاوە کە بەردەوام لە چواردەوریدا بوون، چونکە وەک دەزانیت ئەو کاتە شتێکی ئاسایی بوو کە کۆشکی پاشا کورتەبنەی تێدا بێت.

- بەڕاست؟

- لە بەهاری ساڵی (١٧٩٧)دا گۆیا لە (سانلوکار دی باڕامیدا)دا چاوی بەو موهەریجە بچکۆلەیە دەکەوێت و دەیەوێت بەزۆر بیباتە مەرسەمەکەیەوە تا وێنەی پۆرترێتێکی بکێشێت.

- بەڵام کورتەبنەکە نەیویستووە وێنەی بکێشرێت؟
- هەتا لەتوانایدا بووە ڤیژانویەتی و بەرەنگاری بۆتەوە، بەڵام وەک دەزانیت ئەو وێنەکێشە مەزنە بەتەواوەتی کەڕ بووە و گوێی لە قسەکانی کورتەبنەکە نەبووە. تەنها ئەو کاتەش وازی لێ دەهێنێت کە کورتەبنەکە وێنە پڕ نهێنییەکەی (ئانا ماریا مایا)ی بۆ دەردەهێنێت، گۆیا لەوەوبەر قەت وێنەیەکی لەو شێوەیەی نەدیووە. ئەو کاتە خەریک بووە تابلۆی (ماخای ڕووت) تەواو بکات و بۆ ئەوەی دەموچاوی ڕاستەقینەی مۆدێلەکەی بشارێتەوە، وێنەی دەموچاوی (ئانا)ی دەخاتە سەر.
ئەو کورسییەی ئێمە لەسەری دانیشتبووین، کورسییەکی تریشی بە پشتەوە بوو و لەویادا پیاوێکی بەتەمەن هات و لەسەری دانیشت. خۆسێ کەمێک چاوەڕوانی کرد و ئینجا بە چرپەچرپێک وتی:
- هەمیشە بەلای (ئانا)وە سەخت بوو کە وەک وێنەی ناو ئەو تابلۆ دێرینە بناسرێتەوە، هەندێک جاریش هەر دەتگوت کۆڵێکی قورسە و بەسەر شانییەوەیەتی. بێگومان لەوە تێدەگەیت کە دەبێت لە سەردەمی گۆیادا هەر زۆر سەختتریک بووبێت بەلای مۆدێلە ڕاستەقینەکەوە. لەو کاتەدا ئەگەر ژنە قەرەجێک ڕێگەی دابێت بە ڕووتی وێنەی بکێشن، ئەگەری ئەوەی هەبووە ژیانی لەدەست بدات.
زۆرباش بیرم کردەوە و ئەوجا پرسیم:
- هەر بەڕاستی هیچ نەریتێک لە قەرەجەکانەوە ماوەتەوە کە باسی گۆیا و ئەو کورتەبنەیە و وێنە نهێنییەکەی بکات؟
خۆسێ تەماشایەکی کردم، بەشێوەیەک لە شێوەکان بزەیەکی بچکۆلەم لەسەر دەموچاوی بینی. بەهێواشی سەری ڕاوەشاند و وتی:
- هەموو چیرۆکەکان تەنها باسی ئەوە دەکەن کە کورتەبنەیەک لە بەندەری (کادین) دا بووە کاتێک کە کەشتیی (ئانا) لە بەندەری (کادین)ەوە بەڕێ کەوتووە، وە ئەوەش دەگێڕنەوە کە وێنەی ژنێکی نیشان داوە، وێنەیەک کە پڕ بووە لە وردەکاری و هێندە لە ڕاستەقینە چووە کە خەڵکی بەندەرەکەی بەتەواوەتی سەرسام کردووە. یەکێک لەوانە (ئەنتۆنیۆ)ی بچکۆلە بووە، کە دەڵێن دواتر بووە بە باپیرە هەرە هەرە هەرەگەورەکەی ئانا. بەو شێوەیەش بەدەر لەو وێنەیەی ئانا کە لە ساڵی (١٧٩٠) ەوە لە ئەندەلوسیادا بووە، هیچ بەڵگەیەکی تر لەبەردەستدا نییە، واتە چەندین ساڵ بەرلەوەی گۆیا تابلۆی (جیتانا) یان (ماخای ڕووت) بکێشێت. بە بڕوای من هەر ئەوەندەش بەسە.

لەویادا تەماشایەکی سەعاتەکەی کرد و وتی: «ناچارم بڕۆم». منیش پێشنیارم کرد بەناو پارکی (ڕیتیرۆ)دا تا وێستگەی شەمەندەفەرەکە لەگەڵیدا بڕۆم.
لە ناوەڕاستی ئەو پارکە گەورەیەوە بەهێواشی لە (پاسیۆ دی پاراگوای)یەوە بەرەو گۆڕەپانی (دی هۆندوراس)دا ڕۆیشتین، (خۆسێ)ش بەردەوام بەتوندی ڕۆژنامەکە و زەرفە زەردە گەورەکەی بەدەستییەوە گرتبوو. بۆ ساتێکیش خەیاڵم بۆ ئەوە نەچوو کە ئەو زەرفەی بەدەستییەوە گرتبووی، شتێکی تێدا بوو کە بۆ منی هێنابوو. بەدەم ڕۆیشتنەوە بیرم لەو قسانە دەکردەوە کە بۆی گێڕامەوە، بیرم لەو دوو کەشتییە دەکردەوە کە کاتی خۆی نغرۆی دەریا بووبوون، بیرم لە (ئیل پلانیتا) و (مانوئێل ئیل سۆلیتاریۆ) و ئەو موهەریجە بچکۆلەیە دەکردەوە کە لە هەموو شوێنێکدا دەرکەوتووە:
کەواتە کاتی خۆی لە ساڵی (١٧٩٠)دا لە بەندەری (کادین)دا کورتەبنەیەک وەستاوە و خواحافیزی لە کەشتییەک کردووە کە بەرەو مەکسیک بەڕێکەوتووە، لە گیرفانیدا وێنەیەکی بچکۆلەی کچێکی گەنجی قەرەجی پێ بووە. وا دیارە وێنەکێشەکە توانیویەتی کتومت وێنەی ئەو ئافرەتە بکێشێت، ڕێک هەروەک ئەوەی کە خۆی بە چاوی خۆی لە پارکێکدا یان باخێکی گەورەدا بینیبێتی، چونکە ڕەنگەکان و وردەکارییەکانی وێنەکە تەنانەت لە وێنەی سەر نایابترین پارچە ئاوریشمیش ڕوونترێک بوون، بەڵام ئاخۆ ئەو وێنەکێشە چ تەکنیکێکی بەکارهێنابێت، چونکە ئەو وەرەقەیەی وێنەکەی لەسەر کێشاوە تەنها یەک ملیمەتر ئەستوور بووە؟ نە بە بۆیەی ئاوی و نە بە بۆیەی زەیتیش کێشاویێتی، بەهیچ شێوەیەکیش وێنەی سەر پلێتێکی مسین نەبووە. ڕەنگە سەرسامترین لایەنی ئەو وێنە گچکەیە ڕووە ساف و لووسەکەی بووبێت، هەر لەوە چووە کە بە مۆم یان بە شیلەی دار پێوەیان نوساندبێت.
هەر لەو بەندەرەدا کوڕە منداڵێکی قەرەجی پێنج شەش ساڵانیش دێت و دەچێت. ئەوە باپیرە هەرە هەرە هەرەگەورەکەی ئەو ئافرەتەیە کە لە وێنەکەدایە و چەندین ساڵ دواتریش سەمای فلامینکۆ دەهێنێتە ئیشبیلییەوە. جگە لەوەش دوای پەنجا ساڵێک دیسانەوە هەمان ئەو کورتەبنەیە لە (مارسیلیا)دا دەبینێتەوە. لەو کاتەدا چیتر لەیادی نییە کە هەمان ئەو کورتەبنەیەی چەندین ساڵ لەوەوبەر بینیووە، بەڵام لەوانەیە کورتەبنەکە ئەوەی لەبیر بووبێت. هەروەها: دەریاوانەکانی سەر کەشتییەکە خەریکی هەڵدانی چارۆکەکانن و لەپڕێکدا یەکێکیان ئاوڕ دەداتەوە و دەست بۆ کورتەبنەکە و منداڵێکی قەرەج ڕادەوەشێنێت. دەستەی یاریی کاغەزەکەی لەو

کوڕه بچکۆلەیە کڕیوه و لەسەر یەکێک لە کاغەزەکان وێنەیەکی زۆر بچکۆلەی ئەو کورتەبنەیەی لەسەره کە لە بەندەرەکەدا وەستاوه. کاتێکیش پاش چەند حەفتەیەک کە ئەو دەریاوانە کەشتییەکەی تێک دەشکێت، دەستەی یاریی کاغەزەکە دەکاتەوه و ئەو وێنەیە دەبینێت، بەدرێژایی ئەو ساڵانەش جار لەدوای جار بەوردی لێی ورد دەبێتەوه، بەڵام بڵێیت قەت ئەوەی بە خەیاڵدا نەهاتبێت کە هەر هەمان ئەو کورتەبنەیە بووه کە کاتی خۆی لەسەر بەندەرەکەی (کادین)دا بینیبووی؟

خۆسێ وتی:

- ئانا هەر لە سەردەمی منداڵییەوه ئاشنای ئەفسانەکانی ئەو کورتەبنەیە بووه: چیرۆکی ئەو کورتەبنەیەی بیستبوو کە کاتی خۆی لەسەر بەندەری (کادین)دا وەستاوه، ئەو کورتەبنەیەی لە مارسیلییادا لە کەشتییەکەوه خۆی هەڵداوەتە خوارەوه و هاتۆتە سەر بەندەرەکە، ئەو کورتەبنەیەی لە (تریانا)دا چاوی بە مانوئێل ئیل سۆلیتاریۆ کەوتووه، ئەو کورتەبنەیەی لە گۆڕەپانی (ڤیرجین دی لۆس ڕیبس)دا بەتوندی ڕایکردووه و زرنگەی زەنگۆڵەکانی بەرز بۆتەوه، هەر لە دەنگی کەسێکی مۆسیقی چووه کە چەند ئامێرێکی ژەندبێت.

- بەڵام خۆ چیرۆکی ئەو کورتەبنەیەی نەبیستبوو کە لە باخچەکانی (ئالکازار)دا خۆی نیشان دا؟

دیاربوو لە ئەندێشەیەکی قووڵدا بوو، سەری بۆ ڕاوەشاندم و وتی:

- نەخێر، بەڵام لە ماوەی ئەم چەند ساڵی دوادواییەدا پەرۆشی ئەوه بوو بزانێت لە ساڵی (١٩٩٨)دا چی ڕوودەدات. هەرەخۆشترین چیرۆکیش بەلای (ئانا)وه چیرۆکی ئەو کورتەبنەیە بوو کە کاتی خۆی توانیبووی بە نیشاندانی وێنەیەکی ئەفسووناویی کچێکی گەنج خۆی ڕزگار بکات. شێوازی وەسفکردنی ئەو وێنەیە لە چیرۆکە کۆنەکاندا، وای لە ئانا کرد بێتە سەر ئەو بڕوایەی کە ئەو وێنەیە وێنەیەکی فۆتۆگراف بووبێت، هەرچەندە وەک دەزانیت ئەو ڕووداوەی بەندەرەکەی کادیز زۆر زۆر پێش ئەو کاتە ڕوویداوه کە هونەری وێنەی فۆتۆگرافی تێدا داهێنرا، بەڵام شتێکی تریشیمان هەیە، شتێکی تەواو تەواو جیاواز..

- ئەوەیان چییە؟

- کاتێک ئانا گەیشتۆتە تەمەنی هەرزەکاری، لێرەو لەوێ پێیان گوتووه کە لە وێنەی تابلۆیەکی گۆیا دەچێت. ئەو شانازی بەوەوه کردووه، بەڵام هاوکات شەرمیشی کردووه، چونکە لە وێنەی کچێکی ڕووت چووه. دواتریش هێدی هێدی

لەگەڵ گەورەبوونیدا زیاترێک لە وێنەی ئافرەتە قەرەجەکەی ناو تابلۆکە چووە، دواجاریش بە هەر شێوەیەک مکیاجی بکردایە یان بە هەر شێوەیەک قژی دابهێنایە، هەر لەو چووە. بەتەواوەتی بووە بە (لا نینا دیل پرادۆ). چیتر هیچ کەسێک جیاوازیی نێوان ئەو دووانەیان نەکردووە.

وتم:

- بەیارمەتیت بوەستە. تۆ کەمێک بەپەلە بەسەر وردەکارییەکی گرنگدا تێپەڕیت.

- مەبەستت چییە؟

- ڕاستە ئانا توانیویەتی بەهۆی مکیاج و شێوەی داهێنانی قژییەوە خۆی بگۆڕێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نەیتوانیوە بە موویەک لە وێنەی دەموچاوەکەی گۆیا دوور بکەوێتەوە.

- بۆ نا؟

- چونکە ئەو کاتە وێنەکەی (گۆیا)ش بەشێوەیەکی تر دەبوو.

بۆ چرکەیەک بیری کردەوە و وتی:

- بێگومان ڕاست دەکەیت. چارەنووس ڕێگە نادات جوانکاری تێدا بکرێت، بەڵکو تەنها سێبەری ئەو شتەیە کە ڕوودەدات. ڕەنگە لە شوێنی خۆیدا ئەوەشت پێ بڵێم کە... دەی هیچ..

- بۆچی دوودڵیت؟

- ئەو پێشنیوەڕۆیەی ئانا لە باخچەکانی (ئالکازار)دا دوای کورتەبنەکە کەوت، سووراوی کردبوو. ئەوە یەکەمین جار بوو بە سووراوەوە بیبینم. سووراوی هەبوو، بەڵام تەنها چەند جارێکی کەم لە کاتی نمایشدا بەکاری دەهێنا.

یەکسەر لە شوێنی خۆمدا وەستام و وتم:

- ئەوەش تەنها شت بوو کە نوقسانی بوو! تەنها کوڵمە سوورەکانی نوقسان بوو.

بە نیمچەترسێکەوە تەماشای کردم و منیش درێژەم بە قسەکانم دا و گوتم:

- ئەگەر ئانا لەسەر دوورگەکانی فیجیدا سووراوی بکردایە، ئەوا یەکسەر تابلۆکانی (گۆیا)م بە خەیاڵدا دەهات و دەمناسییەوە.

سەرلەنوێ کەوتینەوە ڕێ و خۆسێ پرسی:

- بەڵام بۆچی ڕێک ئەو ڕۆژە سووراوی کرد؟ تۆ لەوە تێدەگەیت؟ بەو جۆرە نەک هەر زیاترێک لە ئافرەتی ناو ئەو تابلۆ دێرینە دەچوو، بگرە تەنها بەو شێوەیە

کتومت وەک یەکیان لێ دەهات.
وەک سەرنجێک گوتم:
- شتێک هەیە پێی دەڵێن: «هەموو شتێک کاتی خۆی هەیە»، بەدەر لەوەش ئەو پرسیارەی تۆ دەیوروژێنیت لە مەسەلەی هێلکە و مریشکەکە دەچێت، کامیان لە پێش کامیانەوە هاتوون.
- ئاخر شتێکی تریش هەیە کە پێی دەڵێن: «چارەنووسی خۆتت خۆش بوێت».
- باشە ئانا قەت ئەو لێکچوونەی خۆی لەگەڵ تابلۆی (ماخا)ی گۆیادا، گرێ دەدایەوە بەو چیرۆکە کۆنانەوە کە باس لە کورتەبنەکەی کادیز و وێنە ئەفسووناوییەکەی دەکەن؟
- بەڵێ وردەوردە ئەو لێکچوونەی بەوەوە گرێدایەوە. بۆ یەکەمین جار یەکێک لە مامەکانی لێکدانەوەیەکی بۆ ئەو چیرۆکە کۆنە و وێنە پڕاوپڕەکەی کورتەبنەکە کردووە و وای بۆ چووە کە وێنەیەکی ڕەنگاوڕەنگی مۆدێرنی فۆتۆگراف بێت، بەڵام ئەو کاتەی کورتەبنەکە بە خۆی و وێنە ئەفسووناوییەکەیەوە لەسەر بەندەری کادیز بووە، وێنەی فۆتۆگراف بوونی نەبووە، کەواتە دەبێت وێنەی کەسێک بووبێت کە زۆر زۆر دوای ئەو کاتە هاتبێتە دونیاوە. ئێ وێنەی فۆتۆگراف درۆ ناکات و هەمیشە مۆدێلێکی زیندووی لەبەردەستدایە. لەو کاتەشەوە ئەم لێکدانەوەیە بووە بە بەشێک لە خودی چیرۆکەکە. هەموو خێزانی ئانا دەیانزانی کورتەبنەکە وەک ئێمەی ئاسایی و فانی پیر نابێت، بەڵام ئەوەی کە بتوانێت بگەڕێتەوە بۆ ڕابردوو، ئەوەیان شتێکی تەواو تەواو نوێ بوو. سەرتاپای خێزانەکەی بەگوڕ بیریان لەوە دەکردەوە تا وای لێ هات لەنێوان کچانی نەوە زۆر و زەوەندەکەی (ئیل پلانیتا)دا بەدوای ئەو کچەدا دەگەڕان کە دەبووایە ببووایەتە خاوەنی ئەو وێنەیە، هەروەها بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ ئاماژەش بۆ ئەوە کرابوو کە پێی دەچێت وێنەکە لە ساڵی (١٩٩٨)دا بگیرێت، هەربۆیە سەرلەنوێ چاویان بۆ کورتەبنەکە دەگێڕایەوە.
- کاتێکیش ئانا بەرەبەرە زیاترێک لە پۆرترێتەکەی گۆیا دەچوو...
بەگوڕ سەری بۆ لەقاندم و وتی:
- بەڵێ ئەوە وای لە هەندێکیان کرد بڕوا بەوە بکەن کە بازنەکە کۆتایی هاتووە. چەند چیرۆکێکی تەواو نوێ سەریان هەڵدا و وا باس دەکەن گوایە کورتەبنەکە ئەو وێنە سەرسوڕهێنەری بەو وێنەکێشە گەورەیە فرۆشتووە. لە یەکێک لەو چیرۆکانەیشدا هاتووە کە مۆدێلە ڕاستەقینەکەی گۆیا لەلایەن خێزانەکەیەوە سەری لێ کراوەتەوە،

چونکە ڕێگەی داوە بە ڕووتی وێنەی بکێشرێت. هەر بەپێی ئەو چیرۆکە گوایە سەری ئەو ئافرەتەیان، بە مەبەستی سوکایەتیپێکردنی، لە شوێنێکی گشتی و دیاردا داناوە، بەڵام ئەو شتانەیان بەئاشکرا باس نەدەکرد، بەلایەنی کەمەوە لەو کاتانەدا هیچیان لەو بارەیەوە نەدەگوت کە ئانا لەوێ بووایە.

– بەڵام ئەو لەو بارەیەوە خاوەنی بڕوای تایبەتیی خۆی بوو، وا نەبوو؟

– وەک قسەی قۆڕ تەماشای دەکرد. جارجارێکیش بە سەرتاپای ئەو باسانە پێدەکەنی، بەڵام بەڵێ، لەو بارەیەوە بڕوای تایبەتیی خۆی هەبوو. بەهەرحاڵ سەخت بوو بەلایەوە کە بەو شێوەیە لە پۆرترێتە بەناوبانگەکەی گۆیا بچێت. بۆ نموونە هەندێکجار هەر وا بەئاسانی ڕازی نەدەبوو بێتە دەرەوە. لە ئیشبیلییەدا باشترێک بوو، بەڵام لە مەدریددا خەڵکی دەوەستان و دەستیان بۆ ڕادەکێشا، هەندێکیشیان توشی نیمچەشۆکێک دەبوون. دڵنیا نیم، بەڵام وابزانم هەر لەبەرئەوە بوو کە زۆر حەزی لەو باخچەی ڕووەکە بوو. وابزانم لەویادا خۆی دەشاردەوە. ئانا مۆر کرابوو مۆر. هەر دەتگوت نیشانەیەکی زگماکی گەورە بە دەموچاویەوەیەتی.

وتم:

– ئەمە ئەگەر نەڵێین نیشانەی مردنی پێوە بووە.

لەویادا دەموچاوە زەردهەڵگەڕاوەکەی زۆر بە توندی گرژ بوو و گوتی:

– لە ڕاستیدا شتی زیاتریش هەیە. پەنجا ساڵ زیاترە پێشبینییەک کراوە و دەڵێیت ئەو کچەی خاوەنی ئەو وێنە ئەفسووناوییەیە لەو کاتەدا دەمرێت کە تەمەنی دەگاتە تەمەنی (ماخا)کەی گۆیا، بەڵام...

کەمێک دوودڵ بوو، بەڵام من ئاماژەم پێ دا بەردەوام بێت.

– بەڵام تەنها لەو کاتەدا دەمرێت ئەگەر خۆی بدات بە دەستی پیاوێکەوە. وەک سزایەک دەبێت بمرێت، چونکە کاتی خۆی ڕێگەی داوە ئاوها بێ شەرمانە بەڕووتی وێنەی بکێشرێت. بەپێی پێشبینییەکە گوایە هەر لە ڕێگەی وێنەکەوە خۆی داوە بەدەست چەندین پیاوەوە، لەبەرئەوە چیتر ئافرەتێکی ڕێزدار نییە، وە ئەگەر بوێرێت و بکەوێتە عەشقێکی ڕاستەقینەوە، ئەوا چارەنووس سزای دەدات.

ئاوڕێکم لێ دایەوە و گوتم:

– چ جۆرە بۆچوونێکی نابەجێیە، بەڵێ، بگرە نارەواشە. ئێ خۆ ئافرەتی وێنەکە ڕێگەی نەداوە بە ڕووتی وێنەی بکێشرێت. گۆیا هاتووە و تەنها وێنەی سەری ئەوی کێشاوە و خستویەتییە سەر لەشی ئافرەتێکی تر کە بە ڕووتی وێنەی کێشاوە،

وای نەکردووە؟
بەهێواشی سەری بەلای ڕاست و چەپدا جووڵاندەوە، هەر دەتگوت قسەکانم هەڵدەسەنگێنێت، ئینجا بەدڵنیاییەوە گوتی:
- چارەنووس نە ڕەوایە و نە ناڕەواشە. شتێکە ناتوانیت لێی ڕزگار بیت و تەواو. چارەنووس ئەو شتەیە کە هەیە. هەربۆیە هەمیشەش ڕاست دەکات.
دیسانەوە خەیاڵم چووەوە سەر نەخۆشیی دڵەکەی ئانا و گوتم:
- تۆ ئاماژەت بۆ مردنی ئانا کرد و لەو بارەیەوە بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ گوتت بۆیە مرد، چونکە دواجار بەتەواوەتی لە ئافرەتی تابلۆکەی گۆیا دەچوو، هەروەها گوتت لەگەڵ مردنیدا چیرۆکەکە کۆتایی پێ هات. باشە بەهەمان شێوەش ناتوانین بڵێین کە ئافرەتەکەی گۆیا کتومت لە ئانا چووە لەو کاتەدا کە مردووە، چونکە ئەو وێنەیەی کە گیراوە بە ڕێکەوت کەمێک بەر لە مردنی گیراوە؟
- ئێ هەر دەگاتەوە هەمان ئەنجام. ئەمەشیان هەروەک مەسەلەی هێلکە و مریشکەکەیە، لە هەر شوێنێکەوە دەست پێ بکەیت، ناتوانیت وەڵامی ئەو مەتەڵە بدەیتەوە، بەڵام کاتێک کورتەبنەکە ئەو وێنە شومەی (ئانا)ی گرت، چیرۆکی وێنەی کورتەبنەکە و چیرۆکی لێکچوونی ئانا و (ماخا)ی گۆیا لەنێو یەکدا توانەوە. بازنەکە کۆتایی پێ هات. لایەنی سەرسوڕهێنەر و پەشێویی ئەفسانەی ئەو کورتەبنەیە بەشێوەیەک لە شێوەکان لە باخچەکانی (ئالکازار)ەوە دەستی پێ کرد، هەر لەوێشدا کۆتایی هات.
دیسانەوە هەوڵێکی ترم دایەوە و گوتم:
- من نەمگوت کە بڕوام بەو چیرۆکانەیە، وابزانم خۆشت بڕوات پێیان نییە...
دوودڵ بووم، بەڵام ئەو ئاماژەی بۆ کردم کە بەردەوام بم و گوتم:
- وەک دەزانین ئانا نەخۆشیی دڵی هەبوو. نەیدەتوانی سەما بکات و باشتریش وابوو کە دووگیان نەبێت. کەچی لە باخچەکانی (ئالکازار)دا بەدوای کورتەبنەکەدا ڕایکرد و ئەوەش بووە هۆی مردنی. ئەو بەهۆی ماندووبوونێکی زۆرەوە گیانی لەدەست دا. مەگەر ڕاکردنەکەی بەناو باخچەکانی (ئالکازار)دا بە ئەندازەی سەمای فلامینکۆ ماندووی نەکردبێت؟
- بەهەرحاڵ ئەوە سەمای مردنی بوو، بەڵام بۆ دوای کورتەبنەکە کەوت؟ بۆیە دوای کەوت، چونکە وێنەی گرت. جگە لە ئانا هیچ کەسێکی تر دوای کورتەبنەیەک ناکەوێت، تەنها لەبەرئەوەی دەستی ناوە بە دوگمەی کامێرایەکدا و ڕەسمێکی

گرتووە. ئاخر لەیادیشت نەچێت ئەو وێنەیەی کورتەبنەکە گرتی، بەدرێژایی ژیانی بەدوایەوە بوو، ئانا لەگەڵ ئەو وێنەیەدا گەورە بووبوو.
لەو کاتەوەی لەسەر کورسییەکە هەستاین و کەوتینە ڕێ، یەک دوو هەنگاوێکمان دەنا و دەوەستاین، هەموو جارێکیش کە کەسێک بەلاماندا تێدەپەڕی، یەکسەر خۆسێ بەهێواشی قسەی دەکرد. بۆ ماوەیەکی کەم کەوتینەوە ڕێ و هیچمان نەگوت. سەرلەنوێ من دەستم بە قسە کردەوە:
– تۆ گوتت کورتەبنەکە لە مارسیلیادا وێنەی دەستەیەک یاریی کاغەزی بۆ (ئیل پلانیتا) کێشاوە، هەروەها گوتت یەک دوو دێڕ شیعری بچکۆلەشی بۆ هەر وەرەقەیەک داناوە.
خۆسێ کەمێک پێی هەڵگرت. ئینجا گوتی:
– ئیل پلانیتا هەندێک لەو دێڕە شیعرانەی لەبیر بووە، هەرچەندە بە زمانێک گوتراون کە نەیزانیووە و گوایە چۆن ئەو وشانەی گوێ لێ بووە، ئاوها لەسەر پارچە کاغەزێک هەموویانی نووسیوەتەوە. وەک دەڵێن ئەو پارچە کاغەزە تا سەردەمی (مانوئێل)یش لەلای ئەو خێزانە پارێزراوە.
– ئاوها؟
– وە ئەو کاتەی کورتەبنەکە لە (تریانا)دا مانوئێل دەبینێت، هەر ئەو چاکەتە کۆنەی ناداتێ کە کاتی خۆی لە (ئیل پلانیتا)ی قەرز کردبوو، بەڵکو لەگەڵ ئەوەشدا سەفتەیەک کاغەزیشی دەداتێ کە (٥٢) دێڕ شیعری لەسەر نووسراون، ئەو جارەیان بە زمانی ئیسپانی نووسراون. دەگێڕنەوە و دەڵێن گوایە دواتر مانوئێل ئیل سۆلیتاریۆ بۆی دەرکەوتووە کە ئەو شیعرە ئەڵمانیانەی کاتی خۆی ئیل پلانیتا نووسیبوونییەوە، کتومت وەک هەندێک لەو شیعرانە وابوون کە بە زمانی ئیسپانی دەستی کەوتوون.
– بەڵام لە کاتی ئێستادا هیچ یەکێک لەو شیعرانە نەماون؟
بەشێوەیەکی زۆر پڕ نهێنی سەری بۆ لەقاندم و گوتی:
– ئا لێرەدا ڕێگاکانمان پێک دەگەنەوە.
یەکەم جار نەمزانی مەبەستی چییە، بەڵام پاش نەختێک خەیاڵم گەڕایەوە بۆ تاڤیونی. لەویادا لەبەر هەیوانی کوخەکەمدا دانیشتبووم و لەنێو دارگوێزە هیندییەکانەوە گوێم لە چەند دەنگێک بوو. گوتم:
– ئەو ئەزموونەی لەدوای خەلقکردنەوە هەستی پێ دەکرێت، هەر هیچ نییە لەچاو

ئەو ئەزموونە مەزنەدا کە خۆت بتوانیت لە هیچی نەبووەوە خۆت خەلق بکەیت و لەسەر پێی خۆت بوەستیت.
چاوی داپچڕی و گوتی:
- ئافەرم! تۆ نەک هەر یادەوەرییەکی باشت هەیە، بەڵکو بە زمانی ئیسپانییەکی باشیش قسە دەکەیت.
لێوی خۆمم گەزت. تەنها لەویادا بۆم دەرکەوت کە بە ئیسپانی قسەمان دەکرد، لەوەوبەریش هەر بە ئیسپانی قسەمان لەگەڵ یەکتریدا دەکرد، تەنانەت ئەو کاتەش کە لە سالامانکادا بینیم.
پرسیارێکم لێ کرد و وتم:
- کەواتە دەتانزانی کە ئیسپانی دەزانم؟
سەری بۆ لەقاندم:
- دەتوانم بڵێم هەر لە یەکەم چرکەوە هەستمان بەوە کرد، بەڵام با بگەڕێمەوە سەر بابەتەکەم. ئەو (٥٢) دێڕە شیعرەی کە کاتی خۆی کورتەبنەکە بەر لە ونبوونەوەی لەتریانادا دابووی بە مانوئێل، بەدرێژایی ئەو ماوەیە لەلای خێزانی ئانا پارێزراو بوون. بەدەر لەوەش لەگەڵ تێپەڕبوونی ساڵەکاندا هەندێک لەو دێڕە شیعرانە خزاونەتە ناو دونیای گۆرانیی فلامینکۆوە کە لە سەرتاپای ئیسپانیادا دەگوترێت. ئانا هەر لە منداڵییەوە ئاشنای ئەو تێکستانە بوو.
- ئەو تێکستانە بوو کە ئێوە...
قسەکەی پێ بڕیم و گوتی:
- لە دەستەی کاغەزەکەدا هەر وەرەقەیە و شیعرێکی تایبەتی بۆ نووسراوە. ئێ زۆرجاریش من و ئانا لەگەڵ برادەرەکانماندا یاریی کاغەزمان دەکرد. هەمیشە لە یارییەکاندا شەریکی یەکتر بووین و پاشان کە منیش ئەو تێکستە کۆنانەم لەبەر کرد، بە زمانێکی نهێنی لەگەڵ یەکتردا قسەمان دەکرد کە پەیوەندی بە ژمارە و ڕەنگی کاغەزەکانەوە هەبوو.
- کەواتە لە یارییەکاندا گزیتان دەکرد؟
- بەڵێ هەندێکجار گزیمان دەکرد. جارجارێک لە کاتی یارییەکەدا لەبەر خۆمانەوە چەند وشەیەکی پچڕپچڕمان دەگوت و بەو شێوەیە یەکسەر دەمانزانی چ کاغەزێک لە دەستی ئەوی تردا هەیە.
- ئێ کەواتە (ماریۆ) ڕاستی دەکرد.

- بەتەواوەتی نا. (ماریۆ) زیاترێک بردنەوە یەک لەدوای یەکەکانمانی بە شێوەیەکی نهێنی لێک دایەوە، ئەو لەو بڕوایەدابوو کە ئێمە (کلاڤۆیانت) بین.

- بەڵام خۆ هەر هەمووی گزی و فزی نەبوو؟

وەڵامی پرسیارەکەمی نەدایەوە و لەبری وەڵام وتی:

- زۆرجار تا نیوەشەوانێک لەگەڵ برادەرەکانماندا دادەنیشتین و یاریی کاغەزمان دەکرد، بەتایبەتیش پاش ئەوەی کە ئانا چیتر نەیدەتوانی سەما بکات. ئانا هەروەک منداڵێک شاگەشکە دەبوو کە یارییەکی دەبردەوە، منیش.. بەڵێ منیش لە دڵی خۆمدا دەمگوت: «شایانی بردنەوەیە، خۆ ئەو چیتر ناتوانێت سەما بکات، دەبا شتێک هەبێت کە دڵی پێی خۆش بێت». من ئەو خۆشییە بچکۆلەیەم پێ بەخشی، بەڵام دەبێت بڵێم خۆشم دواترێک کەمێک خولیای ئەو یارییە بووم. ئێ خۆ منداڵمان نەبوو، بەڵام یارییەکی منداڵانەمان پێکەوە دەکرد. زمانێکی نهێنیشمان لەنێوان یەکدا پێک هێنابوو.

- قەت هیچ کەسێکیش پێی نەزانین؟

- بێگومان ناچار بووین بەردەوام وشەی نوێ دابهێنین، چونکە نەماندەتوانی بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ هەر هەمان ئەو وشە دیاریکراوانە بەکار بهێنینەوە. واتە بەردەوام یان وشەی نوێمان دەخستە سەر دێڕە شیعرییە کۆنەکان، یاخود دێڕە شیعرێکی تەواو تازەمان دادەڕشت، بەڵام سەرباری ئەوەش هۆیەکی تریش لەئارادا بوو.

- ئەویان چی بوو؟

- هەر لەو کاتەوەی کە بەتەواوەتی بۆمان دەرکەوت ئانا نەخۆشیی دڵی هەیە، پەیوەندییەکی یەکجار هەستیارمان بەرامبەر بە حەقیقەتەکانی ژیان لەلا گەڵاڵە بوو. ئێمە وەک پڕبەهاترین دیاری تەماشای هەموو چرکەیەکی ژیانمان دەکرد کە پێکەوە بەسەرمان دەبرد. پاشانیش کاتێک سەمای فلامینکۆیان لێ قەدەغە کرد و ئامۆژگارییان کرد کە منداڵی نەبێت، خودی مانای ژیانمان سەرلەنوێ تاوتوێ کردەوە و هەڵمانسەنگاندەوە.

- باشە ئانا هیچ مانایەکی نوێی دۆزییەوە؟

- هێشتا هەر پێکەوە بووین و هەردووکمان هەستێکی تایبەت و بەگوڕمان بەرامبەر ژیان هەبوو. دکتۆرەکان هەوڵیان دا هێمنمان بکەنەوە، بەڵام کاتێک لەناکاوێکدا سەماکردن لە (بایلائۆرا)یەکی (سەماکەرێکی) بەناوبانگ قەدەغە دەکرێت، وەک

ئەوەیە یەکسەر فڕێی بدەیتە قەراغی ژیانەوە. ئانا ماریا ئەو هەستەی لا دروست بوو، بەڵێ، هەردووکمان بەو شێوەیە هەستمان دەکرد، بەڵام یەک جیاوازیی گرنگمان هەبوو: ئانا بڕوای بەوە بوو کە ئەم ژیانەمان تەنها ژیانێک نییە کە تەواو بێت و ببڕێتەوە، بەڵکو ئەو بەتەواوەتی قەناعەتی بەوە هەبوو کە لەدوای مردنیشەوە ژیانێکی تر بوونی هەبێت، بەڵام لەلایەکی ترەوە هەردووکمان هەستێکی تەواو ڕوونمان بەرامبەر پەرجووی ئەم ژیانە هەبوو و وەک یارییەکیش دەگەڕاین بەدوای وشەی نوێدا کە گوزارشت لەو شتانە بکەن کە دەمانبینین و بیرمان لێ دەکردنەوە. بەو شێوەیەش پەرەمان بەو وتە دێرینانە دا کە پەیوەندی بە دانە بە دانەی وەرەقەی یاریی کاغەزەکەوە هەبوو. هەندێک لە داڕشتنەکانی کورتەبنەکەمان هێشتەوە و دەستبەرداری هەندێکی تریان بووین. بەو جۆرە دەربارەی ئەم ژیانە، مانیفێستێکی تایبەت بە خۆمانمان داهێنا. لێرەدا دەمەوێت ئەوەش بڵێم کە ویستمان پێکەوە شتێکی وەها دابهێنین کە لەدوای خۆشمانەوە بمێنێتەوە. هەروەها ویستمان ئەو مانیفێستە ببێتە وەسێتنامەیەکی ڕۆحی هەردووکمان.

– هەر لەبەرئەوە بوو کە بەردەوام حیکمەتی نوێتان دەخستە سەر؟

– بەڵێ، بەردەوام دێڕی نوێمان دەخستە سەر، هەموو ڕۆژێک. بەردەوام مانیفێستەکە گۆڕانکاری بەسەردا دەهات، پرۆسەیەکی وروژێنەر بوو. هەتا ئەم دوادواییەش حیکمەتی نوێمان دەهۆنییەوە و لەبری حیکمەتە کۆنەکان دامان دەنا.

– تاڕادەیەک... شتێکی شێتانەیە.

سەری بۆ ڕاوەشاندم و وتی:

– نا، بەهیچ شێوەیەک. هەرچەندە لەوانەیە بەو شێوەیە بێتە بەرچاوی تۆ، بەڵام لە ڕاستیدا شتێکی هێندە سەیر و نائاسایی نییە. قەرەجەکانی ئەندەلوس هەمیشە ئەو دێڕە بچکۆلانانەیان کۆکردۆتەوە کە دەربارەی ژیان و مردن و خۆشەویستین. هەر لە سەردەمی (ئێل پلانیتا)وە ئا بەو شێوەیە گۆرانیی فلامینکۆیان داڕشتووە.

چەند دێڕێکیانم سەرلەنوێ خوێندەوە و وتم:

– ئەگەر خودایەک هەبێت، ئەوا نەک هەر لەوەدا زۆر زیرەکە کە هیچ شوێنەوارێک لەدوای خۆیەوە جێنەهێڵێت، بەڵکو مامۆستایەکی گەورەشە لە هونەری خۆشاردنەوەدا. لە ڕاستیدا جیهانیش هەروا بە ڕاشکاوی خۆی نیشان نادات. گەردوونیش بەردەوام نهێنییەکانی خۆی شاردۆتەوە و نایاندرکێنێت. ئێ خۆ ئەستێرەکانیش هێندە ورتەورت لەگەڵ یەکدیدا ناکەن...

لەویادا ناچار بووم بوەستم، چونکە لەوەندە زیاتری قسەکانی (ئانا) و (خۆسێ)م بیر نەکەوتەوە کە کاتی خۆی لە یەکەمین ئێوارەی (ماراڤیو)دا لەناو دارگوێزە هیندییەکاندا وتیان، بەڵام خۆسێ قسەکەی بۆ تەواو کردم و گوتی:
– بەڵام تا ئێستاش هیچ کەسێک ئەو تەقینەوە گەورەیەی لەیاد نەکردووە. هەر لەو کاتەشەوە بەردەوام بێدەنگی زاڵ بووە و هەموو ئەو شتانەش کە بوونیان هەیە هێدی هێدی لە یەک دوور دەکەونەوە. هێشتا بواری ئەوە ماوە کە چاومان بە مانگێک یاخود ئەستێرەیەکی کلکدار بکەوێت، بەڵام چاوەڕوانی ئەوە مەبە کە بەشێوەیەکی میهرەبانانە بانگهێش بکرێیت، چونکە لە ئاسماندا کارتی سەردان و داوەتنامە چاپ ناکرێن.
چەپڵەم بۆ لێ دا و لێم پرسی:
– خۆ ئەو (تەقینەوە گەورەیە) لە کورتەبنەکەوە نەهاتووە کە کاتی خۆی لە مارسیلیادا چاوی بە (ئیل پلانیتا) کەوت؟
– بۆ نا؟
– ئاخر هەم ئەو دەستەواژەیە و هەم ئەو تیۆرییەش زۆر لەدوای ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەوە داهێنران.
وەک کەسێکی زانا خەندەیەکی بچکۆلەی خستە سەر لێوانی و گوتی:
– وابزانم ئەو زۆرزانە دەتوانێت چەندین شت بە قاچاخ لەنێوان سەدەکاندا بێنێت و بەرێت. بەلای منەوە ئەو نموونەی هەوڵ و تەقەللای مرۆڤایەتییە کە بەردەوام دەیەوێت شتێکی زیاتر لە مەغزای ئەم جیهانە تێبگات. من خۆم ئەو حاڵەتەم زۆر پێ خۆشە کە دەبینم نوێنەرێکمان هەیە و بەو شێوەیە دەتوانێت بە خۆی و پەیام و زانیارییەکانییەوە لەنێوان سەدەکاندا بێت و بچێت.
هەروا وەستابووم و دەمم داچەقیبوو، ئینجا بەپەلە گوتی:
– بەڵام تۆ ڕاست دەکەیت. لە مانیفێستی کورتەبنەکەدا تەنها یەکەم دێڕی تێدایە کە دەڵێت: «ئەگەر خودایەک هەبێت، ئەوا نەک هەر لەوەدا زۆر زیرەکە کە هیچ شوێنەوارێک لەدوای خۆیەوە جێنەهێڵێت، بەڵکو مامۆستایەکی گەورەشە لە هونەری خۆشاردنەوەدا».
بەلای گۆڕەپانی (هۆندوراس) تێپەڕین و بەرەو (پاسیۆ دی لا ڕیپۆبلیکە کوبا) دەڕۆیشتین. گوتم:
– وابزانم کاتی ئەوە هاتووە پوختەیەکی ڕووداوەکان بخەینەڕوو.

- فەرموو.
- ئەو بەیانییەی مانگی یەک کە من گەیشتمە دوورگەی (تاڤیونی)، لە بەرهەیوانی کوخەکەمدا دانیشتبووم. لەپڕێکدا دوو کەس بەناو دارگوێزە هیندییەکاندا هاتن و باوەشیان کردبوو بە یەکدا، لە ناوەڕاستی ڕێگاکەدا وەستان و هەندێک تێکستی تایبەتییان بە زمانی ئیسپانی بە یەکتر گوت. منیش گوێم هەڵخست. ئێ خۆ ئێوە نەتاندەزانی کە من لە بەرهەیوانەکەدا دانیشتووم؟
بە کەمێک ماتەمینییەوە خەندەیەکی بۆ کردم و گوتی:
- لە ڕاستیدا (جۆن) پێی گوتبووین کە نەرویجییەک هاتووە، هەروەها گوتیشی ڕەنگە ببێتە هاوەڵێکی نوێی یاریی (بریج)ەکەمان. بەرلەوەی تۆ بێیت، هۆڵەندییەکی لێ بوو و تازە دوورگەکەی جێهێشتبوو، ئێمەش لەو ڕۆژانەی پێش گەیشتنی تۆ، لەبەرامبەر ئەو و (ماریۆ)دا یاریمان دەکرد. جۆن ئەوەشی پێ گوتین کە تۆ لە چ کوخێکدا دابەزیویت، بەدەر لەوەش سەرنجی دابوو لە بەرهەیوانەکەدا دادەنیشیت.
- بەڵام خۆ نەتاندەزانی کە زمانی ئیسپانی دەزانم؟
- نەخێر، لەو کاتەدا ئەوەمان نەدەزانی. هەرچەندە بەڕاستی زمانێکی کەمینەش نییە. نیوەی دونیا بە زمانی ئیسپانی قسە دەکەن.
- پێم وابێت ئەمەیان جۆرە زیادەڕۆییەکە. بەڵێ ڕاستە نیوەی هونەری دونیا ئیسپانییە، من تا ئێرە لەگەڵتا دێم، بەڵام لەوەندە زیاتر نا.
بۆ ماوەی یەک دوو چرکە هەستم کرد کەمێک ژیان لەسەر ڕووخساری ماسکە ڕەنگ زەردەکەی دەموچاوی دەرکەوت، ئینجا گوتم:
- دواتر لەسەر قەراغ ئاوەکە چاوم پێتان کەوت.
- تۆش کەمێک باسی هۆکاری سەفەرت بۆ ئەو شوێنەی دونیادا بۆ باس کردین. قسەکانت سەرنجی ڕاکێشاین، ئاخر ئێمە بەردەوام حیکمەتی نوێمان دەخستە سەر مانیفێستەکەمان و وەک فیکرەیەک پێمان وابوو بتوانین هەندێک لە تێڕوانین و بۆچوونی زانایەکی بایۆلۆجی دەربارەی ژیان و بوون وەربگرین. ئەوەی زیاتریش فریوی داین، ئەوە بوو کە تۆ بەردەوام بە زمانی ئینگلیزی قسەت لەگەڵدا دەکردین، هەرچەندە بەئاشکرا دیاربوو کە زمانی ئیسپانیش دەزانیت.
- بەئاشکرا دیاربوو؟
- هەرەگرنگترین سیفەتی ئەکتەرێک ئەوەیە کە بەتەواوەتی بچێتە ناو دەورەکەیەوە و بە باشی دەورەکەی خۆی ببینێت.

- ئەی من دەورەکەی خۆمم بەباشی نەدەبینی؟
- نەخێر. هەر لەسەر قەراغ ئاوەکەدا خۆت دەرخست. من و ئانا هیچمان سەعاتمان پێ نەبوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بە زمانی ئیسپانی لە ئانام پرسی: «سەعات چەندە؟»، کەچی تۆ یەکسەر تەماشای سەعاتەکەت کرد و گوتت: «دوانزە و چارەکە».
بەتەواوەتی سەرسام بووم.
- بێگومان تەنها ئەوە بەس نەبوو بۆ ئەوەی بەدڵنیاییەوە بزانین کە زمانی ئیسپانی دەزانیت، بەڵام کۆمەڵێک نموونەی هاوشێوەی ئەوە ڕوویدایەوە و لەو بارەیەوە بۆمان دەرکەوت سەرنجت کورتی دەهێنێت. مەسەلەیەک هەیە دەڵێت: «ئەو کەسەی درۆ دەکات، دەبێت یادەوەرییەکی زۆر باشی هەبێت». لەیادیشت نەچێت من و ئانا هەر لە یاریی وەرەقەدا کارامە نەبووین، بەڵکو لە بواری دەوربینینیشدا پسپۆڕ بووین.
- ئەی بۆ ڕووتان لەسەر هەڵنەماڵیم؟
- ئانا پێی خۆش بوو کە.. کە..
- کە چی؟
- پێی خۆش بوو کە بینەرێکمان هەبێت، ئاخر ئێمە شانازیمان بەو مانیفێستەوە دەکرد کە دامانهێنابوو، یاخود ڕاستترێک بڵێم ئەو مانیفێستەی کە بەردەوام دەمانهۆنییەوە. تا ئەندازەیەک پێمان خۆش بوو وەک دوو کەسی سەیر و پڕ نهێنی دەرکەوین.
- بەڵێ، لەوەیاندا زۆر سەرکەوتوو بوون.
- بەدەر لەوەش ویستمان فریوت بدەین تا باسی تیۆری گەشەسەندنەکەتمان بۆ بکەیت، لەبەرئەوە دەبووایە لە پێشدا کەمێک خۆمان بنوێنین. ناچار بووین بۆ فریودانت، شتێکت پێشکەش بکەین..
- تیۆری گەشەسەندن هی من نییە.
- بێگومان ڕاستە. من و ئانا تەبا بووین لەسەر ئەوەی کە تەنانەت زانستی سروشتیش بۆی هەیە لە چەندین بواری جیاوازدا بەتەواوەتی کوێر بێت.
- بەڵێ، من لەوە تێگەشتم، بەڵام بە بڕوای تۆ ئەو شتە چییە کە زانستی سروشتی لە ئاستیدا کوێرە؟
- ئێ کاتی خۆشی باسی ئەوەیانمان کرد. لە پەیوەندیی نێوان شتەکاندا کوێرە. لە ئاستی ئەو مانایەدا کوێرە کە لە تان و پۆی بووندا هەیە. ئاخر تەقینەوە گەورەکە

هەروا شتێکی بێ مانا نەبووە.
- زۆر بمبوورە، بەڵام بەڕاستی لە مەبەستت تێناگەم و نازانم دەتەوێت چی بڵێیت!
- ئەوەیان لەبەرئەوەیە کە تۆ ئەو حاڵەتە نابینیت کە جیهان خۆی بۆ خۆی شتێکی پڕنهێنییە.
- بەڵێ، ئەوەیان باش دەبینم، بەڵام لە ڕاستیدا لەوەندە زیاترێک نابینم کە ئێمە هەردووکمان باسی مەتەڵێک دەکەین و هیچمان ناتوانین هەڵیبهێنین.
- تەنانەت لەو شتانەشدا کە لێیان تێناگەین، دەکرێت جۆرە مانایەکیان تێدا ببینین.
- باشە، بەڵام خۆ تۆ ناتەوێت ئامانج بۆ شتێک دابنێیت کە خۆی لە خۆیدا هیچ ئامانجێکی نییە؟
کەمێک چاوی گەشایەوە و گوتی:
- بگەڕێوە سەر سەردەمی (دێڤۆن)، چی دەبینیت؟
پاش ئەو هەموو شتانەی کە گوێم لێیان بوو، زۆر بەباشی نەمدەتوانی بیر بکەمەوە، لەبەرئەوە ڕاستەوخۆ کەوتمە ناو تەڵەکەیەوە و گوتم:
- یەکەمین گیانداری وشکاوەکی دەبینم.
سەری بۆ لەقاندم و گوتی:
- ئێ تەنها ئەمڕۆ مانای ئەو شتە دەبینین کە لەو کاتەدا ڕوویداوە. ئەگەر چوارسەد ملیۆن ساڵ لەمەوبەر ژیانی سەر ئەم زەوییەمان ببینیایە، ئەوا وەک نمایشێکی گەورە و ناشیرینی بێ مانا دەهاتە بەرچاومان، بەڵام تەنانەت نهێنیش چوارچێوەیەکی زەمەنی دیاریکراوی خۆی هەیە و لەبەر ڕۆشنایی ئاگایی مرۆڤدا، ئەمڕۆ دەزانین کە ژیانی سەردەمی (دێڤۆن) لێوانلێو بووە لە مانا. ئەوە سەرەتای سەرهەڵدانی خۆمان بوو، بگرە سەرەتای خودی وێناکردنی ژیان بوو لە سەردەمی (دێڤۆن)دا. ئەگەر بۆقە بڕیڕەدارەکانی سەردەمی (دێڤۆن) نەبوونایە، ئەوا قەت هیچ جۆرە ئاگاییەک دەربارەی ژیانی سەر ئەم زەوییە بوونی نەدەبوو، نە لە ڕابردوودا و نە لە داهاتووشدا. نابێت تەنها ڕێز لە دایک و باوکمان بگرین، بەڵکو دەبێت ڕێز لە منداڵەکانیشمان بگرین.
- کەواتە مرۆڤ پێوەری هەموو شتێکە؟
- من وام نەگوت، بەڵام بەڕاستی ئاگاییمان ئەو شتانە دیاری دەکات کە بەلای

ئەقڵمانەوە مانایەک دەبەخشن. ئەو کاتەی کە ئەم سیستەمی خۆرەی خۆمان دامەزرا، هەر لە پرۆسەیەکی لەڕادەبەدەر ناخۆش دەچوو، بەڵام ئەوە تەنها سەرەتایەک بوو.

- سەرەتایەک؟

- بەڵێ سەرەتایەک. پارادۆکسەکەش لەوەدایە کە ئێمە دەتوانین لەو سەرەتایە تێبگەین، هەرچەندە زۆر زۆر دواتر سەرمانهەڵداوە. بەو شێوەیە مێژووی ئەم سیستەمی خۆرییەی خۆمان لە بازنەیەکدا دەخولێتەوە و دەچێتەوە سەر خاڵی سەرەتایی.

- هەروەک مێژووی (ماخا)کەی گۆیا؟ ماوەیەکی زۆر کەم لەمەوبەر لە باخچەکانی (ئالکازار)دا دەستی پێ کرد و هەر لەوێشدا کۆتایی پێ هات.

- بەڵێ دەتوانین هەمان شتیش دەربارەی گەردوون بڵێین: پانزە ملیارد ساڵ بەسەر تەقینەوە گەورەکەدا تێپەڕی، ئینجا دەنگی گرمەکەی بیسترا.

بەدەم ڕێگاوە سەرم ڕاوەشاند و گوتم:

- ئەوە تێڕوانینێکی سەیرە.

- بەڵام من و تۆ، کە پاش پانزە ملیارد ساڵ لەدوای ئەو ڕووداوەوە سەرمانهەڵداوە، لە ڕاستیدا ئەو شتەمان (لەبیرە) کە پانزە ملیارد ساڵ لەوەوپێش ڕوویداوە. بەو شێوەیەش دواجار گەردوون بەئاگا بووە لە خودی خۆی، هەرچەندە زۆر زۆریش دواکەوتووە، تاڕادەیەک هەر لەوەدەچێت کە گوێت لە دەنگی هەورەگرمەیەکی دوور بێت، بەڵام زۆر پێش ئەوە هەورەبروسکەکەی لە ئاسماندا درەوشاوەتەوە.

ویستم پێبکەنم، بەڵام نەمتوانی، ئینجا وەک سەرنجێک گوتم:

- چەند ئاسانە پاش ڕووداوێک حەکیمانە بیر بکەینەوە، تۆ یەکێکیت لەو کەسانە.

کەمێک بە ڕوونی تەماشای ناو چاوی کردم و گوتی:

- ئێ ئەوەش خۆی لە خۆیدا جۆرێکە لە حیکمەت. ڕەنگە تەماشاکردنی ڕابردووش حیکمەتێکی تێدا بێت. ئێ خۆ ئێمە بە پلەی یەکەم ڕابردووی خۆمانین وەک لەوەی داهاتوومان بین.

منیش لەویادا گوتم:

- من لە خودی ئەو وێنەیە تێدەگەم کە باسی دەکەیت و دەزانم کە مانای ئەو شتەی لە ئێستا و ئێرەدا ڕوودەدات، لەبەر ڕۆشنایی شتێکی تردا کە زۆر دواتر ڕوودەدات، ئینجا دەردەکەوێت.

- هەڵبەتە ئەگەر هەر لە بنەڕەتدا شتێکی وەک (لەوەوپێش) و (لەوەودوا) بوونی هەبێت. ئەو شتەی لە ئاسمانی بەریندا دەیبینین، مەبەستم لە مێژووی چەندین ملیارد ساڵی گەردوونە، هۆکاری ئەو ڕووداوانەیە کە لە ئێستادا ڕوودەدەن. گەردوون مریشکەکە و هێلکەکەشە، لە یەک کاتدا هەردووکیانە.

گوتم:

- هەروەک ئانا. یان وەک ئەو وێنەیەی ئانا، کە کورتەبنەکە گرتی.

هیچ شتێکی لەو بارەیەوە نەگوت، بەڵام لەبری ئەوە گوتی:

- ئێمە نازانین بەرەو چ شتێک دەڕۆین. تەنها ئەوەندە دەزانین کە سەفەرێکمان دەست پێ کردووە. کاتێکیش دەگەینە کۆتایی ئەو ڕێگایە، ئینجا دەزانین بۆچی ئەو سەفەرە دووروودرێژەمان کردووە، خۆ پێشیدەچێت ئەو سەفەرە بۆ ماوەی چەندین نەوە درێژ ببێتەوە. بەو شێوەیەش هەمیشە خۆمان لە حاڵەتی کۆرپەلەدا دەبینینەوە. زۆربەی ئەو شتانەی کە ئەمڕۆکە هیچ مانایەکیان تێدا نابینین، ڕەنگە لە دووڕیانی داهاتووی ڕێگاکەماندا ئامانجەکانیان دەرکەون. تەنانەت هەرە بێ ماناترین ڕووداویش، لەوانەیە دواترێک ڕوون ببێتەوە کە هەر زۆر زۆر پێویست بووە. مەبەستم لەمەیە: کاتی خۆی کوڕە قەرەجێک دەستەیەک یاریی کاغەزی بە دەریاوانێک فرۆشتووە، بەڵام کێ لەو کاتەدا هیچ گرنگییەکی بە شتێکی وا داوە؟

یەکسەر لە شوێنی خۆمدا وەستام و سەرلەنوێ گومانم لە هەموو شتێک کردەوە. باشە کاتی خۆی لە تاڤیونی، (جۆن)یش کتومت هەمان ئەم جۆرە بیرکردنەوەیەی هەڵنەڕشت؟ هەر ئەو نەبوو کە گوتی : «سەردەمی دێڤۆن حاڵەتی کۆرپەلەی ئەقڵ بووە»؟ بڵێیت تا ئێستاش جۆن هەر پەیوەندی بە (خۆسێ)وە مابێت؟ بڵێیت ئەو دووانە هاریکاریی یەکتریان نەکردبێت؟ نەک تەنها لەسەر دوورگەکانی فیجی، بەڵکو دواتریش؟ چیتر نەمدەتوانی جیاوازی لەنێوان فیکرەی ئەم و ئەودا ببینم.

گەیشتینە لای «کالە (ئافۆنسۆ)ی دوانزە» و هەردووکمان تەماشای سەعاتەکانمان کرد، چارەکی دەویست بۆ دوانزە.

هەتا ویستگەی شەمەنەفەرەکە لەگەڵیدا ڕۆیشتم، لەویادا گوتم:

- دواجاریش خۆتان لە ئێمە دوور خستەوە، ویستتان بەتەواوەتی تەنهابن.

- بەڵێ، ئەوەش لەبەرئەوە بوو کە دیسانەوە باسی ئانا هاتەوە پێشەوە و ویستتان بزانن لە کێ دەچێت. لەو کاتەشدا کە زۆرتان لە ئانا کرد تا سەمایەکی فلامینکۆ بکات، بەتەواوەتی خۆمان کێشایەوە. پێم وا نییە بزانیت ئانا چەندە پێی خۆش

بوو سەما بکات.
- ئینجا لە کاتی نانخواردنی بەیانیدا بورایەوە و تۆش زللەیەکت لێ دا.
یەک دوو جار بۆی کۆکی، پاشان گوتی:
- هەمیشە کە وای لێ دەهات، لەڕادەبەدەر دەترسام.
- باش تێدەگەم.
گەیشتینە بەردەم شۆستەی شەمەنەفەرەکە، دیسانەوە دڵنیام کردەوە کە بۆ ڕۆژی هەینی لە ئیشبیلییەدا دەیبینم. ڕێک لەو کاتەدا بوو کە زەرفە زەردەکەی بۆ ڕاکێشام و گوتی:
- ئەمە بۆ تۆ و ڤیرا.
- ڤیرا؟
- بەڵێ، بۆ هەردووکتانە.
کەواتە قسەی لەگەڵ (جۆن)دا کردبوو. هیچ گومانێکم لەوە نەبوو. جۆن تەنها کەسێک بوو کە من باسی تۆم کەمێک بە دووروودرێژی بۆ گێڕابووەوە.
- ئاخر ئەی چی لەو زەرفەدایە؟
بەتوندی تەماشای ناو چاوی کردم و بەڕاستی وەک کەسێکی سەرسام هاتە پێش چاوم، ئینجا پرسی:
- تا ئێستاش هەر تێنەگەیشتوویت؟
سەرم بۆ ڕاوەشاند و ئەویش لەسەر قسەکانی بەردەوام بوو:
- ئەوە دیارییەکە، بەڵام هاوکات بارێکی قورسیشە. شتێکە کە دەبێت دوو کەس دابەشی بکەن. شتێکە و بۆ کەسێک کە لەم تەمەنەی تۆدایە باش نییە بە تەنها بۆ خۆی هەڵیبگرێت.
دیسانەوە تەماشای سەعاتەکەی کردەوە و بەپەلە بەرەو قیتارەکە ڕۆیشت.
لە ڕێگەی گەڕانەوەمدا بەرەو ئوتێلەکە زەرفەکەم کردەوە. ئەو زەرفە زەردە گەورەیە کۆمەڵێک وێنەی نایابی تێدابوو کە ئانا لە تاڤیونی گرتبوونی. کاتێکیش کە گەیشتمەوە ژووری ئوتێلەکەم، تەماشای پشتی یەکەم وێنەم کرد، ئینجا زانیم کە شتێک لەسەر پشتی دانە بە دانەی وێنەکان نووسراوە. ئەوە مانیفێستەکە بوو، ڤیرا. ئەوە بوو کە دەبووایە دوو کەس دابەشیان بکردایە. ئەو مانیفێستە بوو کە باش نەبوو بۆ کەسێکی هاوتەمەنی من تەنها بۆ خۆی هەڵیبگرێت.

# دژایەتییەکی یەکجار کەم لە لۆجیکدا هەیە

ئا بەو شێوەیە کۆتایی بەو نامەیە دێت کە بۆ ڤیرا نووسرابوو. ئێوارە درەنگانێکی ڕۆژی پێنجشەممەی (٧ی مانگی پێنجی ١٩٩٨) بە (ئی — مەیل) نێردرابوو، ساڵێکی ڕەبەق بەسەر ناردنی ئەو نامەیەدا تێپەڕی و ئینجا من نوسخەیەکیم دەست کەوت.

لەوەوپێش گوتم پاشکۆیەکی تێروتەسەلی بۆ دەنووسم و ئێستاش هەر لەسەر پەیمانەکەی خۆم ماوم، بەڵام با لە پێشدا بزانین ڤیرا بە چ شێوەیەک وەڵامی نامەکەی (فرانک)ی داوەتەوە. دەتوانین ئەوەشیان بزانین، چونکە پاش ئەوەی ڤیرا نامە دوورودرێژەکە دەخوێنێتەوە، فرانک (ئی— مەیل)ێکی تریشی بۆ ناردووە و دواجار ڤیرا تەلەفۆنێکی کردووە بۆ ئوتێلەکە و قسەی لەگەڵ (فرانک؟)دا کردووە.

بۆ ئێستا شەوێکی هاوینە و من لە (کرۆیدن)م، لەسەر مێزی نووسینەکەم دانیشتووم و نامە دوورودرێژەکەم لەبەردەستدایە، دەبێت ئەوەش بڵێم کە لە مانگی یانزەی هەمان ساڵدا، (فرانک)م لە ئوتێلی (پالاس)دا بینییەوە، واتە شەش مانگێک پاش ئەوەی لەو ئوتێلەدا نامەکەی بۆ ڤیرا نووسیبوو. زۆر بەڕوونی ئەو کاتەم بیر کەوتەوە کە پەرۆش بوو و نەیدەزانی لە (سالامانکا)دا ڤیرا دەبینێتەوە یان نا. کاتێکیش کە لە مانگی یانزەدا بینیمەوە، نەمزانی یەکتریان بینیوەتەوە یان نا، چونکە لەو کاتەوەی کە لە دوورگەکانی فیجی ماڵئاواییمان لە یەکتر کرد، ئیتر هیچ جۆرە پەیوەندییەکمان پێکەوە نەبووە.

لە دڵی خۆمدا گوتم: «بڵێیت دیسانەوە فرانک و ڤیرا پێکەوە بژین؟ یان هەروا بە سەردانێکی کورت هاتۆتە مەدرید و سەفەرەکەی هیچ پەیوەندییەکی بە ڤیراوە نییە؟»

لەژێر قووبەکەدا دانیشتبووم و چام دەخواردەوە، پسکیتم دەخوارد و گوێم بۆ ئاوازی دڵفڕێنی (هارپژەن)ەکە شل کردبوو، پارچە مۆسیقای (شۆخە خەوتووەکە)ی جایکۆڤیسکی دەژەند. بەڕاست، فرانکیش لە نامەکەیدا باسی ئەوەی کردووە کە

کەرەتێکیان لەوێدا دانیشتووە. لەپڕێکدا هەر لە مێزەکەمەوە، کە ڕێک لەبەردەمی بارەکەدا بوو، چاوم بە فرانک کەوت، بەرەو ساڵۆنە خڕەکە دەهات. سەرم سوڕما، ئاخر ڕێکەوتێکی یەکجار دەگمەن نییە کە من لەوێدا لە (پالاس) بیبینمەوە؟ بەلامەوە سەیر بوو هێندە دوور لە دوورگەکانی فیجی و لەندەنەوە بیبینمەوە؟ زیاترێک ڕێی تێدەچوو لە ئۆسلۆدا بیبینم، کە هەر چەند حەفتەیەک لەمەوبەر سەفەرێکی کورتخایەنم بۆ کرد.

من ئۆسلۆم زۆر بەلاوە جوان بوو، خۆشترین شتیش بەلامەوە ئەوە بوو کە فرانک لە پایتەختێکی مۆدێرنی ئەوروپیدا دەژیا و لەگەڵ ئەوەشدا هەر چەند سەد مەترێک لەولا ئۆسلۆوە دەتوانیت بچیتە ناو ناوچەیەکی سروشتیی بەربڵاوەوە. پیاسەیەکی دوورودرێژم بە شوێنێکدا کرد کە پێی دەڵێن (ئوللەڤۆلستە)، کە ناوچەیەکی لەڕادەبەدەر دڵفڕێن و ئارامە و لەوێشەوە چووم بۆ (فرۆگنستە)، وابزانم لەو هەموو ڕێگایەدا توشی یەک دوو کەس بووم.

بینینی فرانک لە (پالاس)دا هەروەک ئەوە وابوو کە بەسەر تاوانێکەوە گیرابم، سەرسام بووم و لەبری ئەوەی یەکسەر بچم بۆ لای و سەلامی لێ بکەم، لە شوێنی خۆمدا چەقیم، بەڵام بەدەر لەوەش بەئاشکرا دیاربوو کە چاوی دەگێڕا و لەو ساڵۆنە خڕەدا بەدوای کەسێکدا دەگەڕا. هەر پاش نەختێک منی بینی و بەرەو لای مێزەکەم هات. هاواری کرد و گوتی:

- جۆن! چ ڕێکەوتێکی سەیرە!

تەنها یەک دوو خولەکێک پێکەوە دانیشتین، چونکە چاوی بەو ژنە کەوت کە هاتبوو بەدوایدا. هەستم کرد ئەو ژنە ڤیرا نییە، سەعاتێک دواتریش بەتەواوەتی دڵنیا بووم کە ئەو نەبوو. من لەبەر چەند هۆیەکی تایبەتی وێنەیەکی ڕوونی ڕووخساری (ڤیرا)م لەبەرچاودا بوو، هەڵبەتە بەبێ ئەوەی قەت لە ژیانمدا بینیبێتم. ڕەنگە ئەم قسەیەم ئاڵۆز بێتە بەرگوێ، بەڵام دواتر لە پاشکۆکەدا بە تێروتەسەلی ڕوونی دەکەمەوە.

فرانک هەر فریای ئەوەندە کەوت کە پێم بڵێت چەند ڕۆژێک لە ئوتێلەکەدا دەمێنێتەوە. لەسەر ئەوەش ڕێکەوتین کە ئەو ئێوارەیە پێکەوە بیرەیەک بخۆینەوە. گوتی:

- با یادەوەرییەکانمان نوێ بکەینەوە، ئاخر ئەو ڕۆژگارانە هەر زۆر بەئاسانی لەیاد دەچنەوە.

هەر ئەوەندەی هەستا و چووە ناو چێشتخانەکەوە، یەکسەر ئەو قسەیەی لێی دام کە وتی: «با یادەوەرییەکانمان نوێ بکەینەوە»، ئیدی یەک و دوو پلانێکی زۆرزانانەم

لە خەیاڵمدا دارِشت، هەر ئەوەندە بوو دەبووایە لە پێشدا وەک کەسێکی چاونەترس یەک دوو تەلەفۆنی گرنگم بکردایە، بەڵام وەک چەند پرسیارێکی بنەڕەتی خۆم بە خۆمم گوت: «بڵێیت بتوانم پلانەکەم بەدی بهێنم؟ وە بەتایبەتیش، بڵێیت بتوانم فرانک فریو بدەم؟» بە داخێکی زۆرەوە دەمزانی مەترسیی ئەوە لەئارادایە کە ببمە هۆی نانەوەی گێژاوێکی گەورە و قوڕ، هەڵبەتە نەک هەر بۆ خۆم، بەڵکو زیاترێک بۆ ئەو کەسانەی کە بەناچاری تێوەی دەگلان.

نامەوێت بڵێم جۆرە ڕێکەوتێکی ئاوها دەستی قەدەر یان جۆرە ئاگاییەکی سەرووسروشتی تێدایە، بەڵام بەڕاستی تەنها یەک کەڕەت شەنسێکی ئاوهام بۆ هەڵکەوت و نەمویست هەروا بەئاسانی بەفیڕۆی بدەم. کەوتبوومە ناو بارودۆخێکی دژوارەوە، بەڵام دەبێت دان بەوەشدا بنێم کە ئەگەر ئەو پاشنیوەڕۆیە لە مەدریددا ئەو هەلەم لەدەست بدایە کە لەپڕێکدا هاتە بەردەمم، ئێستاکە ئەو نامەیەی فرانکم لەبەردەستدا نەدەبوو.

کەواتە فەرموو فرانک، نۆبەی تۆیە قسە بکەیت. نامەیەکی تریشت بۆ ڤیرا نارد و ئیدی لەدوای ئەوەوە تەنها دوابەش دەمێنێتەوە، ئێ خۆ هەر دەبێت یەکێکمان باسی ئەو شتە بکات کە لە ئیشبیلییەدا ڕوویدا. ئەوەیان من دەیگرمە ئەستۆی خۆم و لە پاشکۆکەمدا باسی دەکەم.

ئازیزم ڤیرا...

لەدوای نامە دوورودرێژەکەمەوە، دەمەوێت دیسانەوە سڵاوێکی تریشت بۆ بنێرمەوە.

سەرەتای پاشنیوەڕۆی ئەو چوارشەممەیە بە خۆم و زەرفە زەردە گەورەکەی دەستمەوە لە وێستگەی شەمەنەفەرەکەوە بەرەو ژووری ئوتێلەکەم بەڕێکەوتم، لەو کاتەدا مێشکم لێوانلێو بوو لەو بابەتانەی کە دەبووایە بۆم باس بکردیتایە. لەلای خۆمەوە بڕیارم دا هەتا ئەو کاتەی هەموو شتێک نەنووسمەوە، ژووری ئوتێلەکەم جێنەهێڵم. لەبەرئەوە لەوەبەدواوە و تا ئێوارەی پێنجشەممە پێویستیم بە هەموو خولەکێک بوو، بۆ ئەوەی نووسینەکەم تەواو بکەم و تۆش فریای خوێندنەوەی بکەویت، خۆشبەختانەش خۆت ئامادە بکەیت بۆ سەفەرەکەی ئیشبیلییە.

کۆمپیوتەرەکەم داگیرساند، بەڵام بەرلەوەی لەسەر مێزی نووسینەکەم دابنیشم، سەرلەنوێ زەرفەکەم کردەوە و تەماشایەکی وێنەکانی سەر دوورگەکانی فیجیم

کردەوە. سیانزە وێنەی قەراغ ئاوی (پرێنس چارلس) و سیانزە وێنەی هێڵی (بەرودوا) و سیانزە وێنەی ڕووباری (بۆئوما) و سیانزە وێنەی دارگوێزە هیندییەکانی ماراقیوی تێدابوو. وابزانم هەر ژمارەی یەکسانی وێنەکان وای لێ کردم کە یەکێکیان هەڵبگێڕمەوە و سەیری پشتەکەی بکەم.

لەژێر ناونیشانی (نۆی کوپ)دا نووسرابوو: «هەزاران هەزار ساڵ بەسەر ئەو کاتەدا تێپەڕی کە خۆر تیایدا بوو بە ئەستێرەیەکی گەورەی سوور، بەڵام تا ئێستاش نیشانە لاسلکییەکان لە تەمی ئەستێرەکاندا هەر وەردەگیرێن. ئەنتۆنیۆ، کراسەکەت لەبەرکرد؟ خێرا ڕاکە بۆ لای دایە! تەنها چوار حەفتەی ماوە بۆ جەژنی لەدایکبوونی مەسیح».

وێنەی دوای ئەوەم هەڵدایەوە، (سێی سینەک) بوو: «ئەو دەنگەی کە لە ئێستاکە و لێرەدا بەڕوونی و ڕەوانی قسە دەکات، دەنگی نەوەکانی دواتری گیانەوەرە وشکاوەکییەکانە. لە دارستانە قیرتاوکراوەکەوە لە قوڕگی مارمێلکەکانی برازا و خوشکەزاکانییەوە هاوار دەکات. نەوەی دواتری گیانەوەرە شیردەرە بە فەروو داپۆشراوەکانیش دەپرسن: باشە ئەقڵێک لە دەرەوەی ئەم قۆزاخە بێ شەرمەوە بوونی نییە کە بەردەوام بە هەموو لایەکدا هەر گەشە دەسەنێت؟».

هەستم کرد دڵم خێراتر لێدەدات. لە پشتی سێهەم وێنەدا نووسرابوو (پێنجی قەرە) و ئەم وشانەی خوارەوەم خوێندەوە:

«جۆکەر لەناو هاردیسکێکی ئۆرگانیدا لەسەر سەرینێک خەبەری دەبێتەوە. هەست دەکات دەیەوێت لە شەپۆلێکی گەرموگوڕی هەلوەسەیەکی نیوە هەزمکراوەوە، بەرەو قەراغ دەریای ڕۆژێکی نوێ هەڵسێت. چ هێزێکی ناوەکی ئاگر لە مێشکی فریشتەکان بەردەدا؟ چ مەکینەیەک فیشەکەشێتەی ئاگایی دەبات بەڕێوە؟ چ هێزێکی ئەتۆمی خانەکانی مێشکی ڕۆح پێکەوە دەبەستێتەوە؟».

تەماشای پشتی هەر پەنجا و دوو وێنەکەم کرد. ڤیرا، ئەوە مانیفێستەکە بوو. تەواوی مانیفێستەکەم لەبەردەستدا بوو. هی هەردووکیشمان بوو، ئیتر یەکسەر بەردەوام بووم لەسەر نووسینی نامە دوورودرێژەکەی تۆ. هەر دەمنووسی و هەر دەمنووسی، تەنها ئەو کاتە لەسەر مێزی نووسینەکەم هەڵسام کە ویستم یەک دوو سەعاتێک بخەوم، یان کە بەپەلە کوپێک چام لەژێر قوبەکەی خوارەوەدا خواردەوە

و زۆر بەپەلەش پیاسەیەکی پارکی (ڕیتیرۆ)م کرد تا بوار بە کچێکی فەرمانبەری ئوتێلەکە بدەم کە ژوورەکەم پاک بکاتەوە. ئێوارەی پێنجشەممەش هەموویم بە (ئی- مەیل)ێک بۆ ڕەوا نەکردیت، لەگەڵیشیدا نوسخەیەکی مانیفێستەکەم وەک هاوپێچێک بۆ ناردیت، وەک نووسیبووم بە مەبەست بەسەر چوار بەشی سەرەکیدا دابەشم کردبوو، هەر لەسەر چوار جۆر وەرەقەی یاریی کاغەز دامنابوو و بەم شێوەیە ڕیزم کردبوون: سینەک، دینار، کوپ و قەرە. پاشانیش جۆرە ڕێکخستنێکی تری مانیفێستەکەم بە خەیاڵدا هات کە زۆر زۆر باشترە، بەڵام ئەوەیان هەڵدەگرین بۆ ئەو کاتەی کە یەکتر دەبینین.
لە کورتەپەیامێکی دواتریشدا داوام لێ کردبوویت لە پاش خوێندنەوەی سەرتاپای نامەکە تەلەفۆنێکم بۆ بکەیت بۆ ئوتێلەکە، بەڵام نەک پێش ئەوە. هەربۆیە نیوەشەو تەلەفۆنت کرد.
ئەو کاتە هێشتا نەڕۆیشتبوومە ناو جێگاوە و بەدرێژایی ئەو ئێوارەیە هەر لە ژوورەکەمدا مامەوە، هەرچەندە بەڕاستی پێم خۆش بوو بڕۆمە خوارەوە و کەمێک لە بارەکەدا دابنیشم، بەتایبەتیش لە پاش ئەوەی کە نزیکەی سی و شەش سەعاتێک بەردەوام لەو ژوورەدا بووم. لەنێوان حەمام و ژووری نووستنەکەدا هەر دەهاتم و دەچووم. دەبێت دان بەوەشدا بنێم کە ئەو کاتەی تۆ تەلەفۆنت کرد، دوو بتڵی بچکۆلەی جنم فت کردبوو کە لەناو سەلاجەکەدا بوو، هەروەها دوو بتڵی بچکۆلەی ڤۆدگاش.
یەکەمین شت کە گوتت ئەمە بوو:
- بەڕاستی تۆ چەتەیت فرانک، دەزانیت؟
منیش پرسیم:
- هەموویت خوێندەوە؟
- وشە بە وشەیم خوێندەوە، بەڵام تۆ چەتەیت، چەتە.
- ئێ بۆ؟
- (ئانا) و (خۆسێ) کێن؟
- پێت وایە خۆم لە خەیاڵ دامرشتبێتن؟
- نەخێر، ڕێک مەبەستم لەوە نییە. پێم وابێت ئێوە هاریکاری یەکتری دەکەن.
- هاریکاری؟ ئاخر چۆن چۆنی؟
- شتێک لە دڵمدایە و لە (سالامانکا)دا پێم نەگوتیت.

- وابزانم چەندەها شت هەیە و لە (سالامانکا)دا بە یەکتریمان نەگوت.
- بۆ نموونە وەک چی؟
- نا، تۆ دەست پێ بکە.
- بۆ من دەست پێ بکەم؟
- چونکە تۆ یەکەم جار وتت کە شتێک لە دڵتایە و لە (سالامانکا) پێت نەگوتم.
- ئاخر بەتەواوەتی دڵنیا نیم لەوەی کە تۆش دەستێکت لەوەدا هەبووە یان نا.
- نازانم باسی چی دەکەیت. ڤیرا، من بەیانی دەچم بۆ ئەو پرسەیە، تۆش دێیت، یان نا؟
- بەڵێ، بەڵێ فرانک، دێم. دێمە ئیشبیلییە و خوام لەو خوایەی تۆش نەیەیت. فڕۆکەکەم سەعات دە و نیو بەرەو ئەوێ دەفڕێت.
- بەڕاستی پێم خۆشە کە دێیت.
- بەڵام بەشێوەیەک لە شێوەکان هەست دەکەم هەڵخەڵەتێنراوم.
- مەبەستت لە چییە؟
- دیسانەوە تەلەفۆنی کردەوە.
- کێ؟
- ئەو، (خۆسێ).
- شتێکی سەیرە، منیش پێم وایە شتێکی سەیرە، بەڵام ئەی چی گوت؟
- هەمان ئەو شتانەی کە تۆ دەیانڵێیت. ئەویش بەردەوام هەمان ئەو شتانە دەڵێتەوە کە تۆ دەیانڵێیت. خاڵە هەرەگرنگەکە لەوەدایە. دیسانەوە داوای لێ کردمەوە کە ئامادەی پرسەکە بم. وا ئێستاش بەدڵنیاییەوە دەزانم کە تۆش دێیت.
- ئەو هێندەی بە من گوت کە ئەو مانیفێستە هی هەردووکمانە. دیارە لەوەیاندا مەبەستێکی هەیە.
- مەبەست؟
- نا، نازانم. بەڕاستی نازانم.
- تۆ پێی دەڵێیت کە تەلەفۆنم بۆ بکات؟
- لەو بڕوایەدایت من شتی وای پێ بڵێم؟
- بەڵام تۆش لە ڕووداوەکەی (سالامانکا)دا بەشدار بوویت، وا نییە؟
- بەڕاستی بەهیچ شێوەیەک نازانم باسی چی دەکەیت!
- تۆ نەتدەزانی من بە چ شتێک پێدەکەنیم.. وابزانم دەبێت لەوێوە دەست پێ

بکەین.
- خەریکە دەموروژێنیت.
- مەبەستم لەوەیە.. بەڕاستی نازانم..
- دە بیڵێ. بەڕاستی پەرۆشی بینینتم.
- من.. من لەوەوپێش (ئانا و خۆسێ)م بینیبوو.. فرانک؟ گوێت لێمە؟
- تۆ، ئەوانت بینیبوو؟
- چییە دەڵێی ئاگات لەوەشیان نییە؟
- دواجار کە پێکەوە قسەمان کرد، تۆ گوتت: «نامەوێت ئامادەی ئەو پرسەیە ببم، چونکە ئانا ناناسم».
- فرانک، من بڕوام بە تۆ هەیە. من بڕوام بە تۆ هەیە.
- تۆ بڕوات بە من هەیە؟
- ئەوان داوایان لێ کردم کە دەمم دابخەم. دەبووایە بەهیچ شێوەیەک نەزانیت کە من قسەم لەگەڵ ئەواندا کردووە.
- بۆ خاتری شەیتان پێم بڵێ کەی و لەکوێ قسەت لەگەڵدا کردن؟
- لە سالامانکا. دە تۆ کەمێک ئارام بە. ئەو ئێوارەیە بوو کە من و تۆ بۆ لای ڕووبارەکە چووینە خوارەوە... پاشنیوەڕۆیەکی درەنگ هاتنە ئوتێلەکە و سەردانیان کردم. ڕێک هاتنە ناو ژووری پێشوازیی ئوتێلەکەوە و لێیان پرسیم: «تۆ ڤیراییت؟»
- ئەی ئەوەیان بە چیدا زانی؟
- ئممم، فرانک.
- مەبەستت چییە؟
- من و تۆ نانی نیوەڕۆمان لە قاوەخانەکەی (پلازا مایۆر)دا خوارد، بۆ ڕۆژی دواتریش هەر لەو قاوەخانەیەدا تۆ ئەوانت بینیبووەوە. ئەوان، من و تۆیان لەوێ بینیبوو، ئێ دواتریش بۆ ئەوەی دڵنیا بن کە من (ڤیرا)م، هاتنە ئوتێلەکە و پرسیاریان لە خۆم کرد.
- ئەو دووانە لەسەر دوورگەکانی (فیجی)یش هەروا بوون. دوو کەسی سەیروسەمەرەن و حەزیان لە پلانگێڕانە... سەیرە، دەچێت بە خەیاڵتا کە ئەوە تەنها دوو ڕۆژ بەر لە مردنی ئانا ڕوویدابێت؟
- فرانک، من بەردەوام بیر لەوە دەکەمەوە.

– ئیتر تۆش دڵنیات کردنەوە کە (ڤیرا)یت؟
– پێیان گوتم کە لەسەر دوورگەکانی فیجی لەگەڵ تۆدا بوون و داوای ئیشێکی بچکۆلەیان لێ کردم کە بۆیان بکەم... گوێت لێمە؟
– بەڵێ، بەڵێ، بەردەوام بە.
– بەلایەنەوە سەیر بوو کە تۆیان لە سالامانکادا بینیبوو و هەروا بۆ خۆشیی دەیانویست کەمێک گاڵتەت لەگەڵدا بکەن. پێیان گوتم دەمەوئێوارە لەلای ڕووبارەکەوە پیاسەیەک لەگەڵ تۆدا بکەم، ئینجا ئەوانیش هەروەک ئەوەی ڕێکەوتێکی پەتی بێت، لە پشتەوە خۆیان دەردەخەن، بەڵام بەجۆرێک کە تۆ بیانبینیت. هەروەها پێشیان گوتم کە گوایە زۆر خراپ لەسەر تۆ دەکەوێتەوە ئەگەر بەو ڕێککەوتنەی نێوان من و ئەوان بزانیت، لەبەرئەوە پەیمانم دانێ کە لەو بارەیەوە هیچ شتێکت پێ نەڵێم.
– بەڕاستی ئەمەیان خراپترین شتە کە لە ژیانمدا گوێم لێ بووبێت.
– یانی لەو بارەیەوە ئاگات لە هیچ شتێک نەبوو؟
– بەهیچ جۆرێک.
– بەڵام بەڕاستی دوو کەسی میهرەبان بوون. بەڕاست، شتێکی تریش: لەو کاتەدا کە هاتنە ناو ژووری پێشوازی ئوتێلەکەوە، یەکەم شت کە بە خەیاڵمدا هات ئەوە بوو کە ئانا لەڕادەبەدەر لە (ماخا)کەی گۆیا دەچێت.
– بەڵام تۆ هیچ شتێکت لەو بارەیەوە بە من نەگوت؟
– نەخێر.
– بەردەوامیش لە ناوەوەتدا هەر بیرت لەوە دەکردەوە بەبێ ئەوەی هیچ شتێک دەربارەی بدرکێنیت؟
– ئاخر وەک دەزانیت پەیمانم دابوونێ.
– لە خوارەوە لەلای ڕووبارەکەش بوارت نەدامێ قسەکانم تەواو بکەم. نەتهێشت هیچ بڵێم.
– خۆمم پێ نەگیرا و هەر پێدەکەنیم. خەریک بوو کۆنترۆڵی خۆم لەدەست بدەم، ئێ ئاخر نەدەبوو باسی هیچ بکەم.
– تۆ پێت وابوو کە من ئەو چیرۆکانە دەهۆنمەوە تا تۆ لەگەڵ خۆمدا بهێڵمەوە؟
– ئینجا بەتەواوەتی بێ ئومێد بوویت. بەردەوام هەر قسەت دەکرد و دەمت نەوەستا، بەڵام وابزانم باش بوو کە گوێم لێ نەگرتیت.
– بۆ؟

- ئاخر ئەو کاتە هیچت لەسەر نەدەنووسی.
- ئەی ئێستا ڕات چۆنە؟
- سەرسورھێنەرە.. بەڵام من بڕوام بەوە نییە، فرانک. لەو خاڵەدا بڕوام هەروەک ئەو کاتەیە کە لە (سالامانکا)دا بووم، هیچ نەگۆڕاوم.
- ئەو شتە چییە کە بڕوای پێ ناکەیت؟
- منیش لەو بڕوایەدام کە ئانا لە (ماخای ڕووت) دەچێت، بەڵام من بڕوام بەو جۆرە موهەریجانە نییە کە بە چەپ و ڕاستدا لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی تر بێن و بڕۆن. وابزانم تۆش بڕوات بەو جۆرە شتانە نییە.
- بەلایەنی کەمەوە بڕوام بەوە هەیە کە ئانا لە ئیشبیلییە مرد.
- لەو بڕوایەدایت؟
- ئەی تۆ بڕوات بەوە نییە؟
- ئەوەیانم داناوە بۆ بەیانی تا بۆم دەربکەوێت.
- من خۆم بە چاوی خۆم بینیم کە لە تاڤیونی بورایەوە. بە چاوی خۆشم لە سالامانکادا بینیم کە وروژابوو. دیسانەوە بە چاوی خۆشم (خۆسێ)م لە (پرادۆ)دا بینی و من دەزانم چەندە ڕەنگ زەرد و غەمگین بوو. دەمەوێت بڵێم، ئاخر کەس بە درۆ هەواڵی مردنی هاوسەرەکەی بڵاو ناکاتەوە؟
- نەخێر، ڕەنگە کەس شتی وا نەکات.
- نەخێر، کەس شتی وا ناکات.
- باسی ئەو (شیردەرە ئوسترالی)یەش هێندە سەرنجی ڕانەکێشام. فرانک، باشترێک بوو ئەو باسەت هەر بۆ خۆت هەڵبگرتایە.
- ئاخر لە تەنهاییەکی نەحلەتیدا بووم. تەنها ویستم باسی ئەوە بکەم و هیچی تر. بەڕاستی من لە تەنهاییەکی هەر زۆر نەحلەتیدام.
- بەهەڵە لێم تێمەگە، من مەبەستم لەوە نەبوو.
- ئەی مەبەستت لە چییە؟
- من خۆم هیچ گومانێکی ئەخلاقیم نییە.. ئەگەر مەبەستت لەوەیانە. تەنها ئەوەندەیە دەمەوێت بڵێم من زۆر حەزم لەو (لاورا)یە نەبوو.
- سەری خۆت بەوەوە مەئێشێنە.
- تۆ خۆت لەو بڕوایەدا نیت کە کەسێکی هەر زۆر منداڵانە بووبێت؟
- بێگومان، بەڵام من خۆشم جارجارێک هەست دەکەم منداڵم.

- بەهەرحاڵ من حەزم لێی نەبوو. زۆر بە ساکاری بە بڕوای من کەمێک قێزەون بوو.
- تێگەیشتم.
- بەڵام لەبەرامبەردا من لەوەیان تێناگەم و نازانم بۆ هەر دەبووایە دەربارەی ئەویشت بنووسیبایە؟ چییە، ویستت غیرەت لێ بکەم؟
- بەڕاستی مەبەستم ئەوە نەبوو. من بیرت دەکەم.
- بەهەرحاڵ، مانیفێستەکەم بەلاوە جوانە.
- ئەوە هی هەردووکمانە.
- ئەوەتا لەبەردەستمدایە. بەیارمەتیت.. هەر بۆ نموونە ئا ئەمەیانم زۆر بەلاوە جوانە: «دیمەن و حیکمەت، خەلق و ئەندێشە، لەناو گلێنەی چاودا بەریەک دەکەون. دەرگای بینین، دەرگایەکی ئەفسووناوییە و بە هەردوو دیودا دەکرێتەوە، لەویادایە کە ڕۆحی خولقێنەر خودی خۆی لەناو مەخلوقدا دەبینێتەوە. ئەو چاوەی کە تەماشای قووڵایی گەردوون دەکات، چاوی خودی گەردوون خۆیەتی».
- ئەوەیانم لەیاد نییە.
- بەڕاستی دەبێت دوو کەسی زۆر سەیر بن.
- ئێ من هەر لە سەرەتاوە لەو بڕوایەدا بووم.
- بەڵام بێگومان باوەڕم بەو جۆرە فیکرانە نییە.
- ڕێک مەبەستت لە کامیانە؟
- فرانک، ناشێ بەرپرسیارێتیی پیشەیی خۆتت لەیاد کردبێت؟ مەبەستم لەوەیە زۆربەی ئەو فیکرانە لە ڕوانگەیەکی زانستیی پەتییەوە قسەی قۆڕن.
- من چیتر هێندە زۆر دڵنیا نیم.
- لەو بڕوایەدایت ئەو شتەی کە ئەمڕۆ ڕوودەدات، بەشێوەیەک لە شێوەکان کاریگەری لەسەر شتێک هەبێت کە لە ڕابردوویەکی زۆر دووردا ڕوویدابێت؟ یان بڕوات بە چەند هێزێکی پەنهان و نهێنی هێناوە؟
- بەهیچ شێوەیەک، بەڵام هەر ئەوەندەیە ئێستاکە، بەپێچەوانەی جارانەوە، وا هەست دەکەم ئەم ژیانە مانایەکی هەبێت.
- سەرسامت کردم.
- ئاخر ناکرێت هەروا بە ڕێکەوتێکی پەتی کەسێک کە لە ئێستا دەژی، کتومت

وەک کەسێکی تر بێت کە زۆر لەوەوبەر ژیاوە، دڵنیا نیم ئەمەیان (ڕێکەوتێکی پەتی) بێت.

– وەک گوتم، سەرسامت کردم.

– هیچ شتێک نییە کە هێندەی هەبوونی ئەم جیهانە مایەی سەرسوڕمان بێت. ڤیرا، ئێمە دەژین! سەرسامبوونە هەرەگەورەکە لەوەدایە!

– بێگومان لەمەیاندا لەگەڵتام.

– باشە ئێمە لەوەوبەر جۆرە دۆگمایەکی بنەڕەتیمان نەبوو کە خودی گەردوون خۆی لە خۆیدا تا ئەندازەیەک ڕێکەوتێکی سامناک بێت؟ یان لایەنی کەم هیچ (مانا) یەکی نەبێت؟

– پێم وابێت ئا لێرەدا زۆر پەرشوبڵاو بیر دەکەیتەوە.

– من لەو بڕوایەدام گەردوون مەبەستێکی دیاریکراوی هەبێت.

– چییە، موتەدەین بوویت؟

– دەتوانین وا بڵێین، بەڵام بڕوام بە جۆرە ئایینێکی دیاریکراو نییە، بەڵکو هەر ئەوەندەیە کە هێدی هێدی هەست دەکەم ژیانی خۆم و هەموو ئەو جیهانەی چواردەورم مانایەکیان هەیە.

– ئەوەش خۆی لە خۆیدا شتێکی هێندە ئاسان نییە. باشە دەتوانیت وردترێک ئەو (مانا)یە پێناسە بکەیت؟

– ڤیرا، من بەڕاستیمە و گاڵتەت لەگەڵدا ناکەم. ئێمە دەزانین ژیانی سەر ئەم زەوییە بە چ شێوەیەک لە ماوەی چەندین ملیارد ساڵی ڕابردوودا گەشەی سەندووە، هەروەها دەشزانین زانستە سروشتییەکان بێ وچان بانگەشەی ئەوە دەکەن کە ئەو خەلقە مەزنە بەرهەمی زنجیرەیەک پرۆسەی کوێرانە و ڕێکەوتی فیزیاوی و بایۆکیمیاوییە، وە لە بنەڕەتیشدا سەرتاپای ئەو پرۆسێسانە بە شتێکی بێ مانا لەقەڵەم دەدەن، بەڵام من چیتر بەو شێوەیە ناڕوانم.

– کەواتە واز لە پیشەکەت بهێنە و شتێکی تر بخوێنە، بڕۆ ببە بە قەشە، یان بە دکتۆرێکی بێ شەهادە.

– باش گوێ بگرە: مرۆڤ پرۆسێسێکی بایۆکیمیاوی ئاڵۆزە و لە باشترین حاڵەتدا هەشتا بۆ نەوەد ساڵێک بەردەوام دەبێت، وە بە مانا قووڵەکەشی چوارچێوەیەکی مزەیەفە و لە ناوەوەیدا بۆتە گۆڕەپانی ململانێی چەند گەردیلەیەکی گەورە تا خۆیان بەرهەم بهێننەوە. تەنها ئامانجێک کە بتوانین بیلکێنین بە ژیانی مرۆڤەوە،

ئەو شتەیە کە لەناو دانە بە دانەی خانەکانیدا ڕوودەدات، واتە کۆپیکردنەوەی بەکۆمەڵی جینەکانە و هیچی تر. (مرۆڤ) ئامێرێکی مانەوەی جینەکانە و هیچی تر. خودی ئامانجەکەش ئەو جینانەیە، نەک ئۆرگانیزمەکە. واتە مانای ژیان مانەوەی جینەکانە، نەک ئەو شتەی کە جینەکان دەیبەن بەڕێوە. ئامانجەکە هێلکەکەیە، نەک مریشکەکە، چونکە مریشکەکە تەنها بەرهەمێکی هێلکەکەیە و هیچی تر. لە ڕەگەزی خانەی هێلکەکە زیاتر، هیچی تر نییە. کەواتە زۆر بە ساکاری دەتوانین بیخەینە چوارچێوەیەکەوە.

– هەست دەکەم کەمێک هەڵچوویت، بەڵام قەیناکە، ئەم پوختەیەت جێگای ڕەزامەندییە.

– نەخێر جێگەی ڕەزامەندی نییە، پەنجاساڵی تر زۆرینەی خەڵکی پێکەنینی بە جۆرە تێڕوانینێکی ئاوها دێت. ئێمە سەر بە جۆرە نەوەیەکی زیندەوەرناسانین کە تاڕادەیەک تێکڕایان بەم جۆرە بیر دەکەنەوە: ڕاستی شتێکمان بەهۆی بەتاڵکردنەوەی پێچەوانەکەیەوە بۆ دەسەلمێنن.

– ئەی کەواتە مانای ئەم بوونە چییە؟

– ئێ وتم نازانم. هەر ئەوەندەیە کە دەڵێم ئەم گەردوونە بێ مانا نییە. گەشەسەندنی ژیان لەسەر ئەم زەوییە پرۆسێسێکی سەرسوڕهێنەر بووە، هێندە سەرسوڕهێنەر کە تەنانەت مەزنترین ئەفسانەی خەلقیش ناتوانێت وەسفی بکات.

– بەڕاستی تۆ کەسێکی سەیروسەمەرەیت.

– تۆ لەو بڕوایەدایت ڕۆحت هەبێت؟

– نازانم. نازانم، ڕەنگە من ناوی نەنێم ڕۆح.

– بەڵام پێت وایە کە ئاگاییەکت هەبێت؟

– بێگومان. ئەگەر بڵێم نەء، ئەوا دژی قسەکەی خۆم دەوەستمەوە.

– کەواتە تۆ بەئاگایت لە گەردوون...

– هەروەها بەئاگام لە خۆشم. (من بیردەکەمەوە، کەواتە هەم).

– بەلای منەوە هەر زۆر ئاساییە تا (دیکارت)یش بگەڕێینەوە، چونکە من پێم وایە لەوێوە هەموو شتێک لە جڵەوی خۆی دەرچوو. ماددەیەکمان هەیە، ئاگاییەکیشمان دەربارەی ئەو ماددەیە هەیە. من پێم وایە کە ئاگایی بەشێکی بنەڕەتی و گرنگی بوونی گەردوون بێت، ناکرێت هەروا بەئاسانی بەرهەمێکی لابەلای ڕێکەوت بێت.

– بەڵام لە پێشدا ماددە هەبووە.

– لەوانەیە.
– تا ئێستا من ئاگاییەکم نەدیوە کە بەشێوەیەکی ماددی دەربکەوێت، بەڵام پێچەوانەکەیم بینیووە.
– بەیارمەتیت کەمێک بوەستە. تۆ دەڵێیت تا ئێستا ئاگاییەکت نەدیوە کە بە شێوەیەکی ماددی دەربکەوێت؟
– بەڵێ.
– بەدەر لەم جیهانە، ڤیرا. هەر ڕێک بەدەر لەم جیهانە.
– بەڵێ لەو خاڵەیاندا ڕاست دەکەیت، بەڵام لێرەدا چیتر وەک زانایەکی زانست قسە ناکەیت.
– بەهەرحاڵ، ڕەنگە گرنگ بێت بەدەر لە زانست، باسی شتی تریش بکەین. بەلای منەوە ئاگایی، بە بەراوردکردنی لەگەڵ سەرجەم ئەستێرە و ئەستێرەکلکدارەکاندا، بەشێکی بنەڕەتیتر و جەوهەریتری سروشتی گەردوون پێک دەهێنێت.
– بەڵام ماددە لە پێش ئاگاییدا دێت. لە ڕاستیدا ئەمەیان خاڵێکی گرنگی ئەم جۆرە گفتوگۆیانەیە کە ئێستاکە پێکەوە دەیکەین.
– وەک گوتم لەوانەیە وابێت، بەڵام بەلای منەوە هەتا بێت زیاترێک ئەو لایەنەم بۆ ڕوون دەبێتەوە کە ماددەی گەردوونی بەردەوام دووگیان بووە بە ئاگایی. ئاگایی، لایەنێکی گرنگی حەقیقەتە و هیچی کەمتر نییە لە کارلێکردنە ناوەکییەکانی ناو ئەستێرەکان.
– بەڕاستی نازانم. بەهەرحاڵ لەوەدەچێت، لەچاو مندا، تۆ زیاترێک بیرت لەمەیان کردبێتەوە.
– خوێنیش لە پێش خۆشەویستییەوە دێت.
– بەڵێ؟ ئەوە چی دەڵێیت؟
– لە پێشدا دەبێت خوێن بە دەمارەکانماندا وروژم بکات، ئینجا دەتوانین یەکتریمان خۆش بوێت، بەڵام ئەوە مانای ئەوە نابەخشێت کە خوێن لە خۆشەویستی گرنگتر بێت.
– کەواتە وابزانم دیسانەوە هاتینەوە سەر مەسەلەی هێلکە و مریشکەکە.
– چۆن چۆنی؟
– ئەگەر خوێنمان نەبێت، هیچ خۆشەویستییەکمان نییە و ئەگەر خۆشەویستیشمان نەبێت، هیچ خوێنێکمان نییە.

- بەڵێ، بەڵێ، منیش مەبەستم لەوە بوو.
- باشە، دواتر لە ئیشبیلییە زیاترێک پێکەوە قسە دەکەین. وا سەعات سێی بەیانییە.
- تەنها دەمەوێت بڵێم کە من لە ڕەوتی لەڕادەبەدەر ماندووکەری «ڕیدەکشینیزم[٦٤] reductionism» بوومەتەوە کە وەک مۆتەکەیەک بەسەر سنگی سەرتاپای هەزار ساڵەی پێشووماندا مایەوە. ئێستاکە کاتی خۆیەتی هەزارەیەکی نوێ دەست پێ بکات.
- وە منیش دەمەوێت تەنها ئەوە بڵێم کە زۆر بە ناڕوونی بیروڕاکانت دەخەیتەڕوو. ئێ وەک خۆت دەزانیت بەدەر لە هێزە سروشتییەکان، هیچ شتێکی ترمان نییە کە زانستە سروشتییەکانی لەسەر بنیات بنێین.
- ئاااە! ئێمە کۆمەڵێک دەرئەنجام دەخەینەڕوو کە زۆر زۆر لە مەودای هێزە سروشتییەکان تێدەپەڕن.
- دەتوانیت نموونەیەکم بۆ بهێنیتەوە؟
- خۆر ئەوە نییە کە تەنها ئەستێرەیەک بێت و بەس، زەوی ئەوە نییە کە تەنها ئەستێرەیەکی گەڕۆک بێت و بەس، مرۆڤ هەر ئەوە نییە کە تەنها گیاندارێک بێت و بەس، گیاندار هەر ئەوە نییە کە زەوی بێت و بەس، زەوی هەر ئەوە نییە کە تەنها ئاگراویی بورکانەکان بێت و بەس، وە (ئانا)ش نەمردووە.
- دوا ڕستە وتت چی؟
- نازانم. هەر لە خۆیەوە لە دەمم هاتە دەرەوە، زۆرباشیش لەگەڵ ڕستەکەدا ڕێک دەکەوێت.
- یانی هەر بۆ ڕیتمی ڕستەکە وتت؟
- بەڵێ تەنها بۆ ڕیتمی ڕستەکە وتم.
- وە هەروەها ئەم بەشەی مانیفێستەکەشم بەدڵ بوو: «جۆکەر بەتەواوەتی لە جیهانی فریشتەکاندا نییە، بەڵکو تەنها نیوەی بوونی لەویادایە. دەزانێت هەر دەبێت سەفەر بکات، واتە ڕووبەڕووی خۆی بۆتەوە. دەزانێت هەر دەبێت بەیەکجاری بڕوات، ئێ خۆ هەر لە ئێستاوە نیوەی ڕۆیشتووە. ئەو لە هەموو ئەو شوێنانەوە هاتووە کە بوونیان هەیە و سەفەر بۆ (ناشوێن) دەکات. هەر کە گەیشتە ئەوێش، تەنانەت ناتوانێت خەونیش بە گەڕانەوەوە ببینێت. سەفەر بۆ وڵاتێک دەکات کە تەنانەت لە خەونیشدا

بوونی نییە».
- تۆ بەتەواوەتی دڵنیایت لەوەی ئەو (وڵاتی — هیچ)ە بەڕاستی بوونی هەبێت؟
- بەڵێ بەداخەوە. هەڵبەتە ئەگەر وایدابنێین کە (هیچ) شتێک بێت کە بوونی هەبێت.
- کەواتە هێندەی تر گرنگە کە یەکتری ببینین. ئێ ئاخر ماوەیەکی هەر یەکجار کورت دەژین.
- وایە لەگەڵتام.
- بەلای منەوە مانیفێستەکە کتومت دەربارەی ئەوەیە.
- بەلای منەوە باسی ئەوە دەکات کە ئێمە بەشداری شتێکی دژوار و سەخت دەکەین.
- باشە، کەواتە لە فرۆکەخانەی ئیشبیلییەدا یەکتر دەبینینەوە.
- ئوتێلت گرتووە؟
- بەڵێ، لە ئوتێلی (دۆنا مارییا) ژوورم گرتووە. هەر لە گۆڕەپانی (ڤیرجن دی لوس ریس)دایە، ڕێک لەبەردەم کاتیدڕالی (جیرالْدا)دایە.
- ژوورت بۆ منیش گرتووە؟
- بەڵێ، لە ڕاستیدا وای بۆ چووم کە بێیت، هەڵبەتە ئەگەر بە زەبوونی داوات لێ بکەم.
- بە زەبوونی؟
- ئمم، وابزانم باشترێک بوو بڵێم (ئەگەر بەپەرۆشەوە داوات لێ بکەم). بەهەرحاڵ نامەکەت چاپ کرد؟
- بەڵێ، ڕقم لەوەیە لەسەر شاشەی کۆمپیوتەر شت بخوێنمەوە.
- منیش هەروەها.
- ئێستا تێدەگەم بۆچی گوتت کە من مارمێلکەیەکت بیر دەخەمەوە. (گۆردن)م زۆر بەدڵە.
- منیش وام دانابوو کە بەدڵت بێت.
- تۆ پێویستت بە کەسێکە کە بەشێوەیەکی کەمێک ڕەق لەگەڵتا قسە بکات.
- بەڵام تۆ لە گۆردن ناچیت، بەڵکو گۆردن لە تۆ دەچێت. هۆ و دەرئەنجام، ڤیرا!
- هەر زۆر هەزەلیت... کەواتە دوو ژوورت گرتووە؟

- هەردوو جۆرەکەیم گرتووە.
- مەبەستت لە چییە؟
- من هەم ژوورێکم گرتووە و هەم دوو ژووریش.. ئەلو؟
- بەتەواوەتی سەرسام بووم.
- بۆ؟
- ئاخر تەنانەت وات لێ هاتووە دەربارەی پرێنسیپە لۆجیکییەکانیش کەمتەرخەم بیت.
- دەتوانیت کەمێک زیاتر مەبەستت ڕوون بکەیتەوە؟
- ناکرێت هەم یەک ژوور و هەم دوو ژووریش بگریت.. ئەگەر وابێت کەواتە دوو ژوورت گرتووە و تەواو.
- دژایەتییەکی یەکجار کەم لە لۆجیکدا هەیە. هەر بۆیە هێندە زۆر بەکەڵکی چارەسەرکردنی ناکۆکی و ناتەبایی نایەت، بەڵێ، بگرە بەشێوەیەکی گشتی بەکەڵکی هیچ پرۆسێسێک نایەت. لۆجیک بەتەواوەتی مردووە، ڤیرا.
- بەڵام ئەم قسەیەت تا ئەندازەیەک وەک ئەوە وایە کە بڵێیت (تاڕادەیەک) نەگەیشتوومەتە سەر دوورگەیەکی چۆڵ و هۆڵ. ئاخر هاتن و ڕۆیشتن شتێکە کە بەتەواوەتی دەکرێت و تەواو. بە بڕوای من باشترە سەرنج بدەیتە ئەم لایەنە و لەیادیشت بێت.. بەڵێ، فرانک، پێم وایە دەبێت سەرنج بدەیتە ئەم لایەنە و لەیادیشت بێت.
- ئێستاکەش نازانم تا چەندێک دڵنیام. لە لایەکەوە کورتەبنەکە لەگەڵ دەریاوانێکدا دەگاتە دوورگەکە، بەڵام لەلایەکی ترەوە زۆر دواتر دەردەکەوێتەوە.
- وابزانم چیتر باسی هەمان بابەت ناکەین. من دوورگە چۆڵ و هۆڵەکەم.
- ڤیرا؟
- بەهەرحاڵ بەیانی یەکتری دەبینین.
- وە هەر زووش بۆمان دەردەکەوێت بە چ شێوەیەک یەکتری دەبینین.
- ئەمەیانت وەک حیکمەتێکی قووڵ گوت؟
- ڕەنگە ئاسمانێکی تر لەسەروو ئەم ئاسمانەمانەوە هەبێت.
- ئەمەیان حیکمەتێکی قووڵتر بوو؟
- نازانم... بەڕاستی چیتر نازانم چی دەڵێم. هەست دەکەم کەسێکی تر وشەکان دەخاتە سەر زارم.

- ئەوە پێی دەگوترێت (ڕاکردن لە بەرپرسیارێتی).
- بەڵام وا لەپڕێکدا قسەیەکی (ئانا)م بیر کەوتەوە کە کاتی خۆی لەسەر دوورگەکانی فیجیدا گوتی.
- چی گوت؟
- گوتی: «حەقیقەتێک لە دەرەوەی ئەم حەقیقەتەدا هەیە».
- وایە، وایە، ڕاست دەکەیت.. بەیارمەتیت کەمێک بوەستە..
- ئەوە چی دەکەیت؟
- گوتم کەمێک بوەستە، لاپەڕەکان هەڵدەدەمەوە... ئا، گوتی: «ئەو کاتە وا هەست دەکەن بۆ پرسەیەک هاتوون، بەڵام لە ڕاستیدا بۆنەی لەدایکبوونێک کۆیکردوونەتەوە». بڵێیت توانای بینینی داهاتووی هەبووبێت؟
- وەک لەوەوپێش گوتم، من هیچ نازانم. تەنها ئەوەندە دەزانم کە سەعات هەشت سواری شەمەنەفەر دەبم.
- بیرم کەوتەوە.. سەرلەنوێ بەوردی تەماشای تابلۆکەی (گۆیا)م کردەوە. بەڕاستی داچڵەکیم کە لە سالامانکادا (ئانا)م بینی.
- ئێ تۆ ئەوەیانت پێ خۆشە.
- کە چی؟
- کە کەمێک دابچڵەکیت.
- کاتێکی خۆش و بەهیوای دیدار.
- هەروەها.

# پاشکۆ
# بە قەڵەمی (جۆن سپۆک)

زۆرجار موچوڕکەم پێدا دێت کە تەماشای وێنە ڕەنگاوڕەنگە گەورەکەی (شیلا) دەکەم. چوارچێوەیەکی ڕەشی تێگیراوە و ڕێک لەسەر مێزی نووسینەکەمەوە هەڵواسراوە. من ئێستاکە لەسەر ئەو مێزە دانیشتووم و خەریکی نووسینم. چەند ساڵێک لەمەوبەر ئەو وێنەیەم لەبەردەم شارەوانییە کۆنەکەی شاری (کرۆیدن)دا گرت و لەو کاتەشەوە لەویادا هەڵواسراوە. دیارە لەو کاتەدا کە من وێنەکەم گرتووە، ئەو ڕێک تەماشای ئاوێنەی کامێراکەی کردووە، چونکە لە وێنەکەدا وا هەست دەکەم کەمێک سەری دانەواندووە و چاوی تێبڕیووم. هەندێکجار وام بە خەیاڵدا دێت کە لە دڵی خۆیدا گوتبێتی: «ئەگەر ڕۆژێک لە ڕۆژان ماڵئاواییم لێ کردی، ئا بەم شێوەیە دەتوانم چاوێکم لەسەرت بێت».

من خۆم هەمیشە بەلامەوە ناخۆش بووە کە تەماشای وێنەیەکی ڕەنگاوڕەنگ و ڕوونی کەسانێک بکەم کە چیتر لەم ژیانەدا نین. ئینجا بزانە ئاخۆ پێچەوانەکەی چۆن چۆنی بێت: من وای بۆ دەچم دوو سەد ساڵێک لەمەوبەر، لادێییەکانی ئەندەلوس توشی شۆک بووبن کاتێک بە چاوی خۆیان وێنەی دەموچاوی کچە قەرەجێکی جوانیان بینیوە کە لەناو باخچەکانی (ئالکازار)دا وێنەی گیراوە.

وا سێ ساڵ بەسەر کۆچی دوایی (شیلا)دا تێپەڕیوە و تا ئێستاش باوەڕ ناکەم کە جارێکی تر نایبینمەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا: چۆنە ئاوها بەتەواوەتی دڵنیام کە قەت قەت جارێکی تر لەگەڵیدا کۆنابمەوە؟ دڵنیام، بەڵێ دڵنیام بەڵام زۆر بەتەواوەتیش نا. ئاخر هەر ئەو ڕاستییەی کە ئەم جیهانە بوونێکی هەیە، خۆی لە خۆیدا هەموو سنوورێکی شیاو و نەشیاوی شکاندووە. ئەگەر ئەم جیهانە بوونی هەبێت، ئەی کەواتە بۆ ڕێی تێناچێت کە جیهانێکی تریش دوای ئەمە بوونی هەبێت؟

ڕەنگە فرانک بیگوتایە: شتی وا نییە، لەبەرئەوەی ئێمە وەک بۆق و شەمشەمەکوێرە لە گۆشت و خوێن پێکهاتووین. ئێ وایە، بەڵێ منیش لەگەڵ ئەوەدام، بەڵام ئەگەر شتێک هەبێت و من بێزار بکات، ئەوا کتومت ئەو سوڕی خوێنەیە. ڕاستە من

گیاندارێکی پیرم و سەر بە گروپی شیردەرەکانم، بەڵام ئایا لەهەمانکاتدا بوونەوەرێکی ڕۆحانیش نیم؟

من هەرگیز پێم وانەبووە ڕۆحی مرۆڤ، هەروەک ملی زەڕافە و خەرتومی فیل، دیاردەیەکی سووریالی بێت و بنەمایەکی پرۆتینی هەبێت. من لە ڕێگەی ئاگاییمەوە دەتوانم لە سەرتاپای گەردوون تێبگەم. چیتر لەوەیان دڵنیا نیم کە ڕۆح تەنها ئیفرازێکی بایۆکیمیاوی بێت.

ئێمە هێندە دەزانین کە گەلەهەسارەی تریش بوونی هەیە. یان هەروەک کۆمەڵێک ئەستێرەناس دەڵێن، ڕەنگە گەردوونی تریش بوونی هەبێت. ئەی کەواتە بۆچی جووڵانێک لە پلەیەکی حەقیقەتەوە بۆ پلەیەکی تر، هەروەک جووڵانێک لە شوێن و کاتدا ڕێی تێنەچێت و نەشیاو بێت؟ ئێ خۆ هەر زۆر بەئاسانی خەڵکی لە پاش خەونێک خەبەریان دەبێتەوە.

ئێمە نازانین ئەم جیهانە چییە. من وا مەزەنە دەکەم کە ئەو پلەی حەقیقەتەی خۆمانی تێدا دەبینینەوە، زۆر بەئاسانی هەڵمان بخەڵەتێنێت. وە پێشم وایە ئانا نەمردبێت.

*

بە مەبەستی بەشداریکردن لە بەرنامەیەکی تەلەفیزیۆنیدا، کە لەسەر پاشەڕۆژی مرۆڤ بوو، سەفەرێکم بۆ تاڤیونی کرد، ئەو کاتە ماوەی چەند ساڵێک بەسەر دواهەمین ڕۆمانمدا تێپەڕیبوو. لەو کاتەدا کە شیلا نەخۆش بوو، بەهیچ شێوەیەک نەمتوانی هیچ بنووسم، هەروەها لە ساڵانی سەرەتای دوای مردنەکەشیدا هەر نەمتوانی دەست بە نووسینێکی نوێ بکەم. من قەت نەمتوانیووە لە یەک کاتدا بیر لە دوو شت بکەمەوە. سەیرە بەلامەوە کە کەسێک لەم تەمەنەی مندا هێندە زۆر هۆگری هاوسەرەکەی بێت. چەندە ناخۆشیشە کە خەسارەتێکی ئاوها، بەو شێوە زۆرە ورەی ژیانت بڕوخێنێت.

بەڕاستی پێویستیم بە بینینی خەڵکانی نوێ بوو تا بتوانم سەرلەنوێ دەست بکەمەوە بە نووسین، لە دوورگەکانی تاڤیونیدا کۆمەڵێک خەڵکم ناسی کە زۆر جیاواز بوون لەو کەسانەی لە (کرۆیدن)دا دەیانبینم. بەڕاستی پێویستیم بە کۆمەڵێک بیرۆکە و وێنای نوێ بوو تا دەمەزەردێکی ئاگاییم بکەمەوە. پێم وابێت هەر لەبەرئەوەش بوو کە میوانەکانی (ماراڤیو)م بانگهێشت کرد تا پێکەوە کۆبوونەوەیەکی باڵا لە ناوچە گەرمەکاندا ساز بکەین.

من وا ڕاهاتووم ڕۆمانەکانم لەسەر بنەمایەکی واقیعی هەڵبچنم. بێگومان بەو مانایە نا کە من کەسێکی بێ فەنتازیا بم، نا، من قەت وا نەبووم، بەڵام زۆرجار پاش ماندووبوونێکی یەکجار زۆر ئینجا توانیومە چەند کەسایەتییەکی زیندووی ناو ڕۆمانەکانم بخوڵقێنم.
هەر بەرلەوەی فرانک ببینم، (ئانا و خۆسێ)م وەک دوو کەسایەتیی ڕۆمانە نوێکەم دەستنیشان کردبوو. ئانا کچێکی قەشەنگ و سەرنجڕاکێش بوو، وەک تەمەنیش لە کۆتایی بیستەکانی ژیانیدا بوو. بە ڕێژەیەکی دیار باڵای لە باڵای خۆسێ بەرزتر بوو، قژێکی ڕەش و جووتێ چاوی ڕەشی پێوە بوو، هەروەک خواژنێک دەجووڵایەوە. خۆسێ لەو بەتەمەنتر بوو، چاوی شین بوو و قژیشی لە چاو کەسێکی ئاسایی ئیسپانیدا، زۆر زۆر کاڵتر بوو. وەک دوو پەیامنێری تەلەفیزیۆن خۆیان پێ ناساندم، بەڵام کەڕەتێکیان خۆسێ باسی ئەوەشی کرد کە ئانا سەماکەرێکی فلامینکۆی بەناوبانگە. من خۆشم لەلایەن دەزگای (بی بی سی)یەوە ڕەوانەی ئەوێ کرابووم تا لەسەر هێڵی (بەرودوا)دا بوەستم و چەند ڕستەیەکی دانسقە و جوان دەربارەی ئاکاری جیهانیی و دواڕۆژی ئەم زەوییە بخوێنمەوە. لەوەدەچوو ئەو دوو ئیسپانییەش بۆ ئامادەکردنی ڕیپۆرتاژێکی هاوشێوەی ئەوە هاتبنە سەر ئەو دوورگەیە، تا دواتر لەسەر یەکێک لە کەناڵە ئیسپانییەکان پێشکەش بکرێت. ئا بەو شێوەیە یەک دوو جارێک لەسەر (هێڵی درێژی ۱۸۰ پلە) چاومان بە یەکتری کەوت. ڕاستە هێشتا دوو ساڵی مابوو بۆ گێڕانی ئاهەنگی هاتنی هەزارەی نوێ، بەڵام هەر لەو کاتەوە لێشاوێک لە پەیامنێرانی تەلەفیزیۆنەکانی دونیا لەسەر دوورگەکە بوون.
من لە زۆر لاوە سەرنجم چووە سەر ئەو دوو ئیسپانییە. کاتێک کە بە تەنها دەبوون، یان ڕاستترێک بیڵێم: کاتێک کە وایان نیشان دەدا کە بە تەنهان، بەردەوام کۆمەڵێک ڕستەی سەیروسەمەرەیان دەدا بە گوێی یەکتریدا. ڕاستە دوو کەس بوون، بەڵام هەر لەو کەسانە دەچوون کە بە تەنها بە ڕێگادا دەڕۆن و لەبەر خۆیانەوە قسە بۆ خۆیان دەکەن، ئاخر لەوەدەچوو هەردووکیان بەتەواوەتی ئاشنای سەرجەم ئەو ڕستانە بن کە بە یەکتریان دەگوت. هەرچەندە من زمانی ئیسپانی نازانم، بەڵام باشم لە یادە کە ورتەورتە سەیرەکانیان سەرنجی ڕادەکێشام، دواتریش فرانک سەرنجی چووە سەر هەمان شت. جیاوازیی من و ئەو لەوەدا بوو کە ئەو لە قسەکانیان تێدەگەشت، بێگومان ئەوەش جیاوازییەکی گەورە بوو. شێوازی گوتنەکەیان سەرنجی منی ڕادەکێشا، نەک ناواخنی قسەکانیان. هەر لە یەکەم

ئێوارەوە لەسەر مێزی نانخواردنەکە، سەرنجم دا کە فڕانک دانیشتبوو و بەدزییەوە گوێی بۆ ئەو دوو ئیسپانییە هەڵخستبوو. زۆریشم پێ خۆش بوو کە داوای قەڵەمێکی لێ کردم. لەویادا وای بۆ چووم هەر ڕێک لەو کاتەوە و بەبێ ئەوەی ئاگای لە خۆی بێت، بەشێوەیەک لە شێوەکان (دامەزراندبێت).

بەدەر لەوە شتێکی تریش لەئارادا بوو، وابزانم ئەوەیان وای لێ کردم کە بە جیددی سەرنجیان بدەم، یان وردتریک بیڵێم، ئەوەیان وای لێ کردم کە دوایان بکەوم: هەر لە یەکەم چرکەوە کە بینیمن، زۆر بەگوڕ هەستم کرد لەوەوپێش (ئانا)م بینیبوو. کاتێکیش کە فڕانک هاتە سەر دوورگەکە و گوتی (منیش هەست دەکەم لەوەوپێش بینیبێتم)، یەکسەر کەوتمە لێکۆڵینەوەی ئەو بابەتە. دەبێت دان بەوەشدا بنێم کاتێک کە لە دواجاردا ڕاستییەکەم بۆ دەرکەوت، داچڵەکیم. ئیدی لەدوای ئەوەشەوە بەتەواوەتی سەرم سوڕما و بە چاوێکی تەواو نوێوە تەماشای (ئانا)م کرد.

نەمویست پەلە بکەم، تەنانەت نەمویست هیچ شتێک لەلای فڕانکیش بدرکێنم، پێم وابوو ئەوەیان هێندەی تر سەری لێ بشێوێنێت. هەر ئەوەندەم بەلاوە بەس بوو کە بەرلەوەی لە (تاڤیونی)یەوە سەفەر بکات، نیشانەیەکی بچکۆلەی بدەمێ تا دوای بکەوێت. ئیدی دەبووایە چاوەڕوان بوومایە. شتێکم لەبەردەستدا بوو و دەمویست لەگەڵ خۆمدا بیبەمەوە بۆماڵەوە.

من پێم خۆش نییە باسی ئەو شتە بکەم کە لەسەری دەنووسم، بەتایبەتیش ئەگەر هێشتا دەستم بە خودی پرۆسەی نووسینەکە نەکردبێت. خۆ ئەگەر پرۆژەکەم ببووایەتە باسی سەر مێزی نانخواردنی ئێواران، ئەوا لەوە دەترسام کە هەر لەسەر دوورگەکانی فیجی لەبار بچووایە.

*

ئەو کاتەی فڕانک گەیشتە تاڤیونی، ماوەی دوو مانگ بوو لەسەر دوورگەکانی خوارووی ئۆقیانووسی ئارام بووم. نزیکەی هەموو ئەو زانیاریانەی کە دەربارەی ئەو بەشەی جیهان دەیزانم، لە ئەوەوە فێر بووم. هەتاوەکو زیاتریێکیش دەمناسی، زیاتریێک بۆم ڕوون بووەوە کە دەبووایە ببێتە کەسی (گێڕەرەوە)ی ئەو ڕۆمانەی کە دەمویست بینووسم. وەک تەمەن جیاوازییەکی گەورەمان هەبوو، بەڵام بە بڕوای من لەگەڵ ئەوەشدا زۆر لەیەک دەچووین. بەڕاست، دەبێت ئاماژە بۆ ئەوە بکەم کە ئەو خەونەی فڕانک بۆ گۆردنی گێڕایەوە، لە ڕاستیدا لە منی وەرگرتبوو. من بووم کە شەوێکیان ئەو خەونە نیمچە ناخۆشەم لە ماراڤیودا بینی: لە خەونمدا هەرچەندێکم

دەکرد بیرم نەدەکەوتەوە و نەمدەزانی تەمەنم هەژدە ساڵە یان بیست و هەشت. کە خەبەریشم بووەوە، وەک (فرانک)ی تەمەن چل ساڵ ڕانەچڵەکیم، بەڵکو (٦٥) ساڵەی تەمەنی خۆم توشی شۆکی کردم. بەپەلە هەڵسام و لەبەردەم ئاوێنەی کەنتۆرەکەدا وەستام. گیانەوەرە (شیردەر)ە بەتەمەنەکە، من بووم.

هیچ دوو کەسێکی دونیا وەک یەک نین و بێگومان چەندین جۆر سیفاتی کەسایەتیی مرۆییمان هەیە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا من وای دەبینم دوو جۆر مرۆڤمان هەبێت: گروپی یەکەمیان، کە زۆرینەیەکی بەرچاو پێک دەهێنن، لەو کەسانە پێکهاتوون کە ڕازین بەوەی حەفتا، هەشتا یان نەوەد ساڵێک بژین. هۆکاری ئەو قەناعەتەشیان جیاواز جیاوازە: هەندێکیان پێیان وایە لە پاش هەشتا یان نەوەد ساڵێک، ژیانێکی دوورودرێژ و پڕ ژیابن، دەڵێن تێرمان لە ژیان خواردووە و لەوەبەدواوە کاتی ئەوە دێت کە پاڵ بکەوین و بمرین. هەندێک خەڵکانی تریش بەهیچ شێوەیەک نایانەوێت پیر ببن و ببنە ئەرک بەسەر شانی کەسانی دیکەوە. کۆمەڵێکی تریش جەخت لەسەر شتێکی تر دەکەنەوە و دەڵێن هەرچەندە پێمان خۆشە لە هەشتا یان نەوەد ساڵێک زیاتر بژین، بەڵام هاوکات دەزانین کە داوایەکی لەو جۆرە شتێکی بێمانایە، چونکە سروشت بەشێوەیەکی وا بنیاتنراوە کە تەمەنمان لەوەندە زیاترێک نەبێت. هەروەها کۆمەڵێکی تری ئەم گروپەشمان هەیە، کە ڕەنگە گەورەترین بەشی ئەم گروپە پێک بهێنن، کە زۆر بە ساکاری ئەو فیکرەیە وەک شتێکی تۆقێنەر دێتە بەرچاویان کە بۆ ماوەی چەند سەد ساڵێک یان چەند هەزار ساڵێک لەسەر ئەم زەوییە بژین. ئەوەش باشە، جوانە! هەر زۆر باشە و لەهەمانکاتیشدا لەگەڵ سروشتدا هاوئاهەنگە، بەڵام لەلایەکی ترەوە گروپێکی تری مرۆڤمان هەیە کە بەتەواوەتی جیاوازن لەو گروپەی پێشوو: هەمیشە و لە هەموو سەردەمەکاندا کۆمەڵێکی کەمی مرۆڤ هەن کە دەیانەوێت بۆ هەتاهەتایە بژین. ئەو کەسانە نازانن ئەم ژیانە لەدوای مردنی خۆیانەوە بە چ شێوەیەک بەردەوام دەبێت، ئەوان بەپێچەوانەی خەڵکانی ئاساییەوە، لەوە تێناگەن. فرانک یەکێکە لەو کەسانە، هەربۆیە لە یەکەم چرکەوە کە بینیم، گرنگییەکی تایبەتیم پێ بەخشی و بەردەوامیش زیاترێک سەرنجی ڕادەکێشام. هەر ئەو خاڵەش کە فرانک سەر بەو گروپەیە، خۆی لە خۆیدا مەرجێکی بنەڕەتی بوو کە لە ڕۆمانەکەمدا بیکەمە (منی گێڕەرەوە).

قەت نەمتوانیوە لەو کەسانەوە نزیک بم کە ڕووی خۆیان لە فیکرەی ژیانی هەتاهەتایی وەردەچەرخێنن. لە سەردەمی گەنجیمدا هەر کەسێکم بناسیبایە، یەکسەر دەمویست

بزانم لەو بارەیەوە بە چ شێوەیەک بیر دەکاتەوە. بۆ نموونە لێم دەپرسی: ئەگەر ژیان بەدەست خۆت بووایە، ئایا ئەو کاتە دەتویست بۆ هەتاهەتایە بژیت؟ یان بەشێوەیەکی تر دەمپرسی: ئەوەت پێ قبووڵ دەکرێت کە ڕۆژێک لە ڕۆژان هەر دەبێت ئێرە بەجێبهێڵیت؟ بەو شێوەیە جۆرە ئامارێکی نارەسمیم لەلای خۆمەوە ئەنجام دا و دواجاریش هێندەم بۆ ڕوون بووەوە کە زۆربەی هەرەزۆری خەڵکی دەیانەوێت بمرن! شتێکی باشە کە سروشت بەشێوەیەکی ئاوها زیرەکانە هەڵچنراوە.

زۆرجار ئەو کەسانەی گەورەترین چێژ لەم ژیانە دەبینن، هەمان ئەو کەسانەن کە بەهیچ شێوەیەک نیگەرانی ئەوە نین کە ئەم ژیانە ڕۆژێک لە ڕۆژان کۆتایی دێت. لەوانەیە ئەمەیان وەک پارادۆکسێک بێتە بەرچاو، بەڵام ئەگەر وردتریێک بیری لێ بکەینەوە، ئەوا بەشێوەیەکی تر لێی دەڕوانین. ئەو کەسانەی بەهیچ شێوەیەک قبووڵی ناکەن کە ئەم ژیانە کۆتایی دێت، هەر لە ئێستاوە لەسەر سنوورەکەن. ئەوان دەزانن کە هەر دەبێت بەمزوانە بڕۆن، واتە هەر لە ئێستاوە نیوەیان ڕۆیشتووە. جا ئیتر ئەگەر پێنج ساڵ یان پەنجا ساڵی تری ژیانیان مابێت، هیچ دەورێک نابینێت. ئا لێرەدا خۆیان لەو کەسانە جیادەکەنەوە کە ڕازین بە مەرجی مردن، بەڵام هەر ئەوەندەیە کە ناخوازن کە لە ئێستا و ئێرەدا بمرن. ئەوانەی کە دەیانەوێت بۆ هەتاهەتایە بژین، ئەو کەسانە نین کە یەکسەر هەستن و سەما بکەن. لەو کەسانە نین کە وەک دەڵێن: «چێژ لە ژیان» ببینن. ئەوانەی دڵیان بە سەما خۆشە، هێندە سەرقاڵی سەمای ژیانن کە بەهیچ شێوەیەک پێیان خۆش نییە فیکرەی کۆتاییهاتنی ژیان مەزاجیان تێک بدات.

فڕانک لە نامەکەیدا کە بۆ ڤیرای نووسیوە، باسی ئەو سەفەرە کورتەی نێوان (ڤیتی لیڤیو) و تاڤیونی دەگێڕێتەوە کە بە فڕۆکە کردبووی. بە بڕوای من هەر لێرەوە دەردەکەوێت کە سەر بە چ گروپێکە. بەهەرحاڵ ماوەیەکی باش تێپەڕی و ئینجا زانیم سەرلەبەیانی یەکەمی لەسەر دوورگەی فیجی بیری لە چی کردۆتەوە، بەڵام وابزانم هەر ئەو کاتەش شتێکم دەربارەی شێوازی بیرکردنەوەی بۆ دەرکەوت، داشمنابوو لە ڕۆژانی دواتردا زیاترێکم لەو بارەیەوە بۆ ڕوون ببێتەوە. فڕانک سەر بە گروپێکی دەگمەنی خەڵکە. لەو کەسانەیە کە لەم ژیانەدا بەدەست نەبوونی ژیانی هەتاهەتایی و بەردەوامنەبوونی ڕۆحەوە دەناڵێنن.

فڕانک لە کۆتایی وەسفکردنی سەفەرەکەی (نادی)دا دەڵێت: «هەستێکی زۆر سەیری پێ بەخشیم کە نەمتوانی بەرەنگاری ببمەوە، هەستم کرد گیانەوەرێکی

بڕبڕەداری لاوازی گەنجم و لەوە زیاتر هیچی تر نیم». کە ئەوەم خوێندەوە لە دڵی خۆمدا گوتم: «زۆر بەئاسانی ڕێگەی پێ دەدەم شتێکی وا بڵێت»، نەک لەبەرئەوەی کە خۆناسینەوەی خۆمم بەلاوە سەختە، بەڵام جیاوازییەکەی ئێمە لەوەدایە کە من نزیکەی سی ساڵێک لەو گەورەترم، واتە هاوتەمەنی فرۆکەوانەکەم و ئەوەشیان بەلای منەوە جیاوازییەکی زۆر گەورەیە. ئا ئێستاکە کە بەسەر مێزی نووسینەکەی ماڵەوەماندا لە (کرۆیدن) خۆم چەماندۆتەوە، جارجارێک ئازارێک وەک بروسکە لە قاچم دەدات. واتە پێویستم بەوە نییە کە لە بواری گیانەوەرە بڕبڕەدارەکاندا پسپۆڕ بم تا هەست بەوە بکەم کە پەیکەرێکی ئێسکیی ناساغم هەیە. بەدەر لەوەش توشی هەوکردنی قوڕگ بووم و لەژێر چارەسەری ئەو ئازارەدام، من دەزانم کە دەبێت ڕێز لە هەموو چرکەیەکی داهاتووی ئەم ژیانەم بگرم و دەبێت وەک دیارییەکی بەنرخ تەماشایان بکەم. هەر لەوە دەچێت کە بەردەوام دەمانچەیەک لەسەر ملم بێت. وا هەست دەکەم کە دەبێت باقی ژیانم لەم گەلەهەسارەیەی کاکێشانەدا لەناو (فرۆکەیەکی شقارتە)ییدا بەسەربەرم کە چەند ئامێرێکی شکاوی تێدایە. وا لەو دوا سەفەرەشمدا، تەنانەت کچێکی برادەریشم نییە کە نەخشەی ڕێگاکەم لەگەڵدا بخوێنێتەوە.

وا سێ ساڵ بەسەر مردنی (شیلا)دا تێپەڕیوە، چەند مانگێکیش بەر لە مردنەکەی هێندە لەشی ساغ بوو کە دەیتوانی بێت و دەستێکی میهرەبان بهێنێت بە ملمدا. ئەو کاتەی شیلا مرد، چل ساڵ زیاتر بوو کە یەکتریمان دەناسی. کاتێک باسی شتێکی ئاوها تایبەتی ژیانی خۆم دەکەم، تەنها بۆ ئەوەیە کە بزانن بۆچی بەو شێوە تایبەتییە و بەبێ هیچ گومانێک ڕەفتارم لەگەڵ فرانکدا کرد کاتێک کە نزیکەی ساڵێک لەمەوبەر لە مەدریددا بینیمەوە.

*

ئانا و خۆسێ هاتنە چێشتخانەکەوە تا نانی بەیانی بخۆن، ئەو بەیانییە بوو کە من (فرانک)م لە فرۆکەخانەکەوە هێنا، پێم گوتن کە نەرویجییەک لەگەڵ فرۆکەی ئەو بەیانییەدا گەیشتۆتە دوورگەکە، هەروەها ئاماژەم بۆ ئەوەش کرد کە زۆربەی نەرویجییەکان، بەهۆی زستانە دووروودرێژەکەیانەوە، کارامەن لە یاریی کاغەزدا. ئەو کاتە من هێندە تێگەیشتبووم کە بە پلەی یەکەم لەبەر خاتری ئانا لە چەند شەوی ڕابردوودا یاریی کاغەزیان دەکرد. یان دەتوانم بڵێم بەلایەنی کەمەوە دەمبینی کە ئانا زیاترێک پەرۆشی دۆزینەوەی کەسێک بوو کە یاریی کاغەزی لەگەڵدا بکات. هەر

هەمان ئەو بەیانییە، ئەو هۆڵەندییەی کە شەوانی پێشووتر یاریان لەگەڵدا دەکرد، سەفەری کرد. ئێ کێ شوێنەکەی بگرتایەتەوە؟ لە هەموو بارێکدا ئەو کەسە من نەبووم، چونکە نە یاریی کاغەزم دەزانی و نە دەشمویست فێری ببم.
بەلای منەوە یاریی کاغەز بەستراوەتەوە بە (شیلا)وە. هەموو ئێوارانێک کە من لە ژوورەکەی سەرەوە خەریکی کاری خۆم بووم، ئەو لە خوارەوە بۆ خۆی خەریکی یاریی کاغەز بوو. هەمیشەش کە کارەکانم تەواو دەکرد و دەهاتمە خوارەوە، ڕووی دەکرایەوە و دڵی خۆش دەبوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەستی لە یاریی کاغەزەکەی هەڵنەدەگرت و تەواوی دەکرد، ئێ منیش ناچار بووم بەدیارییەوە دابنیشم و سەیری بکەم. خۆ ئەگەر بشیویستایە سەر بکاتە سەرم، دەبووایە بەرلەوەی یارییەکی تر دابمەزرێنێت، من وەرەقەکانم بۆ تێکەڵ بکردایە، ئینجا دوای ئەوە تەماشایەکی دەکردم.
ئاگام لێ بوو چ کوخێکیان دا بە فرانک. کاتێکیش هیچ کارمەندێک لە ژووری پێشوازییەکەدا نەبوو، فرسەتم لێ هێنا و تەماشای ناونیشان و ساڵی لەدایکبوون و شوێنی دەرکردنی پاسپۆرتەکەیم کرد کە لە نەرویج دەریهێنابوو. کەمێک دواتر شوێنی کوخەکەی (فرانک)م بە ئانا و خۆسێ گوت، وتیشم بینیم لە بەرهەیوانەکەدا دانیشتبوو. هەروەها ئەوەشم پێ گوتن کە من پێم وابوو کەمێک هەست بە تەنهایی بکات. من هەموو ئەوانەم بەبێ هیچ مەبەستێکی خراپ بۆ گێڕانەوە.
بەشێوەیەکی گشتی دەبێت ئاماژە بۆ خاڵێکی گرنگ بکەم و بڵێم سەرتاپای ئەو شتانەی لە مانگی یەکدا لە ماراڤیو ڕوویاندا، هەروا خۆیان بۆ خۆیان ڕوویان نەدا. نامەوێت بڵێم کە من لەژێرەوە بەشێوەیەک لە شێوەکان شتەکانم ڕێک دەخست، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا چەند ڕووداوێکی گەورە بەهۆی پلانی منەوە ڕوویاندا. من بووم بەهۆی ئەوەی چەند کەسێک خێراتر یەکتری بناسن و ئەگەر من نەبوومایە ڕەنگە بەلایەنی کەمەوە حەفتەیەکی بویستایە.
بۆ نموونە من بە (ئانا و خۆسێ)م گوت کە ڕەنگە فرانک یاریی کاغەزیان لەگەڵدا بکات. ئەوە یەکێک بوو لەو شتانەی کە من کردم و زیاتریش هەر لەبەر خاتری ئانا بوو. دووهەم شتیش ئەوە بوو کە لەدوای نانخواردنی بەیانی یەکسەر کوخەکەی (فرانک)م نیشان دان، سێهەم شتیش ئەوە بوو کە وەک پێشنیارێک پێم گوتن بۆ ئێوارەکەی هانی ئەو زانای بایۆلۆجییە بدەین، کە تایبەتمەندە لە بواری گەشەی ژیاندا، باسی ئاستی زانستی ئەمڕۆی خۆیمان بۆ بکات، بەتایبەتیش لە کاتێکدا کە

نزیکەی (١٥٠) ساڵێک بەسەر کتێبی (ڕەچەڵەکی ڕەگەزەکان)ی داروینیدا تێپەڕیوە. بە بڕوای من هەقی خۆی بوو کە ئەو هەڵە لەدەست نەدەین. شەوی ڕابردوو من و خۆسێ بەشێوەیەک لە شێوەکان ئەو پەیوەندییە ڕەسمییەی نێوانمان شکاند و پێکەوە گەیشتینە تیۆرییەکی ڕوون و ئاشکرا: بە بڕوای هەردووکمان مرۆڤی مۆدێرن بە پلەی یەکەم شتێکی نوقسانە و پێکەوە ناومان نا (فەنتازیای مەعریفی).

ئەگەر ئەو نامەیەی بۆ ڤیرا نووسراوە (وە هەروەها ئەم پاشکۆیەش) بەڕاستی لەسەر هێڵی نێونەتەوەیی (بەرودوا)دا بخرێتە ناو کەپسولێکی زەمەنییەوە، ئەوا من هەزار ساڵی تر ڕووبەڕووی لێپرسینەوە دەبمەوە بەرامبەر ئەو هەموو فرت و فێڵە گەنجانانەی کە کردبوومن، وە هەر لە ئێستاشەوە وا خەریکە شوێنی دادگاییەکەم بنیات دەنێن، بەڵام ئەو کاتە هەموو تۆمەتەکانم لەسەر لادەبەن، تەنانەت ئەوەشیان کە نزیکەی ساڵێک دواتر لە ئیشبیلییەدا کردم. چونکە نە چیرۆکی ئانا و خۆسێ تەواو بووە و نە چیرۆکی فرانک و ڤیراش.

بەلای منەوە جۆرە دڵنەواییەک لەو حاڵەتەدا هەیە کە سەرتاپای ئەو شتانەی دەیانکەین، ئیتر هەر شتێک بێت، هێندەیان پێ ناچێت و لەبیر دەچنەوە. تکایەکیشم هەیە بۆ هەموو ئەوانەی کە هەزار ساڵی تر ئەمە دەخوێننەوە: با چیرۆکی ئانا لەناو پەرۆشی هاتنی هەزارەیەکی نوێتردا نغرۆ نەبێت.

ماوەیەک لەمەوبەر لە ڕۆژنامەی (دەیلی تەلەگراف)دا شتێکم دەربارەی (پەیکەرێکی بیرەوەریی هەزارساڵە) خوێندەوە کە دەیانەوێت لەسەر دوورگەی تاڤیونی بنیادی بنێن. هەرکەسێک کە ئارەزوو بکات، دەتوانێت لەبەرامبەر پێنج سەد دۆلاردا سڵاوی خۆی بۆ هەزارەی چوارەم بنووسێت و بیخاتە ناو کەپسولێکی شوشەییەوە. ئەو کەپسولە دەخرێتە ناو خشتێکەوە و دواتر مۆر دەکرێت و دەبێتە بەشێکی پەیکەرەکە. دەزگایەکی تایبەتیش لە ماوەی هەزار ساڵی داهاتوودا ئەو دیوارە دەپارێزێت و گەرانتیش دەدات کە هەموو کەپسولە زەمەنییەکان لە ساڵی (٣٠٠٠) دا بکرێنەوە.

واتە هەزار ساڵی تر چیرۆکەکەی (ئانا ماریا مایا) لەو شوێنەدا دەخوێنرێتەوە کە هێڵی (١٨٠) پلەی درێژی دوورگەی تاڤیونی دەبڕێت. هەندێکجار هەوڵ دەدەم کە مەزەنەی ئەو دیمەنە بکەم، هەموو کەڕەتێک وا دێتە بەرچاوم کە کورتەبنەیەک لەسەر پەیکەرەکە دانیشتووە و ئەو دێڕانە دەخوێنێتەوە.

لە پێشەکی ئەو نامەیەدا کە بۆ ڤیرا نووسراوە، فرانک وەسفێکی زۆر ورد و

تێروتەسەلی ئەو دوورگەیە دەکات کە ڕووی تێکردووە. من بەتەواوەتی تێناگەم و نازانم چۆن ئاوها فریای ئەو هەموو شتە کەوتووە. مەبەستم لەوەیە کە ئەو لە ژووری ئوتێلێکدا لە (مەدرید) دانیشتووە و تەنها دوو ڕۆژی لەبەردەستایە تا باسی ئانا و خۆسێ بۆ ڤیرا بگێڕێتەوە، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا کاتی خۆی بە باسی بۆق و شەمشەمەکوێرەوە دەکوژێت! نازانم ئەندازەی ئەو کەپسولانە چەندە کە بە پێنج سەد دۆلار دەفرۆشرێن، بەڵام دەزانم کە دەخرێنە ناو خشتەوە. ئەگەر نامەی ناو شووشەکەی من کە بۆ داهاتووی دەنێرم، شوێنی هەموو ئەو شتانە نەبێتەوە کە فرانک نووسیونی، ئەو کاتە ناچار دەبم لێرەو لەوێ هەندێک لاپەڕەی لێ بکەمەوە. لەلایەکی تریشەوە: ئەو کاتەی لە ڕۆژی یەکی یەکی ساڵی (٣٠٠٠)دا ئەو نامەیە دەخوێندرێتەوە کە بۆ ڤیرا نووسراوە (هەموو هەوڵ و کۆششی منیش لە کاتی ئێستادا هەر ئەمەیانە)، ئەو کاتە نەوەکانی داهاتوومان ڕاپۆرتێکی تێروتەسەلیان لەبەردەستدا دەبێت و دەزانن هەزار ساڵ لەوەوبەر (دوورگەی بەهەشت) بە چ شێوەیەک بووە. چەند نەگبەتین! ڕەنگە ئەو کاتە ڕقیان لێمان بێت. من گومانم لەوەیە ئەو کاتە کۆترە ڕەنگ پرتەقاڵییەکە بەیانیان بەسەر دەریاچەی (تاجیموشا) دا بفڕێت. گومان لەوە دەکەم شتێکی وا لەو دارستانە پڕ بارانە بمێنێتەوە. هەربۆیە تا ئێستاکە ئەو لاپەڕانەم لێ نەکردۆتەوە کە فرانک تیایاندا وەسفی ژیانی سروشتی دوورگەی تاڤیونی دەکات. ئێ خۆ لە خراپترین حاڵەتدا دەتوانم دیسکێک بخەمە ناو خشتەکەوە، بەڵام ئایا هەزار ساڵی تر شتێکی وەک (دیسک) دەخوێنرێتەوە؟ هەروا بۆ دڵنیایی خۆم نوسخەیەکی مانیفێستەکە دەخەمە کەپسولەکەوە، خۆ ئەوەیان شوێنێکی هێندە زۆر ناگرێت.

ئاخۆ چی ڕوویبدایە، ئەگەر ڤیرا بەڕاستی نامەکەی فرانکی پێ بگەیشتایە، من هەندێک جاری کەم کە بیر لەوە دەکەمەوە موچوڕکە بە لەشمدا دێت. بەهەرحاڵ هەر کاتێک کە پاشکۆکەم خستەسەر، مشوری ئەوە دەخۆم کە ڤیرا بیخوێنێتەوە. لەوانەیە بەو شێوەیە قووڵترێک لەو شتە تێبگات کە لە ئیشبیلییەدا ڕوویدا. خۆ ئەگەر سووریش بێت لەسەر ئەوەی کە خەڵکانی تریش بواری خوێندنەوەی چیرۆکی (ئانا)یان هەبێت، ئەوا ڕەنگە ئەو کاتە فیکرەی کەپسولەکە لە مێشکم دەربهێنم. ئێ ئاخر هیچ مانایەکی نییە کە تێکستێک بۆ ماوەی هەزار ساڵ بخرێتە کەپسولێکی زەمەنییەوە، ئەگەر هەر لە ئێستاوە لەبەردەستی خەڵکیدا بێت. پێم وابێت ئەو کاتە بڕیاری یەکلاکەرەوە دەکەوێتە دەستی جیهانەوە و ئەو بڕیار دەدات چ شتێک لە

یادەوەریدا بمێنێتەوە و چ شتێکیش فرێبدرێتە ناو دەفتەری لەیادچوونەوەوە.

*

یەکەمجار من بووم کە باسێکم دەربارەی مارمێلکەکان لەگەڵ (فرانک)دا دامەزراند. دڵنیا بووم کە من لە ئەو زیاترێک قێزم لەو گیانەوەرانە دەکردەوە، بەلایەنی کەمەوە ئەگەر ڕاستەوخۆ بەر لەشم بکەوتنایە، بۆ نموونە لە کاتی خەودا. لە دڵی خۆمدا گوتم: «ئێ فرانک خۆی وەک جۆرە پسپۆڕێک لە بواری ئەو گیانەوەرانەدا ناساند و ڕەنگە بتوانێت تەنانەت بۆ کەسێکی بەفیزی بەریتانی وەک منیش، یەک دوو وشەی ئارامبەخش بڵێت دەربارەی پێکەوەژیانی ئاشتییانەی نێوان مرۆڤ و گیانەوەرە خشۆکەکان». کەچی وا هاتە بەرچاوم کە ئەو خۆشی وای بە باش دەزانێت لە ژوورێکدا بخەوێت کە مارمێلکەی تێدا نەبێت، تەنانەت هۆکەشی بۆ ڕوون نەکردمەوە، بەڵام ئاماژەی بۆ ئەوە کرد کە تەنها یەک مارمێلکەی لە ژوورەکەیدا بینیوە، هەروەها گوتیشی گرنگییەکی زۆری بەوە داوە کە دەرگاکەی بەردەوام داخرابێت تا مێشوولە نەچێتە ژوورەکەیەوە، ئەوەیان شتێک بوو کە من بەهیچ جۆرێک لەو کاتەدا بیرم لێ نەدەکردەوە. ئەو مارمێلکەیە بوو کە ناوی نا (گۆردن)، هەڵبەتە ئەو ناوە لە ناوی مەشروبێکی لەندەنییەوە هاتووە کە بەلای منەوە هەمیشە بەهایەکی تایبەتی هەبووە، بەڵێ بەهایەکی هەر زۆر تایبەتی، تەنانەت (شیلا)ش هەموو کەرەتێک شتێکی دەربارەی دەگوت. تا ئێستاش هەموو کەرەتێک کە سەری ئەو بتڵە دەکەمەوە، بەتایبەتیش ئەگەر بتڵێکی تازە بێت، وا هەست دەکەم شیلا تەماشام دەکات.

فرانک هەر تەنها سەر بەو کەسانە نەبوو کە بە دەستکورتی ژیان و بەردەوامنەبوونی ڕۆحەوە دەناڵێنن، بەڵکو لەهەمانکاتیشدا یەکێک بوو لەوانەی بەردەوام گوێیان لە دەنگی ناو سەری خۆیان بوو.

من خۆشم گوێم لە دەنگی ناو سەری خۆمە، بەتایبەتیش لەدوای مردنی (شیلا) وە. واتە تا ئێستاش دەتوانم گفتوگۆی دووروودرێژ لەگەڵ شیلادا بکەم، هەمیشەش ئاگام لەوە نییە کە بە دەنگی بەرز قسە دەکەم یان هەر لە ناوەوەی خۆمدا بیر لە وشەکان دەکەمەوە، بەڵام ئەوەیان دەزانم هەندێک جار بە دەنگی بەرز قسە دەکەم و (شیلا)ش لەناو بیرکردنەوەکانمدا وەڵامم دەداتەوە.

ئەو کاتەی کە لە ژیانیشدا بوو هەر زۆر بەئاسانی دەمتوانی قسەی لەگەڵدا بکەم. کە بیروڕای خۆمم دەربارەی شتێک دەردەبڕی، بەرلەوەی شیلا هیچ شتێک بڵێت،

یەکسەر دەمزانی چی دەڵێت، نەک هەر ئەوەندەی کە ڕەئیم دەربارەی شتەکان دەزانی، بەڵکو دەمزانی وشە بە وشە چی دەڵێت. ئاخر ئێمە یەکتریمان زۆر زۆر باش دەناسی.
وابزانم هەموو کەسێک خاوەنی زمانێکی تایبەتیی خۆیەتی، پێشم وابێت هەریەکەمان لە هەڵبژاردنی وشە و دەستەواژەی ڕۆژانەدا زۆر تایبەتمەندین، هەر بۆ نموونە کاتێک کە دەڵێین: «ئاها، بزانە»، «خەریکبوو بڵێم»، یا بەشێوەیەکی تر بیڵێم، «ئەگەر لە مەبەستم بگەیت»، «من هەمیشە لەو بڕوایەدا بووم کە»، «نازانیت چەندە بێ ئەقڵییە کە» و... هەتا دوایی. زۆرجار کە لەگەڵ خەڵکانی تردا دادەنیشم، گوێم لە هەندێک وردە ڕستە دەبێت کە هەر لە ڕستە تایبەتییەکانی شیلا دەچن.. بەو شێوەیەش هەست دەکەم بەجۆرێک لە جۆرەکان تا ئێستاش هەر لە چواردەورمدایە.
زۆرجار کە شیلا قسەیەک دەکات و توڕە دەبم، بە دەنگی بەرز قسە دەکەم، تەنانەت ئەو کاتانەش کە بزانم ئەو قسەیەی کە دەیەوێت بیکات توڕەم دەکات، هەر بە دەنگی بەرز قسە دەکەم. لەم لایەنەوە هیچ شتێکی وا لە ژیانمدا گۆڕانکاری بەسەردا نەهاتووە. هەرچەندە بەهۆی تەمەنەکەمەوە ڕەنگە ئەم قسەیەم سەیر بێتە بەرگوێ، بەڵام لە ڕاستیدا بیری لەشی دەکەم. دەنا هەموو شێوازەکانی پێکەوەبوونمان هەروەکو خۆی ماوەتەوە، هەڵبەتە نەک تەنها لەبەرئەوەی هێشتا هەر لەگەڵ یەکتریدا قسە دەکەین، بەڵکو بەهۆی ئەو هەموو یادگارییەشەوەیە کە پێکەوە هەمانە. لە ڕاستیدا جارجارێک تەنانەت بیری ئەوەش دەکەم کە داوای لێ دەکردم وەرەقەی یاریی کاغەزەکەی بۆ تێکەڵ بکەم.
شیلا هەمیشە یاریی کاغەزی دەکرد، لە کاتی گەنجیشیدا، ئەو سیفەتەی یەکێک بوو لەو شتانەی کە وای لێ کردم عاشقی ببم، بەڵام لە چەند ساڵی ڕابردوودا، تاوناتاوێک کتومت هەر لەبەر ئەو سیفەتەی ڕقم لێی بوو. بۆ نموونە جارجارێک ڕقم لەوە بوو کە بەدرێژایی ئێوارەکە لەبەردەم ئاگردانەکەدا دادەنیشت و یاریی کاغەزی دەکرد. بیرم دێت کەڕەتێکیان پێم گوت: «یاریی کاغەز یارییەکی مردووە». ئای کە چەندە هەستی بریندار بوو بەو قسەیەم! بەدەر لەوەش پێم ناخۆش بوو کە جارجارێک دەمبینی گزی دەکرد تا یارییەکەی بکرێتەوە. ئێستاکەش، کە ئەو ڕۆیشتووە، بیری هەموو ئەو شتانە دەکەم کە جاران تاوناتاوێک دەبوونە هۆی ئەوەی ڕقم لێی بێت. ئا بەو شێوەیە بازنەکەمان کۆتایی پێ هات و بازنەیەکی ناخۆشیش نەبوو. ئاخر زۆر

ئاسانتره کەسێکت خۆش بوێت کە قەت پێی نەگەیت، وەک لەوەی کەسێکت خۆش بوێت کە قەت نەتوانیت لە دەستی ڕزگار ببیت.
دراوسێییەکەم یەک دوو جارێک پێی وتووم کە قسە لەگەڵ خۆمدا دەکەم. من خۆم پێم وایە کەسێکی ساویلکە بێت، بەڵام هاوکات پێم خۆشە کە گوێی لە قسەکانی شیلا نییە. بەهەرحاڵ، وابزانم ئەو ڕۆژەش هەر دێتە پێشەوە کە چیتر منیش نەتوانم قسەکانی شیلا تەنها لەلای خۆم بهێڵمەوە. من دەزانم بەرەو تەمەنی پیری دەڕۆم. ڕەنگە هێشتا زوو بێت، بەڵام هەر لە ئێستاوە بەبێ ویستی خۆم توشی شتێک بووم کە من دەمەوێت ناوی بنێم (فرێدانی قسە) و پێشی دەچێت ئەم حاڵەتە بەرەو خراپتریش بچێت.
هەتا ئەو کاتەی ئەو دەنگانە تەنها لەناو سەری خۆمدا دەمێننەوە، شەرم لە هیچ شتێک ناکەم. هیچ شەرم لە شیلا ناکەم کە تا ئێستاش هەر قسەی لەگەڵدا دەکەم. ئاخر ئەو کاتە وەک ئەوە وایە کە شتەکان ئاوەژوو بکەینەوە، چونکە لە ڕاستیدا ئەوە شیلایە کە زایەڵەی دەنگی خۆی لەدوای ڕۆیشتنییەوە لەلام جێهێشتووە: «جۆن، چاکە ئامادەیە.. هاتیت؟»، «ناشێ ئەو قاتە لەبەر بکەیت؟ من دوو مانگ لەمەوبەر پێم گوتیت ببیە بۆ شۆرین»، «دەڵێی چی ئەم ئێوارەیە (جێرمی) و (مارگرێت) بانگ بکەین؟ زۆر دەمێکە نەهاتوون!»

*

نامەوێت بە قووڵی هیچ شتێکی وا دەربارەی وەسفەکەی فڕانک بڵێم کە تیایدا باسی کۆبوونەوە باڵاکە دەکات، ئەو کۆبوونەوەیەی کە خۆم بە شپرزەیی ڕێکم خست و بەڕێوەم برد. بەشێوەیەکی گشتی دەتوانم بڵێم وێنەیەکی پڕاوپڕی سەرجەم قسەکانمانی خستۆتە ڕوو، بەڵام ڕەنگە لەجێی خۆیدا بێت کە لە یەک خاڵی گرنگدا گێڕانەوەکەی فڕانک وردترێک بکەمەوە.
فڕانک نووسیویەتی کە ئانا بیروبۆچوونی خۆی دەربارەی ئەم واقیعە، لە سێ وتەیدا چڕ کردۆتەوە: یەکەمیان کە گوتوویەتی: «حەقیقەتێک لە دەرەوەی ئەم حەقیقەتەدا هەیە. من کاتێک کە دەمرم، نامرم. ئەو کاتە هەمووتان وا دەزانن کە من مردووم، بەڵام من نەمردووم. دیسانەوە پاش ماوەیەکی تر لە شوێنێکی تردا یەکتری دەبینینەوە». ئینجا گوتوویەتی: «ئەو کاتە وا هەست دەکەن بۆ پرسەی کەسێک هاتوون، بەڵام لە ڕاستیدا بۆنەی لەدایکبوونی کەسێک کۆیکردونەتەوە». دواجاریش گوتوویەتی: «حەقیقەتێک لە دەرەوەی ئەم حەقیقەتەدا هەیە. ئێمە لێرەدا تەنها

ڕۆحێکین کە لە سەفەرداین و زوو تێپەڕ دەبین».
بێگومان شتێک لەو بابەتە باس کرا، من خۆم هیچ لارییەکم لەوەیان نییە، بەڵام گومانم لەوەیان هەیە کە نووسینەوەی پڕاوپڕ و وشە بە وشەی گفتوگۆیەک ڕێی تێبچێت کە ساڵێک زیاتری بەسەردا تێپەڕیبێت. بەهەرحاڵ بەهۆی ئەو بارودۆخەوە کە هاتۆتە پێشەوە، دەبێت ئاماژە بەوە بکەم کە (فرانک)ی ئازیز کەمێک زیاد لە ڕادە گرنگیی بەوە داوە کە ئانا جیهانبینییە دوو فاقییەکەی خۆی گرێداوەتەوە بە ژیانی خۆی و مردنی خۆی و ناشتنی خۆیەوە. ئاخر ئەو بەشێوەیەکی زۆر گشتی بیروڕای خۆی دەربڕی کاتێ کە گوتی حەقیقەتێک لە دەرەوەی ئەم حەقیقەتەوە هەیە و ژیانێکیش لەدوای ئەم ژیانەوە بوونی هەیە. ئەو لەسەر بنەمای قسەکانی من و (لاورا)وە ئەو شتانەی گوت. بەهەرحاڵ زۆر بەڕوونی بیرمە کە ئانا گوتی: «لەوانەیە لە شوێنێکی تردا یەکتری ببینینەوە و ئا ئەم دانیشتنەمان وەک خەونێک بێتەوە یاد».
ئەگەر من چەند مانگێک دواتر (فرانک)م لە مەدریددا نەبینیبایەتەوە، ئەوا ئەو کاتە پێویستی نەدەکرد لە ڕێگەی ئەم ئاڵۆزکارییانەمەوە ئەو نامەیە بشێوێنم کە بۆ ڤیرا نووسرابوو، بەڵام دواترێک دەرکەوت ئەو قسەیەی کە ئانا کردی زۆر زۆر گرنگتر بوو لەوەی کە ئێمە مەزەنەمان دەکرد. هەڵبەتە منیش، هەروەک فرانک، لەو بڕوایەدام کە ئانا زیادەڕۆیی لەوەدا کرد کاتێک کە (ناشتن)ی خۆی لەگەڵ (لەدایکبوون)دا بەراورد کرد. بەدەر لەوەش دەبێت جەخت لەسەر ئەوەیان بکەمەوە کە کاتێک ئانا قسەکانی کرد، خۆسێ بەڕاستی فرمێسکێکی بە چاودا هاتە خوارەوە، پێشم وا نییە لەبەر ئەوە بووبێت کە شتێک چووبێتە ناو چاوییەوە. ئەوە بوو ڕۆژ و نیوێک لەدوای کۆبوونەوەکەوە ئانا بورایەوە، ئەو کاتە من لەلای خۆمەوە بۆم پرسیار بوو و نەمزانی فرمێسکەکەی خۆسێ پەیوەندیی بەو بورانەوەیەوە هەبوو یان نا.
هەر ڕێک لە پاش ئەوەی ئانا و خۆسێ چوونە ناو دارگوێزە هیندییەکانەوە، من هەستام و بەجێمهێشتن، فرانک لەمەیاندا ڕاست دەکات، لەبەرئەوە نازانم لەدوای منەوە ئەو چەندێک لەویادا ماوەتەوە. هاوکاتیش بەهۆی چەند هۆیەکەوە لەو بڕوایەدام کە سۆفیگەرییە سروشتییەکەی لاورا، فرانکی فریودا. ئێ ئەو لایەنە هەر لەو گفتوگۆیانەشدا دەردەکەوێت کە شەوانە لەگەڵ (گۆردن)دا کردبوونی. من وای بۆ چووم لە ناوەوەیدا ململانێیەک لەگەڵ خۆیدا بکات و بیەوێت خۆی لەو تێڕوانینە فرەمیکانیکییە ڕزگار بکات کە دەربارەی ئەم ژیانە لەلای گەلالە بووبوو. بەو شێوەیە

بە بڕوای من ئەو ڕەهەندە شیرینانەی کە لاورا بە خۆی و پرچە ڕەش و چاوە سەرسوڕهێنەرەکانییەوە دەریدەبڕین، فریوێکی گونجاو بوون بۆ ئەو.
فرانک لە نامەکەیدا باسی دوا شەوی بەر لە سەفەرەکەی دەکات و بەسەرهاتی چۆنییەتی ڕۆیشتنی لەگەڵ لاورادا دەگێڕێتەوە. بیرم دێت تا ئەو کاتەی لە بەرهەیوانەکەیدا دانیشتن، چاوم لێیان بوو، بەڵام دەبێت ئەوەشیان بڵێم کە من بەدەر لەو شتانەی کە فرانک لە نامەکەیدا دەربارەی ئەو شەوە دەیگێڕێتەوە، هیچ شتێکی تر نازانم.
من خۆشم ڕۆژێک لەدوای سەفەرەکەی فرانکەوە بەرەو لەندەن بەرێکەوتمەوە، بەڵام بەپێچەوانەی ئەوەوە، من بەرەو ڕۆژئاوا سەفەرم کرد بۆ (سیدنی) و دواتریش بۆ (سەنگافورا) و (بانکۆک). دەبێت ئەوەش بڵێم کە تەنها لەدوای ئەو سەفەرە دوورودرێژانەوە ئینجا شێوە تێگەیشتنێکم دەربارەی ئەو شتانە لەلا گەڵاڵە بوو کە لە ماراڤیودا بینیمن.
لە پاش سەفەرەکەی فرانکەوە، ئانا کەرەتێکی تریش لەپڕێکدا بورایەوە. ئەو جارەیان یەک دوو خولەکێکی خایاند، ئەو کەرەتەشیان خۆسێ بەتەواوەتی شڵەژا. قۆڵی وشی و چەند جارێک بانگی کرد، هەوڵی دا هەردوو قاچی ئانا بەرز بکاتەوە و بە قەدی یەکێک لە دارگوێزە هیندییەکاندا هەڵیبسپێرێت. ڕێک بە قەدی ئەو دارەوە لافیتەیەکی پێوە هەڵواسرابوو، زۆر بەڕوونی و ئاشکرا لەسەری نووسرابوو (وریابە، لێرەدا گوێزی هیندی دەکەوێتە خوارەوە).
هێندەم پێ گوتن کە فرانک نیگەرانی باری تەندروستیی ئانا بوو و تەمەننای چاکبوونەوەی کردووە، هەروەها گوتیشم کە زۆر حەزی لە هونەری ئیسپانی بوو و تەنانەت مۆزەخانەی (پرادۆ)ی بە یەکێک لە هەرەقەشەنگترین مۆزەخانەکانی دونیا داناوە. وابزانم هێندەشم پێ گوتن کە لەنێو کەڵەوێنەکێشانی ئیسپانیدا (گۆیا)ی زیاترێک بەدڵ بوو، بەڵام ئەو وەڵامەم نەدرایەوە کە من دەمویست، بگرە خۆسێ جاڕس بوو لێم و هەروا زۆر بە ساکاری گوتی: «باشە باش، بەڵام بەیارمەتیی خۆت دەتوانیت جێمان بهێڵیت تا بۆ خۆمان کەمێک پێکەوە بین؟»
کاتێک کە باسی (گۆیا)م کرد، وا هاتە بەرچاوم کە ئانا زیاترێک بەدەم قسەکەمەوە بێت، هەرچەندە هەر چارەکێک دواتر لەناو هەرێزەکەی تەنیشت مەلەوانگەکەوە بورایەوە. لە کاتی نانخواردنی ئێوارەشدا هەروا بە سەرم یەک دوو جارێک سەلامم لێ کردن، هەروەها کۆمەڵێک میوانی نوێش هاتبوون.

فرانک لە نامەکەیدا بەهیچ جۆرێک باسی ئەو ماوەیە ناکات کە لە ئۆسلۆدا تا کۆتایی مانگی چوار بەسەری بردووە. ئەگەر تا ئەو کاتەش هەر لە (سۆنگڤای) ژیابێت، ئەوا دەبێت سەخت بووبێت بەلایەوە کە هەموو ڕۆژێک لە ڕێگەی گەڕانەوەیدا لە دانیشگاوە بەسەر ئەو گردەدا سەرکەوتبێت. تەنانەت ئەگەر بە سەیارەش هاتوچۆی کردبێت، ئەوا ناچار بووە ڕۆژانە چەند جارێک بەلای شوێنی ڕووداوەکەدا تێپەڕیبێت. من خۆم زۆرجار لە (کرۆیدن)دا چەندین لاڕێی دوورودێژ دەگرمەبەر، تەنها بۆ ئەوەی بەلای ئەو خەستەخانەیەدا نەڕۆم کە (شیلا)ی تێدا مرد.

من و فرانک هەردووکمان بەشێوەیەک لە شێوەکان دووچاری جۆرە تەسلیمبوونێکی ئەم ژیانە بووین. تا ئەندازەیەکیش پێم ناخۆش بوو کە ئەو و ڤیرا نەیاندەتوانی پێکەوە قسە بکەن. ڕاستە منداڵێکیان لەدەست دابوو، بەڵام خۆ هەر هیچ نەبێت ڕۆژێک لە ڕۆژان ئەو منداڵەیان پێکەوە هەبووە. من و شیلا بۆ ماوەی چەندین ساڵ هەوڵمان دا و قەت منداڵمان نەبوو. ئەو یاریی کاغەزەکەی خۆی هەبوو و منیش ڕۆمانەکانی خۆم.

❊

وا بەم شێوەیە بۆمان ڕوون بووەوە کە زۆربەی ئەو شتانەی فرانک دەربارەی دوورگەکانی فیجی دەیانگێڕێتەوە، لەسەر بنەمای ڕووداوی ڕاستەقینە هەڵچنراون.

من هەمیشە، وە هەتا بۆم بلوێت، کتێبەکانم لەسەر بنەمای ڕووداوی ڕاستەقینە هەڵدەچنم، بەڵام خۆ ناشکرێت زانیاری دەربارەی هەموو شتێک بەدەست بهێنرێت، هەربۆیە لەو کاتانەدا فەنتازیا ڕۆڵێکی بەرچاو دەبینێت. تەنانەت ئەو زانیارییانەی دەربارەی بابەتە مێژووییەکانیش لەبەردەستدان هەر سنووردارن، بۆ نموونە وەک زانیاری دەربارەی مۆدێلەکانی گۆیا، یان پێشانگا تایبەتییەکەی مانوئێل گۆدۆی، یاخود دەربارەی سەرەتای گۆرانی فلامینکۆ. هاوکاتیش، ئا ئەمەیانم بەلاوە گرنگە کە بیڵێم، ڕوودەدات کە ڕۆماننووسێک بچێتە سەر چەند سەرچاوەیەک کە تا ئێستا تەنانەت بەلای مێژوونووسانیشەوە شاراوە بن. بگرە لەوەش زیاتر: ڕێدەکەوێت نووسەرێک بەختەوەر بێت و دەستی بە چەند سەرچاوەیەکی دێرین و شاراوەی وەهادا بگات کە بەڕاستی بتوانێت لە ڕێگەیانەوە تیشکێکی نوێ بخاتە سەر ڕووداوە مێژووییەکان. من ئەم جارەیان لە چەند لایەکەوە لەو جۆرە بەختە هاتە سەر ڕێم. کاتێکیش کە ئاوها بەڕوونی جەخت لەسەر ئەمەیان دەکەمەوە، تەنها لەبەرئەوەیە کە ڕوونی بکەمەوە و بڵێم زۆربەی ئەو شتانەی دەربارەی دوورگەکانی فیجی و

ئیسپانیا باس کران، له ڕووداوی ڕاستەقینەوە هاتوون.
من ئەو لێکچوونە زۆرەی نێوان سیمای ئانا و (ماخا)کەی گۆیا سەرسامی کردبووم. لە مۆزەخانەی پرادۆشدا، لەسەر لاپەڕەی دەلیلی ڕەسمیی تابلۆکانی گۆیا، دەربارەی (ماخای ڕووت) ئەم وشانە نووسراوە: «ئەم تابلۆیە، کە تا ئێستاکە وەک مەتەڵێکی بێ وەڵام ماوەتەوە، نموونەی تابلۆیەکی پڕ نهێنییە»، هەروەها نووسراوە: «تا ئێستا ئەو نهێنییە چاوەڕوانی هەڵهێنانە»، نەنووسراوە کە: «قەت هەڵناهێنرێت»، بەڵکو نووسراوە: «تابلۆیەکی پڕ نهێنییە». وا ڕێک دوو سەد ساڵ بەسەر کێشانی ئەو تابلۆیەدا تێپەڕیووە و بە دڵنیاییەوە تەنها شت نییە کە بە داخراوی مابێتەوە، لە ڕاستیدا چەند چەکمەجەیەکی داخراوی دوو سەد ساڵە لە ئیسپانیادا بوونیان هەیە، هەر بۆ نموونە لە (سانلوکار دی باڕامێدا)دا.
لە مەدریددا چاوم بە فرانک کەوت و هەر ئەوە کاری نووسینەکەمی بەتەواوەتی شێواند. لە گەرمەی نووسینی ڕۆمانەکەمدا کەسایەتی هەرەسەرەکی ڕۆمانەکەم لە ئوتێلی (پالاس)دا لەبەردەممدا قوت بووەوە، مەبەستم لەوەیە هەر ڕێک بە مانای وشە لەناو ڕووداوەکانی ڕۆمانەکەمدا بینیم. من بۆیە لەو ئوتێلە نایابەدا لامدابوو، چونکە مەزەنەم دەکرد فرانک لەویادا نامە دووروودرێژەکەی بۆ ڤیرا نووسیبێت.
حەفتەی پێشوو هەروا وەک کەسێکی بێ خەیاڵ سەفەرێکم کرد بۆ ئیشبیلییە. نەدەبووایە ئەوەم بکردبایە، چونکە ڕێک لەوێشدا شتێک ڕوویدا و کەمێک پڕۆژەی ڕۆمانەکەمی تێک دا.
ناچار بووم بەشداریی پرسەکە نەکەم، ئەوەشیان شتێکی وا نەبوو کە لە سەرەتاوە پلانم بۆ دانابێت. بگرە بەپێچەوانەوە، بەتەواوەتی پەرۆشی وەسفکردنی کۆمەڵێک قەرەجی مات و دڵتەنگ بووم، ئاخر ئانا ماریا مایا بۆیە مردبوو، چونکە بەدوای کورتەبنەیەکدا ڕایکردبوو کە وێنەکەی گرتبوو.
ئەی لە ئیشبیلییەدا چی ڕوویدا؟
جاری وا هەیە هەندێک ڕووداوی زۆر سەیر و سەرنجڕاکێش لە ژیانی ڕۆژانەماندا ڕوودەدەن، هێندە سەرنجڕاکێش کە تەنانەت وێنەیان لە جوانترین و قەشەنگترین چیرۆکی هەڵبەستراویشدا نابینینەوە.

*

بەرەو بارەکەی ئوتێلی (پالاس) چوومە خوارەوە، لەویادا فرانکم بینی دانیشتبوو و بیرەیەکی لەبەردەمدا بوو. ناوەڕاستی مانگی یانزە بوو، نزیکەی ساڵێک بەسەر ئەو

کاتەدا تێپەڕی بوو کە بۆ یەکەمجار لە تاڤیونیدا یەکترمان بینی. ئەو ڕۆژە من چووم بە شوێن ئەو و یەک دوو ئەمەریکی تردا و لە فڕۆکەخانە بچکۆلەکەوە تا ئوتێلەکەم گەیاندن، ئێستاش بەڕوونی سیمای ئەو کاتەی (فڕانک)م لەیادە: وەک کەسێکی لەڕادەبەدەر مات و غەمگین هاتە بەرچاوم.

وا شەش مانگێک بەسەر ئەو کاتەدا تێپەڕیووە کە فڕانک لە ئوتێلی پالاسدا لایدا و نامە دوورودرێژەکەی بۆ ڤیرا نووسی. یان با ڕوونترێک بیڵێم: شەش مانگێک بەسەر ئەو کاتەدا تێپەڕیووە کە من وام مەزەنە دەکرد فڕانک لە ژووری ئوتێلێک لە ئوتێلەکانی مەدریددا دانیشتبێت و نامەیەکی دوورودرێژ بۆ ڤیرا بنووسێت، هەڵبەتە پاش ئەوەی لە کۆنفرانسەکەی سالامانکادا چاوی پێکەوتبوو. لە ئێستا بەدواوە گرنگە ئەو دوو چیرۆکە لە یەکتری جیا بکەینەوە. من هەر لە مانگی یانزەی ساڵی (١٩٩٨)ەوە دەستم کرد بە نووسینەوەی نامەکە، بەڵام بەڕاستی نەمتوانی تەواوی بکەم.

من خۆم بەهیچ شێوەیەک بە خەیاڵمدا نەدەهات کە ڕێک لەو ئوتێلەدا فڕانک ببینم. من دەمزانی ئەو لە ئۆسلۆ دەژی: ڕاستە بۆ ماوەی چەند ساڵێک پەیوەندی بە ئیسپانیاوە هەبووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بواری بینینی لە مەدریددا هەر زۆر زۆر کەم بوو. نەک هەر ئەوەش، فڕانک خۆی بەهیچ جۆرێک ئاماژەی بۆ ئەوە نەکردبوو کە من بچمە ئوتێلی پالاس، بەڵکو (کریس بات)ی بەڕێوەبەری کتێبخانە نوێکەی (کرۆیدن) ئەو ئامۆژگارییەی کردم.

لەسەر مێزەکەی دانیشتم، فڕانک هەروەک کەسێک کە ئومێدێکی زۆری هەبێت، خەندەیەکی بۆ کردم، ئینجا قەڵەمێکی ڕەشی مارکەی (پیلۆت)ی لە گیرفانیدا دەرهێنا و گوتی:

- بیرم چوو ئەم قەڵەمەت بدەمەوە، فەرموو.

پێکەنیم، لە دوولاوە پێکەنیم، چونکە لە ڕاستیدا دەبووایە من سوپاسیم بکردایە. گوتم:

- ئێ من وتم بۆ خۆتی هەڵبگرە.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا قەڵەمەکەم لێ وەرگرتەوە، چونکە بەلامەوە جۆرە نرخێکی تایبەتی پەیدا کردبوو. ئینجا پرسیم:

- ئەی لەگەڵ ڕاپۆرتەکەدا گەیشتیتە کوێ؟

- دەڕوات و وا خەریکە تەواوی دەکەم. ئەی تۆ لەگەڵ ڕۆمانەکەتدا چیت کرد؟

- منیش وا خەریکە تەواوی دەکەم.
- بۆ پشوو هاتوویتەتە ئێرە؟
بێگومان پرسیارێکی چاوەڕوانکراو بوو، لە وەڵامدا گوتم:
- پشوویەکی تەواوەتی نا.
- سەرقاڵی لێکۆڵینەوە و شتی وایت بۆ ڕۆمانەکەت؟
- بەڵێ، بەشێوەیەک لە شێوەکان.
- دەربارەی شتێکی ئیسپانی دەنووسیت؟
پەنجەیەکم خستە سەر دەمم:
- من قەت باسی ئەو شتە ناکەم کە دەربارەی دەنووسم. ئەی تۆ؟
- من دەتوانم باسی ڕاپۆرتەکەم بکەم.
- مەبەستم لەوەیە چۆنە وا لە مەدریدایت؟
نەیتوانی دەمودەست وەڵامم بداتەوە، لەبەرئەوە پرسیم:
- هاتوویت سەردانی ڤیرا بکەیت؟
- ئەو لە بەرشەلۆنە دەژی.
- بەڵێ، بیرم دێت کاتی خۆی باسی ئەوەیانت بۆ کردم. ئەی لە کۆنفرانسەکەی سالامانکادا چاوت پێکەوت؟
بەپەلە سەرێکی بۆ لەقاندم.
- ڕەنگە ئێستا هێندە پەیوەندیتان پێکەوە نەبێت، یان چی؟
بەکورتی گوتی:
- خۆشم نازانم، بەڵام با بزانین چۆن دەبێت.
منیش لەدوایەوە گوتمەوە:
- با بزانین چۆن دەبێت. خۆ ئەوە ئەو نەبوو کە ئەمڕۆ نانی نیوەڕۆت لەگەڵدا خوارد؟
سەری بۆ ڕاوەشاندم و بەرلەوەی وەڵامم بداتەوە، دیاربوو وەڵامەکەی هەڵدەسەنگاند:
- ئەوە کۆنە برادەرێکی سەردەمی تەلەبایەتیم بوو. چەند ساڵێک لەمەوبەر من لە مەدریددا دەمخوێند.
- ئێستاکەش هەروا بۆ پشوویەکی بچکۆلە لێرەیت؟
کەمێک لەسەر کورسییەکەی بەملاولادا جووڵایەوە، ئینجا گوتی:

- بەڵێ، هەروا بۆ چەند ڕۆژێک و کۆتایی حەفتەکەش لێرە دەمێنمەوە. ئاخر من لە سەردەمی منداڵیمدا چەند ساڵێک لێرە ژیاوم. کاتی خۆی باوکم بۆ ماوەی چوار ساڵ لێرەدا پەیامنێری ڕۆژنامەیەکی نەرویجی بوو. من هەمیشە شتێک لە شتەکان سەرلەنوێ ڕامدەکێشێتەوە بۆ ئێرە.

- وابزانم ڤیراش هەروایە؟ پەیوەندیتان پێکەوە هەیە؟

تا ئێرە توانیم لەگەڵ قسەکانمدا بیهێنم، بەڵام لەوەندە زیاتر نا، چونکە لەویادا خەندەیەکی کرد و گوتی:

- هەست دەکەم بەرەبەرە پرسیارەکانت لە لێپرسینەوە و شتی وا دەچێت.

ئێ لە ڕاستیشدا هەروا بوو. ئاخر ناچار بووم پێشوەخت فیکرەیەکی باش دەربارەی وەربگرم. بەدەر لەوەش دەبووایە هەوڵم بدایە و بمزانیبایە لە بەرنامەکەیدا چەند ڕۆژێکی بەتاڵی لەبەردەستدایە یان نا. دیسانەوە لە لایەکی ترەوە هەوڵم دایەوە و گوتم:

- سەردانی مۆزەخانەی پرادۆ یان ئەو جۆرە شوێنانە ناکەیت؟

یەکسەر دەموچاوی گەشایەوە، پێشم وا نییە تەنها لەبەرئەوە بووبێت کە من بابەتەکەم گۆڕی. پاشان گوتی:

- لە ڕاستیدا وامدانابوو بەیانی سەردانێکی ئەوێ بکەم. ئەگەر تۆش کاتت هەبێت، ئەوا دەتوانین پێکەوە بچین. زۆرم پێ خۆشە دوو تابلۆت نیشان بدەم.

لە دڵی خۆمدا گوتم: «ئاها، کەواتە دەیەوێت دوو تابلۆم نیشان بدات، ئاها، بزانە».

پرسیارێکم لێ کرد و گوتم:

- تابلۆی گۆیا یان ڤیلاسکویز؟

بە نیگایەکی لێوانلێو لە ڕاز و نهێنییەوە تەماشایەکی هۆڵە پڕ لە دووکەڵەکەی کرد، ئینجا گوتی:

- گۆیا.

- دەتوانیت پێم بڵێیت کام دوو تابلۆیەیە؟

ڕێک تەماشای ناو چاوی کردم، هێندە هەڵچووبوو، بیلبیلەی چاوی سەمای دەکرد کاتێک کە گوتی:

- هەر دەبێت بیانبینیت. بەلایەنی کەمەوە ئومێدەوارم لەو کاتەدا کە دەیانبینیت، سیمات ببینم.

وەک جۆرە شانازیکردنێک قسەکانی هەڵڕشت، هەروەک ئەوەی شانازییەکە بۆ ئەو بگەڕێتەوە کە ئەو دوو تابلۆیەم نیشان دەدات. ئینجا لەناکاوێکدا بە وریاییەوە گوتی:

– دەترسم تۆش بزانی کە مەبەستم لە کام دوو تابلۆیەیە؟

بێگومان دەمزانی کام دوو تابلۆیەی لە خەیاڵدایە. ئەو کاتەی لە تاڤیونی بووین، من لە پێش ئەوەوە ئەو دوو تابلۆیەم دۆزییەوە. کۆمپیوتەرێکی لاپتۆپ و مۆدیۆمێکم لە (یۆکین کیس) وەرگرت و لە ماوەی یەک دوو خوولەکدا چەند وێنەیەکی ڕوونی تابلۆ هەرەبەناوبانگەکانی گۆیام لە ئینتەرنێتدا دۆزییەوە. بەڕاستی سەرسام بووم، هێندە سەرسام بووم کە خەریکبوو دەرگاکەم بکەمەوە و بەرەو ناو دارگوێزە هیندییەکاندا هاوار بکەم: «ئۆریکا[٦٥]»، بەڵام دانم بە خۆمدا گرت و لەبری ئەوە بەدوای هەندێک زانیاریی تردا گەڕام و ویستم شتێک دەربارەی فلامینکۆی شاری ئیشبیلییە بدۆزمەوە. هێندەی نەبرد و بۆم دەرکەوت کە ئانا سەماکەرێکی بەناوبانگی فلامینکۆیە، هەروەها هێندەشم بۆ ڕوون بووەوە کە ناوی تەواوەتی (ئانا ماریا مایا)یە. پاش ئەوە ئیدی شتەکان خۆیان بۆ خۆیان بەرەبەرە ڕوویان دا. بەڕاست، شتێکی سەیر نییە کە ڕێک لەو ڕۆژەدا کە من بۆم دەرکەوت لەقەبی ئانا (مایا)یە، لاورا هات و باسی زاراوەی دێرینی (مایا)ی هیندی کرد؟! ئیدی فریوم خوارد و بە ناوی ڕاستەقینەی خۆیەوە بانگم کرد. بگرە لەوەش زیاترێک ڕۆیشتم و وەک (هونەرێکی باڵا) وەسفم کرد. بەهەرحاڵ ڕێک بەو شێوەیە بوو کە فرانک لە نامەکەیدا باسی دەکات. ئانا لەڕادەبەدەر لە (ماخا)ی گۆیا دەچوو، وابزانم بێزار بوو لەوەی کە بەردەوام ئەو شتەی بەڕوودا دەدرایەوە، پێشم وابێت هەر ئەو هۆیە وای لە خۆسێ کرد کە بەو شێوەیە ڕەفتار بکات، سەرەڕای ئەوەش هێندەی بۆ دەرکەوت کە من لەقەبی ئانا دەزانم. ئیدی لەدوای ئەوەوە ئانا و خۆسێ بەردەوام لێمان دوورکەوتنەوە. ئەوە بوو ئینجا ئانا بۆ یەکەم جار بوورایەوە، دواتریش پاش ئەوەی فرانک سەفەری کرد، دیسانەوە کەڕەتێکی تریش بوورایەوە. من خۆم وای بۆ چووم کە زۆر بە جیددی نەخۆش بێت.

گوتم:

– ئاخر کۆمەڵێک کاری یەکجار زۆری گۆیا لە مۆزەخانەی پرادۆدا هەیە.

لە خۆشیدا هەناسەیەکی هەڵکێشا، وا خۆم دەرخست کە لە مەبەستی تێناگەم. ئینجا گوتی:

– لەو بڕوایەدام زۆر سەرسام بیت.

ئا بەو شێوەیە بۆ ماوەیەک پێکەوە قسەمان کرد. بەردەوام بە دەوروخولی بابەتەکەدا دەهاتین و دەچووین، نەک هەر ئەوەش، بگرە بە دەوری چەند بابەتێکی تریشدا دەخولاینەوە. پاشان بڕیارم دا ڕاستەوخۆ بچمە ناو بابەتەکەمەوە و گوتم:

– لە ڕاستیدا وام نیازە بەیانی سەردانی ئیشبیلییە بکەم. حەفتەی پێشووش هەر لەوێ بووم و دەمەوێت بەرلەوەی بگەڕێمەوە بۆ بەریتانیا، پشووی حەفتەکەم لەوێ بەسەر بەرم.

– باشە، کەواتە سەلامیان لێ بکە. سەلام لە دار پرتەقاڵەکان بکە.

– بێگومان سەلامیان لێ دەکەم.

نەمدەزانی ئەو قەت ئەوێی دیوە یان نا، بەڵام گوتی:

– دڵنیام ئەندەلوس لەم وەرزەدا زۆر خۆشە.

لە دڵی خۆمدا گوتم: «ئاها. بیلێ!»، سەیری ناو چاوە قاوەییەکانیم کرد و گوتم:

– حەز دەکەیت لەگەڵمدا بێت بۆ ئەوێ؟

وا هاتە بەرچاوم کەمێک سەری لێ شێوابێت، لەوەدەچوو لە دڵی خۆیدا بڵێت (ئەمە چییە؟)

گوتم:

– زۆرم پێ خۆشە لەوێ شتێکت پیشان بدەم.

بە دەنگی بەرز پێکەنی و گوتی:

– ئەی ئەوەیان چییە؟

دیسانەوە پەنجەیەکم خستەوە سەر دەمم:

– فرانک، دەبێت خۆت ببیینیت.

هەرچی دەربارەی ئەو شتانە بوو کە دەمانویست پیشانی یەکتری بدەین، یەک بەرامبەر یەک بووین. فرانک تەماشایەکی سەعاتەکەی کرد و هەروا بێ ئۆقرە لەسەر کورسییەکەی دەجووڵایەوە، ئینجا گوتی:

– پێم وا نییە بتوانم. بەڕاستی نە وەک کات و نە وەک مەسرەفیش دەتوانم.

لەویادا هەستم کرد کەوتبێتە تەڵەکەمەوە، گوتم:

– مەسرەفەکەت لەسەر منە، ئەوەیان هەر کێشە نییە.

ئینجا گوتی:

– لە ڕاستیدا خۆم دەمویست لە ڕێگەی بەرشەلۆنەوە سەفەر بەرەو ئۆسلۆ بکەمەوە. هەر ئەوەندە بوو کە دەبووایە لە پێشدا تەلەفۆنێکم بکردایە و خۆت دەزانیت چۆنە،

بەڵام بەردەوام هەر دوام خست و پشتگوێم خست.
دڵنیام کردەوە و گوتم:
- ئێ دەتوانیت هەردووکیان بکەیت. لە پێشدا ڕۆژێک یان دوو ڕۆژ لە ئیشبیلییەدا بەسەر بەرە و دواتریش لە بەرشەلۆنەوە بەرەو ئۆسلۆ سەفەر بکە. ڕەنگە خۆری ئیشبیلییەش کەمێک ئەسمەرت بکات. ئەوەش شتێکە خەڵکی سەرنجی دەدەن.
بیرەیەکی تری داوا کرد و دیاربوو فیکرەکەمی هەڵدەسەنگاند. لەو کاتەدا هەروا تاڕادەیەک بە بێ مەبەست ئەم قسەیەم فڕێدا:
- دڵنیات دەکەمەوە کە نائومێد نابیت. پێم وابێت بەتەواوەتی سەرسام دەبیت.
کۆمەڵێک پرسیارم لەسەر سیمای بەدی کرد، بێگومان پەیوەندییەکی بەوەوە هەبوو کە لاساییم کردەوە. گوتم:
- دەترسم بزانیت مەبەستم لە چییە؟
خەندەیەکی گەورەی خستە سەر لێوانی، بەڵام سەری بۆ ڕاوەشاندم و منیش لەسەر قسەکانم بەردەوام بووم:
- بەڕاستی دیمەنێکی بێ وێنەیە. زۆرم پێ سەیر دەبێت ئەگەر نەبێتە یەکێک لە هەرەجوانترین ئەو شتانەی کە لە ژیانتا بینیوتە.
شانێکی بۆ هەڵتەکاندم، هەستم کرد خەریکە قەناعەت بکات.
- ئەی چ کاتێک نیازت هەیە بەرەو ئەوێ بکەویتە ڕێ؟
- پێشنیوەڕۆی بەیانی. لەو کاتانەدا قیتاری (ئاڤی) سەعاتی کەڕەتێک بەرەو ئەوێ دەڕوات. دەشتوانین نانی نیوەڕۆ لە قیتارەکەدا بخۆین.
دیاربوو زۆر دڵنیا نەبوو، چونکە گوتی:
- خۆ لەوانەشە فیکرەیەکی باش بێت. لە ڕاستیدا من قەت ئیشبیلییەم نەدیوە، بەڵام بێگومان ڕازی نابم کە تۆ مەسرەفی من بکێشیت.
- بێگومان دەکرێت و هەر زۆر ئاساییشە. نەک هەر پێم خۆشە، بەڵکو لەوانەیە بەلای منەوە ببێتە لێکۆڵینەوەیەکی زۆر گرنگ.
دیسانەوە پێکەنییەوە، هەروەک کەسێکی ئاسایی ئەسکەندەنافی بە دەنگی بەرز پێکەنی و پاشان گوتی:
- ئومێدەوارم مەبەستت لەوە نەبێت کە لێکۆڵینەوەت لەسەر من بێت.
لەویادا جگەرەیەکم داگیرساند و گوتم:
- کەس نازانێت چی ڕوودەدات. دەکرێت کەمێک باسی گیانەوەرە خشۆکەکان

و ئەو شتانە بکەین، یان باسی ئەو گیانەوەرانە بکەین کە لە ناوچەی خوارووی ئۆقیانووسی ئارامدا هەڕەشەی فەوتاندنیان لەسەرە. زۆرن ئەو شتانەی کە دەمەوێت سەرلەنوێ زانیاریی زیاتریان لەسەر وەربگرمەوە.

– ئاااه، بێگومان دەتوانین. بە ئارەزووی خۆت پرسیار بکە.

تا نیوەشەوێک لە بارەکەدا ماینەوە و هەر لەویادا گەیشتینە قووڵایی تیۆری گەشەسەندنی ژیان. بەدەر لەوەش چیرۆکی هەرەغەمگینی ئەو ڕووداوەی بۆ گێڕامەوە کە تیایدا کچەکەی لەدەست دابوو.

پاش چەند سەعاتێک لە شەمەنەفەرەکەدا دانیشتبووین و بەرەو ئیشبیلییە دەڕۆیشتین. لەویادا هەستم کرد یارییەکی گەورە دەکەم و هیچ بەدووریشم نەزانی خۆشم بکەومە ناو تەونەکەی خۆمەوە، بەڵام بەهەرحاڵ تازە یارییەکە دەستی پێ کردبوو.

کاتێک شەمەنەفەرەکە گەیشتە (قورتوبە)، لەپڕێکدا سەری بۆ دواوە برد و هەروەک ئەوەی شتێکی لەیاد کردبێت، دەستێکی کێشا بە ناوچەوانی خۆیدا. بە دەنگێکی بەرز گوتی:

– ئاااه، خۆ تابلۆکانم نیشان نەدایت!

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هیچ شتێکی دەربارەی ئەو دوو تابلۆیە پێ نەگوتم، بەڵکو دیسانەوە گوتی: «ئەوە شتێکە و دەبێت بە چاوی خۆت بیانبینیت».

❊

من سێ ژوورم لە ئوتێلی (دۆنا مارییا) گرتبوو. فرانکیش سەری لەوە سوڕمابوو و نەیدەزانی بۆچی دوو ژوورم نەگرتووە، بەڵام بۆم ڕوونکردەوە و گوتم «ژوورێکم بۆ برادەرێکی خۆم گرتووە و سەرلەئێوارە دەگات». هاوکاتیش بەتەواوەتی دڵنیا نەبووم کە پێویستیم بەو ژوورە دەبێت یان نا، بەڵام بە فرانکم گوت کە بۆ ئێوارەکەی شتێکی وای نیشان دەدەم کە قەت قەت بیری نەچێتەوە. تا ئێوارەش کاتێکی باشمان لەبەردەستدا بوو کە پیاسەیەکی تێروتەسەل لە پایتەختی ئەندەلوسیادا بکەین.

بردمە ناو کاتدرالییەکە و (پاتیۆ دی لۆس نارنجوس)ەوە، بەنێوان زنجیرەیەک دار پرتەقاڵدا ڕۆیشتین، لەو وەرزەدا پرتەقاڵی گەییو درەختەکان دادەپۆشێت، لەویادا فرانک پێی گوتم کە لاورا وێنەی کۆترە دەگمەنەکەی تاقیونی بۆ ناردووە، ئەو کۆترەی کە ڕەنگی سنگی پرتەقاڵییە. پێم خۆش بوو ئەوەی پێ گوتم، بەتایبەتیش

لە کاتێکدا کە نەیدەزانی من شتێکم دەربارەی حەکایەتە بچکۆلە ڕۆمانسییەکەی ئەوان نووسیووە.
بە (لا جیراڵدا)دا سەرکەوتین، کە لە بنەڕەتدا منارەی مزگەوت بووە و دواتر کراوە بە بورجی کڵێسە. لەوێوە دیمەنێکی فراوانی ئەو شارە سپییەمان لەبەرچاودا بوو کە لە هەردوو بەری ڕووباری (گوادالکیوڤیر)دا بڵاوبۆتەوە. دواتر بە ناو گۆڕەپانی (ڤێرجن دی لوس ڕیس)دا تێپەڕین و بەلای ڕیزێک لە عەرەبانەی تەکسیدا ڕۆیشتین کە مۆڵگەیان لەو گۆڕەپانەدایە. ئینجا خۆمان کرد بە باخچەکانی (ئالکازار)دا، کە پڕە لە حەوز و نافورەی فێنک. لەویادا داری گوێزی هیندی لە هەموو شوێنێکدا ڕواوە، هەر دەتگوت گەڕاومەتەوە بۆ تاڤیونی.
بە چەپ و ڕاستی بەشی دێرینی باخچەکەدا پیاسەمان کرد، دواتر لە دەرگای (دیل پریڤیلیجیۆ)وە چووینە ناو باخچەی ڕۆمانسیی شاعیرانەوە، کە دوو حەوزی تێدایە و بە پەرژینێک چواردەوریان گیراوە کە بەرزییەکەی مەترێک دەبێت. لەویادا فڕانک لەپڕێکدا وەستا و بە هەناسەبڕکێیەکەوە گوتی:
– ئێرە هەر زۆر... هەر زۆر زۆر جوانە.
چاوم لێ بوو فرمێسک بە چاویدا هاتە خوارەوە، لەبەرئەوە دەستێکم خستە سەر شانی. لە دڵی خۆمدا گوتم لەوانەیە توشی حاڵەتی (ستینداڵ) بووبێت، چونکە چاوی هەڵگلۆفی و پێم وابێت بۆ شاردنەوەی باری دەروونییەکەی بوو کە گوتی:
– وابزانم توشی (دیژەڤیو[٦٦]) بووم.
دواتر بەدرێژایی دیوارەکە و بەسەر شۆستە سەرگیراوەکەدا بەرەو سەرەوە ڕۆیشتین، ئینجا لەسەر کورسییەکی ناو گۆڕەپانی بە زیخ داپۆشراوی (پۆرتا دی مارشینا) دا دانیشتین. دونیا زۆر گەرم بوو و چوومە قاوەخانەکەوە تا شلەمەنییەک بکڕم و بیخۆینەوە.
نەختێک پاش ئەوە شتێکی زۆر سەیر ڕوویدا! خۆی لە ڕوانگەیەکی دیاریکراوەوە هەموو شتێک لێرەوە دەستی پێ کرد: بەڵام لە کۆمەڵێک ڕوانگەی ترەوە دەتوانین هەر بۆ نموونە بڵێین هەموو شتێک لە باخچەیەکی ساوایانی ئۆسلۆوە دەستی پێ کرد، یان لە فڕۆکەخانەیەکی بچکۆلەی تاڤیونییەوە، یاخود لەسەر پردەکەی سەر ڕووباری (تۆرمس)ەوە، یان لەنێوان هەندێک کۆگای بێ سەروبەری سەر بەندەری (مارسیلیا)وە، یان لە (باریۆ ترینا)ی لای ڕاستی ڕووباری (گوادالکیوڤیر)ەوە، یاخود هەموو شتێک پتر لە سەد ساڵێک لەمەوبەر لەسەر بەندەری (کادین)ەوە

دەستی پێ کردووە، یان لە خانووە هاوینەکەی میری (ئالبا)وە لە (سانلوکار دی باڕامیدا)دا دەستی پێ کردووە. ئەمە ئەگەر باسی ئەو شتەش نەکەین کە وا بڕیارە ئەم شەو لەبەرچاوماندا لە ئیشبیلییەدا ڕووبدات، بەڵام لە ڕوانگەیەکی قووڵترەوە و بەلای منەوە هەرەگرنگترینیشیان، هەموو شتێک لە سەردەمی (دێڤۆن)ەوە دەستی پێ کردووە، لەو کاتەدا بوو کە گیانەوەرە وشکاوەکییە سەرەتاییەکان بە خۆیان و چوار پەلی سەرەتایی و هاوکاتیش زۆر پێشکەوتووەوە بە خشکەیی هاتنە سەر وشکانی، بەڵام بەڕاست، بۆ نەگەڕێینەوە بۆ سەر (تەقینەوە گەورە)کە کە پانزە ملیارد ساڵ لەمەوبەر ڕوویداوە؟ ئێ لەویادا بوو کە شوێن و کات سەریان هەڵدا. ڕۆژێک لە ڕۆژان سەرەتای هەموو چیرۆکەکان لەناو ناوکێکی چڕدا بووە، لەناو ناوکی هێزێکی خولقێنەردا بووە کە هێشتا نەتەقیبووەوە.
ئەو شتەی کە ڕوویدا بەم شێوەیە بوو: لەپڕێکدا کورتەبنەیەکی بچکۆلە بەپەلە خۆی کرد بە (پۆرتا دی مارشینا)دا. جلوبەرگێکی سەیری لەبەردابوو، هەر دەتگوت ڕێک لە پاش کەرنەڤاڵێکەوە هاتووە. لەناکاوێکدا وەستا و زۆر بەوردی تەماشای کردین. چرکەیەک دوای ئەوە کامێرایەکی دەرهێنا و چەند ڕەسمێکی گرتین، یەکەم جار ڕەسمی منی گرت و دواتریش فرانک.
فرانک هاواری لێ بەرز بووەوە و گوتی:
– بینیت؟
کورتەبنەکە ئاوڕێکی دایەوە و ڕۆیشت، هەر پاش نیو خولەکێک لە یەکێک لە دەرگا بچکۆلەکانی دیوارەکەوە چاوی تێبڕینەوە. دیسانەوە لەوێشەوە چەند ڕەسمێکی تری ئێمەی گرتەوە.
فرانک پرسی:
– کەسێکی سەیر نەبوو؟
منیش گوتم:
– بەلایەنی کەمەوە هەڵسوکەوتێکی سەیری کرد.
بەڵام فرانک هەر بەوەوە نەوەستا، یەک و دوو لە شوێنی خۆی بەرز بووەوە و ڕێک دوای کورتەبنەکە کەوت. لە دەرگا بچکۆلەکانی دیوارەکەوە چاوم لێی بوو ڕایکردە ناو (پۆرتا دیل پریفیلیجیۆ)وە. پاش یەک دوو خوولەک فرانک گەڕایەوە، دەستی بەملاولادا بادا و گوتی:
– ون بوو، نازانم عەرزەکە قوتیدا یان چی!!

کاتژمێر چوار و نیو بوو، کاتی داخستنی باخچەی (ئالکازار) نزیک ببووبووەوە. دیسانەوە گەڕاینەوە ناو گۆڕەپانی (ڤێرجن دی لوس ڕیس) و لەوێشەوە خۆمان کرد بەناو کۆڵانە باریک و تەسکەکانی گەڕەکە کۆنەکەی (سانتا کروز)ی جوولەکەکاندا. لەویادا تەماشای حەوشە فێنک و باڵکۆنە جوانەکانی خانوەکان و شیشبەندی پەنجەرەکانمان کرد. من خۆم حەفتەیەک لەوەوبەر لەوێ بووم، لەبەرئەوە کەوتمە باسکردنی شیشبەندەکانی بەردەم پەنجەرە و حەوشەکان و بە فرانکم گوت کە لە دوولاوە سوودیان هەیە: لەلایەکەوە هەم لە دەرەوە دیمەنی ناوەوە دیارە و هەم لە ناوەوەشەوە دیمەنی دەرەوە دیارە، بەو شێوەیەش ئەو حاڵەتە یاریدەدەرێک دەبێت بۆ دامەزراندنی کۆمەڵگایەکی کراوە، کە ئەمەشیان خۆی لە خۆیدا ڕەنگە ڕێژەی تاوانکاری کەم بکاتەوە. لەلایەکی تریشەوە هەمیشە داخراون و لێرەشەوە جۆرە هەستێکی ئارامی و دڵنیایی دەبەخشێت. لە سەردەمی کۆندا کچە عازەبەکان لەودیو شیشبەندەکانەوە دانیشتوون و عاشقەکانیشیان لە دەرەوە وەستاون، زۆرجاریش بۆ ماوەی چەند سەعاتێک بە چرپەچرپ قسەی نەرمونیانیان لەگەڵ یەکتریدا کردووە. خۆ ئەگەر عاشقەکەی هەوەس و جۆش و خرۆشی سێکسیشی هەڵسابێت، ئەوا ناچار بووە بۆ خۆی (ئاسنەکە بخوات). هەروەها ئەوەشم پێ گوت کە نیوەی ساڵەکە، کە ئاووهەوا گەرم دەبێت، زۆربەی ژیانی ڕۆژانەیان لە حەوشەکاندا بەسەر دەبەن و ئەگەر دونیاش هەر زۆر گەرم ببێت، ئەوا چەتری گەورە گەورە هەڵدەدەن و زۆرجار تەواوی حەوشەکەیانی پێ دادەپۆشن.

لە گۆڕەپانی (لا ئالیانزا)دا بیرەیەکمان خواردەوە، چێژمان لە بینینی دارێکی (بۆگیانیڤیللیا)ی پڕ گوڵ بینی کە بە یەکێک لە خانووەکانی ئەویادا هەڵزنابوو. لە پشت خانووەکانەوە دارگوێزێکی هیندیی گەورە بە ئاسماندا چووبوو، لە پشت دارگوێزەکەشەوە نەختێکی (لا گیرالدا)مان لێوە دیاربوو. هەروەک هەموو گۆڕەپانەکانی تری گەڕەکی جوولەکەکان، ئەم گۆڕەپانەش بە داری پرتەقاڵ چواردەوری گیرابوو.

پاش سەعاتێک بەرەو گۆڕەپانی (دۆنا ئیلڤیریا) ڕۆیشتین کە بە کورسییە سیرامیکەکانی بەناوبانگە، لەوێوە فرانکم ڕاکێشایە ناو کۆڵانێکی باریکەوە کە ناوی (سوسۆنا)یە. پێم گوت کە دەمەوێت نهێنیی (سانتا کروز)ی نیشان بدەم. لە کۆڵانەکە دەرچووین و چووینە ناو گۆڕەپانێکی بچکۆلەوە کە کاتی خۆی لە بنەڕەتدا حەوشەی ماڵێک بووە، لەویادا ئاماژەم بۆ پارچە کاشییەکی سیرامیکی هەڵواسراو

کرد کە وێنەی ئێسقانی کەللەسەری مرۆڤێکی لەسەر کێشرابوو. پارچە کاشییەکە لەسەر پەنجەرەیەکەوە بە دیوارەکەوە چەسپاوە و لەژێر کەللەسەرەکەدا نووسراوە (سوسۆنا).

پیاوە نەرویجییەکە لێی پرسیم:

- ئەمەیە نهێنیی سانتا کروز؟

سەرم بۆ لەقاند و بۆم ڕوون کردەوە:

- (سوسۆنا) کچێکی جوولەکە بووە و لە سەدەی پانزەدا ژیاوە. ئەو کچە لەژێرەوە و بەشێوەیەکی نهێنی دەستگیرانی کوڕێکی مەسیحی بووە. ڕۆژێکیان خێزانەکەی پێی دەڵێن کە پلانێکی خوێناوییان داناوە و دەیانەوێت لە سەرکردە مەسیحییەکانی شارەکە هەڵبگەڕێنەوە. دەستگیرانەکەی خۆشی لەنێو ئەوکەسانەدا بووە کە دایاننناوە بیانکوژن. ئەویش دەچێت دەستگیرانەکەی خۆی لەو دەسیسەیە ئاگادار دەکاتەوە. لە ئەنجامیشدا باوکی دەگرن و لەسێدارەی دەدەن، دواتریش دەستگیرانەکەی خۆشی پشتی لێ هەڵدەماڵێت و بەجێی دەهێڵێت. لە پاش ژیانێکی پڕ لە میحنەت دەمرێت و لە وەسێتەکەیدا دەنووسێت کە دەیەوێت سەری لەلاشەی بکرێتەوە و وەک عیبرەتێک بە دیواری پێشەوەی ئەوماڵەدا هەڵبواسرێت کە تیایدا ژیاوە. کەللەی سەری (سوسۆنا) هەتا سەدەی هەژدەش هەر بەوێوە هەڵواسرابوو و دواتریش ئەو پارچە سیرامیکەیان لە شوێنی دانا.

لەو گۆڕەپانەدا دوو داری پرتەقاڵی لێبوو، فرانک گوتی: «تۆ دەزانیت بە چیدا دەردەکەوێت کە دارپرتەقاڵێک بەرەکەی شیرین بێت یان تاڵ؟»، لە وەڵامدا گوتم: «نازانم». ئینجا گەڵایەکی لە دارێکیان کردەوە و لەژێر گەڵاکەدا گەڵایەکی بچکۆلەی نیشان دام و گوتی کەواتە ئەم دارە پرتەقاڵی تاڵ دەگرێت.

بۆ سەرەوە و بەرەو (پلازا دی لوس ڤینیرابلس) کەوتینە ڕێ، کاتی خۆی لەویادا نەخۆشخانەیەکی لێبووە کە تایبەت بووە بە قەشە خانەنشینکراوەکان. لەلای ئەو گۆڕەپانەوە دوو چێشتخانەی لێ بوو و یەک دوو داری پرتەقاڵیش. لەسەر یەکێک لە مێزەکانی دەرەوە دانیشتین و بەرلەوەی خواردن داوا بکەین سەرو پەرداخێک شەرابی (مانزانیللا)مان خواردەوە. دیسانەوە باسی گەشەکردنی ژیانی سەر ئەم زەوییەمان کردەوە. وابزانم فرانک باسەکەی دامەزراند و پێشم وابێت ویستبێتی هەقی ئەو پارەیەم بۆ بکاتەوە کە لە سەفەرەکەی ئیشبیلییەدا خەرجم کرد. دواترێکیش سوودێکی یەکجار زۆرم لە زۆربەی ئەو شتانە وەرگرت کە لەو ئێوارەیەدا

باسمان کرد. لەویادا بوو کە باسی (تواتارا)ی نیوزلەندی بۆ کردم.
لە دڵی خۆمدا گوتم تا ئێستا ڕێکەوتی بینینی فرانک لە مەدریددا هەر تەنها خۆشیی بوو، بەڵام ئیتر کاتژمێر خەریک بوو لە نۆ نزیک دەبووەوە و لەگەڵ ئەوەشدا چرکەی هەرەگرنگ و یەکلاکەرەوە وا لەبەردەمماندا بوو. پاش ئەوەی پارەی مێزەکەم دا، فرانکم بە کۆڵانە باریکەکاندا بردەوە بۆ گۆڕەپانی سانتا کروز. لەویادا هێندەم نیشان دا کە چەندە نزیک بووین لەو دیوارە بەرزەوە کە لە باخچەکانی (ئالکازار)ی جودا دەکردینەوە، بەتایبەتیش لە باخچەی شاعیران. گوتم:
- وابزانم چاوت باش نابینێت.
لە مەبەستم تێنەگەیشت، گوتم دە تەماشایەکی چواردەوری خۆت بکە. ئینجا ئاماژەی بۆ خاچێکی مەزی ئاسنین کرد کە لە ناوەڕاستی گۆڕەپانەکەدا بوو، منیش گوتم کاتی خۆی کڵێسەیەکی دێرین ئا لێرەدا بووە و فەرەنسییەکان سوتاندوویانە، هەروەها گوتم هەم ناوی گۆڕەپانەکە و هەم ناوی گەڕەکەکەش لەسەر ناوی ئەو کڵێسەیەوە ناونراون. کەڕەت و نیوێک بە دەوری ئەو گۆڕەپانەدا خولاینەوە کە بە دەوری خاچە بارۆکییەکەدایە، ئینجا لەپڕێکدا چاوی بە شتێک کەوت. بە چاوێکی گەشاوەوە سەیرێکی کردم و خۆی کرد بە ناو باڕی فلامینکۆی (لۆس گالۆس)دا.
دەستێکی کێشا بە ناوچەوانی خۆیدا و گوتی:
- زۆربەی هەرەزۆری ئەو ماوەیەی پێشوو من هەر بیرم لە تابلۆکانی گۆیا دەکردەوە. بەتەواوەتی بیرم چووبووەوە کە ئەو یەکێک بوو لە سەماکەرە بەناوبانگەکانی ئیشبیلییە.
هەروا دەستێکم کێشا بە شانیدا. پاشان گوتی:
- ئا ئەمەیان هەر زۆر خۆش دەبێت.
بەڵام من زۆر دڵنیا نەبووم کە وا بێت.

*

تەنها گروپێکی یابانی لەناو باڕی فلامینکۆکەدا بوون و نیوەی هۆڵەکە بەتاڵ بوو. لەسەر مێزێکی بەردەم تەختەی سەماکەدا دانیشتین، من پێشوەخت ئەو مێزەم بەناوی خۆمەوە گرتبوو. دوو پێک (براندی)مان داوا کرد، فرانک یەک وشەی لە دەم نەهاتە دەرەوە، هەروا پێکەکەی بەرز کردەوە و بە پەرۆشەوە چاوەڕوان بوو.
کەمێک پاش ئەوە نمایشەکە دەستی پێ کرد. لە پێشدا سێ پیاو لە ژوورێکی ئەوسەری هۆڵەکەوە بە پلیکانەکاندا هاتنە خوارەوە، بەناو خەڵکەکەدا ڕۆیشتن و

چوونه سەر تەختی بارەکە و شوێنی خۆیان گرت. هەرسێکیان پانتۆڵی ڕەش و کراسی سپییان لەبەردا بوو. یەکێکیان گیتارێکی پێ بوو و دووانەکەی تریش بەدەر لە دەنگی گرِی خۆیان و ڕیتم و دەنگی پەنجەکانیان، هیچ ئامێرێکی تریان پێ نەبوو. گیتارژەنەکە دەستی کرد بە ژەنینی گیتارەکەی و دووانەکەی تریش کەوتنە لێدانی چەپڵە و چەقەنە.

ئینجا خۆی نیشان دا: هەروەک خواژنێکی شۆخ و شەنگ و ڕەزین، (ئانا) لەگەڵ هاڕەی چەپڵەی یابانییەکاندا، لە پلیکانە لولپێچەکەوە بۆ سەر تەختەی نمایشەکە هاتە خوارەوە. گومانم نییە یابانییەکانیش (ئانا)یان دەناسی. ئێ بە پلەی یەکەم هەر لەبەرئەوە کە ئەو سەفەرە دووروردرێژەیان لە تۆکیۆ و کیۆتا و ئۆساکاوە کردووە و هاتوونەتە ئێرە. ئانا ماکسییەکی سووری لەبەردا بوو، شاڵێکی ئاڵی لە ملیەوە پێچابوو و جووتێ پێڵاوی سووری بریقەداری لەپێدا بوو. قژە ڕەشەکەشی هۆنیبووەوە و گوڵێکی لێدابوو.

لەو کاتەدا کە هاتە سەر تەختی نمایشەکە، فرانک بە چرپەیەک گوتی:

– ئانا..

سەرێکم بۆ لەقاند و گوتم:

– ئانا ماریا مایا.

– ناوی تەواوی ئەوەیە؟

دیسانەوە سەرم بۆ لەقاندەوە.

– مایا؟

– ششششش.

چەپڵەی بەتین و دەنگی گیتار بەرز بووەوە و ئانا کەوتە سەماکردن. زۆر بەگوڕ سەمای دەکرد و لەچاو حەفتەی پێشوودا باشتر و جوانتر لەشی دەجووڵاندەوە. سەرنجم چووە سەر ئەو دژایەتییەی نێوان جووڵەی نەرمی دەست و پلی و ڕووخساری توندی کە هەر دەتگوت زۆر بەگوڕ سەرنجی چۆتە سەر شتێک. ئەوە با باسی سەمای پەنجەکانیشی هەر نەکەین، لەگەڵ بینینیدا یەکسەر خەیاڵمی بردەوە بۆ سەمای ناو پەرستگایەکی هیندی کە کەرەتێکیان لە (ئۆریسا)دا بینیم.

دوای ئەو، کۆمەڵێک سەماکەری تریش نمایشی سەمای خۆیان نیشان دان، بەڵام (ئانا ماریا مایا) ئەستێرەی هەرەگەورەی ئەو ئێوارەیە بوو. بە قۆڵ و دەست و قاچ و سک و کەمەرەی سەمای دەکرد. لە خۆی ڕازی بوو، توندوتیژ بوو، بەناز بوو،

هەروەها بەڕێزیش بوو. من بەتایبەتی پێم خۆش بوو لە ئیشبیلییەدا ئانا نیشانی فرانک بدەم. ویستم ئاهەنگێکی سەخی پیشان بدەم کە چوارپەلێکی نەرمونیانی گیاندارێکی بڕبڕەداری (پۆست) گیاندار سازی دەکات. لە دڵی خۆمدا گوتم: «ئەو گیانەوەرە وشکاوەکییە دێرینە دەبێت ئەوە ببینێت». ئێستاکەش وا منداڵی منداڵەکەی لە ئیشبیلییەدا سەمای فلامینکۆ دەکات، بێگومان بۆ ئەو سەمایەش پێویستی بە هەر چوارپەل و سەرتاپای ماسولکە و بڕبڕە هەیە، هەروەها پێویستی بە سەرجەم پەیوەندییە ڕیکوپێکەکانی نێوان خانە دەماخییەکانیش هەیە، بەڵام ئاخۆ گیانەوەرە وشکاوەکییە سەرەتاییەکان چەندێکیان دەربارەی ئەو ئاراستەیە زانیبێت کە کاتی خۆی بەرەوڕووی ڕۆیشتوون؟ لە سەردەمی نیوەتاریک و پڕ لە نەزانینی (دێڤۆن)دا چییان زانیووە کاتێک بەهێواشی و بە قورسییەوە لەنێوان ڕووەکی سەرخەس و قەوزەدا ڕێیان کردووە و لە نزیک دەریاچەی بچکۆلە و کانیاوە پڕ لە سەوزاییەکاندا بەرەو جێژوانی بەردەوامی خۆشەویستییان ڕۆیشتوون؟ ئێمە شاهیدی سەمایەکی پەتی و پڕ لە شانازی و جۆرە سەرکەوتنێکی خۆشی بووین، بەڵام هەر تەنها سەمایەکی خۆشی سەرکەوتن نەبوو، بەڵکو لەهەمانکاتدا شاهیدی سەمای مردنی گیانەوەرێکی بڕبڕەداری فانی بووین، چونکە هاوکات بە دەنگێکی زۆر قووڵ و گڕ گۆرانییان دەربارەی خۆشەویستی و مەرگ و هەڵخەڵەتاندن و ستەمکاری دەچڕی.

ئینجا کاتی پشوو هات. پاش چەپڵەلێدان، ئانا لەگەڵ گروپە مۆسیقییە بچکۆلەکەدا بەرەوژووری شانۆکە ڕۆیشت، بەڵام لەویادا خۆسێ بەرەو لای مێزەکەمان هات، منداڵێکی ساوای لەباوەشدا بوو و فرانک چاوی داپچڕی. منداڵەکە هەر دوو سێ مانگ دەبوو. فرانک بەرلەوەی تەماشای خۆسێ بکات و بەباشی سەلامی لێ بکات، لە پێشدا سەیرێکی منداڵەکەی کرد. ئینجا وەک ئەوەی زمانی بیگرێت پرسی:

– ئەوە... ئەوە منداڵی تۆیە؟

خۆسێ بە فەخرەوە سەری بۆ لەقاند و خەندەیەکی گەورەی خستە سەر لێوەکانی، بەرلەوەی لەسەر مێزەکەمان دانیشێت گوتی:

– ناوی (مانوئێل)ە.

نەختێک دواتر (ئانا)ش هات و پێش ئەوەی کەرەتێکی تریش بچێتەوە سەر شانۆ، کەمێک لەلامان دانیشت..

– فرانک، پێم خۆشە کە دیسان بینیمیتەوە، چ ڕێکەوتێکی سەیرە!

فرانک له شوێنی خۆیدا چەقیبوو.
- تەمەنی چەندە؟
بەشێوەیەکی سەیر ئەو پرسیارەی لەو دایک و باوکە دڵشا دەکرد، هەر دەتگوت لەهەمانکاتدا پرسیارەکە لە خۆشی دەکات.
ئانا وەڵامی دایەوە و گوتی:
- تەمەنی دە حەفتەیە.
زانای بایۆلۆجییەکە لە رێگەی پەنجەکانییەوە کەوتە حسابکردن و پرسی:
- ئەو کاتەی لە (تاڤیونی) بوون، دەتانزانی کە دووگیانیت؟
فریای ئەوە نەکەوت وەڵامی پرسیارەکەی بدرێتەوە، چونکە رێک لەو کاتەدا ژنێکی قەشەنگ بە خۆی و جانتایەکی گەورەی شانییەوە هاتە ناو هۆڵەکەوە و رێک بەرەو مێزەکەی ئێمە هات. ڤیرا بوو. هەر بە سکە خڕ و هەڵئاوساوەکەیدا دیاربوو کە تەنها یەک دوو مانگێکی مابوو کە منداڵی ببێت.
- ڤیرا؟
بۆ دووهەم جار فرانک لەو رۆژەدا داچڵەکییەوە و سەری سوڕما. وابزانم دیسانەوە توشی حاڵەتی (دیژەڤیو) بووەوە، بەهەرحاڵ ئەوە یەکەم جاری نەبوو کە ڤیرا بە سکێکی گەورەوە ببینێت.
ڤیرا لە خۆشیاندا باوەشێکی پیا کرد.
لەویادا گوتم:
- هەر لەو کاتەوەی لە تاڤیونی هاتمەوە، ناوی ئەمم لەناو دەفتەرەکەمدا پاراستبوو. دوێنێش لە مەدریدەوە یەک دوو جارێک تەلەفۆنم بۆ کرد، دوای ئەوەی کە من و تۆ چاومان بە یەکتری کەوت. من خۆم وام بەباش دەزانی کە هەر پێنجمان پێکەوە کۆببینەوە. یان هەر شەشمان. یاخود وابزانم هەر حەوتمان. من دوێنێ شەو بانگهێشتم کرد تا بێتە ئیشبیلییە.
من دەمزانی لەو کاتەوەی کە فرانک لە سالامانکادا ڤیرای بینیبوو، چیتر نەیبینیبووەوە. چەند جارێک نیگای گرتە سکە گەورەکەی ئانا، کاتێکیش کە چاوی لەسەر هەڵدەبڕی، ماتەمینییەکی قووڵم لە نیگایدا دەبینی. بەوپەڕی توانایەوە هەوڵی دا جەوی دانیشتنەکە تێک نەدات، لەو کاتەشدا کە ڕووی کردە ڤیرا و ئاماژەی بۆ سکەکەی کرد، زۆر لەسەرخۆ گوتی:
- پیرۆزە.

نەختێک دوای ئەوە ڕووی بەرەولای من وەرچەرخاند و بە نیگایەکی پڕ لە گلەییەوە تەماشای کردم. دڵنیا نەبووم لەبەرئەوە بوو کە ئافرەتێکم بانگ کردۆتە ئیشبیلییە کە خەریکە دەبێتە دایک، یان لەبەرئەوە بوو کە من وەک نهێنییەک ئەوەیانم لەلای خۆم هێشتبووەوە.

ڤیرا لە شەرما بزەیەکی کرد، دیاربوو زۆر دڵی خۆش نەبوو. من ئەوەیانم کەمێک بەلاوە ناخۆش بوو، چونکە بەبۆنەی بانگهێشتەکەی منەوە لە ئیشبیلییەدا بوو. فریای ئەوە نەکەوت کە وەڵامی پیرۆزباییەکەی فرانک بداتەوە، چونکە لەو کاتەدا گیتارژەنەکە و دوو کەسەکەی هاوەڵی لە ژوورەکەی ئەوسەری هۆڵەکەوە هاتنە خوارەوە، بەناو هۆڵەکەدا هاتن و چوونە سەر شانۆکە. ئەویش وەک خواژنێکی چاوەڕواننەکراو لە پلیکانە لولپێچەکەوە هاتە خوارەوە.

ڤیرا لەنێوان من و فرانکدا دانیشتبوو و تاوێک تەماشای منی دەکرد و تاوێکیش سەیری فرانکی دەکرد، ئینجا بە چرپەیەک گوتی:

– وابزانم لەوەوپێش ئەو ئافرەتەم بینیووە.

هەرچەندە باری دەروونی فرانک زۆر تەواو نەبوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا خۆی پێ نەگیرا و خەندەیەک گرتی. تەماشایەکی منی کرد و وابزانم لەویادا هەردووکمان خەیاڵمان چووەوە سەر ئەو کاتەی لە ماراڤیو بووین و بیرمان لەوە دەکردەوە کە لە چ شوێنێک ئاناامان بینیووە و بیرمان نەدەکەوتەوە.

فرانک سەیرێکی ڤیرای کرد و گوتی:

– بیر لە (پرادۆ) بکەرەوە.

– لە پرادۆ؟

– بەڵی، بیر لە گۆیا بکەرەوە.

ئینجا ڤیرا چاوی داپچڕی، بە دەنگێکی بەرز گوتی: «ماخای ڕووت!»، هێندە بەرز گوتی، لەوە ترسام لەسەر شانۆکەشەوە گوێیان لێبێت.

من و فرانک بە فەخرەوە سەرمان بۆ لەقاند، هەر دەتگوت ئێمە مۆدێلە ئەفسووناوییەکەی (گۆیا)مان زیندوو کردۆتەوە. بەهەرحاڵ فرانک هێندەی بۆ ڕوون بووەوە کە پێویست ناکات من بباتە مۆزەخانەکەی پرادۆ.

دیاربوو ڤیرا ورووژابوو، بۆیە بە چرپەیەک گوتی:

– هەر کتومت لە یەک دەچن!

گوتم:

- ششششش.
ئیدی سەرلەنوێ سەما دەستی پێ کردەوە.

*

پاش سەعات و نیوێک نمایشەکە کۆتایی هات. ئەو کاتە کاتژمێر یەک و نیوی شەو بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە تەنیشت بارەکەوە مێزێکی گەورەیان بە خواردنی سوک و شەرابی (مانزانیللا) ڕازاندەوە. ئانا و خۆسێ خۆیان دوورەپەرێز گرت، بەڵام من و فرانک و ڤیرا بە فرسەتمان زانی ڕوونکردنەوەیەکی پێویست بخەینە ڕوو. وا بیرم کردەوە کە ئەوان بەهۆی منەوە کەوتبوونە ئەو حەڵەتەوە و لێرەشەوە هەستم بە جۆرە بەرپرسیارییەک کرد، هەروەها وای بۆ چووم پێویستیان بە کەسێک بێت دانیشتنەکە ببات بەڕێوە. گوتم:
- هیچ پێویست ناکات شەرم بکەن. ئێ لە هەموو بارێکدا من تەنها کەسێکم کە ئاگام لە هەموو شتێکی هەردووکتانە. زۆرجار کە گەورەکان ناتوانن پێکەوە قسە بکەن، دەکەونە حاڵەتێکی ئاوهاوە.
هەردووکیان شڵەژابوون، دەتگوت دوو قوتابین و شتێکی قۆڕیان کردووە و بۆ لێپرسینەوە هێنراونەتە بەردەم بەڕێوەبەرێکی توندوتیژ. نایشارمەوە کەمێک چێژم لەو حاڵەتە وەرگرت.
فرانک گوتی:
- ڕاست دەکەیت.
کەڕەتێکی تریش سەیری سکی ڤیرای کردەوە و گوتی:
- ئێ هەردوو حەفتە لەمەوپێش پێکەوە بە تەلەفۆن قسەمان کرد، هەتا بشڵێیت بەشێوەیەکی ڕێکوپێک لەگەڵ یەکتریدا دواین. هەر هیچ نەبێت دەتتوانی پێم بڵێیت کە دووگیانیت.
لەویادا ڤیرا زۆر بە جیددی ڕووانی، ئینجا وەک دانپیانانێک گوتی:
- ترسنۆک بووم. نەموێرا باسی بکەم.
فرانک سەیرێکی کردم، پاشان ڕوویکردەوە ڤیرا و گوتی:
- گومانم نییە ئەو منداڵە باوکێکی هەر هەیە.
- فرانک...
- بەهەرحاڵ ماوەی جیابوونەوەمان تەواو بووە. مەبەستم لەوەیە زۆر ئاساییە بەلامەوە. مافی تەواوی خۆتە شوو بکەیتەوە.

ڤیرا بە سەرسامییەوە تەماشایەکی کردم، بەڵام من نەمویست یارمەتی بدەم، لەوەیادا دەبووایە خۆیان تەدبیری حاڵی خۆیان بکردایە. من هەروا بەگوڕ سەرێکم بۆ لەقاندەوە.

دەستی فرانکی گرت، ئەویش یەکسەر دەستی ڕاکێشایە دواوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بە نیگای چاوی لێی پاڕایەوە کە لێی تێبگات و گوتی:

– فرانک، ئەوە منداڵی تۆیە.

لە ماوەی چرکەیەکدا ڕەنگی دەموچاوی فرانک گۆڕا و ڕەنگێکی سەیری گرت، زیاترێک لە ڕەنگی دەموچاوی ئانا دەچوو لەو کاتەدا کە لە تاڤیونی لەسەر نانخواردنی بەیانییەکە بورایەوە. ئینجا کوڵمەکانی سوور هەڵگەڕان و قووڵتر هەناسەی هەڵدەکێشا. هێندەی نەمابوو گوێم لە بەرزبوونەوەی فشاری خوێنی ببێت. بۆ ساتێک لەوە ترسام زللەیەکی تێ بسرەوێنێت، بەڵام بەدڵنیاییەکەوە گوتی:

– ئەوەیان بەهیچ شێوەیەک ڕێی تێناچێت.

ڤیرا سەری بۆ ڕاوەشاند و لێی پرسی:

– چییە حساب نازانیت؟

– ئاخر... نا، پێم وابێت گاڵتەم لەگەڵدا دەکەیت.

ئا لەویادا پێکێک (براندی) ترم بۆ فرانک بانگ کرد. پێویستی بە شتێک بوو ئارامی بکاتەوە.

پاشان ڤیرا کەوتە قسەکردن:

– ئومێدەوارم ئەو شەوەت لەیاد مابێت کە لە سالامانکادا پێکەوە بووین. ئێ خۆ ئەو شەوە ئەوەندە شەرابیشت نەخواردەوە.

فرانک ڕووی لە من کرد و گوتی:

– تۆ بەڕاستی تاقەتی ئەوەت هەیە گوێ لەم قسانە بگریت؟

زۆر بە ساکاری وەڵامم دایەوە:

– بەڵێ.

ڤیرا بەردەوامی بە قسەکانی دا:

– فرانک، نەخێر نەموێرا ئەوەیانت پێ بڵێم، ئاخر ئێمە پەیمانمان بە یەک دابوو کە سەرلەنوێ پێکەوەژیان دانەمەزرێنینەوە، بەڵام ئەو شەوە لە ئوتێلەکەدا خۆمان لەبەردەم دەرگای ژوورەکەی مندا بینییەوە، دەبووایە یان بڕۆیشتیتایەتە ژوورەکەی خۆت، یان لەگەڵ مندا بێیتە ژوورەوە. ئەوەت لەیاد نییە؟ هەردووکمان بەتەواوەتی

تەبا بووین کە ئەو شەوە، هەروەک ناویشمان نا: «ناوبڕێکی بچکۆلە»، مانای ئەوە نییە کە سەرلەنوێ بمانەوێت پێکەوە بژینەوە، چونکە پەیوەندیی نێوان من و تۆ بەتەواوەتی کۆتایی پێ هاتبوو.

فرانک دانی بە قسەکانیدا نا و گوتی:

- بەڵێ بەلایەنی کەمەوە ئەوەیانمان گوت.

- هەروەها دڵنیاشم کردیتەوە کە ئەو شەوە بواری دووگیانبوونم زۆر زۆر کەم بوو، چونکە لەو بارەیەوە ئەمینترین ڕۆژی مانگەکەم بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کاتێک کە دووگیان بووم، بێگومان بیرم لە سۆنیا کردەوە. هیچ گومانێکم نەبوو کە دەمویست ئەو منداڵەم ببێت. خۆم بۆ ئەوە ئامادە کردبوو کە ببمە دایکێکی تەنها، بێگومان واشم دانابوو هەر ڕێک لەدوای لەدایکبوونییەوە ئەو هەواڵەت پێ ڕابگەیێنم، بەڵام ناچار بووم دان بە خۆمدا بگرم، مەبەستم لەوەیە ڕێی تێدەچوو منداڵەکە کێشەی بۆ دروست ببووایە و نەبووایەتە هیچ.. واشم بە خەیاڵدا هات بڕیارەکە بدەمە دەست خۆت و خۆت بڕیار بدەیت تا چەندێک دەتەوێت پەیوەندیت بە منداڵەکەوە هەبێت، ئێستاش هەروا بیر دەکەمەوە.

فرانک نەیویست گریانەکەی بشارێتەوە و گوتی:

- ئێ، ئینجا چی؟

- ئینجا کەسێک بە ناوی (جۆن سپۆک)ەوە تەلەفۆنی بۆ کردم و گوتی لە تاڤیونیدا لەگەڵ تۆدا بووە و زۆر بە ڕێکەوتیش کەڕەتێکی تر لە مەدریددا چاوی پێت کەوتۆتەوە. هەروەها گوتیشی ڕەنگە تۆ ئەم پشووی حەفتەیە لە ئیشبیلییەدا ببەیتەسەر و بانگهێشی کردم بۆ شتێک کە خۆی ناوی نابوو (نمایشی سەمای فلامینکۆی ئەم سەدەیە). بەڕاست، وا دەبینم قسەکەی پڕاوپڕی خۆی بوو، ئانا بەشێوەیەکی هەر زۆر قەشەنگ سەما دەکات. ئێ منیش لە دڵی خۆمدا گوتم ڕەنگە ئەوە فرسەتێکی باش بێت تا هەموو شتێکت بۆ ڕوون بکەمەوە. پاشنیوەڕۆی دوێنێ ئەو شتانەی پێ گوتم و بۆ شەوەکەشی سەرلەنوێ تەلەفۆنی بۆ کردمەوە و بەدڵنیاییەوە پێی گوتم کە تۆش دێیت. بلیتی فڕۆکەیەکی بۆ کڕیبووم و دەبووایە لە فڕۆکەخانەی بەرشەلۆنە وەرم بگرتایە. بەدەر لەوەش پێی وابوو تا ئێستاش تۆ منت هەر خۆش بوێت. ئینجا بە توندی سەرزەنشتی چۆنییەتی ڕەفتاری هەردووکمانی کرد لەدوای ڕووداوەکەی ئۆسلۆوە.

فرانک لەو کاتەدا هیچ شتێکی لە دەم نەهاتە دەرەوە، لەبەرئەوە بەردەوامی بە

قسەکانی دا:
- فرانک، دەتوانیت بمبەخشیت؟ مەبەستم لەوەیە ئەم دووگیانییەی من، تۆ بەهیچ شتێکەوە نابەستێتەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەمەوێت بزانم دەمبەخشیت یان نا؟
لەویادا فرانک لێی پرسی:
- تۆ تا کەی لێرە دەمێنیتەوە؟
- نازانم، بەڵام لە بلیتەکەمدا نووسراوە کاتژمێر سێ و نیوی ڕۆژی یەکشەممە فرۆکەکەم دەگەڕێتەوە. ئەی تۆ؟
- نازانم. ڕەنگە تا دووشەممە لێرە بم.
دیاربوو هێشتا پێویستییان بە کەسێکی سێهەم بوو، بۆیە گوتم:
- هەردووکتان ڕێک وەک یەک لێرە دەمێننەوە و هەروەها دەبێت لەسەر ئەوەش ڕێک بکەون کە دەتانەوێت بگەڕێنەوە بۆ ئۆسلۆ یان بۆ بەرشەلۆنە. ئەگەر نەتوانن، ئەوا هەموو مەسرەفەکەتان لێ دەسەنمەوە.
چیتر نەمانتوانی لەسەر ئەو باسە بڕۆین، چونکە لەو کاتەدا بانگیان کردینە سەر مێزەکە کە بە قاپی بچووک و پەرداخ و خواردنی سوک و شەرابی مانزانیللا ڕازاندبوویانەوە. هاوکات سەرنجم دا فرانک دەستی ڕاستی خستە سەر سکە گەورەکەی ڤیرا و ئەویش دەستێکی خستە سەر دەستی ئەو.
ئەو دیمەنە قسەیەکی ئانای بیر خستمەوە، کە بەپێی نامەکەی فرانک، لەو کاتەدا گوتوویەتی کە بە سەیارە لە هێڵی (بەرودوا)وە بەرەو ماراڤیو گەڕاونەتەوە:
«بەردەوام لەناو تاریکی ئەو سکە هەڵئاوساوانەدا، ملیۆنەها قۆزاخەی نوێی ئاگایی جیهانی مەلە دەکەن. شەکرەپەرییە بێدەسەڵاتەکان هەر ئەوەندەی کە پێدەگەن و توانای هەناسەدانیان دەبێت، یەک بەدوای یەکدا دێنە دەرەوە. ئەوان شیری شیرینی پەری دەخۆنەوە کە لە دوو گۆپکەی نەرمی گۆشتی پەرییەوە دێنە دەرەوە، بەدەر لەوە ناتوانن هیچ شتێکی تر بخۆن».
شتێکی تریشم بە خەیاڵدا هاتەوە. ئەو کاتەی لەناو دارەکانی ماراڤیودا دانیشتبووین و هەریەکە و باسی بیروباوەڕی خۆی کرد، ئانا گوتی:
- من لەو بڕوایەدام حەقیقەتێک لە دەرەوەی ئەم حەقیقەتەوە بوونی هەبێت.
هەروەها گوتی:
- لەوانەیە لە شوێنێکی تردا یەکتری ببینینەوە و ئا ئەم دانیشتنەمان وەک خەونێک

بێتەوە یاد.
خۆ ڕەنگە وەک سەربەستییەکی ئەدەبی ئەو مافە بە خۆم ببەخشم و بهێڵم فڕانک ئەو ڕستەیە بخاتە ناو نامە دووورودرێژەکەیەوە، چونکە وا هەموومان لێرەدا سەرلەنوێ کۆبووینەتەوە و ئاناش نەمردووە.
ئەو شەوە بڕێکی باشی شەرابی مانزانیللا خورایەوە و سەرلەنوێ کۆمەڵێک یادەوەریی تاڤیونیشمان هێنایەوە پێشێ. لەسەروو ئەوەشەوە کەسێکمان لەگەڵدا بوو کە لە تاڤیونیدا لەگەڵماندا نەبوو و دەمانتوانی هەموو شتێکی بۆ بگێڕینەوە، هەڵبەتە ئەو کەسە ڤیرا بوو، جگە لەوەش زۆری پێ خۆش بوو گوێ بۆ یەکە بەیەکەمان شل بکات. کاتێک کە باسی (لاورا) و (بیل)مان بۆ گێڕایەوە، لە دڵەوە پێکەنی، بەڵام من باسی ئەوەیانم بۆ نەکرد کە لەگەڵ فڕانکدا ئاهەنگەکەیان جێهێشت، بتڵێک شەرابیان لەگەڵ خۆیاندا لوول کرد و پێکەوە بەرەو کوخەکەی فڕانک ڕۆیشتن.
پرۆگرامە تەلەفیزیۆنییەکەی ئانا و خۆسێش کە دەربارەی سەدەی بیست و یەک بوو و یەکێک لە گرتەکانی لەسەر هێڵی (بەرودوا)ی تاڤیونی بوو، دەمێک بوو تەواو بووبوو و بڵاویش کرابووەوە. لەویادا خۆسێ فیلمێکی ڤیدیۆیی ئەو پرۆگرامەی بە فڕانک بەخشی. ئانا بە شانازییەوە باسی ئەوەی کرد کە لە پرۆگرامەکەی دوورگەکانی فیجیدا، چاوپێکەوتنێکی بچکۆلەی فڕانکی تێدایە کە تیایدا باسی هەمەڕەنگیی بایۆلۆجی و هەڕەشەی سەر ژینگەی ڕەگەزەکانی خوارووی ئۆقیانووسی ئارام دەکات. من و فڕانکیش باسی ئەوەمان گێڕایەوە کە هەردووکمان زۆر بە قووڵی لە تاڤیونیدا هەستمان دەکرد لەوەوبەر لە شوێنێکی تردا (ئانا)مان بینیبێت.
ئانا پێکەنی و گوتی:
– ئۆووو.. تکایە وا مەڵێ!
بە هەردوو دەستی دەموچاوی داپۆشی و گوتی:
– خۆزگە بتانزانیبایە چەند کەڕەت گوێم لەوە بووە.
باسی ئەوەیانم بۆ گێڕانەوە کە چوومە سەر ئینتەرنێت و لە ماوەی چەند خوولەکێکی کەمدا توانیم جوانترین و ڕوونترین وێنەی (ماخا)ی گۆیا بدۆزمەوە، هەروەها ئەوەشم گێڕایەوە کە هەر لە ڕێگەی ئینتەرنێتەوە توانیم زانیارییەکی زۆر دەربارەی سەماکەری بەناوبانگ (ئانا ماریا مایا) ببینمەوە.
لەویادا خۆسێ وەک سەرنجێک گوتی:
– ئینجا پەنجەیەکت خستە سەر ناوچەوانی ئانا و بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ نیشانت

دا کە لە ڕێگەی ئینتەرنێتەوە وتارێکت دەربارەی ئەو دۆزیوەتەوە. من خۆم ئەمەیانم بەو لایەنەوە گرێ دایەوە کە هەردووکتان ئاماژەتان بۆ ئەوە کرد کە لەوەوپێش ئاناتان بینیووە، نەک هەر ئەوەش، بگرە زیاد لە ڕادە باسی ئەوەتان کرد. هاوکاتیش دەمزانی ئانا چەندە ڕقی لەوەیە کە بناسرێتەوە، هەم وەک سەماکەرێکی فلامینکۆی ئیشبیلییە و هەم وەک (ماخا)ی گۆیاش. لەسەروو ئەوەشەوە تۆ وەک (هونەرێکی زۆر بالا) ناوت هێنا، وا نەبوو؟ ئێ ئاخر ئێمە لەسەر دوورگەکانی فیجی بووین، دوورگەکانی فیجی بۆ خاتری ئاسمان، تەنانەت ئینتەرنێتیش دەکرێت بە خراپە بەکار بهێنرێت.

دیسانەوە فرانک هەمان پرسیاری پێشووی کردەوە و گوتی:

- ئەو کاتەی لە (تاڤیونی) بوون، دەتانزانی کە دووگیانیت؟

هەردووکیان سەریان ڕاوەشاند.

- بەڵام وابزانم هەر لەبەر ئەوە بوو کە لەپڕێکدا بووڕایەوە؟

لەویادا خۆسێ وەڵامی دایەوە و گوتی:

- بەڵێ، دواترێک پێمان زانی. ئەو کاتەی کە بووڕایەوە، من زەندەقم چوو. ئاخر ئانا هەمیشە حەساسییەتی بەرامبەر پێوەدانی مێش و مەگەز هەبووە، وامزانی لەویادا توشی جۆرە شۆکێکی حەساسییەتی کوشندە بووە. بەڕاستی لەویادا نەمتوانی بەڕوونی بیر بکەمەوە، بەڵام هەستم کرد زللەیەک ئاستی (ئەدرینالین)ی خوێنی بەرز بکاتەوە.

ئا بەو شێوەیە لە باسێکەوە دەچووینە سەر باسێکی تر و بەردەوامیش بتڵی شەرابی تر دەخرایە سەر مێزەکە. تەنانەت ئەوەش بەڕووی فرانکدا درایەوە کە لە تاقگەکانی (بۆئوما)دا بەدزییەوە لەنێوان بۆشایی پەنجەکانییەوە تەماشای جەستەی ڕووتی ئانای کردووە. فرانکیش دانی بەوەدا نا و گوتی:

- ئەوە لەو کاتەدا بوو کە بۆم دەرکەوت من لەوەوبەر تەنها دەموچاوی تۆم بینیبوو، دەنا بەشێوەیەکی ئاسایی کەسێک نیم لەوانەی بەدزییەوە سەیری خەڵکانی تر بکەم و چێژی لێ ببینم.

ئانا پێکەنی:

- پێم وابێت یەک دوو مانگێک لەدوای ئەو سەفەرەمەوە زیاترێک لە (ماخا)کەی گۆیا دەچووم.

دەوروبەری سەعات چواری بەیانی کۆتاییمان بە دانیشتنەکەمان هێنا و فرانک و

ڤیرام بە کۆڵانی تەسکی (سانتا کرون)دا بردەوە و هەردووکیانم گەیاندە ئوتێلی (دۆنا مارییا). کارمەندی خەفەری ئوتێلەکە گوتی: «هیچ میوانێک نەهاتووە داوای ئەو ژووری سێهەمە بکات کە ئێوە گرتبووتان». فرانک و ڤیرا تەماشایەکی یەکتریان کرد، وابزانم لەویادا بیریان لەو کاتە دەکردەوە کە لەبەردەم ژووری ئوتێلەکەی سالامانکادا وەستابوون و کێشەیەکی ئاوهایان هەڵسەنگاندبوو، لەویادا بوو کە ڤیرا دووگیان بووبوو. پاش نەختێک هەردووکیان پێکەنین. منیش گوتم:

– وابزانم بەشی خۆمان ژوورمان هەیە، بەڵام دەتوانی ژنێکم بۆ بدۆزیتەوە؟

بەرلەوەی هەریەکەمان بەرەو ژووری خۆمان بڕۆین، وەک دوا قسەی ئەو شەوە بە فرانک و ڤیرام گوت: «پۆستکارتێکی چرچولۆچ لەسەر مێزی نووسینەکەیماڵەوەمدایە لە (کرۆیدن)، وێنەی (لا ساگرادا فامیلیا)ی لەسەرە، دواتر لە دەرفەتێکدا بۆتان دەگەڕێنمەوە».

*

پێشنیوەڕۆی ڕۆژی دواتر هەروەک یەک خێزانی گەورە کۆبووینەوە و پیاسەیەکی دوورودرێژمان پێکەوە کرد، خۆریش لە بەرزایی ئاسمانی پایتەختی ئەندەلوسیاوە دەدرەوشایەوە. سەرەتا لە ئوتێلی (دۆنا ماریا)، (ئانا و خۆسێ)مان بینی، (مانوئێل)ی بچکۆلەشیان هێنابوو، لە گالیسکەیەکی منداڵانی خەتخەتی سوور و ڕەشدا بوو. پاش نەختێک لە گۆڕەپانی (ڤێرجن دی لوس ڕیس) پەڕینەوە، بەلای (ئارشیفۆ دی ئینڈیاس)دا تێپەڕین و لەوێوە بەرەو (پیورتا جیریس) ڕۆیشتین، دواتریش بۆ خوارەوە بەرەو (پاسیۆ دی لاس دیلیسیاس) ڕێمان کرد، لەوێوە بۆ ماوەیەکی باش بە قەراغ ڕووباری (گوادالکیوڤیر)دا ڕۆیشتین تا گەیشتینە ناو پارکی (ماریا لویسا)، کە یەکێکە لە هەرەگەورەترین مێرگە زۆر و زەوەندەکانی ئیشبیلییە.

ئەم پارکە لە بنەڕەتدا دیارییەکی شازادە (ماریا لویس) بوو کە لە ساڵی (١٨٩٣)دا پێشکەشی شارەکەی کردووە، دواتریش لە ساڵی (١٩٢٩)دا بوو بە شوێنێکی مەزنی پێشانگای (ئیبرۆ- ئەمریکی[٦٧]). ئێستاکەش پارکی (ماریا لویس) یەکێکە لە پارکە هەرەقەشەنگ و جوانەکانی ئەورووپا کە تۆڕێکی گەورەی ڕێگا و لاڕێگای تێدایە، پڕە لە خانۆچکەی دارین و کەپر، چەندین ئەشکەوت و گردی دەستکردی لەخۆ گرتووە، لێوانلێوە لە گوڵ و گوڵزار و پەرژین، چەندین دارستانی بچووک بچووکی فێنک و خۆش، ئەمانە و هەزاران درەختیش کە هێندەی تر پارکەکەیان ڕازاندۆتەوە.

لەنێوان کەپرەکاندا زیاترێک سەرنجمان چووە سەر دانەیەکیان کە لەسەر شێوازی

هونەری (مایا)ی مەکسیکی دروست کراوە. خۆسێ پێی گوتین کە لەدوای پێشانگا جیهانییەکەوە، ئەو کەپرە وەک خەستەخانەیەکی تایبەت بە منداڵبوون بەکارهێنراوە. قسەکانی هەم بوونە مایەی سەرنجی ئەو دایکەی کە تازە منداڵی بووە و هەم ئەو ژنەش کە چاوەڕوانی منداڵێکی دەکرد. فرانک ئاماژەی بۆ زاراوەی (مایا) کرد و گوتی: «هەرچەندە هیچ پەیوەندییەکی زمانەوانی لەنێوان هیندییەسوورەکانی ئەمریکا و هیندییەکانی ئاسیادا نییە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەردوولایان ئەو زاراوەیە بەکاردەهێنن». خۆسێ بەراوردکارییەکەی فرانکی بە شتێکی بێ مانا دانا و گوتی: «ئێ وشەی فلامینکۆی ئیسپانیش، هاوکات مانای باڵندەی (فلامینکۆ)ش دەبەخشێت، هەرچەندە هیچ جۆرە خزمایەتییەکی (ئیتیمۆلۆجی[68])ش لەنێوان ئەو دووانەدا نییە». ئینجا ئانا و خۆسێ باسی ئەوەیان کرد کە کەرەتێکیان بۆ حەجکردن چوونەتە سەر مەزاری پیرۆزی (مارییاس دی لا میر) کە لە (کامارگیو) دایە و لەویادا ئانا سەمای فلامینکۆی لەبەردەم کۆمەڵێک قەرەجی زۆردا کردووە کە لە هەموو ئەورووپاوە بەشداری ئەو کۆبوونەوە گەورەیەیان کردووە. هەروەها گوتیان هەر لەوێشدا لەسەر دەلتای ڕووباری (ڕۆون) کۆمەڵێک فلامینکۆیان بینیوە.

پاشان بەرەو (پلازا دی ئەمریکا) ڕۆیشتین کە دەکەوێتە لای مۆزەخانەی (ئارکیۆلۆجی)یەوە. کۆتری سپیی گۆڕەپانەکەی داپۆشیبوو و ئانا کیسەیەک خواردنی بۆ کۆترەکان کڕی. هێندەی نەبرد و وەچەی سپیی باڵداری دایناسۆرەکان دایانپۆشی. دیسانەوە لەویاشدا فرانک باسی کۆترە سنگ پرتەقاڵییەکەی کردەوە کە لاورا لە (فیجی)دا توانیبووی وێنەی بگرێت.

لە (پلازا دی ئەمریکا)وە چووینە ناو خودی پارکەکەوە. ئانا و خۆسێ بە نۆرە پاڵیان بە گالیسکەی منداڵەکەوە دەنا. فرانک و ڤیراش بەردەوام سەرنجی یەکترییان دەدا، لە ڕاستیدا زۆر زیاترێک لەوەی کە خۆیان ئاگایان لێ بوو: هەر ئەوەندەی ڤیرا نیگای دەچووە سەر شوێنێکی تر، خێرا فرانک سەیری دەکرد. هەر کاتێکیش فرانک سەیرێکی گالیسکەکە یان خۆسێ و ئانای دەکرد، بەردەوام ڤیرا چاوی تێدەبڕی، بەڵام بەردەوامیش خۆیان لادەدا لەوەی ڕاستەوخۆ تەماشای یەکتر بکەن.

داوام لە ئانا و خۆسێ کرد کە کەمێک دەربارەی مێژووی فلامینکۆی ئەندەلوسیام بۆ باس بکەن. باسی (ئیل پلانیتا) و (سەرافین کالدەرۆن)ی بەناوبانگیان بۆ کردم کە بە لەقەبی (ئیل سۆلیتاریۆ) ناسراوە کە مانای (کەسێکی تەنیا) دەبەخشێت. لە کتێبی (چەند چیرۆکێکی ئەندەلوسی)دا، کە لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەدا

نووسیویەتی، زنجیرەیەک چیرۆکی قەشەنگ دەربارەی فلامینکۆی ئەو سەردەمە دەگێڕێتەوە، لەنێوانیاندا چیرۆکی (ئاهەنگێک لە تریانا)ی تێدایە، کە خۆی بۆ خۆی زۆر سەرنجڕاکێشەرە، بۆیە پڕ بە پێستی خۆیەتی کە (ئیل پلانیتا) بە یەکەمین سەماکەری فلامینکۆ ناوزەد بکرێت.
فرانک لەدوایەوە پرسییەوە:
- گوتتان (ئیل پلانیتا) (ئەستێرەیەکی گەڕۆک) و (ئیل سۆلیتاریۆ) (کەسێکی تەنیا)؟
ئانا سەری بۆ لەقاند و دیاربوو فرانک درکی بە پەیوەندیی نێوان ئەو دووانە کردبوو، بۆیە گوتی:
- (لاورا)م بیرکەوتەوە. بەردەوام دانیشتبوو و کتێبی (ئەستێرەی گەڕۆکی تاقانە)ی دەخوێندەوە.
خۆسێ دانی بە سەرنجەکەی فرانکدا نا و گوتی:
- سەرنجێکی جوانە.
لەبەردەم تابلۆیەکدا وەستابووین و ناوی ئەو باڵندانەی لەسەر نووسرابوو کە لەو پارکەدا هەن. پێم وابێت لەویادا بوو کە فرانک باسی ئەو کورتەبنە سەیرەی گێڕایەوە کە لە باخچەکانی (ئالکازار)دا بینیمان.
ئانا خەندەیەکی گەورە گرتی و گوتی:
- ئەو لەویادا دەژی.
- لەویادا دەژی؟
- خەڵکی وا دەڵێن. دەڵێن گوایە بە نێوان باخچەکاندا دێت و دەچێت و ڕەسمی گەشتیاران دەگرێت، دواتریش لەبەر دەرگای دەرەوە بە نرخێکی زۆر بەرز پێیان دەفرۆشێتەوە. خەڵکانێک دەڵێن لە (گالیریا دیل گروتیسکۆ)دا دەژی. هێندەی منیش بیرم بێتەوە، ئەو لەو باخچە دێرینانەدایە و کەسیش نازانێت تەمەنی چەندە.
دواتر چووینە ناو (پلازا دی ئیسپانیا)، ئەو گۆڕەپانەی کە کاتی خۆی بەتایبەتی بۆ پێشانگا گەورەکەی (ئیبرۆ - ئەمریکی) دروستیان کرد. ئەو گۆڕەپانە لە شێوەی نیوەمانگێکدا بنیات نراوە، جۆگەیەک بە چواردەوریدایە و چەند پردێکی لەسەر شێوازی پردەکانی شاری (بوندقییە)ی لەسەر دروست کراوە. گۆڕەپانێکی مەزنی نیوەبازنەییشی تێدایە و وەک پێشانگایەکی جیهانی، تەرخان کراوە بۆ نمایشکردنی پیشەسازی و هونەری پیشەی دەستیی ئیسپانی. ڕووی پێشەوەی ئەو

بینا گەورەیە، کە دەڕوانێتە خۆرهەڵات و ڕووباری (گوادالکیوڤیر)، چوار دەرگای سەرەکیی چوونەژوورەوەی هەیە کە لە پایە دروست کراون، هەر دەرگایەکیشیان لە سیانزە پایەی دوانی پێکهاتووە.
بەسەر یەکێک لە پردەکاندا پەڕینەوە و خۆسێ و ئانا بەرەو دەرگای چەپیان بردین، لەویادا نەخشی پڕ لە وردەکاری سەر هەندێک پارچە فەخفوریی مۆزاییکیان نیشان داین. نەخشەکان باسی ڕووداوە هەرەگرنگەکانی مێژووی پارێزگاکانی ئیسپانیا دەکەن، هەروەها نەخشەی پارێزگاکان و دروشمی هەریەکێکیشیان دەردەخەن.
خۆسێ گوتی: «ئیسپانیا لە پەنجا پارێزگا پێک هاتووە، بەدەر لەوەش دوو شاری سەربەخۆی لە مەغریبدا هەیە کە ناویان (سەبتە) و (مەلیلە)یە».
فرانکیش گوتی:
- کەواتە دەکاتە پەنجاو دوو. واتە هەر هێندەی ژمارەی ناوچەی هەڵبژاردنی هەرێمییەکانی پەرلەمانی فیجییە.
ئەو یاری نموونەکارییەی نێوان خۆسێ و فرانک، بوو بە جۆرە بەربەرەکانێیەک، خۆسێ گوتی:
- هەر هێندەی ژمارەی وەرەقەکانی دەستەیەکی یاریی کاغەزیشە. بەڕاست، لە فیجیدا حەشرمان پێ کردن بە یاریی کاغەز.
منیش لەلای خۆمە زۆر بە گرنگم دەزانی کە باسێکی زۆری مایا و ژمارەی پەنجاو دوو کرا. بێگومان پێشم وابوو لەو بوارەدا بۆڕی هەردووکیانم دایەوە کاتێک کە گوتم:
- هەر هێندەی ژمارەی ساڵنامە کۆنەکەی (مایا)شە. هەر ساڵێکی فەلەکییان (٣٦٥) ڕۆژ بووە، بەڵام هاوکات ساڵی (سروت)یشیان هەبووە کە (٢٦٠) ڕۆژ بووە. بەو شێوەیەش بۆ ئەوەی حسابەکەیان ڕێک بکەنەوە، هەموو دەورەیەکی ساڵنامەکەیان لە پەنجاو دوو ساڵ پێک هێناوە.
ئانا تەماشایەکی کردم، دیسان لەویاشدا هەستم کرد تەماشای (ماخا)ی گۆیا دەکەم، ئینجا گوتی:
- ئاخر ئەوەیان ڕاست نییە.
سەرێکم بۆ لەقاند:
- بەڵی ڕاستە، پەنجاو دوو ساڵی فەلەکی دەکاتە (١٨٩٨٠) ڕۆژ، وە ئەگەر ئەو ژمارەیە بەسەر (٢٦٠)دا دابەش بکەین، کە ژمارەی ساڵنامەی ئاهەنگگێڕانیانە، ئەوا (٧٣) ساڵی (سروت)مان دەست دەکەوێت. بەڕاست (٢٦٠) ڕۆژەکەشیان بەسەر

(١٣) مانگدا دابەش کردبوو.
باسی ساڵنامە و دەورەی زەمەنی هاتە ئاراوە و لە کاتێکیشدا کە سەرەی من بوو قسە بکەم، بەردەوامیم بە باسەکەم دا و گوتم:
– بێگومان لەیادتانە کە بە چ شێوەیەک پلانی هەزارەی نوێ لە فیجیدا دارێژرا، وا نییە؟
خۆسێ گوتی:
– ئێ هەر ئەو هۆیە ئێمەی گەیاندبووە ئەوێ. بەدەر لە هەندێک ناوچەی پۆڵی باشوور و چەند ناوچەیەکی کەمی سیبریا، فیجی تەنها شوێنێکی وشکانی سەر ئەم زەوییەیە کە هێڵی (١٨٠) پلەی درێژی دەیبڕێت. دوورگەکانی فیجی تەنها شوێنێکی سەر ئەم گۆی زەوییەیە کە بەبێ پێڵاوی سەر بەفر، بتوانیت لە ڕۆژێکەوە پێ بنێیتە ناو ڕۆژێکی تر.
بە سەبرەوە سەرێکم بۆ لەقاند:
– بەڵام ئایا نوێترین دەنگ و باستان لەو بارەیەوە بیستووە؟
خۆسێ سەری بۆ ڕاوەشاندم، منیش گوتم:
– بەهۆی پرسیارگەلێکی وەک هێڵی (بەرودوا) و کاتی هاوینە و کاتی خۆرهەڵاتنەوە، مشتومڕێکی توندوتیژ لەنێوان کۆمەڵێک لە دوورگەکانی ئۆقیانووسی ئارامدا هەڵگیرساوە و تەبا نین لەسەر ئەوەی کام دوورگەیان یەکەمین شوێنە کە پێ دەنێتە ناو هەزارەی نوێوە، بەڵام لە ڕاستیدا تەنها دوورگەی تاڤیونی و یەک دوو دوورگەی تری فیجی هێڵی درێژی (١٨٠) پلە دەبڕێت، وە هەر بۆ ئەوەی دوورگەکانی فیجی پێش (تۆنگا) و دوورگەی بچکۆلەی (لیتڵ پیت ئیسلاند) بکەون، لەم ساڵەوە کاتی هاوینەیان بەکارهێناوە. چەند حەفتەیەک لەمەوبەر بڕیاریان دا بۆ یەکەمین جار سەعاتەکەیان یەک کاتژمێر بەرنە پێشەوە، بەڵام ئەوە هەموو شتێک نییە و...
فڕانک لەویادا پرسی:
– ئەی چیی تریش؟ ئومێدەوارم نەڵێیت کە ئوتێلی پلە یەکیان لەسەر دوورگەکە دروست کردووە؟
– نەخێر، بەتەواوەتی بەو شێوەیە نا، بەڵام دەبێت لەسەر هێڵی (١٨٠) پلەی درێژی (پەیکەرێک) بۆ بیرەوەری هەزار ساڵە بنیات بنرێت، ڕێک لەو شوێنەدا کە ئانا چاوپێکەوتنەکەی لەگەڵ فڕانکدا سازدا و باسی ئەو ڕەگەزی گیانەوەرانەی ناوچەی خوارووی ئۆقیانووسی ئارامی کرد کە هەڕەشەی فەوتانیان لەسەرە. لە خودی ئەو

پەیکەرەدا هەر کەسێک کە بیەوێت، دەتوانێت کەپسولێکی زەمەنی دابنێت کە هەزار ساڵ دواتر دەکرێتەوە. دەتوانیت سەلامێک و پەیامێک بۆ هەزارەی چوارهەم بنووسیت و بیخەیتە ناو کەپسولێکی شووشەییەوە. ئەو کەپسولە مۆر دەکرێت و دەخرێتە ناو خشتێکەوە کە دەبێت بە بەشێک لە خودی پەیکەرەکە. نرخی هەر کەپسولێک تەنها پێنج سەد دۆلارە و ڕێکخراوێکی تایبەتیش کاری پارستن و هێشتنەوەی ئەو کەپسولانە بۆ ماوەی هەزار ساڵی داهاتوو دەگرێتە ئەستۆ. بەدەر لەوەش گەرانتی ئەوەت دەدەنێ کە کەپسولە زەمەنییەکەت لە ئاهەنگێکی تایبەتییدا لە جەژنی سەری ساڵی (٣٠٠٠)دا بکرێتەوە.

خۆسێ گوتی:

– من خۆم دڵنیا نیم و نازانم ئەگەر شتێکم بۆ ئەو کاتە لە دڵدا بێت و بمەوێت بیڵێم، ئاخر هەر زۆر زۆری ماوە. ئەی تۆ؟

– بیرم لەوە کردۆتەوە کە مانیفێستێک دەربارەی سەدەی بیستەم بخەمە ناو کەپسولێکەوە.

خۆسێ پرسی:

– مانیفێستێک؟ مانیفێستێکی سیاسی؟

سەرم بۆ ڕاوەشاند و گوتم:

– کورتەیەکی کۆبوونەوە باڵاکەی خۆمانم نووسیوەتەوە کە کاتی خۆی لە ئوتێلی (ماراڤیۆ پلانتەیشن ڕیسۆرت) سازمان دا. هەست ناکەن قەرزاریاری دوورگەکانی فیجی بین و لەجێی خۆیدا بێت کورتەیەکی ئەو شتانەیان بۆ بەجێبهێڵین کە لەویادا بینیمانن؟

پێم پێکەنین.

ئانا گوتی نمایشی پارێزگا ئیسپانییەکان بەپێی پیتی ئەلفوبێ ڕێکخراون، هەر لە (ئالاڤا)وە تا (زاراگۆزا). کاتێکیش لە دەرگای بەردەم پایەکان نزیک بووینەوە، ئامازەی بۆ تابلۆیەک کرد و گوتی: «ئالاڤا، ئالباسیتا، ئالیکانتی، ئالمیریا، ئاڤیلا...»

ڤیرا قسەکانی پێ بڕی:

– دایکم کاتی خۆی لە (ئالمیریا)دا بە من دووگیان بووە. دایک و باوکم پێیان وایە لەو شارە بچکۆلەیەدا منیان دروست کردبێت کە ناوی (ڤیرا)یە. هەر بەو ناوەشەوە ناویان ناوم.

ڕۆیشتە لای نەخشەکەوە و ئاماژەی بۆ ئەو شارە کرد کە ناوی (ڤیرا)یە.
لەبەردەم تابلۆی پارێزگای (ئالاڤا)دا وەستا بووین و لەو کاتەدا ئانا تەماشایەکی خۆسێی کرد و گوتی:
- بۆم هەیە نهێنییەک بدرکێنم؟
یەکسەر ئەو کاتەم بیر کەوتەوە کە لە تاڤیونی بووین، لەویادا خۆسێ بەردەوام ڕێگر بوو و نەیدەهێشت ئانا وەڵامی پرسیارەکانمان بداتەوە. کەچی کە ئەو پرسیارەی لێ کرد، هەروا بەئاسانی شانێکی بۆ هەڵتەکاند، هەروەک ئەوەی بڵێت: «فەرموو سەربەستیت»، ئانا گوتی:
- ئێمە بەشێوەیەکی گشتی هەموو ڕۆژی یەکشەممانێک پیاسەیەک بێرەدا دەکەین، لەگەڵ تێپەڕبوونی ساڵەکانیشدا، چیرۆکێکی بچکۆلەمان بۆ هەریەکێک لەو پارێزگایانە داناوە. کاتێکیش کە سەفەر دەکەین، هەوڵ دەدەین بە ڕیز ئەو چیرۆکانەمان بیر بکەوێتەوە، خۆ ئەگەر نەشتوانین، ئەوا چیرۆکی نوێ دەهۆنینەوە.
من و فرانک نیگایەکمان گرتە یەکتری، هەروەک ئەوەی باش لە قسەکەی تێبگەین. وا لەویادا هۆی قسە ناڕوونەکانی ئەو دوو ئیسپانییەشمان بۆ ڕوون بووەوە کە بەردەوام لە فیجیدا بە یەکتریان دەگوت. ئێ خۆ من لە قسەکانیان تێنەدەگەیشتم، هەربۆیە (فرانک)م وەک وەرگێڕێک و یاریدەدەرێک بەکارهێنا: ئیشێکی وام پێ سپاردبوو کە تا ئەو کاتەش خۆی بێ ئاگا بوو لێی.
بەهێواشی بەلای هەموو پارێزگا ئیسپانییەکاندا ڕۆیشتین. ئانا و خۆسێ ئاماژەیان بۆ مۆزاییکەکان کرد و دەربارەی هەریەکێکیان حەکایەتێکی بچکۆلە یان ئەفسانەیەک، یاخود چیرۆکێکی خۆشیان بۆ گێڕاینەوە.
لەویادا فرانک و ڤیرا بەسەرە پاڵیان بە گالیسکەکەی (مانوئێل)ەوە دەنا. لە خەیاڵی خۆمدا گوتم: «ئەگەر (٦٥) ملیۆن ساڵێک لەمەوبەر ئەو ئەستێرە کشاوە بەر زەوی نەکەوتایە، ئەوا ئێستاکە لەوانەیە پاڵیان بە گالیسکەیەکەوە بنایە کە لەجیاتی منداڵ (هێلکە)ی تێدا بووایە: بێگومان دواجار دایناسۆرەکانیش تایەیان هەر دەدۆزییەوە.
گەیشتینە لای پارێزگای (زامۆرا)، کە ڕێک بەرامبەر گۆڕەپانەکەیە، لەویادا هەردووکیان پێکەوە پاڵیان بە گالیسکەکەوە دەنا. دواتریش خۆمانمان لەبەردەم پارێزگای (زاراگۆسا)دا بینییەوە و خۆسێ باسی کاتدراڵییە جوانەکەی (نیوسترا سینیۆرا دیل پیلار)ی کرد کە بە تابلۆ کلسییەکانی گۆیا ڕازێنراوەتەوە، لەویادا، تەنها لەویادا غیرەت گرتنی: گالیسکەکەیان دایەوە بە ئانا و دەستی یەکتریان گرت،

زۆر بەگوڕ تەماشای ناو چاوی یەکتریان کرد. بەو شێوەیە نیوەی بازنەکە تەواو بوو. نیوەکەی تری بازنەکەش، نامەکەی فرانک بوو کە بۆ ڤیرای نووسی. هەرگیز مەبەستەکە لەوەدا نەبوو کە ئەو دوو نیوەبازنەیە پێک بگەن و بازنەیەکی تەواو پێک بهێنن. ئاخر من چاوەڕوانی ئەوە نەبووم فرانک لە سالۆنە خڕەکەی ئوتێلی (پالاس)دا ببینم، بەهەرحاڵ ئەوە ڕوویدا و توشی سەرئێشەیەکی زۆریشی کردم، بەڵام هاوکات کۆمەڵێک سروشی نوێشی پێ بەخشیم.

دواترێک لە فرسەتێکدا خۆسێ دەربارەی کتێبەکەم پرسیاری لێ کردم، ئەو کتێبەی کە لە دوورگەکانی فیجیدا تێبینیم بۆ کۆدەکردەوە، ویستی بزانێت لەو بارەیەوە گەیشتوومەتە کوێ، منیش دیسانەوە پەنجەم خستەوە سەر دەمم و گوتم: «من قەت باسی ئەو شتە ناکەم کە دەربارەی دەنووسم».

خۆسێ گوتی:

– ئێ هەر ویستم بزانم لەگەڵ کتێبەکەتدا گەیشتوویتەتە کوێ، هیچی تر.

هەموویان سەیریان کردم، ئاخر لە ماوەی ئەو شەو و ڕۆژەدا کە پێکەوە بووین، هەموویان خۆیان بۆ یەکتری کردەوە و بە شیاوم نەزانی لەدوای دوا دیدارمانەوە تەنها من هیچ شتێکی نوێم پێ نەبێت کە بیخەمە ڕوو. نەک هەر ئەوەش، بگرە دوو کەسی نوێشیان هێنابووە جیهانەوە. لەبەرئەوە گوتم:

– هەم چیرۆکێکی ڕاستەقینەیە و هەم چیرۆکێکیشە کە خۆم هۆنیومەتەوە. خۆشم نازانم کام چیرۆکەیان جوانترێکە. پێم وابێت هۆکەی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە بەشێوەیەک لە شێوەکان تێکەڵی یەکتری دەبن. هەروەک هێلکە و مریشکەکە وایە. بەبێ چیرۆکە ڕاستەقینەکە، چیرۆکە داهێنراوەکە بوونی نەدەبوو، وە بەبێ چیرۆکە داهێنراوەکەش، چیرۆکە ڕاستەقینەکە نەدەچووە ئەقڵەوە. بەدەر لەوەش مەحاڵە بزانیت ئەو دوو چیرۆکە لەکوێوە دەست پێ دەکەن و لەکوێشدا کۆتاییان دێت، چونکە تەنها سەرەتای چیرۆکەکان کۆتاییەکەیان دەستنیشان ناکەن، بەڵکو کۆتاییەکانیشیان سەرەتای چیرۆکەکان دەستنیشان دەکەن. لەوەوپێش باسی ئەوەمان کرد: پانزە ملیارد ساڵ بەسەر تەقینەوە گەورەکەدا تێپەڕی، ئینجا دەنگی گرمەکەی بیسترا.

ڤیرا بەڕاستی دەیویست بزانێت چیرۆکەکان دەربارەی چین، هەربۆیە پرسی:

– باشە ئەو دوو چیرۆکە دەربارەی چین؟

بیرێکم کردەوە و ئینجا گوتم:

- دەربارەی گیانەوەرە بڕبڕەدارەکانن.
فرانک هەردوو چاوی زەق کردەوە و پرسی:
- دەربارەی گیانەوەرە بڕبڕەدارەکان؟
سەرێکم بۆ لەقاند و گوتم:
- دەربارەی (سیناپسید)ەکانە، وە بەتایبەتی دەربارەی دوا نەوەی ئەو ڕەگەزەن، هەڵبەتە مەبەستم لەو گیانەوەرانەیە کە لەدوای گیانەوەرە سەرەکییەکانەوە هاتوون. من خۆم بۆ خۆم یەکێکم لەو گیانەوەرە سەرسوڕهێنەرانە و وا تەمەنم گەیشتۆتە (٦٥) ساڵ. هەربۆیە سەیرە بەلامەوە کاتێک بیر لەوە دەکەمەوە کە من بە ڕەچەڵەک لە گیانەوەرێکی بچکۆلەی وەک (شیرناڵی)ییەوە هاتووم، کە (٦٥) ملیۆن ساڵ لەمەوبەر لەسەر ئەم زەوییە ژیاوە! یان با لەوەش دوورتر بڕۆین: لە گیانەوەرێکی وشکاوەکییەوە هاتووم کە (٣٦٥) ملیۆن ساڵ لەمەوبەر لێرەدا ژیاوە. ئەوەشیان شتێکی باشە، شتێکی هەر زۆر نایابە! هەرچەندە وابزانم تا ئێستاش خۆمان هەر لە سەرەدەمی قۆزاخەدا دەبینینەوە.
بەسەر گالیسکەکەی (مانوئێل)دا خۆم چەماندەوە و دواتریش ئاماژەم بۆ سکی ڤیرا کرد و ئینجا گوتم:
- پێشبڕکێ مەزنەکەی هاتنی یەک بەدوای یەکی نەوەکان هێشتا کۆتایی نەهاتووە. برادەران، ئەو سەفەرە هێشتا هەر بەردەوامە و لە ئێمەشەوە دوور دەکەوێتەوە، هەر زۆر زۆر دوور دەکەوێتەوە، بەڵام هەرچی دەربارەی دوا مەنزڵی ئەو سەفەرە دوورودرێژەیە، ئەوا هێشتا هەر زۆر زووە کە هیچ شتێکی دەربارە بڵێین.
ئانا بە بێدەنگی سەرێکی بۆ لەقاندم، هەستم کرد کە ڕۆمانەکەم بڵاو دەکرێتەوە، یەکێک نابێت لەو کەسانەی کە یەکسەر بەپەرۆشەوە بیخوێنێتەوە، بەڵام خۆ لەوانەشە ئەوە شتێکی ئاسایی بێت.
چوار کۆمەڵ ڕەسم لەگەڵ نامەکەی فرانکدا بوو کە بۆ ڤیرای نووسی بوو، هەر کۆمەڵێکیشیان لە سیانزە وێنە پێکهاتبوو کە لە تاڤیونییدا گیرابوون. لە پشتی هەر وێنەیەکدا ئانا بەشێکی ئەو مانیفێستەی نووسی بووەوە کە خۆی و خۆسێ لەوێ بەردەوام بۆ یەکترییان دەگێڕایەوە. لەو کاتەدا کە لەمسەرەوە بۆ ئەوسەری (پلازا دی ئیسپانیا) دەڕۆیشتین، وە هەروەها لەو کاتەشدا کە بەو ڕێگا دوورودرێژەدا ڕۆیشتین لە (ئالاڤا)وە بۆ (زاراگوزا)، من هەوڵم دەدا بۆ هەر پارێزگایەکی ئیسپانی، حیکمەتێکی کورتی مانیفێستەکەم بیر بکەوێتەوە. سەیربوو بەلامەوە کە خۆسێ جەختی لە خاڵێک دەکردەوە و بەلایەوە گرنگ بوو بڵێت مانیفێستەکە بۆ دوو

کەس نووسراوە کە شەریکی ژیانی یەکتر بن، چونکە تاڕادەیەک ئەو ڕەهەندی مانیفێستەکە دەری دەخات، بۆ کەسێکی تەنها سەختە و باشترە دەستی کەسێکی تری هەبێت کە بیگرێت.

فرانک چیتر وەک ئەو کاتە پەست و بێتاقەت نەبوو کە لەناو دارگوێزە هیندییەکانی (ماراڤیو پلانتەیشن ڕیسۆرت)دا پیاسەمان دەکرد و پێکەوە قسەمان دەکرد. لە دڵی خۆمدا گوتم: «وابزانم ئێستاکە ئاسانترێک فیکرەی قورسی ئەبەدییەتی ون بوو قبووڵ دەکات». لایەنی کەم وا هاتە بەرچاوم کە چیتر بە تەنها ڕووبەڕووی تاریکایی شەوانی گەردوونی نابێتەوە. ئێستاکە کەسێکی هەیە کە لەو ڕێگا سەختەدا هاوەڵی بێت. هەستم دەکرد هێشتا هەروەک فریشتەیەک بێت کە لە تەنگانەدا بێت، بەڵام زەرووڕەتی ژیان فریشتە بێ باڵەکانیش فێری عەشق دەکات.

هەر لە (پلازا دی ئیسپانیا)دا ماڵئاواییمان لە یەکتری کرد. ئانا و خۆسێ و (مانوئێل)ی بچکۆلە ڕۆیشتنەوە ماڵەوە، فرانک و ڤیراش بە ڕاشکاوانە گوتیان کە پێویستیان بەوەیە پاشماوەی پشووی حەفتەکە بە تەنها لە ئیشبیلییەدا بەرنەسەر.

ئا بەو شێوەیە دیسانەوە بە تەنها مامەوە. من خۆم هەستم دەکرد دۆستایەتییەکی باشم لەگەڵ هەریەکێک لەو برادەرە گەنجانەدا هەبێت، دۆستایەتییەکی زۆر زیاتر لەوەی کە هیچیان بتوانن لێی تێبگەن.

*

بەرلەوەی بە شەمەنەفەر بەرێکەوم بۆ مەدرید و لەوێشەوە بە فڕۆکە بەرەو (گاتویچ) بگەڕێمەوە، پیاسەیەکم بەلای ڕووباری (گوادالکیوڤیر)دا کرد، ئینجا لە پردی (سان تیلمۆ)وە پەڕیمەوە و لەناکاوێکدا لە (تریانا)دا خۆمم لەبەردەم کڵێسەی (سانتا ئانا)دا بینییەوە. دەرگای کڵێسەکە واڵا بوو و لەویادا (من) توشی حاڵەتی (دیژەڤیو) بووم.

لەو کاتەدا کە لە گۆڕەپانی بەردەم ئەو کڵێسە ڕەنگ کرێمییەدا وەستابووم، هێدی هێدی کۆمەڵێک خەڵکی ڕەشپۆش لەو ناوەدا کۆبوونەوە. هێندەم بۆ دەرکەوت کە بۆ پرسەی کەسێک هاتوون. کاتێکیش کە خۆیان کرد بە کڵێسەکەدا، منیش لەگەڵیاندا چوومە ژوورەوە. زۆر کەم لە قسەی قەشەکە تێگەیشتم، بەڵام دیاربوو کە ژنێکی گەنج کۆچی دوایی کردبوو، چونکە زۆر بەئاسانی توانیم دایک و باوکی مردووەکە و مێردەکەی لەنێو ئامادەبوواندا جیا بکەمەوە.

قەشەکە لەسەر بەرێوەبردنی پرسەکە بەردەوام بوو و لەو کاتەدا خۆم لە خۆمم پرسی: «کێ مردووە و بۆچی؟ بڵێیت بەشێوەیەک لە شێوەکان خەتای منی تێدا بووبێت؟».

پاش ئەوەی هەڵسایین و کڵێسەکەمان جێهێشت، چاوم بە کورتەبنەکەی باخچەکانی (ئالکازار) کەوت. لەو کاتەدا کە لە دەرگای کڵێسەکە چووینە دەرەوە، تەماشایەکی کردم و چاوێکی لێ داگرتم. وابزانم ناسیمییەوە، چونکە ڕۆژی پێشووتر منی بینی. بەهەرحاڵ، دڵنیا نیم لەوەی کە منیش لەبەرامبەردا چاوێکم لێ داگرتبێتەوە، کەچی ئەو بە پەنجەی دۆشاومژەی دەستی چەپی ئاماژەیەکی بۆ کردم و کەمێک ڕایکێشام و لە خەڵکەکەی جیا کردمەوە. دەستی کرد بە گیرفانی ناوەوەی چاکەتەکەیدا، سەفتەیەک ڕەسمی ڕەنگاوڕەنگی بچکۆلەی دەرهێنا و دانەیەکیانی دامێ. وێنەی خۆم بوو، لەو کاتەدا گرتبووی کە لەبەردەم (پۆرتا دی مارشینا)دا لە باخچەکانی (ئالکازار)دا دانیشتبووم. بەپەلە دەستم کرد بە گیرفانمدا و بەدوای پارەدا گەڕام تا بیدەمێ، بەڵام کورتەبنەکە بەهیچ جۆرێک نەیویست پارەی بدەمێ و زۆر بە ساکاری گوتی: «دی نادا، دی نادا!»[٦٩]، منیش لە دڵەوە سوپاسم کرد، بەڵام بەرلەوەی فریا بکەوم بەتەواوەتی لە کورتەبنەکە ورد ببمەوە، هەم خۆی و هەم خەڵکەکەش لەبەرچاومدا ون بوون.

بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ لەبەردەم کڵێسەی (سانتا ئانا)دا وەستام و بەوردی لە وێنەکەی خۆم ورد بوومەوە. تەنها ئەو شتەم بینی کە پێشوەخت دەمزانی و هەمیشەش ئاشنا بووم پێی. گیانەوەرێکی سەرەکیی شیردەری مات و مەلوولم بینی و هیچ جۆرە تەبایی و ئاشتبوونەوەیەکم لەو نیگا بێ ئومێدەدا نەبینی کە چاوی تێ بڕیبووم. بەو شێوەیەش دواجار بۆم ڕوون بووەوە کە ئەو ڕۆمانەی کە دەستم بە نووسینی کردبوو، بە پلەی یەکەم دەربارەی فرانک و ڤیرا یان ئانا و خۆسێ نەبوو، بەڵکو دەربارەی شیلا و یاریی کاغەزەکەی بوو. دەربارەی خۆشم بوو.

زیاتر هەروەک غەریزەیەک ڕەسمەکەم هەڵگێڕایەوە و بینیم لەسەر ڕووی پشتەوەی، کورتەبنەکە بە قەڵەمێکی سوور شتێکی لەسەر نووسیبوو:

(ڕەنگە مرۆڤ تەنها بوونەوەرێکی زیندووی سەرتاپای ئەم گەردوونە بێت کە خاوەنی ئاگاییەکی گەردوونی بێت. کەواتە پاراستن و هێشتنەوەی ژینگەی زیندووی سەر ئەم گۆی زەوییە، تەنها بەرپرسیارێتییەکی جیهانی نییە، بەڵکو هاوکات بەرپرسیارێتییەکی گەردوونیشە. ئاخر پێدەچێت ڕۆژێک لە ڕۆژان تاریکی باڵی خۆی بەسەر هەموو شتێکدا ڕابکێشێتەوە و ڕۆحی خوداش چیتر بەسەر ئاوەکاندا نەسوڕێتەوە).

# مانیفێستەکە

بللی سینەک

جیهانێک بوونی هەیە. خۆ ئەگەر وەک (ئەگەرێک) بیری لێ بکەینەوە، زۆر لە سنووری مەحاڵ نزیک دەبێتەوە. بە مانایەکی تر، زۆر زیاتر ڕێی تێدەچوو کە هەر لە بنەڕەتدا بە ڕێکەوت هیچ شتێک بوونی نەبووایە، بەڵام ئەو کاتە هیچ کەسێک بەهیچ شێوەیەک نەیدەپرسی: بۆچی هیچ شتێک بوونی نییە؟

دووی سینەک

لە ڕوانگەیەکی بێلایەنەوە بڕوانین، ئەم جیهانە نەک هەروەک دیاردەیەکی ناوازە و نەشیاو دێتە بەرچاو، بەڵکو بەردەوام وەک کێشە و گرفتێک ڕووبەڕووی هزر دەبێتەوە. هەڵبەتە ئەمە ئەگەر هەر لە بنەڕەتدا هزرێک بوونی هەبێت، مەبەستم لەوەیە ئەگەر هزرێکی بێلایەن بوونی هەبێت. دەنگەکەی ناوەوە ئاوها دەڵێت. دەنگی جۆکەر بەو شێوەیەیە.

سێی سینەک

ئەو دەنگەی کە لە ئێستاکە و لێرەدا بەڕوونی و ڕەوانی قسە دەکات، دەنگی نەوەکانی دواتری گیانەوەرە وشکاوەکییەکانە. لە دارستانە قیرتاوکراوەکەوە لە قوڕگی مارمێلکەکانی برازا و خوشکەزاکانییەوە هاوار دەکات. نەوەی دواتری گیانەوەرە شیردەرە بە فەروو داپۆشراوەکانیش دەپرسن: باشە ئەقڵێک لە دەرەوەی ئەم قۆزاخە بێ شەرمەوە بوونی نییە کە بەردەوام بە هەموو لایەکدا هەر گەشە دەسەنێت؟

چواری سینەک

ئێمە دەپرسین: چەندە بواری ئەوە هەیە کە شتێک لە هیچی نەبووەوە

بێته بوون؟ یان بێگومان بەپێچەوانەوە: چەندە ڕێی تێدەچێت شتێک لە ئەزەلەوە هەر بوونی هەبوو بێت؟ ئەی ئایا دەکرێت بزانین چەندە بواری ئەوە هەیە کە ماددەیەکی گەردوونی سەرلەبەیانی ڕۆژێک لە ڕۆژان، لەپڕێکدا لە خەونە ئەبەدییەکەی خەبەری ببێتەوە و بەئاگا بێت لە خۆی؟

پێنجی سینەک

ئەگەر خودایەک هەبێت، ئەوا نەک هەر لەوەدا زۆر زیرەکە کە هیچ شوێنەوارێک لەدوای خۆیەوە جێنەهێڵێت، بەڵکو مامۆستایەکی گەورەشە لە هونەری خۆشاردنەوەدا. لە ڕاستیدا جیهانیش هەروا بە ڕاشکاوی خۆی نیشان نادات. گەردوونیش بەردەوام نهێنییەکانی خۆی شاردۆتەوە و نایاندرکێنێت. ئێ خۆ ئەستێرەکانیش هێندە ورتەورت لەگەڵ یەکدیدا ناکەن، بەڵام تا ئێستاش هیچ کەسێک ئەو تەقینەوە گەورەیەی لەیاد نەکردووە. هەر لەو کاتەشەوە بەردەوام بێدەنگی زاڵ بووە و هەموو ئەو شتانەش کە بوونیان هەیە هێدی هێدی لەیەک دوور دەکەونەوە. هێشتا بواری ئەوە ماوە کە چاومان بە مانگێک یاخود ئەستێرەیەکی کلکدار بکەوێت، بەڵام چاوەڕوانی ئەوە مەبە کە بەشێوەیەکی میهرەبانانە بانگهێش بکرێیت، چونکە لە ئاسماندا کارتی سەردان و داوەتنامە چاپ ناکرێن.

شەشی سینەک

لە سەرەتادا، ماوەیەکی هەر زۆر زۆر لەمەوبەر، تەقینەوە گەورەکە ڕوویدا. ئەمە تەنها وەبیرخستنەوەی ئەوەیە کە نمایشێکی زیادەی ئێوارەکەمان نیشان دەدرێت. هێشتا بوار ماوە بلیتی ئەو نمایشە پەیدا بکرێت. زۆر بەکورتی مەبەستی ئەم نمایشە زیادەیە ئەوەیە کە جەماوەرەکەی ئافەریدە بکرێن. ئێ لە هەموو بارێکدا بەبێ تەماشاکەران، بەهیچ شێوەیەک لە شێوەکان بەجێ نییە ئەو ڕووداوە کتوپڕە ناو بنێین نمایش. هێشتا چەند کورسییەکی بەتاڵ ماوە.

## حەوتی سینەک

ئاخۆ کێ خۆشیی لە نمایشی تەقاندنی فیشەکەشێتەکانی گەردوون ببینیبێت، لە کاتێکدا کاتی خۆی سەرجەم کورسییەکانی ئاسمان تەنها و تەنها جمەیان هاتووە لە سەهۆڵ و ئاگر؟ کێ بە خەیاڵیدا دەهات ڕۆژێک لە ڕۆژان خشۆکە سەرەتاییە ئازاکان هەنگاوێکی بچکۆلە بەرەو کەناری دەریا بنێن، نەک هەر ئەوەش، بەڵکو لەو ڕێگا دوورودرێژەدا هەنگاوێکی گەورەتریش بنێن بەرەو گیانەوەرە شیردەرە باڵاکان، کە ئێستاکە بەوپەڕی شانازییەوە لە سەرەتای ئەو ڕێگایە دەڕوانن؟ پانزە ملیار ساڵ بەسەر تەقینەوە مەزنەکەدا تێپەڕی و ئینجا هاڕەکەی بەرگوێ کەوت.

## هەشتی سینەک

بێگومان دەبێت دان بەوەدا بنێین کە خەلقکردنی جیهانێکی تەواو کارێکی یەکجار مەزنە و شایانی هەموو ڕێز و پێزانینێکە، بەڵام ئەگەر جیهانێکی تەواو لە توانایدا بووایە خۆی خۆی بخوڵقێنێت، دەبووایە ڕێزێکی گەورەتری لێ بگیرایە. وە بەپێچەوانەشەوە دەتوانین بڵێین: ئەو ئەزموونەی لەدوای خەلقکردنەوە هەستی پێ دەکرێت، هەر هیچ نییە لەچاو ئەو ئەزموونە مەزنەدا کە خۆت بتوانیت لە هیچی نەبووەوە خۆت خەلق بکەیت و لەسەر پێی خۆت بوەستیت.

## نۆی سینەک

جۆکەر هەست دەکات کە خۆشی گەورە دەبێت، هەست بە گەشەسەندنی دەست و قاچەکانی دەکات، هەست دەکات شتێک نییە کە تەنها خۆی مەزەندەی بوونی خۆی بکات. هەست بە سەرهەڵدانی مینا و عاجی ناو دەمە ئاژەڵییە شێوە مرۆییەکەی خۆی دەکات. لەژێر ڕۆبەکەی بەیانیانیدا هەست بە سوکی کێشی پەراسووی گیاندارە شیردەرەکەی خۆی دەکات. هەست بە ترپە ڕێکوپێکەکانی دڵی دەکات کە بەردەوام هەر لێدەدات و لێدەدات، بەو شێوەیەش وەک پەمپێک لەناو لەشیدا پاڵ بە شلەیەکی گەرمەوە دەنێت.

دەی سینەک
مایەی سەرسوڕمان نییە کە خالق، وەک دەڵێن پاش ئەوەی مرۆی لە قوڕ دروست کرد و فووی ژیانی لە لوتییەوە پێدا کرد و بووە بوونەوەرێکی زیندوو، یەک دوو هەنگاو هاتە دواوە. ئەو شتەی لەو ڕووداوەدا زیاترێک مایەی سەرسوڕمانە، ئەوەیە کە کاتی خۆی ئادەم سەرسام نەبووە.

کوڕی سینەک
جۆکەر لە شێوەی گیانەوەرێکی شیردەری باڵادا بەناو شەکرەپەرییەکاندا دێت و دەڕوات. سەری دادەنەوێنێت و تەماشای دوو دەستی نامۆی خۆی دەکات، دەستێک بە کوڵمێکدا دەهێنێت کە نایناسێت، دەستی دەبات بۆ ناوچەوانی و دەزانێت ئەوێ ماڵی نهێنیی خودە، جێگای پلازمای ڕۆح و دەڵەمەی مەعریفەیە. ناتوانێت لەوەندە زیاتر لە کرۆکی شتەکان نزیک ببێتەوە. بە لێڵی مەزەنەی ئەوە دەکات کە دەشێت خانەخوێیەکی مێشک بێت. لێرەشەوە چیتر خۆی خۆی نییە.

کچی سینەک
تاسەیەک جیهانی تەنیوە. هەتاوەکو شتەکانیش گەورەتر و مەزنتر بن، هەستی ڕزگاربوون لەو تاسەیە قووڵترێک دەبێتەوە. کێ گوێ لە تاسەی زیخێک دەگرێت؟ کێ گوێ بۆ تاسەی ئەسپێیەک شل دەکات؟ خۆ ئەگەر هیچ شتێک بوونی نەبووایە، ئەو کاتە هیچ کەسێک تاسەی هیچ شتێکی نەدەکرد.

پاشای سینەک
ئێمە ڕۆحێکمان هەڵگرتووە، هەر هەمان ڕۆحیش هەڵیگرتووین و نایناسین. سەرەی ئێمە ئەو کاتە دێت کە نهێنییەکە لەسەر دوو پێ دەوەستێت و هەڵناهێنرێت. ئەوە ئێمەین کە وەک وێنە خەونییەکان چڕنووق لە دەستی خۆمان دەگرین و خەبەرمان نابێتەوە. ئێمە ئەو نهێنییەین کە کەس هەڵیناهێنێت. ئێمە ئەو حەکایەتەین کە لەناو وێنەی خۆیدا قەتیس

کراوە. ئێمە ئەو شتەین کە بەردەوام دەڕۆین و دەڕۆین، بەبێ ئەوەی بگەینە تێگەیشتنێک و بینینێکی ڕوون.

بللی دینار

شتێک گوێ قووڵاغە و چاوی داپچڕیوە: لە سەرەوە لە کڵپەی ئاگرەکەوە تەماشا دەکات، لە شلە چڕە سەرەتاییەکەوە دەڕوانێت، لە دەرکی ئەشکەوتەکانەوە و لە ئاسۆی دەشتە پڕ گژوگیاکانەوە سەیر دەکات.

دووی دینار

ڕێگا پڕ نهێنییەکە بەرەو ناوەوە ناڕوات، بەڵکو بەرەو دەرەوە دەڕوات. ئەو ڕێگایە بەرەو گێژاو ناڕوات، بەڵکو لە گێژاو دێتە دەرەوە. ئەو ڕێگا پڕ نهێنییە لە تەمی هایدرۆجینی و سەدیمی گەردوونی خولاوە و سوپەر نۆڤاوە دەستی پێ کردووە. دوا قۆناغیش گەیشتووە بە جۆرە شانەیەکی گەورەی گەردیلە کە توانای دروستکردنەوەی خودی خۆی هەیە.

سێی دینار

نهێنیی تەونی جاڵجاڵۆکەیی ڕەگەزەکان لە وێنەی بچکۆلە بچکۆلەی ناو شلەی سەرەتایی ژیانەوە درێژ بۆتەوە و بەرەو ماسیی پەڕەکەداری پەل پەل و گیانەوەری وشکاوەکی پێشکەوتووی (کلاڤۆیانت) ڕۆیشتووە. ئەو داری پێشکەوتنە زۆر بەوریاییەوە لەلایەن خشۆکە خوێنگەرمەکانەوە دراوەتە دەست گیانەوەرە (نیومەیموون)ە ئەکرۆپاتەکان و ئەوانیش بەخشیویانەتە مەیموونە شێوە مرۆییە دڵتەنگەکان.بڵێیت کاتی خۆی جۆرە تێگەیشتنێکی شاراوە بەرامبەر بە خود، لە قووڵایی مێشکی خشۆکەکاندا هەبووبێت؟ بڵێیت مرۆی شێوە مەیموونیی گەشەسەندوو، جارجارە دەربارەی خودی پلانە گشتییەکە، هیچ جۆرە فیکرەیەکی خەواڵووی بە خەیاڵدا هاتبێت؟

چواری دینار

دیمەنە سەرەکییەکە وەک تەمێکی ئەفسووناوی بەرز دەبێتەوە، بەنێو

تەمەکەدا تێدەپەڕێت و دەچێتە سەروو تەمەکەوە. زڕبرا بەنازەکەی نیاندەرتاڵ دەست دەخاتە سەر ناوچەوانی و دەزانێت لە پشت ئێسقانی ناوچەوانی گیانەوەرە شیردەرە باڵاکانەوە ماددەی نەرمی مێشک مەلە دەکات، دەزانێت هەر ئەو مێشکەش کاپتنی ئۆتۆماتیکی سەفەری گەشەکردنە، پەی بەوە دەبات کە هەر ئەوە باڵۆنی پارێزەری فیستیڤاڵی پڕۆتینە، ئەو باڵۆنەیە کە شت و بیرکردنەوە لە یەکدی جودا دەکاتەوە.

## پێنجی دینار

پێشکەوتنە هەرەگەورەکە لەناو بازنەی سێرکی مێشکی گیانەوەرە چوارپەلەکاندا ڕوودەدات. لەوێوە دەنگوباسی دواهەمین سەرکەوتنی ڕەگەزەکەیان ڕادەگەیەنرێت. لەناو خانە دەمارییە گەرموگوڕەکانی گیانەوەرە بڕبڕەدارەکاندا، بۆ یەکەم جار تەپەدۆری شەمپانیاکان بە ئاسماندا هەڵدەدرێن. گیانەوەرە شیردەرە پۆستمۆدێرنەکانیش لە دواجاردا دەگەنە تێگەیشتنە مەزنەکە. پێویست بە ترس و نیگەرانیش ناکات: چونکە هەر ئەوەندەیە کە گەردوون لە گۆشەیەکی کراوەوە تەماشای خودی خۆی دەکات.

## شەشی دینار

گیانەوەرە بڕبڕەدارەکە لەناکاوێکدا ئاوڕ دەداتەوە و لە ئاوێنەی ڕابردووی ساڵە تیشکییەکانی شەوەوە، دەڕوانێتە کلکی پڕ نهێنیی ڕەگەزەکەی خۆی. ئەو ڕێگا پەنهانە تەنها لە ئێستادا گەیشتۆتە ئامانجەکەی، ئامانجەکەشی ئەوە بوو کە بەئاگا بێت لەو ڕێگا دوورودرێژەی کە بەرەو ئامانجەکە دەڕوات. تەنها هێندەی پێ دەبڕێت کە چەپڵە لێبدات، هەر ئەو پەلانەشە کە وەک بۆماوەیەک بۆ ڕەگەزەکەی جێدەهێڵێت.

## حەوتی دینار

بێگومان فیل هەست بە شەرم دەکات، چونکە نەوەکانی پێشووی لەپڕێکدا بەرەو کۆڵانێکی بنبەستی بێکۆتایی ڕۆیشتوون. حورمەتێکی زیاتر بۆ گیانەوەری (نیومەیموون) ماوەتەوە. ڕەنگە وەک ڕووخسار، دیمەنێکی سەیرتری هەبووبێت، بەڵام بەلایەنی کەمەوە بە ئاراستەیەکی باشتردا

ڕۆیشتووە. هەموو ڕێگاکان ناچنەوە سەر جۆکەر.

## هەشتی دینار

گیانەوەرە شیردەرە زرنگەکە لە ماسی و خشۆک و (شیرناڵی) بچکۆلەی شیرینەوە، وەک بۆماوەیەک، دوو چاوی قەشەنگ و قووڵبینی بۆ ماوەتەوە. ئێستاکەش نەوە بۆماوە دوورەکانی ماسییە پەڕەکە پەلکدارەکان لە هەڵهاتنی گەلەهەسارەکانی ئاسمان دەڕوانن و دەشزانن کە چەند ملیاردساڵێکی پێچووە تا بتوانن بەو شێوە قووڵە بڕوانن. هاوێنەکانی چاویان لە گەردیلەی سافکراوی گەورە گەورە پێکهاتووە. بەهۆی پڕۆتین و ترشی ئامینی لەڕادەبەدەر کامڵیشەوە، دەتوانن بەو شێوە وردە سەرنج بدەن.

## نۆی دینار

بینینی فرەلایەن و حیکمەت لە گلێنەی چاودا بەیەکدا دەدەن، هەروەها ئەندێشەی قووڵ و مەخلوقیش لەویادا بەگژیەکدا دەچنەوە. بەرهەمی بینین دەرگایەکی ئەفسووناوییە و بە هەردوو دیودا دەکرێتەوە، لەویادا ڕۆحی خالق ڕووبەڕووی خودی خۆی دەبێتەوە کە لەناو مەخلوقەکانیدایە. ئەو چاوەی کە تەماشای قووڵایی ناو گەردوون دەکات، چاوی خودی گەردوونە.

## دەی دینار

فریشتەکان شتێکی خەیاڵی نین، بەڵکو گیانەوەری بڕبڕەدارن. گەرای ماسین، گەرای بۆقن، بەچکەی ئەو گیانەوەرە خشۆکانەن کە گۆڕانکاریی کتوپڕی بایۆلۆجییان بەسەردا هاتووە. فریشتەکان گیانەوەری بڕبڕەداری پێنج پەنجەیین، وەرەسەی ڕەسەنی گیانەوەرە شیرناڵییە سەرەتاییەکانن، گیانەوەری شیرداری بێ کلکن، کە دەنگی کپی تەپڵێکی کۆن لە درەختەکانەوە دەیانهێنێتە خوارەوە.

## کوڕی دینار

فریشتەکان لە دەرەوەڕا نایەن، بەڵکو لە ناوەوە دێن. تاڵی زڕاف و

کەیفخۆشی تەونی جاڵجاڵۆکەی (دی ئێن ئەی DNA)ین. فریشتەکان سێبەری چەند وێنەیەک نین کە لەسەر دیواری ئەشکەوتێک دەردەکەون، بەڵکو چەند کۆلۆنییەکی باڵا و جیاوازی خانەیین. فەنتازیا نین، بەڵکو حەکایەتن، حەکایەتێکی دیاریکراون.

## کچی دینار

لە کاتی ئێستادا ئەم ئەستێرە زیندووە گەڕۆکە لەلایەن چەند ملیارد تاکێکی پڕ بەهاوە دەبرێت بەڕێوە. هەر هەموویان لە هەمان کەنداوەوە هاتوون. هەر هەموویان لەناو سکی تەنها یەک ماسیی پەڕەکەداری پەل پەلەوە هاتوون. قەت ڕوونەداوە کە دوو دانەیان کتومت وەک یەک وابن. تا ئێستا ڕوونەداوە دوو فریشتە بکەونە سەر هەمان ئەستێرەی گەڕۆک.

## پاشای دینار

جۆکەر لەلای کۆتایی ڕێگا پڕ نهێنییەکەوە وەستاوە. دەزانێت کە شتێکی فرە دێرینی پێیە، لە کیسە و تورەکەدا هەڵینەگرتووە، بەڵکو لە دانە بە دانەی خانەکانی لەشیدایە. تەماشای زەوی دەکات و دەبینێت کە بەردەوام پەیکەرە پڕ لە وردەکاری و هونەری (دی ئێن ئەی DNA) یەکانی خۆی بڵاو دەکاتەوە، ئەو پەیکەرانەی کە لەسەر ئامانجێکی وردی ناوەکی هەڵچنراون. کێ دەبێتە فیلی ئەم ساڵ؟ ئەی وشترمرخی ئەم لەکوێدایە؟ لە کاتی ئێستا کێ بەناوبانگترین گیانەوەری شیردەری سەرەکی سەر ئەم زەوییەیە؟

## بللی کوپ

ئێستاکە پەرییەکان لەنێو حەکایەتەکەدان، هەربۆیە ناتوانین بە وشە گوزارشتیان لێ بکەین. ئەگەر خۆیان توانایان هەبووایە کە خۆیان ببینن، بڵێیت ئەو کاتە حەکایەتەکەیان ببووایەتە حەکایەتێکی ڕاستەقینە؟ بڵێیت ژیانی ڕۆژانە شتێکی ناوازە و تایبەت بووایە، ئەگەر بەردەوام بەڕوونی لە ماناکەی بگەیشتینایە؟

## دووی کوپ

هەمیشە پەرییەکان زیاترێک هەستیارن وەک لەوەی ئەقڵانی بن، زیاترێک لە حەکایەت دەچن وەک لەوەی بە بەڵگەوە بسەلمێنرێن، پڕ نهێنیترن وەک لەوەی ئەقڵە بچکۆلەکەی خۆیان مەزەندەی دەکات. هەروەک چۆن هەنگە گەورەکان بە لارەلار لە پاشنیوەڕۆیەکی خەواڵووی مانگی هەشتدا لە گوڵێکەوە بۆ گوڵێکی تر بە گیزەگیز دەفڕن، بەهەمان شێوەش شەکرەپەرییەکانی ئەم وەرزە خۆیان دەبەستنەوە بە خانە ئاسمانییە بەئەدەبەکانیانەوە. تەنها جۆکەر خۆی ڕزگار کردووە.

## سێی کوپ

پەرییەکان ڕووی تەلیسکۆبە ڕادیۆییەکەیان دەخەنە سەر قەراغی تەمە دوورە داخراوەکەی حەکایەتەکە، بەڵام شتە قەشەنگەکە ڕێگە نادات لە ناوەوەڕا ببینرێت، و پەریەکانیش گیرۆدەی ناوەوەی شتەکانن. پەرییەکان لە جیهانی تایبەتی خۆیاندا دەژین. بەهۆی ئەنتۆلۆجی بازنەی ڕاکێشانی نهێنییەکەوە بەستراونەتەوە. ئەوان ئا ئەوەن و هیچ جۆرە لێکدانەوەیەکیشی نییە، تەنها درێژبوونەوەی کات و شوێن لەئارادایە.

## چواری کوپ

لە بەرزایی چل هەزار پێوە، خوشکەزا و برازا هەرە هەرە هەرەدوورەکەی ماسی، بەڕاشکاوی دانیشتوون و تەماشای ڕووناکییەکانی ماڵی (هانس و گرێتە) دەکەن. تەنانەت ئەگەر کارەباش ببڕێت، ئەوا لەو خوارانەوە کۆمەڵێک کەس لەو تاریک و ڕوونەدا بەهێواشی و لارەولەنجە هەر دێن و دەچن. تەنانەت ئەگەر هەموو گڵۆپەکانیش بکوژێنەوە، هالەیەک لە زەوییەوە هەر بەرز دەبێتەوە.

## پێنجی کوپ

بەیانییەکی زووە و لە وڵاتی پەرییەکانداین. دونیا نیمچەتاریکە، هەرچەندە بەرلەوەی گڵۆپە کارەباییەکان دابگیرسێنرێن، سەدان هەزار ڕووناکیی

ناوەوە بەهێواشی دەسوتێن. وا شەکرەپەرییەکان هێدی هێدی خۆیان لە خەونە هێواشەکانیان قورتار دەکەن، بەڵام خانەکانی مێشکیان هێشتا فیلم بۆ یەکتری لێدەدەن. فیلمەکە لە هۆڵەکەدا دانیشتووە و لەسەر شاشەکە تەماشای خودی خۆی دەکات.

## شەشی کوپ

پەرییەکان بیر لە شتی سەخت دەکەنەوە. هێندە سەخت، کە خۆشیان ناتوانن بیریان لێ بکەنەوە. ئەوان ناتوانن ئەوە بکەن. ئێ خۆ وێنەکانی سەر شاشەیەکی سینەما، لە شاشەکەوە خۆیان هەڵنادەن و بە چەپ و ڕاستدا پەلاماری ئامێری پەخشکردنی وێنەکان بدەن. تەنها جۆکەر دەتوانێت ڕێگای خۆی لەنێوان ڕیزی کورسییەکاندا بدۆزێتەوە.

## حەوتی کوپ

پەرییەکان بەبێ هیچ خۆئامادەکردنێک ڕۆڵی خۆیان لەسەر شانۆی ئەفسووناویی شارستانییەتدا دەبینن. هەموویان ڕۆڵەکانیان زۆر بەجوانی دەبینن و قەت هیچ کەسێک تەماشای نمایشەکەیان ناکات. هیچ کەسێکی نامۆی لێ نییە، هیچ کەسێکیش بەڕاشکاوی تەماشایان ناکات. تەنها جۆکەرە کە هەنگاوێک دێتە دواوە.

## هەشتی کوپ

دایە پەری لەبەردەم ئاوێنەکەدا وەستاوە و قژە کاڵەکەی دەپشکنێ، ئەو قژەی کە بە چڕی بەسەر شانە ناسکەکانیدا هاتوونەتە خوارەوە. ئەو لەو بڕوایەدایە کە جوانترین گیانەوەری شیردەری مێینەی سەر ئەم زەمینە بێت. منداڵە پەرییەکانیش بەملاولای سەر عەرزەکەدا گاگۆڵکێ دەکەن و چنگیان پڕە لە پارچە پلاستیکی ڕەنگاوڕەنگ. باوە پەریش لەسەر قەنەفەکە پاڵکەوتووە و سەری خستۆتە ژێر ڕۆژنامەیەکی پەمەییەوە. ئەو پێی وایە کە ژیانی ڕۆژانە شتێکی پتەو و مەحکەم بێت.

## نۆی کوپ

هەزان هەزار ساڵ بەسەر ئەو کاتەدا تێپەڕی کە خۆر تیایدا بوو بە ئەستێرەیەکی گەورەی سوور، بەڵام تا ئێستاش نیشانە لاسلکییەکان لە تەمی ئەستێرەکاندا هەر وەردەگیرێن. ئەنتۆنیۆ، کراسەکەت لەبەر کرد؟ خێرا ڕاکە بۆ لای دایە! تەنها چوار حەفتەی ماوە بۆ جەژنی لەدایکبوونی مەسیح.

## دەی کوپ

بەردەوام لەناو تاریکی ئەو سکە هەڵئاوساوانەدا، ملیۆنەها قۆزاخەی نوێی ئاگایی جیهانی مەلە دەکەن. شەکرەپەرییە بێ دەسەڵاتەکان هەر ئەوەندەی کە پێدەگەن و توانای هەناسەدانیان دەبێت، یەک بەدوای یەکدا دێنە دەرەوە. ئەوان شیری شیرینی پەری دەخۆنەوە کە لە دوو گۆپکەی نەرمی گۆشتی پەرییەوە دێنە دەرەوە، بەدەر لەوە ناتوانن هیچ شتێکی تر بخۆن.

## کوڕی کوپ

کوڕە شەکرە پەرییەکە بەدلەیەکی شینی لەبەردایە و هەر حەز دەکەیت بیخۆیت. دایەپەری بەوردی تەماشای دەکات و ئەویش لەسەر جۆلانەیەکی تەختە دیلانێ دەکات، جۆلانەیەک کە بە دوو پەتی ئەستور بە لقی دار هەرمێیەکی گەورەوە هەڵواسراوە. دایکی ئاگای لە هەموو پریشکێکی بچکۆلەی ئاگری گەورەی پەرجووی ئەو پاشنیوەڕۆیەیە و بەتەواوەتی دەزانێت چ شتێک لەو باخچە بچکۆلەیەدا هەیە، کەچی لە ئاستی ئەو ڕووناکییەدا کوێرە کە هەموو باخچەکان پێکەوە دەبەستێتەوە.

## کچی کوپ

کچی کوپ هەر خۆی گوڵێکە بۆ خۆی. کاتێک کە بیەوێت ژوورەکەی بڕازێنێتەوە یان ئەو کەسە ببینێت کە خۆشی دەوێت، خۆی خۆی لێ دەکاتەوە. هەر لە بنەڕەتدا ئەوە خۆی بۆ خۆی هونەرێکی باڵایە و دەشزانێت کە ڕەگەزێکی ناوازەیە. گوڵاڵەکان ڕەق وەستاون و دەیانەوێت

لاسایی ئەو بکەنەوە. گوڵەسپیی بەهارانیش بە ئیرەییەوە سەیری دەکەن. گوڵەسەوسەنەکانیش بەڕێزەوە سەری بۆ دادەنەوێنن.

### پاشای کوپ

هەروەک چۆن وێنەگرتنی دیمەنێک تەواو دەبێت و پەردەکان دادەماڵن و دەیانسوتێنن، ئێمەش بەهەمان شێوە ئەو کاتەی کە دەمرین لە یادەوەریی نەوەکانی داهاتوودا دەبینە چەند وێنەیەکی فەنتازی.. گیانەکەم، دەبینە تارمایی، دەبینە ئەفسانە، بەڵام هێشتا هەر پێکەوەین، ڕابردوومان پێکەوەیە، ڕابردوویەکی دووردوور. من لەژێر قوبەی ڕابردوویەکی پڕ نهێنی و تەمومژدا هێشتا هەر گوێم لە دەنگتە.

### بللی قەرە

جۆکەر هەروەک سیخوڕێک لە حەکایەتەکەدا بێ وچان بەدزییەوە بەناو شەکرە پەرییەکاندا دەڕوات. دەگاتە چەند دەرئەنجامێک، بەڵام کەس شک نابات تا بۆی هەڵڕێژێت. تەنها جۆکەر دەزانێت کە خۆی چی دەبینێت. تەنها جۆکەر خۆی بەو شێوەیە دەبینێت کە هەیە.

### دووی قەرە

فریشتەکان بیر لە چی دەکەنەوە کاتێک لە نهێنیی خەونەکان بەرەڵا دەکرێن و بەوپەڕی کامڵییەوە دێنە ناو ڕۆژێکی تەواو نوێوە؟ ئامارەکان لەو بارەیەوە چی دەڵێن؟ جۆکەر ئەو پرسیارە دەکات. ئەو هەموو کەرەتێک سەرسام دەبێت کە پەرجوویەکی ئاوها بچکۆلە ڕوودەدات. ئەو سەرسامی ئەو جادووەیە کە خۆی ئەنجامی داوە. ئەو بەو شێوەیە ئاهەنگی بەیانیی ئافەریدەکردن دەگێڕێت. ئەو ئا بەو شێوەیە سەلام لە بەیانیانی خەلق دەکات.

### سێی قەرە

جۆکەر لە خەوە سوکەکانییەوە خەبەری دەبێتەوە و پێست و ئێسقانی خۆی دەبینێت. بەپەلە تووترکی شەوەکە دەڕنێت، بەرلەوەی ڕۆژ

لەڕادەبەدەر پێیان بگەێنێت. یان ئێستا دەبێت ئەوە بکات یان قەت ناتوانێت. ئێستا دەبێت ئەوە بکات و تەواو. جۆکەر دەزانێت کە ناتوانێت دووجار لە هەمان جێگای خەوەوە بێتە دەرەوە.

چواری قەرە

جۆکەر بووکەشووشەیەکی میکانیکییە و هەموو شەوێک تێکدەشکێت. کە خەبەری دەبێتەوە، سەرلەنوێ قاچ و دەستەکانی پێکەوە دەکاتەوە و بەو شێوەیەش وەک ڕۆژی پێشووتری لێدێتەوە. چەند دەستی هەبوو؟ چەند قاچی هەبوو؟ بەرلەوەی هەڵسێت، سەرێک و دوو چاو و دوو گوێچکە پێکەوە دەنێت.

پێنجی قەرە

جۆکەر لەناو هاردیسکێکی ئۆرگانیدا لەسەر سەرینێک خەبەری دەبێتەوە. هەست دەکات دەیەوێت لە شەپۆلێکی گەرموگوڕی هەلوەسەیەکی نیوەهەژمکراوەوە، بەرەو قەراغ دەریای ڕۆژێکی نوێ هەڵسێت. چ هێزێکی ناوەکی ئاگر لە مێشکی فریشتەکان بەردەدا؟ چ مەکینەیەک فیشەکەشێتەی ئاگایی دەبات بەڕێوە؟ چ هێزێکی ئەتۆمی خانەکانی مێشکی ڕۆح پێکەوە دەبەستێتەوە؟

شەشی قەرە

هەست دەکات بە ئاسمانی بەتاڵدا دەسوڕێتەوە. ناکرێت بەو شێوەیە بەردەوام بێت. بڵێیت شایانی ئەوە نەبێت کە هەنگاوێک بچێتە پێشەوە؟ جۆکەر لەبەردەم ئاوێنەی ژووری خەوتنەکەدا وەستاوە و وەک کەسێکی سەرکەش چەند جارێک خۆی دەجووڵێنێتەوە، بێهودە هەوڵ دەدات نیگایەکی قووڵ لە خەیاڵی ڕۆحیدا ببینێت، بەڵام هەموو شتێک وەک جارانە. دانی جیڕ دەکاتەوە و لەناو پەرجووەکەدا چڕنووق لە خۆی دەگرێت.

حەوتی قەرە

لەپڕێکدا لەسەر زینی سەفەرێکی شومدا دانیشتووە و لە (ئەلف)ەوە

دەچێت بۆ (یَ). ئەو کاتەی لەیاد نییە کە سواری ئەسپەکە بووە، بەڵام ئێستاکە هەست دەکات ئەسپی وجود لەژێریدا غارغارێن دەکات و چەند هێزێکی نهێنی لەناکاوێکدا دەیوەستێنێت.

### هەشتی قەرە

تواناکانی جۆکەر لەڕادەبەدەر زۆرن، هێندە زۆرن کە لە ساتێکی مەستیدا هەست دەکات لە هەرەتی هێزدایە. چەند نەوە دەتوانێت بژمێرێت لەدوای دابەشبوونی یەکەمین خانەوە؟ ئەی لە پاش یەکەمین گیانداری شیردەرەوە، چەند لەدایکبوون دەتوانێت حساب بکات؟ کات، کاتی ژمارە گەورەکانە. وا یەکەمین ماسیی (سی)دار ڕووکەشی ئاو دەشکێنێت و لەوێوە دێتە دەرەوە، بڵێیت لە ئامادەکردنی تێڕامانی ئەم پێشنیوەڕۆیەیدا برێکی باش نەچووبێتە پێشەوە؟ ئینجا لەپڕێکدا ئەو موهەریجە بچکۆلەیە بەشێوەیەکی کوشندە سەری گێژ دەخوات. ڕاستە تواناکانی لەڕادەبەدەر زۆرن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هیچ پاشەڕۆژێکی نییە. ڕاستە خاوەنی ڕابردوویەکی دەوڵەمەندە، بەڵام دواتر هیچە هیچ.

### نۆی قەرە

جۆکەر فریشتەیەکە کە لە تەنگانەدایە: بەهۆی تێنەگەیشتنێکی کوشندەوە خۆی خزاندە ناو لەشێکەوە کە لە گۆشت و خوێن پێکهاتبوو. ویستی بۆ چەند ساتێکی کەمی گەردوونی بەشداریی ژیانی گیانەوەرە شیردەرە باڵاکان بکات، بەڵام نەیزانی و بەدوای خۆیدا پەیژە ئاسمانییەکەی داگرت. ئەگەر کەسێک لە کاتی ئێستادا نەیگەڕێنێتەوە، ئەوا کاتژمێرە بایۆلۆجییەکەی خێراتر و خێراتر لێدەدات، بەو شێوەیەش درەنگ دادێت و دواتر ناتوانێت بگەڕێتەوە بۆ ناو مەملەکەتی ئاسمان.

### دەی قەرە

دەرگای هاتنەدەرەوە لە حەکایەتەکەدا بەتەواوەتی لەسەر پشتە. بێگومان دەبێت کەسێک ئەو پەیامە ڕابگەیێنێت، بەڵام هیچ لایەنێک نییە کە ئەو پەیامە بگەیێنێت. زۆر بێ ڕەحمانە جۆکەر بەرەو هەموو ئەو شتانە

ڕادەکێشرێت کە لە دەرەوەڕا بوونیان نییە. فرمێسکێک دەسڕێت، نا، وا بەڕاستی دەگری. ئا بەو شێوەیە ئەو هەزەلییە بزێوە بە دڵێکی ماتەوە ماڵئاوایی دەکات. دەزانێت کە هیچ دەسەڵاتێکی نییە. سوور دەزانێت کە جیهان قەت قەت ناگەڕێتەوە.

## کوڕی قەرە

جۆکەر بەتەواوەتی لە جیهانی فریشتەکاندا نییە، بەڵکو تەنها نیوەی بوونی لەویادایە. دەزانێت هەر دەبێت سەفەر بکات، واتە ڕووبەڕووی خۆی بۆتەوە. دەزانێت هەر دەبێت بەیەکجاری بڕوات، ئێ خۆ هەر لە ئێستاوە نیوەی ڕۆیشتووە. ئەو لە هەموو ئەو شوێنانەوە هاتووە کە بوونیان هەیە و سەفەر بۆ (ناشوێن) دەکات. هەرکە گەیشتە ئەوێش، تەنانەت ناتوانێت خەونیش بە گەڕانەوەوە ببینێت. سەفەر بۆ وڵاتێک دەکات کە تەنانەت لە خەونیشدا بوونی نییە.

## کچی قەرە

هەتاوەکو جۆکەر زیاترێک لە عەدەمی هەتاهەتایی نزیک بێتەوە، وە لەگەڵ بەخەبەربوونەوەیدا بۆ هەموو ڕۆژێکی نوێ، ڕوونتر و ڕوونتر سیمای گیانەوەرێک لە ئاوێنەکەیدا دەبینێت. هیچ جۆرە دڵنەواییەک لە نیگای بێ ئومێدی گیانەوەرە شیردەرە غەمبارەکەدا نابینێت. ماسییەکی جادوولێکراو دەبینێت، بۆقێک دەبینێت کە شێوەکەی لە ساتێکەوە بۆ ساتێکی تر دەگۆڕێت، مارمێلکەیەکی شێواو و نوقسان بەدی دەکات. لە خەیاڵی خۆیدا دەڵێت (ئەمە کۆتایی دونیایە). لێرەدا کتوپڕ کۆتایی بە سەفەری دوورودرێژی گەشەکردن دێت.

## پاشای قەرە

چەند ملیارد ساڵێکی پێدەچێت تا مرۆڤێک ئافەریدە دەکرێت، کەچی لە ماوەی یەک دوو چرکەدا دەمرێت.

# پەراوێزەکان

١- دوورگەی بەرودوا: مەبەست لە دوورگەی (تاڤیونی)یە کە (١٨٠) پلە لە (گرینیچ)ەوە دوورە. لەبەر جیاوازیی کاتەکان ئەگەر بەسەر ئەو هێڵەدا بەرەو ڕۆژهەڵات سەفەر بکەیت، ڕۆژێکت بۆ دەگەڕێتەوە و ئەگەر بەرەو ڕۆژئاوا بەسەریدا تێپەڕیت ڕۆژێکت دەفەوتێت. یەکەم شوێنی زەویە کە خۆری لێ هەڵدێت. و

٢- کاتالانی: زمانێکە نزیکەی حەوت ملیۆن کەس لە دەوروبەری ناوچەی (کاتالونی) ئیسپانیا قسەی پێ دەکەن. و

٣- پالیۆنتۆلۆجی (Paleontology): زانستێکە لە ڕووەک و گیانەوەری بەبەردبوو دەکۆڵێتەوە. و

٤- بۆقی کێوی: پێشی دەڵێن نێرە بۆق، بۆقی ژەهراوی، بۆقی قوڕ. و

٥- سوپای ڕزگاری: کۆمەڵەیەکی دینی مەسیحییە و ئەندامەکانیان لە ئەفسەر و سەرهەنگ پێکهاتووە، لە (١٠٧) وڵاتدا نزیکەی (٣) ملیۆن ئەندامیان هەیە و زیاتر کاری کۆمەڵایەتی و ئایینی بەجێ دەهێنن، وەک یارمەتیی خەڵکانی هەژار و بێکەسان. و

٦- سەردەمی دیڤۆن devon: ماوەیەکی جیۆلۆجیە کە نزیکەی (٤٠٩_٣٦٣) ملیۆن ساڵ لەمەوبەر دەگرێتەوە. و

٧- Opossum گیانەوەرێکی گۆشتخۆرە، هەر هێندەی پشیلەیەک دەبێت و پێستەکەی زۆر بەنرخە. و

٨- بانەوانک: یان مریشکخۆرە، گیاندارێکە لە دەڵەک دەچێت، پەلەکانی کورتن و کلکی درێژە، سەری قوچەک و چاوی سوورە، ڕەنگەکەی قاوەیی یان ڕەشە. پێستەکەی بەنرخە و مریشک و مشک و مار دەخوات. و

٩- هەڵبەتە مەبەست لەو زنجیرەیەیە کە ئۆرگانیزمێک لە قۆناغێکدا لەسەر شتێکی دیاریکراو دەژی و دواتریش خۆی دەبێتە خۆراکی گیانەوەرێکی تر، بۆ نموونە: ئەو گیانەوەرانەی ڕووەک دەخۆن و دواتر دەبنە خۆراکی ئەو گیانەوەرانەی گۆشتخۆرن. و

-[10] مەبەست لە شێوە قازانجێکە کە بەشێوەیەکی نائەخلاقی هەڵپەی بۆ دەکرێت. و

[11] (شیرناڵی soricidae)، پێشی دەگوترێت (مشکی دارودرەخت): گیاندارێکە لە مشک دەچێت، کلکی کوڵە و چاوی بچکۆلەیە و لمۆزی درێژە، لەسەر مێش و مەگەز و کرم دەژی. و

[12] (تواتارا tua(tara)): وشەیەکی نیوزلەندی کۆنە (توا) واتە پشت، (تارا: واتە چقڵ)، یەکێکە لەو گیاندارە خشۆکانەی کە تەمەنی سەرهەڵدانیان بۆ (٢٢٠) ملیۆن ساڵ لەمەوبەر دەگەڕێتەوە، واتە لەپێش دایناسۆرەکانەوە بوونیان هەبووە. لە کاتی ئێستادا تەنها دوو جۆری لە ژیاندایە. لە کونی ژێر زەویدا دەژین و بە شەوان دێنە دەرەوە. و

-[13] (گۆندوانا gond wana ): کاتی خۆی (لە سەردەمی دێرین و ناوەڕاستی گەشەی زەویدا) کیشوەرێکی گەورە بووە کە کەوتبووە لای پۆڵی جەمسەری باشوورەوە. زۆربەی بەشەکانی خوارووی ئەمریکا و ئەفریقا و هیندستان و ئوستralیاو بەشی پۆڵی جەمسەری باشووری گرتبووەوە. دواتر لە سەردەمی (جوراسیک)دا لە یەکتر جوودابۆتەوە. و

[14] (فولمار fulmar): باڵندەیەکی دەریاییە. و

[15] (جورا jura): ماوەیەکی جیۆلۆجییە: (٢٠٦) بۆ (١٤٢) ساڵ لەمەوبەر دەگرێتەوە. لەم ماوەیەدا دایناسۆرەکان بەهێزترین گیانەوەر بوون لەسەر ئەم زەوییە، هەر لەم ماوەیەشدا بوو کە باڵندەکان سەریان هەڵدا. و

-[16] (لاوراسیا laurasia ): کیشوەرێکی دێرینە و کاتی خۆی پێکهاتبوو لە ئەمریکای باکوور و گریندلاند و باکووری خۆرئاوای سکۆتلاند و ئەورووپا و ئاسیا (جگە لە هیندستان). و

[17] مۆنۆگرافی: کتێبێک دەربارەی بابەتێکی دیاریکراو بێت لە بوارێکی زانستیدا، یان دەربارەی کەسێکی دیاریکراو بێت. و

[18] ئیگوانا iguaner: جۆرە مارمێلکەیەکی گیاخۆرە. و

[19] بالسا: درەختێکی ناوچە گەرمەکانە، کەڵەکی لێ دروست دەکرێت، چونکە تەختەکەی هەم پتەوە و هەم سوکیشە. و

[20] ئاوکلاند auckland: گەورەترین شاری نیوزلەندایە. و

[21] بانەوانک: پێشی دەڵێن مریشکخۆرە، گیاندارێکە لە دەڵەک دەچێت،

پەلەکانی کورتن و کلکی درێژە، سەری قوچەکی و چاوی سوورە. مریشک و مشک و مار دەخوات. و
[٢٢] مانگرۆف: درەختێکی ناوچە گەرمەکانە، لقەکانی ڕەگی تازەیان لێ دەبێتەوە. و
[٢٣] سەرخەس: ڕووەکێکە گوڵ ناگرێت، گەڵاکانی درێژ و درزدارە. و
[٢٤] پۆلینیزی: زنجیرەیەک دوورگەیە وکەوتۆتە بەشی ڕۆژهەڵاتی ئۆقیانووسی ئارامەوە، بۆ نموونە دوورگەی (تاهیتی) یەکێکە لەو دوورگانە. و
[٢٥] قورناویلکە: جۆرە گیاندارێکی کۆمەڵەی بۆقە، کلکی هەیە. و
[٢٦]- هێڵی بەرودوا: ڕێک ئەو هێڵەیە کە لەگەڵ هەڵهاتنی خۆردا یەکەمین تیشکی خۆری بەردەکەوێت، واتە یەکەمین شوێنی زەویە کە ڕۆژی لێوە دەست پێ دەکات. و
[٢٧] سەردەمی (پریکامبرییان Precambrain): کۆنترین ماوەی جیۆلۆجیە کە لە نزیکەی (٤،٦) ملیار ساڵ تا (٥٤٥) میلۆن ساڵ لەمەوبەر دەگرێتەوە، لەو کاتەدا بووە کە ژیانی سەرەتایی لەسەر ئەم زەویە سەری هەڵداوە. و
[٢٨]- گوڵداڕوو: پێشی دەگوترێ (کەرەوزە کێویلکە)، جۆرێکە لە گیای ئاوی لقەکەی ڕەشە، گەڵاکانی لە گەڵای کەرەوز دەچێت و گوڵ ناگرێت. و
[٢٩] پێرمیەن permian: ماوەیەکی جیۆلۆجیە کە نزیکەی (٢٩٠ تا ٢٤٨) ملیۆن ساڵ لەمەوبەر دەگرێتەوە. و
[٣٠] سورگەی کارژۆڵە: پێشی دەگوترێت (دەغدەغان)، ئەو بازنەیەیە کە دەوری بەشی خوارووی خڕۆکی زەوی داوە، لە خوارووی هێڵی ئیستیواوەیە. و
[٣١] ئامۆر: خواوەندی خۆشەویستی لە میتۆلۆجیای ڕۆمانیدا، بەرامبەر (ئیرۆس)ی میتۆلۆجیای یۆنانییە.
* سایکە: لە میتۆلۆجیای یۆنانیدا واتە بە مرۆڤکردنی ڕۆحی مرۆڤ. وەک هونەر، لە وێنەی ئافرەتێکی بچکۆلەدا دەکێشرێت کە باڵی هەیە. و
[٣٢]- بابتیست: ڕێبازێکە لە مەسیحییەتدا و لەو بڕوایەدان تا خەڵکی گەورە نەبن و لە مانای مەسیحییەت نەگەن، نابێت بەڕەسمی ناوی مەسیحیان لێ بنرێت. و
[٣٣]- سیاتڵ: شارێکی قەراغ ئاوی نزیک واشنتۆنە. و
[٣٤] بریج: جۆرە یارییەکی وەرەقەیە و بەبێ جۆکەر دەکرێت، دوو کەس

بەرامبەر دوو کەسی تر یاری دەکەن. و

-٣٥ توورێت: نیشانە هەرە دیارەکانی ئەم نەخۆشییە لەوەدا دەردەکەوێت کە کەسەکە بەبێ ویستی خۆی بەردەوام کۆمەڵێک جووڵە یان قسە و دەنگ دووبارە دەکاتەوە. و

-٣٦ کلاقۆیانت: لە دونیای ڕۆحانیدا، کلاقۆیانت ئەو کەسەیە کە توانای بینینی ئەو شتانەی هەیە کە لە سەروو مەودای بینینی ئاساییەوەن. و

-٣٧ ئارکایۆپتیرێکس «Archaeopteryx»: لە وشەی لاتینی archaios واتە کۆن یان دێرین و pteryx واتە پەڕ یان باڵەوە هاتووە، واتە یەکەم باڵندە یان باڵندەی ڕەسەن. و

-٣٨مەبەست لەو پێستەیە کە لەنێوان پەنجەکانی قاچی هەندێ گیانەوەردا هەیە، بۆ نموونە لەنێوان پەنجەکانی قاچی مراویدا. و

-٣٩ سەردەمی خەڵوزی: ماوەیەکی جیۆلۆجییە کە دەگەڕێتەوە بۆ نزیکەی (٣٥٤ بۆ ٢٩٠) ملیۆن ساڵ لەمەوبەر. و

-٤٠ سەرخەس: دارێکە نزیکەی (١٠) مەتر درێژ دەبێت و لە داری گوێزی هیندی دەچێت. و

-٤١ مەبەست لە (سامۆئیل مۆرس Samuel Morse)ە، (١٨٧٢/١٧٩١) داهێنەر و وێنەکێشێکی پۆرترێتی ئەمریکییە. بەتایبەتی ناوبانگی بە داهێنانی تەلەگرافی ئەلەکترۆنی (١٨٣٧) و ئەلفابێتی (مۆرس)ی دەرکرد. و

-٤٢ Hemidactylus frenatus: جۆرە مارمێلکەیەکی ناو ماڵانە و هەر زۆر بچکۆلەیە، شوێنی ڕەسەنی لە خوارووی ڕۆژهەڵاتی ئاسیا و بەشی سەرووی ئەفریقیایە، درێژییان بەشێوەیەکی گشتی هەر هێندەی نیو پەنجەیەک دەبێت. و

-٤٣ زۆر بەکورتی واتە (هێزێکی پڕ نهێنی جۆرە ترس و سامێک لای مرۆڤ دروست دەکات، بەڵام هاوکاتیش هێندە سەرنجڕاکێشەرە کە بەلای خۆیدا ڕایدەکێشێت). و

-٤٤ sphinx سفینس: گیاندارێکی خورافییە، سەری لە شێوەی ئادەمیزاددایە و لەشیشی لە شێوەی گیانەوەر، ئەبولهەول. و

-٤٥ Synapside و diapside : کۆمەڵێک خشۆکن کە لە سەردەمی ترياس (trias)دا سەریان هەڵداوە، نزیکەی (٢٤٥ بۆ ٢٠٨) ملیۆن ساڵ لەمەوبەر،

دیاپسیدەکان باوە گەورەی دایناسۆرەکانن. و
٤٦- Lepidosauria و archosauria: دوو جۆر گروپی خشۆکن. و
٤٧- Jurassic & Cretaceous: جوراسیک ئەو ماوە جیۆلۆجییە دەگرێتەوە کە دەکەوێتە نێوان (٢٠٨ بۆ ١٤٤) ملیۆن ساڵ لەمەوبەر، لەویادا بوو کە یەکەمین باڵندە گەشەی کرد و سەردەمی هەرە زێڕینی دایناسۆرەکان بوو. (کریتاسی)یش ئەو ماوە جیۆلۆجییە دەگرێتەوە کە کەوتۆتە نێوان (١٤٤ بۆ ٦٥) ملیۆن ساڵ لەمەوبەر. و
٤٨- چاخی سێهەم: ئەو ماوە جیۆلۆجییەیە کە لە نزیکەی (٦٥ تا ١،٨) ملیۆن ساڵ لەمەوبەر دەگرێتەوە، لەو سەردەمەدا گیانەوەرە شیردەرەکان سەریان هەڵدا. و
٤٩- دەیڤید: مەبەست لە دەیڤید پاشای ئیسرائیلە، نزیکەی ساڵی (١٠٠٠) پێش زایین قودسی داگیر کرد و ئیسرائیلی کۆکردەوە، بەپێی چیرۆکێکی پەیماننامەی کۆن لەگەڵ (گۆلیاد)ی زەبەلاحدا جەنگاوە و کوشتوویەتی. و
٥٠- هێلکەکەی کۆلۆمبوس: مەبەست لە چارەسەرێکی ساکاری کێشەیەکە کە تارادەیەک مەحاڵ دێتە بەرچاو، دەڵێن گوایە کاتی خۆی هێلکەیەکیان داوە بە کۆلۆمبوس و داوایان لێ کردووە لە سەرێکییەوە کەمێک پانی بکاتەوە. و
٥١- Gaia: لە میتیۆلۆژیای یۆنانیدا خواژنی زەوییە، نموونەی هەموو دایکە زیندووەکانە. بەرامبەر خواژنی (تیلوس)ی میتۆلۆژیای ڕۆمییەکانە. و
٥٢- سەلەماندەر: پێشی دەگوترێت (قورناویلکە)، جۆرە گیاندارێکە لە کۆمەڵەی بۆق و کلکی هەیە. و
٥٣- مەبەست لە جۆرە ئاگاییەکە کە لەسەروو سنووری تێگەیشتنی هەستەکان و ئاگایی ئاساییەوەیە. و
٥٤- (tellus) تیلوس: ناوی لاتینیی زەوییە، لە میتیۆلۆجی ڕۆمیدا بەمرۆڤکردنی زەوییە و بەرامبەر (گایا)ی یۆنانییەکانە. و
٥٥- دیاردەی دۆپلەر (Doppler effect): کەمی یان زۆری لەرینەوەی شەپۆلی دەنگ یان ڕووناکی بەهۆی جووڵەیەکی ڕێژەیی لەنێوان سەرچاوەی شەپۆلەکان و ئەو کەسەی کە گوێی لێیانە یان تەماشایان دەکات. و
٥٦- ئەستێرەیەکی زۆر گەورەی سوورە، نیوە تیرەکەی بە بەراوردکردنی لەگەڵ خۆردا (١٠٠٠) جار گەورەترە. ئەم خۆرەی خۆشمان نزیکەی (٥) ملیارد ساڵی تر دەبێتە ئەستێرەیەکی گەورەی سوور: ئەو کاتە دەبێت کە

چیتر گازی هایدرۆجین لە سەنتەرەکەیدا نامێنێت، کە ئەو گازەش نەما، چیتر ناتوانێت وزە بەرهەم بهێنێت. و

٥٧- سوپەر نۆڤا: کۆتایی هەندێک ئەستێرەیە کە لە کاتی تەقینەوەیاندا رووناکییەکی فرە گەورە پەخش دەکەنەوە (نزیکەی دە ملیارد کەرەتی رووناکی خۆر) و زۆربەی ماددەکەیان بە گەردووندا پەرشوبڵاو دەبێتەوە، یان بەتەواوەتی لەتوپەت دەبن، وەک ئاکامێکیش ئەستێرەی نیوترۆن یان (کونی رەش) لە گەردووندا سەرهەڵدەدات. تەنها ئەو ئەستێرانەی لە خۆر گەورەترن، دەبنە سوپەر نۆڤا و لەم گەلەهەسارەیەی خۆماندا (رێگای کاکێشان) لە سەدەیەکدا دوو سێ جار سوپەر نۆڤا روودەدات. و

٥٨- ئەستێرەی سپیی بچکۆلە: ئەو ئەستێرانەن کە چیتر وزە بەرهەم ناهێنن، لێرەشەوە هاوسەنگی هێزی راکێشانیان تێدەچێت، هەر ئەوەش وا لە ناوکی ئەستێرەکە دەکات کە چڕ ببێتەوە، هێندە چڕ دەبێتەوە کە لە دواجاردا توێکڵی دەرەوەی ئەستێرەکە جیادەبێتەوە، دەبێتە (تەمی ئەستێرە) و وەک دیاردەیەکی جوان لە گەردووندا دەردەکەوێت. بەپێی گەردووناسان لەسەدا دەی ئەستێرەکانی گەردوون (ئەستێرەی سپیی بچکۆلەن). و

٥٩- مەبەست لە سەردەمی (ئەنتیک) ئەو ماوەیەیە کە دەکەوێتە نێوان نزیکەی ساڵی (٧٥٠)ی پێش زایین و تا نزیکەی ساڵی (٤٠٠)ی پاش زایین. لەو سەردەمەدا بوو کە گەشەسەندنی کەلتووری و ئەدەبی پەرەی سەند و دواتریش کاریگەرییەکی مەزنی لەسەر گەشەسەندنی زانستی بەجێهێشت و

٦٠-حاڵەتی ستینداڵ (stendhal syndrome): حاڵەتێکی دەروونییە و زۆرجار لێدانی دڵی کەسەکە بەرز دەبێتەوە، سەری گێژ دەخوات و هەندێکجاریش تا رادەی هەلوەسە دەروات. زۆرجار ئەم دیاردەیە لە کاتی ئەزموونکردنی هونەردا سەرهەڵدەدات، بەتایبەتیش ئەو هونەرەی کە کەسەکە سەرسام دەکات، یان لەو کاتەدا دەردەکەوێت کە کۆمەڵێک هونەری زۆر لە شوێنێکی بچکۆلەدا دەبینرێن. ناوەکەش لە ناوی (ستینداڵ)ی نووسەری بەناوبانگی سەدەی نۆزدەی فەرەنسییەوە هاتووە. و

٦١- واتە ئیسپانی و پورتوغالی. و

٦٢- Celtic: نەتەوەیەکی بچکۆلەی ئەوروپین کە بە زمانی (سێلتی) قسە

دەکەن، لە چاخی ئاسنیندا لە ناوەڕاست و ڕۆژئاوای ئەوروپادا ژیاون. ئەمڕۆکە تەنها لە چەند شوێنێکی (ئێرلەندا و سکۆتلاند و وەیڵس و فەرەنسا) دەژین. و

٦٣- Moor: ئەو (عەرەب)انەی لە سەرووی ئەفریقادا دەژین، ئەم زاراوەیە بەتایبەتی بۆ ئەو عەرەبانە بەکار دەهێنرێت کە کاتی خۆی لە سەدەی ناوەڕاستدا چوونەتە ئیسپانیاوە. و

٦٤- بەشێوەیەکی گشتی (ڕیدەکشینیزم) هەوڵێکە بۆ لێکدانەوەی چەند دیاردەیەکی دژوار لە ڕوانگەیەکی تاکڕەوی مەتریاڵیییەوە، بۆ نموونە دەڵێن ئایین تەنها دیاردەیەکی سایکۆلۆجییە، کە دیسانەوە ئەمەشیان دەکرێت وردتریێک بکرێتەوە و بڵێین بەهۆی پرۆسێسە کیمیاوییەکانی ناو دەماخەوەیە و... هتد. و

٦٥- ئۆریکا: وشەیەکی یۆنانییە و واتە دۆزیمەوە. دەڵێن گوایە کاتێک ئەرخەمیدس یاساکەی دەدۆزێتەوە (کە ئێستاکە بە یاسای ئەرخەمیدس دەناسرێت)، بە ڕووت و قووتی لە حەمامەکەیەوە هاتۆتە دەرەوە و هاواری کردووە: ئۆریکا!. و

٦٦- دیژەڤیو «Deja_vu»: وشەیەکی فەرەنسییە، زۆر بەکورتی: دیاردەیەکە و کەسەکە وا هەست دەکات ئەو شتەی کە لە ئێستادا ئەزموونی دەکات، لەوەوپێش بینیویەتی، واتە هەست دەکات دووبارە هەمان شت دەبینێتەوە. وەرگێڕ

٦٧- ئیبرۆ_ ئەمریکی: مەبەست لەو وڵاتە ئەمریکییانەیە کە کاتی خۆی کۆڵۆنی ئیسپانیا و پورتوگال بوون. و

٦٨- ئیتیمۆلۆجی: زانستێکە لە ڕەچەڵەکی وشە و مێژووی وشە، گەشەکردن و خزمایەتی وشەکان دەکۆڵێتەوە. و

٦٩- De nada: واتە پێی ناوێت، هیچ نییە. و